ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: دواهەمین هەناری دونیا
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
تۆبەتی چاپ: شەشەم ٢٠١٥
"تەنیا ئەو چاپانە ئەژمارکراون کە بە سەرپەرشتی نووسەر بوون"
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (١٢٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٩٦٩)ـی ساڵی (٢٠١٢)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-958-2



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# ١

مـن لەبەریەیانـی یەکەمـەوە زانیـم کـە دیلیکـردوم. لەکۆشـکێکدا، لەنـاو جەنگـەڵ و دارسـتانێکی نادیـاردا، ئـەو پێیگوتـم لـەدەرەوە دەردێکـی کوشـندەی وەک تاعـوون بڵاوبۆتـەوە. کـە درۆیدەکـرد باڵنـدەکان هەمـوو دەفڕیـن. لەمنداڵییـەوە وابـوو، هـەر کاتێـک درۆیبکردایـە، شـتێکی دیکـە ڕویـدەدا، یـان بـاران دەبـاری، یـان درەختـەکان دەکەوتـن، یـان باڵنـدەکان بەپـۆل بەسەرسـەرماندا دەفڕیـن. مـن لەکۆشـکێکی گـەورەدا دیلبـووم، کتێبـی زۆری بـۆ هێنـام و گووتـی بیانخوێنـەوە. مـن پێمگـووت «لێمگـەڕێ بڕۆمـەدەرێ». گووتی«سـەرتاپای دونیـا نەخۆشـییە، موزەفـەری سـوبحدەم، لێـرەدا لـەم دونیـا جوانـەدا دانیشـە، ئەمـە ئـەو کۆشـکەیە کەمـن بـۆ خۆمـم دروسـتکرد... بـۆ خـۆم و فریشـتەکانم... بـۆ خـۆم و شـەیتانەکانم... لێـرەدا دانیشـە و ئارامبگـرە... فریشـتەکانی منیـش بـۆ تـۆ و شـەیتانەکانی منیـش بـۆ تـۆ... دەرەوە تاعوونـە و دەبێـت تـۆ بەدووربیـت... دوور، تێدەگەیـت، تـۆ دەبێـت لەتاعوونـەکان بەدووربیـت». مـن لـەوێ دووربـووم لەتاعـوون. لەمنداڵییـەوە وابوویـن، ئـەو شـتەکانی خـۆی بـۆ مـن جێدەهێشـت و مـن شـتەکانی خـۆم بـۆ ئـەو. «یاقوبـی سـنەوبەر» ئـەو پیـاوەی کاتێـک سـەیری ئاسـمان دەکات شـتێک ڕوودەدات، هەورێکـی نـاکاو دروسـتدەبێت، نەیزەکێـک دەکشـێت، نورێـک توندتـر لەخێرایـی خـۆی دێتـە دڵمانەوە یان شـەوێک زووتر لـەوادەی خـۆی دادێـت. لەگـەڵ ئـەودا سروشـت هەرگیـز وەک خـۆی نەبـوو،

مـن گەلـەک لەگەڵیـدا بەڕێـگادا ڕۆیشـتووم، ئـەو لەگـەڵ ڕێگاوبـان و هەمـوو شتەکاندا سـیحربازێکی گەورەبـوو، دەیتوانـی چەندیـن شـەو و ڕۆژ بەڕێگاکاندا ڕامانکێشـێت بێئـەوەی هەسـت بەبرسـێتی بکەیـن. مـن تاکـە هاوڕێـی دێرینەی بـووم... لەمنداڵییـەوە دەمناسـی، ئەوانـەی تـر کـە لەگەڵمانـدا شـەڕیاندەکرد گەنجبـوون، دواتـر نیوەیـان دەبنـە دوژمنـی و نیوەیـان دەبنـە نۆکـەری. نازانـم چیرۆکـی مـن و یاقـوب کـەی دەسـتپێدەکات... بیسـتویەک سـاڵ زینـدان جگـە لەکەمێـک یـادەوەری زیاتـر هیچـی بـۆ نەهێشـتوومەوە. بیسـتویەک سـاڵ زینـدان منـی کـرد بەکۆیلەیەکـی تـەواو... لـەو بیسـتویەک ساڵەدا ئـەو تاکـە کەسـێک بـوو نامـەی بـۆ دەنـاردم، لەکاغەزێکـی چکۆلانـەدا دەینوسـی «کەهاتیتــەدەرەوە ســەردەمێکی تــر دەبێــت، تــۆ لەخۆشــترین کۆشــکی دونیـادا دەژی». سـاڵ دوای سـاڵ ئـەو ئـەو نامەیـەی بۆدەنـاردم، نـاوی خـۆی نەدەنوسـی یـان دەینوسـی دۆسـتێک کـە غەریبیتـدەکات یـان لەبنـەوە وەک جـاران وێنـەی باڵندەیەکـی دروسـتدەکرد. مـن سـاڵ بە سـاڵ بەدەسـتوخەتیدا هەسـتم بەشـتێک دەکـرد، هەسـتم بەگۆڕانێکـی هێمـن و لەسـەرەخۆ دەکـرد. لەمـاوەی ئـەو بیسـتویەک سـاڵەدا هیـچ شـتێکم لـەدەرەوە بـۆ نەهاتبـوو دونیـای پێبخوێنمـەوە، ئـەو نوسـراوانەی ئـەو نەبێـت. ئـەو نامـە بچوکانە تاکە ڕێـگای مـن بـوون بـۆ تێگەیشـتن لەگۆڕانکارییەکانـی دونیـا. بیسـتویەک سـاڵ لەسـەریەک ئـەو ڕسـتەیەی بـۆ دەنوسـیمەوە، بیسـتویەک سـاڵ لەسـەریەک مـن یـەک ڕسـتەم لـەدەرەوە بـۆ دەهـات، بـەڵام بۆمـن هەرجـارە و مانایەکـی هەبـوو، لەخوێندنـەوەی دەسـتوخەتەکەیدا گۆڕانکارییەکانـی ڕۆحـی یاقوبیشـم دەبینـی.

یاقوبـی سـنەوبەر پیاوێـک بـوو پڕلەفەنتازیـا. شـەوی یەکەمـم لـەو کۆشـکەدا سـاردو بێدەنـگ و ترسـناک بـوو. بیسـتویەک سـاڵم بەتەنیـا بردبووەسـەر. بیسـتویەک سـاڵ بێدەنـگ بوویـووم، لـەو بیسـتویەک ساڵەدا ڕەنجێکـی گـەورەم دابـوو زمانـم بیرنەچێتـەوە، نـا زمانـم بیرنەچووەوە، بەڵام

لەو ساڵە دووردرێژانەی زینداندا کاتی ئەوەم هەبوو جۆرە زمانێکی تر دروستبکەم، زمانێکی شیعرئاسا. کەهاتمەدەرێ دەمتوانی هەموو شتێک بڵێم، بەڵام بەجۆرێکی دیکە، بەجۆرێک هەندێ جار تێمنەدەگەیشتن. کاتێک هاتمەدەرێ بۆنی سەحرام لێدەهات... هەموو سەحرایەک بۆنێکی خۆی هەیە، ئەوانە زیاتر هەستی پێدەکەن کەتەمەنێکی درێژ لەگەڵیدا دەژین. من بۆنی ئەو بیابانەم لێدەهات، تاکە جارێک منیان دەرهێنا، ئەو جارەبوو کە ویستیان لەگەڵ دیلێکی دەوڵەتدا بمگۆڕنەوە، بەڵام سەرینەگرت، پاش دەڕۆژ لە زیندانێکی دیکە دووبارە هێنامیانەوە بۆ بیابان. بیستویەک ساڵ من گوێم لە لم دەگرت. زیندانەکەم ژوورێک بوو دوور لەهەموو دونیا، یەک ژووری بچوک لەناوەڕاستی دەریایەکدا لەلم... یەک ژووری بچوک لەناو ئابلۆقەی ئاسمان و بیاباندا. ڕۆژگارێک بەترسناکترین دیلی هەموو نیشتیمانیان دادەنام، جودا لەدونیا، لەو سەری ئەوسەری وڵات، لە شوێنێکدا کە خوداش مرۆڤ لەیاددەکات، لەجێگایەکدا ژیان تەواودەبێت و مەرگ دەست پێدەکات، جێگایەک ڕەنگی ئەستێرەیەکی خاڵی هەبوو... جێیانهێشتم. لەماوەی بیستویەک ساڵدا فێربووم قسەلەگەڵ لمدا بکەم. سەیرتان لێنەیەت گەر بڵێم بیابان پڕە لە دەنگ، بەڵام مرۆڤ تەواو فێرنابێت ئەو دەنگانە جیابکاتەوە. من بیستویەک ساڵ گوێم لەبیابان دەگرت و هیرۆگلیفیای ئەو دەنگەجیاوازانەم شیدەکردەوە... گەر بیستویەک ساڵ لەژوورێکدا بیت لەبیابان فێردەبیت ژیانی خۆت چۆن پڕبکەیتەوە، چۆن ئیش بۆ خۆت بدۆزیتەوە. گرنگترین شت ئەوەیە بتوانیت بیر لەزەمەن نەکەیتەوە، هەر کاتێک توانیت بیر لەتێپەڕینی کات نەکەیتەوە دەتوانیت بیر لەشوێنەکانیش نەکەیتەوە، ئەوەی پیاوێکی دیل دەکوژێت بیرکردنەوەی بەردەوامە لەکات و شوێنەکانی تر. تا ساڵی حەوتەم ڕۆژ بەڕۆژ دەمژمارد، بەڵام مرۆڤ بەیانییەک لەخەو هەڵدەستیت و سەیردەکات لە ناکاو

هەمـوو شـتێکی لێتێکچـووە... سـەرەتا چرکـە بـە چرکـە هەمـوو شـتێک حیسـابدەکەیت، بـەڵام ڕۆژێـک لەخـەو هەڵدەسـتیت و سـەیردەکەیت هەمـوو شـتەکانت تێکەڵکـردووە. نازانیـت سـاڵێکە یـان سـەدەیەکە تـۆ لەوێیـت، نازانیـت وێنـەی دونیـا لـەدەورەوە چۆنـە. ترسـناکترین شـت ئەوەیـە کـە بزانیـت یەکێـک چاوەڕوانتـدەکات، کەدڵنیابوویـت کـەس چاوەڕوانـت نـاکات و تـۆ لەبیـر دونیـا چوویتەتـەوە، ئیـدی دەکەویتـە بیرکردنـەوە لەخـۆت، دوای بیسـتویەک سـاڵ ژیـان لەسـەحرادا لـم تەنیا شـتێکە بتوانیـت بیـری لێبکەیتـەوە. هەنـدێ شـەو گوێت لەنـاوی خۆتـە کە سـەحرا دەیخوێنێتـەوە و بانگتـدەکات، هەمیشـە شـەوان یـان دەمـەو ئێـواران هەسـتمدەکرد بیابـان بانگمـدەکات، بـەڵام گرفتـی هـەرە گـەورە ئەوەیـە نازانیـت چـی وەڵامبدەیتـەوە. مـن خێوەکانـی بیابانـم بینـی، ئـەو تارماییانـەم بینـی کـە لـە لم دروسـتبووبوون، ڕەشـەبا دروسـتیدەکردن و بڵاویدەکردنەوە. زۆری دەوێت تـا فێردەبیـت لەگـەڵ لمدا قسـەبکەیت. لـەو بیسـتویەک سـاڵەدا فێردەبیت کەهونـەری قسـەکردن لەگـەڵ لمـدا شـێوەیەکی تـرە... قسـەکردن لەگـەڵ لمـدا ئەوەیەکـە هەرگیـز چاوەڕوانـی وەڵامەکانـت نەکەیتـەوە، قسـەبکەیت و گـوێ لەسـەداکەی بگریـت، سـەدایەک وەک خـۆڵ زەوی دەیبـات و دەبێـت بەژێـر بـاری هـەزاران سـەدای تـرەوە.

مانگـی جارێـک بواریانـدەدام بچمـە سـەحراوە، پاسـەوانێکیان دەهێنـاو مـن لەگەڵیـدا چەنـد سـەد مەترێـک بەسـەر لمەکانـدا دەڕۆیشـتم، ئـەو ڕۆژانـە خۆشـترین ڕۆژانـی ژیانـم بـوون... هەمیشـە لـە هەفتەیـەک لەوەوبـەرەوە خۆم بـۆ ئامادەدەکـرد، کـە پێمدەخسـتە سـەر لمـەکان دڵـم دەفـرِی... بیسـتویەک سـاڵ مـن لـە لـم زیاتـر هیـچ هاوڕێیەکـی تـرم نەبـوو... کەپێمدەخسـتە نـاو لمەکـەوە هەسـتم بەژیـان دەکـرد، هەسـتم بـەزەوی دەکـرد، هەسـتم بـەو لایەنـە بێسـنوورانەی خۆمدەکـرد کـە لـەو ژوورەدا مردبـوون. هێـدی هێـدی خەڵکـم یادکـرد، تەنیـا شـتێک لەگەڵیـدا دەژیـام گـەردون بـوو...

بیستویەک ساڵ ماوەیەکی درێژە بۆئەوەی بیر لەگەردون بکەیتەوە، من لەناو لمەکەدا تەنیا بیرم لەگەردون دەکردەوە، خۆم لەبیاباندا هەڵدەکێشاو تینم تێدەگەڕایەوە. گەورەیی سەحرا هەستێکی بێئەندازە قووڵی بەئازادی لادروستدەکردم. گەر بیستویەک ساڵ لەبیاباندا دیلبیت ڕۆژێک لەڕۆژان وات لێدێت جگە لەو ئازادییەی دەریا بێسنوورەکانی لم پێتی دەبەخشێت بیر لەهیچی تر نەکەیتەوە. پاش چەند ساڵێکی کەم لەزیندان ، دروست نازانم کەی بوو، وازم لەوەهێنا بیر لەسیاسەت بکەمەوە... شەوێک لەسەر ڕۆشنایی مانگ بەئاگاهاتم، تریفەکان بەئەندازەیەک زیندانەکەمیان ڕووناککردبووە هەموو شتێکم وەک ڕۆژی ڕووناک دەبینی، ئەو ڕووناکییە هێزی ئەوەی پێبەخشیم جگە لە گەردون بیر لەهیچی تر نەکەمەوە. من لەمێژبوو مردبووم، یاقوبی سنەوبەر نەبێت کەس نەیدەزانی ماوم... هیچ کەسێکیشم نەبوو سۆراغمبکات... من لەهیچەوە هاتبووم و بووبوومەوە بەهیچ.

ساڵ دوای ساڵ یادگارییەکانم هەمووی دەبوون بەلم.

نەمدەزانی لەکوێ دیلم، سەحرایەک بوو بێناو. ئەو ڕۆژەی منیان بردە ئەوێ چاویان بەستمەوەو چەندین ڕۆژ لەپشتی زیلێکی سەربازییدا بەڕێگاوەبووین. بەبۆنی ڕێگاکاندا دەمزانی ماوەیەکی زۆر درێژە بەسەحرادا دەڕۆین. بیستویەک ساڵە منیان هەڵگرت بۆ ڕۆژێک بمگۆڕنەوە بەیەکێکی گەورە، دواجار لەشەوێکی تاریکدا منیان ئازادکرد.

دوای بیستویەک ساڵ کە دێیتەدەرێ لە لم زیاتر هیچی تر نابینیت. لەلم زیاتر ناتوانیت بیر لەهیچ بکەیتەوە.

منیان هێنایەئەم کۆشکەوە. من هیچ شتێک تێنەدەگەیشتم و ئارەزووی ئەوەشم نەبوو تێبگەم. هەموو شتەکان لەشەودا ئەنجامدران. تا گەیشتمە ئێرە لە تاریکییدا بووم، لەشەوەوە بۆ شەو. شوێنەکان بەئەندازەیەک تاریک بوون لەهیچ نەدەگەیشتم. لەو کاتەوەی لەزیندان

هاتمەدەرێ تا ئەو کاتەی لەو کۆشکەدا چاومکردەوە ڕووناکیم نەبینی... دەستێک لەتاریکیدا بەخشیمی بەدەستێکی تر، دەستێک بێدەنگتر لەشەو، بێدەنگتر لەدیوار، بێدەنگتر لەدەرگا داخراوەکانی زیندانییەکی پیر. پیاوێک بوو مەچەکی گرتم و سوار ماشێنێکی تری کردم، هیچی نەگووت، گوێم لەدەنگی هەناسەکانیشی نەبوو. من تا ئەو کات تەنیا گوێم لەهاواری لم بوو. نەمدزانی بۆ کوێم دەبەن، بەلاشمەوە گرنگ نەبوو بۆ کوێم دەبەن. بیرکردنەوەی زۆر لەگەردون وات لێدەکات نەترسیت. تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو کە گیرام، کە ئازادیانکردم تەمەنم چل و سێ ساڵ بوو. شەوێکی تاریک هاتن و چاویان بەستمەوە و بردیانم. من لەپاسەوانەکەم پرسی «دەمبەن بۆ ئەوەی بمکوژن» گووتی «نا دەتبەین بۆ ئەوەی ئازادتبکەین...». تێنەگەیشتم مەبەستی لەئازادی چییە؟. هیچ شتێک لەوە بێماناتر نییە دوای بیستویەک ساڵ دیلی یەکێک باسی ئازادیت لەگەڵدا بکات. تاکە ئازادییەکی گەورەی من گەڕانەوە نەبوو بۆ دونیا، بەڵکو ئەوەبوو لێمگەڕێن لەسەحرادا بژیم. دڵنیابووم هیچ شتێک لەو دونیایە تێناگەم، ترسێکی گەورەم لەشار و لەمرۆڤان هەبوو، دوای چەند ساڵێک زیندان چیتر مرۆڤ و لمت بۆ جیاناکرێتەوە، من ئەو ماوەیە جگە لە پاسەوانەکانم کەسیترم نەبینیبوو، ئەوانیش لە بیابان کپتر و سەیرتربوون. لەماوەی ئەو بیستویەک ساڵەدا بەدەگمەن چەند وشەیەک قسەیان لەگەڵداکردم. پێدەچوو خۆیان لە سەحرادا لەدایکبووبێتن، لە سەحرادا ژیابێتن و لە سەحرا زیاتر هیچ جێگایەکی دونیایان نەبینیبێت.

کۆشکێکی گەورەبوو، بەرێگایەکی زۆر سەختدا تێپەڕین، تاگەیشتینە ئەوێ بەهەڵبەز و دابەزی ماشێنەکەدا دەمزانی بەرەو هەرێمێکی شاخاوی دەچین. بەیانی کە لەپەنجەرەکانەوە سەیرمکرد لە گەڵا دەترسام. بەیانییەکی پڕ شنەی شەماڵ بوو، هەزاران گەڵای سەوز بادەیهێنان

و دەیبـردن... لێمەپرسـن ئـەو گـەڵا سـەوزانە چیـان دەکـرد لەهـەوادا، بـەڵام مـن ترسـەکانم وایانکـرد سـیمای چەندەهـا جانـەوەری باڵـدار لەنـاو درەختەکانـدا ببینـم، جانـەوەری سـەوز، جانەوەرگەلێـک چاویـان وەک دڵۆپـە شـەونمی درەوشـاوەبوو. یەکـەم بەیانـی کـە چاومکـردەوە جگـە لەپەنجـەرە و تـرس هیچـم نەبینـی. هیـچ کەسـێک، هیـچ دەنگێـک، ئاسـەواری هیـچ مرۆڤێـک. پەنجەرەکانیـش هەمـوو داخرابـوون، خـۆم بـووم بەتەنیـا لـە کۆشـکێکی گـەورەدا، دەرگاکانـی دەرەوە قفڵکرابـوون، لـە دەرەوەش سـیما و دەنـگ و دەرکەوتـەی ئادەمیزادێـک نەبـوو. تـا ئـەو سـەوزاییە دڕندەیـەم نەبینـی تێنەگەیشـتم ئازادکـراوم... خودایـە سـەوزاییەکی بێوێنـە دڵڕەقبـوو، بـەڵام تیشـکێکی ڕۆشـنی هەتـاو لەنێـو دەرختەکانـدا سـەمایدەکرد. ڕووناکییـەک لـە ڕووناکییـە ڕۆشـن و ئاوێنەئاسـا و بێسـنوورەکانی بیابـان دەچـوو. دوای بیسـتویەک سـاڵ یەکـەم بەیانیـم بـوو چاوبکەمـەوە و بیابان نەبینـم... بیابـان ئـەو دۆسـتە دێرینـەی چووبـووە نـاو ڕۆحمـەوە. دەمزانـی ئـەو منـی هێنـاوە بـۆ ئێـرە، لـەو کۆشـکەدا شـتێکم دەبینـی ئـەوی بەیـادا دەهێنامـەوە... یاقوبـی سـنەوبەر.

بەژوورەکانـی ئـەو کۆشـکەدا کەوتمـە گـەڕان، هەسـتمدەکرد لەشـم ناتوانێـت لەگـەڵ ئـەو جوگرافیـا تازەیـەدا ڕابێـت... شـەوێکی سـەیربوو... شـەوێک هەرگیـز لەیادمناچێتـەوە... مـن هێشـتا لەنـاو چنگـی لمـدا بـووم، هێشـتا بەدەگمـەن بـاوەڕم بەئـازادی خـۆم دەکـرد.

نازانـم کـەی بـوو منیـان لـەو ماشـێنە داگـرت، بـەڵام هەسـتمکرد دەمەوبەیانـە... مـن بەبۆنـدا دەمەوبەیانم دەناسـییەوە، عەرد لە هەرجێگایەکدا بێـت بەیانیـان عەتـری خـۆی هەیـە، مـن کە دوای بیسـتویەک سـاڵ پێمخسـتە سـەر ئـەو زەمینـە هێشـتا لـەو دەریـای لمـەدا دەژیـام، نیشـتیمان هێـدی هێـدی بوویـوو بـە بیرۆکەیەکـی خەیاڵـی لـەلام، ئەگەرچـی مـن بۆنـی شـنەی بەیانـم دەکـرد، بۆنـی عەتـری درەخـت و کـزەی دۆڵەسـاردەکانی دەوروبـەرم

دەکرد، بەڵام هەموو ئەو بۆنانە هێشتا تێکەڵاوی هەستێکی قووڵبوون بە دەسەڵاتی بێسنووری لم، کە بەسەر زەویدا دەڕۆیشتم هێشتا هەمان ترسم هەبوو، ترس لە لەرزۆکی و خۆنەگیری و داچوونی قووڵ. من کەسم نەبینی، هەستم بەکەس نەکرد، هێند هەبوو کەچاومکردەوە لەماڵێکی بەریندا بووم، کەچاومکردەوە شەوبوو، تاریکی بوو، تەنیا مۆمێکی کز دەسووتا، مۆمێک لەگۆشەیەکی تاریکدا... مۆمێکی تازەبوو، دیاربوو یەکێک بەر لەهاتنی من ئەو مۆمەی داگیرساندوە و ڕۆیشتووە... من پڕ بەو کۆشکە هاوارمکرد «تۆ ئەی ئەوەی ئەو مۆمەت داگیرساندووە لەکوێیت؟». بەڵام جگە لەسەدایەکی قووڵ هیچی ترم نەبیستەوە... سەدایەک چین بەچین بەرەو ناو تاریکی دەڕۆیشت و لەوسەرەوە بەکزی و خامۆشی دەگەڕایەوە... سەدایەک دەرگای دونیایەکی تری لەمن دەکردەوە... سەدایەک زرینگەیەکی تری هەبوو جیاواز لەسەدای ناو لم. ئەو شەوە هیچ کەسم نەبینی، هیچ کەس لەو ماڵەدا نەبوو. یەکێک منی گەیاندە ئەو ماڵەو جێیهێشتم، گوێم لەدەنگی ماشینێک بوو لەدوورەوە ڕۆی. کۆشکێک بوو بەناوماڵێکی سەیرەوە. لەشوێن حەوانەوەی پادشایەک دەچوو، بەڵام ئاسەواری مرۆڤێکم نەبینی. من ماندووبووم، دەمویست بخەوم، یان بمرم... لەپەنجەرە گەورەکانەوە سێبەری دارستانێکی چڕم دەبینی، پەنجەرەکان بەسەر دونیایەکی بەریندا دەیانڕوانی، ئاسمان وەک ئەوەی هورووژم بێنێت بەسەر سەرمەوە بوو. ڕەشی ئاسمان شتێکی تیابوو جیاواز لەڕەشی بیابان، لەبیاباندا شەو هەمیشە بریسکەیەکی برۆنزی هەیە، ئاسمان جوڵەیەکی تیایە لە جوڵەی لم دەچێت، لمێک ڕەشێتییەکەی لەزوڵمەتی پشکۆیەکی خامۆش دەچێت، پشکۆیەک هەستدەکەیت هەناسەیەک دەیگەشێنێتەوە. بەڵام ئەو بەیانییە جوڵەی گەڵاکان دەیانترساندم... لەو بیستویەک ساڵەی پێشوودا جیهان بەجۆرێکی تر لەپێشچاوم جوڵابوو. ئەو شەوە

هەستم بەوە دەکرد لەگەردونێکی ڕێک و پڕ یاساو ئولفەتەوە هاتوومەتە گەردونێکی تر. بۆئەوەی بیرنەکەمەوە دەخەوتم، لەبری ئەوەی بەو کۆشکەدا بگەڕێم لەیەکەم کونجدا پاڵدەکەوتم و دەخەوتم. شتێک پاڵی پێوەدەنام لەپێخەفەکان بترسم. شتێک تەنیا پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە بیستویەک ساڵە من لەسەر زەوی دەخەوم و پێخەفی ڕاستەقینەم نەدیوە، بەڵکو پەیوەندی بەو گومانەوە هەبوو کە دەرهەق بەو شوێنە تیامدا سەوزبوو. ساتێک بوو لەساتە ڕەشەکانی ژیان. بیستویەک ساڵ بوو دەمزانی من لەکوێم و من چیم، دەمزانی بۆ لەو سەحرایەدا دیلم، بەڵام ئەو شەوە نەمدەزانی لەو کۆشکەدا چیدەکەم. ئەو شوێنە لەخەیاڵی من گەورەتر بوو، جەستەم ڕانەهاتبوو لەژوورێکەوە بچێتە ژوورێکی تر. هەستمدەکرد شتەکانی ئەو کۆشکە تەنهایم دەکوژن، من سەر بەجوگرافیایەکی خاڵی بووم... جوگرافیایەکی بەتاڵ لەهەر زەخرەفەیەک، سەر بەدونیایەک بووم بێ دیکۆر، دونیایەک ئینسان جگە لەسێبەرەکەی خۆی هیچی دیکەی نەبوو، دونیایەک درێژکراوەی مرۆڤ تەنیا گەردون خۆی بوو. درێژکراوەی ڕۆح تەنیا لم و ئاسمان بوون. لەو ماوەیەدا من بیرم لەوەدەکردەوە کە خاڵیتی و بەتاڵی و نەبوونی هیچ زەخرەفەیەک جوانترین ژیانە... لم وامان لێدەکات، ئینسان بەوێنە ڕەسەنەکەی خۆی ببینین، بەو جۆرەی کە هەیە، بێ هیچ زیادەیەک، بێ هیچ درێژکراوەیەکی دەستکرد. من بەهەموو شتێک غەریببووم... هەموو شتێک ترسێکی بێوێنەی تیا دروستدەکردم... من لەو ساتەدا بۆ ژیانێکی خاڵی دەگەڕام... خاڵی لەهەموو سێبەرێک.

ئا وامەزانن من ئەم قسانە لەخۆڕا دەکەم... کاتێک من سەریاسی سوبحدەمم بەجێهێشت تەمەنی چەند ڕۆژێک بوو، ئەو کات نەمدەزانی سەریاسێک و سەریاسێکی دیکەش دێنە دونیاوە. ئا وامەزانن من لەزیندان بیرم لەسەریاسی سوبحدەم نەکردۆتەوە...

وامەزانن من باوکێکی بەدبووم و تەنیا بیرم لە لم کردۆتەوە، بەڵام کە بیستویەکساڵ تەنیا تەماشای لم بکەیت، لم و هیچی تر ڕۆژێک لەخەو هەڵدەستیت و هەموو شتێکت تێکەڵاوکردووە، هەڵدەستیت و هیچ وێنەیەکی تر لەیادەوریتدا نەماوە وێنەی لم نەبێت... ئاه هیچ شتێک وەک لم یادەوەرییەکانمان ناخوات... هەموو ڕۆژێک هەڵدەستیت و هەستدەکەیت بەشێک لەڕابوردووت لەیادچۆتەوە. نا من هەرگیز سەریاسی سوبحدەمم لەیادنەچووەوە، هەموو دونیام لەیادچووە و سەریاسی سوبحدەمم لەیادنەکرد. تاکەشتێک بوو کە نەبوو بەلم، تاکەشتێک بوو هەمیشە سەوزبوو. ساڵگەلێکی زۆر هەموو بەیانییەک دەمبینی، هەموو ڕۆژێک لەخەیاڵمدا گەورەمدەکرد، هەزاران دەموچاوم بۆ دروستکرد، بیرم لەهەموو ئەگەرەکانی نیگاری دەکردەوە. ڕۆژانە لەنێوان پەنجەرەکانەوە تەماشای بیابانم دەکرد و بیرم لەو دەکردەوە. ڕۆژانێک دواتر کەهەموو ئەو شتەسەیرانەڕویاندا، وای بۆ دەچووم هەموو کارەساتەکان لەو بەیانی و ئێوارە سەیرانەی بیابانەوە دەستیپێکردووە کە من هەمیشەزیاد لەنیگارێک و زیاد لەشێوەیەکم بەسەریاسی سوبحدەم دەبەخشی. تا بەیانییەک لەخەو هەستام و لەناو نیگار و شێوەکاندا ونمکردبوو... ساڵ دوای ساڵ کەمتر بیرم لێدەکردەوە، لەبەرئەوەی دواجار نەمدەزانی بیر لەچی دەکەمەوە، بیرکردنەوەکانم نەشێوەیان هەبوو نە ئاراستە، ئەوەی وایدەکرد بێغەم بیر لەو تاکە مرۆڤە بکەمەوە کەدوای خۆم جێمهێشتبوو، بیرۆکەی مردنی خۆم بوو. دڵنیابووم لەو ماوە درێژەدا من مردووم و هەموو دونیا منی لەیادچۆتەوە. ئەو خەیاڵەی کە تۆ مردوویت و کەسانی تر بەبێ تۆ دەژین و ژیانیان شێوەڕوخساری خۆی وەرگرتووە، ئاسوودەییەکی مەزن بەمرۆڤ دەبەخشێت... ئەوەی هیچ کەس چاوەڕوانی گەڕانەوەت ناکات، دەبێتە بەهەشتێکی گەورە بۆت. دوای شەشەمین ساڵ تەواو دڵنیابووم

کە ئیدی هەرچییەک بێت سەریاسی سوبحدەم بەنەبوون و مردنی من ڕاهاتووە. مردنیش وەک زیندان ڕاهاتنە، مرۆڤ وەک هەر شێکی دی دەبێت ڕووبەرێکی داگیرکردبێت تا دواتر هەست بەونبوونی بکەین. وەک هەر شتێکی دی، وەک گوڵدانێک لەسەر مێزێک، یان دەنگی ڕادیۆیەک لەپەنجەرەیەکدا، دەبێت سەرەتا شوێنێکیان گرتبێت و دواتر ونبووبێتن. بەڵام گەر لەسەرەتاوە شتێک نەبوو، دەنگێک یان ڕەنگێک نەبوو ئیدی هەست بەنەبوون و ونبوونی ناکەین. لەساتێک لەساتەکاندا من هەستمکرد ژیانی من لەو بیابانەدا بێئەوەی پێویستیم بەهیچ کەس هەبێت گەیشتۆتە دوا پلەی کەماڵی خۆی... من و ئەو شتانەی دەوروبەرم، من و ئەو هیچییە بێسنوور و بێئەندازەیەی گەردون پێکڕا لەدۆخی کەماڵدا دەژیاین. هەستمدەکرد دونیای دەرەوەی منیش نوقمی کەماڵی خۆیەتی. شوێنێکی گرنگم لەدونیادا نەگرتبوو، بۆ من جیهان بەجوانترین شێوە دەڕۆیشت، بۆ من شتەکان ژیانی خۆیان و مانای خۆیان هەبوو. هەستم نەدەکرد دوورکەوتنەوەی من چ برینێکی لەسەر ژیانی کەس جێهێشتبێت. دوای بیستویەک ساڵ دڵنیابووم کە سەریاسی سوبحدەمیش ژیانی خۆی دەژی، دڵنیابووم سەریاسی سوبحدەمیش وەک هەموو ئەوانی تر وادەزانێ مردووم... تا دەهەمین ساڵی زیندانیش من یەک ئومێدم هەبوو، ئەویش بۆ چەند دەقیقەیەک سەریاسی سوبحدەم ببینم و دواتر بمرم، بەڵام بەیانییەک لەخەو هەستام و وازم لەو ئاواتەش هێنا، دوای دەساڵ لەیەکدابڕان هەموو یەکدی بینینەوەیەک یەکدی ونکردنێکی ترە. من و سەریاس، باوک و کوڕێکی خەیاڵی بووین... بەیانییەک کاتێک سەیری لمم دەکرد، کاتێک سەیری پیربوونی سەحرام دەکرد، تێگەیشتم کە هەرگیز نابمە باوک... ڕۆچوون لەناو لمدا وات لێدەکات نەبیت بە باوک... دەمزانی وەک تۆپەڵێک لم دەگەڕێمەوە، وەک یەکێک کە دەست دەخاتە سەر هەر شتێک دەبێتە تۆز... باوکایەتی ئامێزکردنەوەیە،

بەڵام من چنگێک خۆڵی ڕەش بووم... من بەنیگایەکەوە دەهاتمەوە کە هەمووی دیمەنی بیابان بوو، هەستمدەکرد نزیکبوونەوەو حوکمدانم لەسەر کەسانی تر، هەتا هەتایە لەدیدی یەکێکەوە دەبێت کە وەک سەحرایەک تەماشای کۆی ژیان دەکات.

ئەو شەوەی کە گەڕامەوە نەمدەزانی سەریاسی سوبحدەم لە کوێیە، نەمدەزانی کە دواجار من و ئەویش لە ناو جۆرەبیابانێکی دیکەدا وندەبین کە نەبیابانی من بوو، نەبیابانی ئەو.

# ٢

چەند ساڵێک بەر لەئێستا، ئێوارەیەک «محەمەدی دڵشوشە» کە ئارەزووی دۆزینەوەی نهێنییەکانی هەبوو، دەچێت بۆ دیدەنی توحفەفرۆشێک. دیدەنییەک وەک هەر دیدەنییەکی دی نا کە مرۆڤێک لەڕێگایەوە یەکێکی دی دەبینێت، بەڵکو دیدەنییەکی گرنگ، سەردانێک دەشێت نهێنی تەلیسمێکی بۆ شیبکاتەوە. ئێوارەیەکی بارانە، پڕە لەخەیاڵاتی سەیر سەیری هەور، ئەو بێتەوەی بیر لەنیازی هەورەکان بکاتەوە بەهێمنی و بەدەم گۆرانی گووتنەوە لە کوچەکانی باکورەوە بەرەو باشور شۆڕدەبێتەوە. جگە لە کلیل و مەدالیاکانی کەیاریان پێدەکات، هەنارێکی شوشەش لە گیرفانیایەتی... کلیلەکانی هەڵدەدا بۆ ئاسمان و دەیانگرێتەوە، ئەو کلیلانەی لەشوشەن و دەرگای دونیا هەوایی و سەرزەمینە خەیاڵییەکان بۆ ئەو گەنجە دەکەنەوە کە ئەو ئێوارەیە خۆی بە بەختەوەرترین کەسی دونیا دەزانێت.

هەموو کەس دەیناسێت، هەموو کەس چیرۆکی ئەو مێردمنداڵە دڵشوشەیەی بیستووە کەخۆی مردنی خۆی لەخەوندا دەبینێت. مردنێک ڕۆژ دوای ڕۆژ دەیگێڕێتەوەو قسەی لێدەکات... خەونی بەربوونەوەی دڵی و شکان و پارچەپارچەبوونی وەک هەریەک لەو توحفەشوشانەی لە ناو دۆڵاب و لەسەر ڕەفەبەرز و درێژەکانی ماڵەوە

ڕیزیکردون. ئەو ئێوارەیە هێدی هێدی باران دادەکات، محەمەدی دڵشوشە سەیری ئاسمان دەکات و سەرەنجی ئەوەدەدا تائێستا هەوری بەو جۆرە ترسناکی لەژیانیدا نەبینیوە، بەلام بێئەوەی بترسێت بەردەوام یاری بەکلیلی دەرگا خەیاڵییەکانی خۆی دەکات و گۆرانی دەڵێت. ئێوارەیەکی خۆشە بۆ محەمەدی دڵشوشە کە پێیوایە یەکێک لەکلیلەکانی تەنیا لەباراندا دەرگا دەکاتەوە.

من هەرگیز محەمەدی دڵشوشەم نەبینیوە. بەلام دەتوانم بیهێنمە پێشچاوی خۆم کەبەکوچەکاندا ڕووەو باشور دێتەخوارێ و یاری بەکلیلەکانی دەکات، لەم دەستەوە هەڵیاندەدا بۆ ئەو دەستی تر، لەژێر قاچەوە هەڵیاندەدا و بەهەواوە دەیانگرێتەوە. دەتوانم گەنجێکی خۆشنوود ببینم کەسەیری ئاسمان دەکات و لەبری ئەوەی بترسێت پێدەکەنێت، گەنجێکە تەنیا ماوەیەکی کەمە ژیانێکی بۆ خۆی لەشوشە دروستکردووە، ژیانێک تەنیا خۆی دەزانێ چەند ناسکەو چەند خێرا دەشکێت. بەلام بێباکانە دەڕوات و گۆرانی دەڵێت. ژوورەکەی پڕە لە گوڵدانی سەیر سەیر، لەقۆری بەزەخرەفەی چینییەوە، پڕە لەو پەرداخانەی پڕن لەوێنەی باڵندە، ئەو فەخفورییە سەیرانەی وێنەی ئەژدیها و پڵنگ و کۆتری ئاگرینیان لەسەر نەخشکراوە. دۆلابەکانی، کتێبخانەکەی، مێزەکەی، سندوقی جلەکانی هەموو لەشوشەن. لەسەر یەکێک لەدۆلابەکان، تۆپێکی شوشەی شین کە نەخشەی هەموو دونیای لەسەرە، دانراوە، تۆپێک ئەو دونیا شوشەییەمان وەیادا دەهێنێتەوە کەمن و تۆ تیا دەژین. تۆپێک ئامادەگییەکی ون و نادیاری تیایە بۆ شکان. ئەو ئێوارەیە کەمحەمەدی دڵشوشە دێتەدەرێ، باوەڕێکی قووڵی بەفرسەتەکانی ژیانی خۆی هەیە. کە هێدی هێدی باران دەست پێدەکات ئەو بەهەمان شێوەی ئاسایی خۆی یاری بە کلیلەکانی

دەکات، باران دادەکات و ئەو لەسەر یارییەکانی خۆی بەردەوامە. خەڵکی بەپەلە بەچەترەکانیانەوە ڕادەکەن، ئەو نە سەیری ئاسمان دەکات و نە گوێدەداتە باران، کەمەکەمە باران زیاد دەکات، کەمەکەمە دەبێتە لافاوێکی مەزن، کەمەکەمە شتەکان دەکەونە سەر ئاو، هیچ کەسێک بەشەقام و شۆستەکانەوە نامێنێتەوە، خەڵکی ڕوودەکەنە باڵەخانەبەرزەکان، لەنهۆمی بڵندی خانووە بەرزەکانەوە تەماشادەکەن، دەچنە سەر منارەکان، سەر سەربانی ئوتێلەکان، سەر گومەزە شینەکان، سەر کالیبتۆس و سنەوبەر و شاتووەکان. تەنیا محەمەدی دڵشوشە نەبێت کەبێباکانە ئاو دەیبات و کوچە بەکوچە لافاو دەیهێنێت. ئەو بێئەوەی نوقمبێت وەک بەسەر بەلەمێکی چکۆلە و نەبینراوەوە بێت سەر ئاو دەکەوێت، چوارمەشقی لەسەر لافاوەکان دادەنیشێت و بەزەردەخەنەیەکی گەورەوە سەیری دونیا دەکات. لافاو ماشێن، کەلوپەل، کورسی، کەسانی خنکاو بەملاو بەولای محەمەدی دڵشوشەدا دەفڕێنێت و ئەو تەماشایاندەکات. ئاوی لافاو پڕدەبێت لەشتە عەنتیکەکانی شار، لەتابە، لەسەفتە کتێبی هەرگیز نەخوێندراوە، لەسینی و خوانی پڕ و ئامادە، لەئامێری ماڵ، لەژنی خنکاو بەعەبا ڕەشەکانیانەوە، لەو پیاوانەی مردوون و هێشتا دەستیان لەسەر پارەکانیانە تەڕنەبێت. محەمەدی دڵشوشە لەگەڵ ئەو شتانەدا ئاودەیبات، بەڵام ئەو وەک یەکێک لەسەر بەرماڵی نوێژ دانیشتبێت لەسەر ئاوەکان دادەنیشێت و بەپێکەنینەوە تەماشای ئەوانە دەکات لەسەر سەربانەکان و باڵکۆنی بازاڕە دوو نهۆمەکانەوە تەماشایدەکەن، دەست بەرزدەکاتەوە و سڵاویان لێدەکات، ماچیان بۆ هەڵدەدات، شەپۆلەکان خێرا دەیبەن و ئەو وەک یەکێک لەنمایشێکی تایبەتیدا بێت، هەڵدەستێتە سەرپێ و لەسەر ئاوەکان دەوەستێت، بەپێوە سڵاو لەوانە دەکات کە لەمبەرەوبەری

شـەقامەکانەوە سـڵاوی لێدەکـەن. ئـاو دەبیـات و ئـەو پێدەکەنێـت، باراندەبـارێ و ئـەو لەسـەر شـەپۆلەکان بەپێـوە یـاری بەکلیلەکانـی دەکات، هەڵیانـدەداو دەیانگرێتـەوە. بەهەمـوو کوچەکانـدا دێتەخـوارێ، بەهەمـوو شـەقامەکاندا ئـاو دەیهێنێـت، هەمـووان ئـەو موعجیزەیـە دەبینـن، هەمـووان محەمـەدی دڵشوشـە دەبینـن لەنـاو مردووەکانـدا یاریـدەکات، دەچێتەسـەر ئـەو ئوتومبیلانـەی ئـاو دەیانبـات و لەوێـوە بازدەداتـەوە نـاو ئـاو، دەسـتدەبات سـێو و پرتەقاڵـی ڕاپێچـی سـەر لافاوەکـە دەگرێتـەوە و وەک یاریبازێکـی سـێرک یارییـان پێـدەکات، ئەو قوتـوی خشـڵانە هەڵدەگرێتـەوە کـە لافـاو لەدوکانـی زەڕەنگەرانـەوە ڕایـداون و زێڕەکـەی ناویـان هەڵـدەدا بـۆ خەڵـک. دیمەنـی محەمـەدی دڵشوشـە لەنـاو ئـەو تراژیدیایـەدا هەمـووان دەهێنێتـە پێکەنیـن. بـاران دەبـارێ و ئـەو بەشـەقامەکاندا دەڕوات، وەک سـەوڵێکی خەیاڵـی پێبێـت، یان بەلەمێـک خـودا بیبزوێنێـت، بەشـەقامە گەورەکانـدا دێـت، بەقەیسـەرییەکاندا کـە سـەرتاپایان نوقمـی ئاوبـووە دەڕوات ، بەگـوزەری قەسـابەکاندا تێدەپەڕێـت، بـۆ ماوەیـەک دەسـتدەکاتە ملـی ئـەو کەلاکانـەی سـەرئاو کەوتـوون، لەگـەڵ بەرخـە سـەربڕاو و کەوڵکراوەکانـدا دەکەوێتـە سـەما، بەبـازاڕی پێڵاوفرۆشـەکاندا تێدەپەڕێـت، لەگـوزەری توحفەفرۆشـەکان گوڵدانێکـی زیـو لەسـەر ئاوەکان دەگرێتـەوە و دەیخاتـە باوەشـی و لەسـەر ئـاوەکان دادەنیشـێت. خـۆی دەداتـە دەسـت ڕەوتـی لافـاوەکان... هێـدی هێـدی ئـاو بـەرەو کوچـە تاریـک و داخراوەکانـی دەبـات، بـەرەو نـاو ئـەو کۆڵانانـەی باشـوری شـار، ئـەو کۆڵانـە داخـراو و فەرامۆشـکراوانەی نەدەنگێـک، نەچرپەیەکیـان لێوەنایـەت... هێـدی هێـدی ئـاو لەبـازاڕ و کوچـەو شـەقامی جەنجاڵـەوە بـەرەو جێـگای بێدەنگتـر و کپتـر ڕاپێچیـدەکات. محەمـەدی دڵشوشـە سـەرەنجدەدات شـەپۆلە هێمنـەکان تادێـت بـەرەو شـوێنی داخراوتـری دەبـەن، بـەرەو

ئەو کۆڵانە تەسک و پێچاوپێچانەی ناو گەیشتۆتە ئاست نهۆم و ئاقارەبەرزەکانیان... دواجار دوای گەشتێکی درێژ لە چەندەها کوچەی پێچاوپێچدا، بەناو چەندەها کۆڵانی بێ سەرو دەری ئاڵۆزدا، لەگەڵ دەمەو تاریکیدا و هاوڕێ بەهێمنبوونەوەی باران. ئاوەکان لەسەر ئەو سەری کوچەیەکی دەربەست و بێدەرگادا محەمەدی دڵشوشە دەبەنە بەردەرکی ماڵێکی دوو نهۆم. ئەو دەیەوێت لەگەڵ ئاوەکاندا بگەڕێتەوە و ناتوانێت، دەیەوێت هەستێت و بەسەر شەپۆلەکاندا بڕوات و لەکوچەیەکی ترەوە خۆی بداتەوەدەست مەجرای تۆفانەکان و ناتوانێت، هێزێکی نادیاری ناو شەپۆلەکان بەرەو ئەو دەرگایەی دەبەن. لەویادا دەوەستێت، لەسەر ئاوەکان دادەنیشێت، ترسێکی قووڵ دایدەگرێت، کەمەکەمە شەو دادێت و ڕۆژ ئاوادەبێت، کەمەکەمە هەورەکان دەڕەوێنەوە، مانگ بەهێمنی و شەرمنی دەردەکەوێت. هاوارێکی نادیار لەدڵی محەمەدی دڵشوشەدا سەرهەڵدەدات کە پێیدەڵێت «ئەم ئێوارەیە، ئێوارەی خۆشەویستییە». دەستدەبات و کلیلەکانی دەردێنێت، یەکێک لەکلیلەکانی کلیلی عەشقە... کلیلی خۆشەویستییە ناکامەکانێتی. بەترسەوە ئەو دەرگایە دەکاتەوە، لەگەڵ کردنەوەی دەروازەکاندا ئاو بەرەو حەوشێکی گەورە دەیبات، حەوشی ماڵێکی دێرین بەڵام ئێجگار بەرین و گەورە، وەک بەدەوری پەرستگایەکی کۆندا بسوڕێتەوە بەدەوری ئەو خانووە دێرینەدا دەچەرخێت و دەگەڕێتەوە، دەڕوات و دێتەوە، سەیری پەنجەرەکان دەکات، گوێ لەهێمنی بێئەندازەی دیوارەکان دەگرێت، دێت و دووبارە دەسوڕێتەوە، لەیەکێک لەپەنجەرەکاندا دوو کچ دەبینێت، دوو کچ کە هەردووکیان لەدوو دەست جلی سپیدان و هەردووکیان دوو پرچی درێژیان تا ناو ئاوەکان بەرداوەتەوە و لەسەرەوەڕا تەماشایدەکەن. یەکێکیان «لاولاوی سپییە» و ئەویتریان خوشکە گەورەکەیەتی

«شادەریای سپی». لەگەڵ ئاوەکاندا دەچێتە بەر پەنجەرەکەیان و دەڵێت «ئێوارەتان باش، من ناوم محەمەدی دڵشوشەیە و لافاوەکان منیان هێناوە بۆ ئێرە، دەتوانن پەنجەرەکەتانم بۆبکەنەوە؟». لاولاوی سپی پەنجەرەکە دەکاتەوە و بەمحەمەدی دڵشوشە دەڵێت «فەرموو»، نازانێت لەگەڵ کردنەوەی پەنجەرەکەدا دەرگای تۆفانێکی گەورەی لەسەر ژیانی خۆی خستۆتە سەرپشت. محەمەد دێتەژوورێ و جگە لە گوڵدانێکی زیو و هەنارێکی شوشە لەگیرفانیدا و کۆمەڵێک کلیل و مەدالیا زیاتر هیچی تری پێنییە. محەمەدی دڵشوشە لە یەکەمین ساتەوە دڵنیایە سەروکاری لەگەڵ عەشقێکی ئەفلاتوونی دژواردایە. تەماشای ئەو دوو کچە دەکات کە قژیان لەسەر فەرشەکان دەخشێت، لەشتەکان دەگیرێت، شەپۆلان دەدات و هێمن دەبێتەوە. پێشتر دیمەنی وای نەبینیوە، ئەو کوڕی یەکێک لەپیاوە ناسراوەکانی شارە«سلێمانی مەزن» ئەو پیاوەی لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە لەژێرەوەڕا ئەمینداری نهێنییە ترسناک و گەورەکانی ئەو شارەیە... لەو شەش ساڵەی ڕابوردوودا لەهیچ جێگایەک لەو جۆرە جوانییەی پێشچاو نەکەوتووە، ئەو کلیلسازی هەموو دەرگا زەحمەت و ئەستەمەکان بووە، بەستەی کلیلەکانی هەموو دەرگایەکیان کردۆتەوە... ئەو هونەرمەندی یەکەمی کردنەوەی نهێنییەکانە.

ئەو ئێوارەیە چیرۆکی عەشقێکی ناکام دەست پێدەکات، ئەو دوو خوشکە بەڕۆحێکی کراوە و دۆستانەوە پەنجەرەی ژیانیان لەمحەمەدی دڵشوشە دەکەنەوە، بەتایبەت کاتێک دەبینن گەنجێکی دڵساف و خۆشڕوو و دەمبەخەندەیە. بەڵام لاولاوی سپی لەئێوارەی یەکەمەوە پێیدەڵێت «لەبیرت نەچێت تۆ لەدەرگاوە نەهاتوویتە ژوورێ». ئەو ئێوارەیە ئەو دوو خوشکە وەک دوو کەسی دڵسۆز خزمەتی محەمەدی

دڵشوشە دەکەن، قژی بۆ وشکدەکەنەوە، جلەکانی بۆ وشکدەکەنەوە، چای بۆ لێدەنێن و پێیدەڵێن «وەک خوشکی خۆت تەماشامانبکە... جیاوازی نییە ئێمە خوشکی تۆین». محەمەدی دڵشوشە بە ڕوویەکی خۆش، بەڵام ناڕازییەوە دەڵێت «شتی وا نییە، ئێوەخوشکی من نین، من بەهەموو تۆفاندا هاتووم تا حەز لەیەکێکتان بکەم. من باران ناردومی تا لاولاوم خۆشبوێت». زرینگەیەکی سەیر لەدەنگی محەمەدی دڵشوشەدایە، نەرمییەک تێکەڵاوی سەمای غەم و هاواری خۆشیشە، چاوانیشی بەهەمان شێوە پڕن لەپێکەنین و گریان، پڕن لەشەرم و بێشەرمی، پڕن لەسەدای باو زرینگەی شوشە. شادەریای سپی دەزانێت لەو ساتەوە دەبێت ئەو ڕۆڵێکی سەیر ببینێت، کەتەماشای چاوی ئەو گەنجە دەکات، دەزانێت لافاو بۆ شتێکی سەیر بەرەو ئەوماڵەی هێناوە. ئەو ئێوارەیە شادەریای سپی دەڵێت «محەمەدی دڵشوشە، ئێمە تۆ ناناسین... تۆفان تۆی هێنابێت یان ڕەشەبا... باران تۆی هەڵگرتبێت یان گەرداو، دەبێت ئێمە تۆ بناسین». محەمەد دەڵێت «لەهەموو شتێک گرنگتر من دڵم لەشوشەیە، لەشوشەیەکی زۆر ناسک، بچوکترین دڵشکان دەمکوژێت... من کەسێکم لەشوشە، کەشکام ورددەبم، کەوردیش بووم پارچەبەجێدەهێڵم، کەپارچەشم بەجێهێشت، دەبم بەمردوویەکی بەد، من کە مردم بەجۆرێک پەراش دەبم کەس ناتوانێت تێبگات کە پارچە ورد و تەنک و خۆڵئاساکانی منە ژیانی تێکداوە... لەبەرئەوە دڵم مەشکێنن». قسەکانی تێکەڵەیەکن لەهەڕەشەو تکا، لەپاڕانەوە و ترساندن. ئەو ئێوارەیە بەهێمنی تێدەپەڕێت، دوو خوشکەکە داوای لێدەکەن ئەو هەنارە شوشەیەیان بداتێ، بەشەرمەوە دەڵێت «ئەوەهەناری من نییە، بەڵکو هەناری نهێنییەکانە». لەبری ئەو هەنارە گوڵدانە زیوینەکەیان بۆ یادگار

لاجێدەهێڵێت، ئەو هەنارەی دواجار بەشێوەیەکی دی دەکەوێتەوە دەست خوشکەسپییەکان، ئەو گوڵدانەش کە سالوەختێکی دی دەکەوێتە دەست من و لەگەڵ خۆمدا بەرەو دەریا دەیهێنم. ئەو شەوە خوشکەکان تا کاتێکی درەنگ گوێ بۆ محەمەدی دڵشوشە رادێرن. درەنگ وەختێک لەماڵی ئەو دوو کچە سپییە دێتەدەرێ، بەڵام لەهەر ساتێکی تری ژیانی ترساوتر و نائارامترە. ئەوە ئەو ساتەیەکە بۆ هەتاهەتایە لەبیریدەکات بچێت بۆ لای «سەی مژدەی شەمس» ئەو توحفەفرۆشەی لەسەرەتاوە بەشێک لەنهێنییەکانی ئەم چیرۆکە دەزانێت، ئەو نهێنیانەی محەمەدی دڵشوشەش سەردەمانێک عەودالیان بوو. ئەو ئێوارەیە دەستێکی نادیار پێچ بەو گەشتە تایبەتییەی دڵشوشە دەکاتەوە، گەشتێک سالانێک دواتر دەبێت من تەواوییکەم. ئەو ئێوارەیە وەک هێزێک پێیبلێت ئەوەرێگای تۆ نییە، ئازارو ترسەکانی رێگای لێدەگۆڕن و بەرەو جێگایەکی دیکە دەیبەن. ئەو شەوە هێندەی شنەی ساردی شەو هەڵدەمژێت، هێندەی هەوای دوای تۆفان لێیدەدا، تێدەگات نەخنکانی لەلافاوەکاندا، ڕزگاربوونێکی سەیرو مەزن نییە لەمەرگ، بەڵکو دواخستنێکی کورت و خەیاڵییە، کە پەیوەندی بەخولیاکانی خۆیەوە هەیە دەربارەی جوانییەکانی مردن. مردنێک دواتر هەرایەکی چکۆلانە لەناو هاوڕێکانی خۆیدا دەنێتەوە، مردنێک کەسانێکی دی وەک لەعنەتێکی خودایی تەماشایدەکەن، وەک سزایەک بۆ ئەوەی نهێنییەکان دەخوێنێتەوە.

ئەو شەوەکە لەماڵی خوشکە سپییەکان هاتەدەرێ، نەیدەزانی بەرەو کوێ بچێت. بۆ یەکەمجار لەدڵە شوشەکەیدا هەستی بەئازارێکی قووڵ کرد، ئاسەواری لافاو لەهەموو جێگایەکدا بوو، پێدەچوو تۆفان نیوەی شاری کاولکردبێت، لەگەڵ سەدان کەسدا بەرەو باکوری شار هەڵگەڕا، شڵپ وهووڕ دەیدا لە بارانا وی

قەتیسی سەرجادەکان. شارێکی ترسناک و بێتروسکەبوو، خەڵکی بەلایتە دەستییەکانیانەوە بەشەقامەکاندا دەڕۆیشتن. باران نیوەی نهێنییەکانی ئەو شارەی هێنابووە دەرێ و لەسەر شەقامەکان توڕیدابوون، هەندێ کۆڵان لەبەر کەڵەکەبوونی شتومەک بواری ڕۆیشتنی تیانەبوو. شەوێک بوو وەک شەوی خێوەکان، بایەکی سارد دەهات و ئەو لەناو سەدان غەریبەدا بەرەو ژوورەشوشەکەی خۆی دەگەڕایەوە، لەهەر کات زیاتر هەستی بەلەرزینێکی نائاسایی دەکرد. بەڕێگادا دەڕۆیشت و بەخۆی دەگووت «عەشقە... من دڵنیام عەشقە». ئەو شەوە کە گەیشتە ژوورەکەی خۆی تۆفانێکی سامناک لەهەناویدابوو، لافاوێکی نادیار گەلەک سەیرتر و توندتر لەو لافاوە گەورەیەی ئێوارە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، بەڵام لافاوێک بوو پڕ لەنیگار و خەونی سەیر. ئەو شەوە محەمەدی دڵشوشە ئەو خەونە دەبینێت کە سەرتاپای ئەو ئێوارەیەی لێ ئاوەژوودەکاتەوە. لەخەونیدا لافاوێکی سپی دەیبات، لافاوێک وەک چوڕی شیر، پڕ لە بەلەمی سپی، پڕ لە مەخلوقاتی سپی، لەناو ئەو لافاوەدا هەموو کەس دەپەڕێتەوە ئەو نەبێت. خەڵکی دەبینێت چوارمەشقی لەسەر ئاوەکان دانیشتوون و دەڕۆن، بەڵام ئەو نیمچە خنکاو تۆفان ڕاپێچیدەکات. لەخەونەکەیدا دەچێتە بەردەرگای کۆشکێکی سپی، کە دەریایەکی سپی لەچوارلاوە دەوریداوە، ئەو لەویادا کلیلەکانی خۆی دەردەهێنێت و دەیەوێت ئەو دەرگایە بکاتەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئێوارەوە بۆیناکرێتەوە، یەکەیەکە هەموو کلیلەکان تاقیدەکاتەوەو بۆیناکرێتەوە... هێدی هێدی دەستەکانی دەکەونە لەرزین، جار دوای جار خێراتر کلیلەکانی دەگۆڕێت و ناتوانێت ئەو دەرگایە بکاتەوە، کەمەکەمە ئاو بەرەو قووڵایی سپی خۆی کێشیدەکات، دەکەوێتە هاوارکردن، کە بەئاگادێتەوە بۆ ساتێک هەموو گەردون

لەشـێوەی تەمێکـی سـپیدا دەبینێـت و هەسـت بەئازارێکـی کوشـندەش دەکات لەدڵیـدا، ئازارێـک لەتەکیـدا دەسـتدەکاتە گریـان.

ئـەو خەونـە سـەرەتای دەرکەوتنـی یەکـەم درزە لەدڵـی شوشـەیی ئـەو گەنجـەدا. کەڕووداوەکانـی ئـەم چیرۆکـەی ئێمـە لەوێرانـەی دوای عەشـقی ئـەودا ڕوودەدەن.

# ٣

یاقوبی سنەوبەر هات و ماچیکردم، وەک ئەوەبوو لەناو ترسەکانی منەوە قسەبکات... بەو ڕستە سەیرانە دەستیپێکرد و گووتی «دواجار تۆ لێرەیت، لەناوماندایت، بوویتەوە بەیەکێک لەئێمە... لەبیابان زەوی دەستکورت و هەژارە، لەبەرئەوە مرۆڤ کاتێکی زۆری هەیە بیر لەگەردون بکاتەوە، کاتێکی بێئەندازە درێژی هەیە بیر لەئاسمان و ئەستێرە و خۆر و خودا بکاتەوە، ناکۆتا سەیری لم بکات... بەڵام لێرە، لەناو ئەم دارستانە جەنجاڵ و زەوییە دەوڵەمەندانەدا کەهەر درەختەو موعجیزەیەکە، هەر باڵندەیە و بابەتێکی گەورەیە بۆ بیرکردنەوە و ڕامان، هەر مرۆڤەو تەمەنێک بیرکردنەوە و خەیاڵاتی دەوێت، زەوی دەمانکاتە دیلی خۆی... دەبینە موڵکی زەمین... موڵکی شتە تێپەڕ و بچوک و سەروەختەکان، لێرە مرۆڤ لەناو وردەکارییەکاندا وندەبێت و مانا گەورەکان فەرامۆشدەکات، تۆ خۆشبەختیت کە لەسەر زەمینێکەوە هاتوویت، تەنیا خەیاڵت لای مانا گەورەکانی گەردون و ژیان بووە».

دەمەو نیوەڕۆ بوو هات، بەتەنیا هاتە ژوورێ، گەر ناوی خۆی نەگووتبایە لەوانەبوو نەیناسمەوە. لەدەنگیدا هێشتا هاژەیەکی سەیر هەبوو. کەمێک پیر، بەڵام بەقیافەت و بەهەیبەت بوو، جۆرە ساردییەک و بێباکییەک لەپێشوازییەکەیدا بوو. من چاوەڕوانمدەکرد لەساتی یەک بینیندا یەکتر بگرینە ئامێزو بەسەریەکدا بگرین، بەڵام نە ئەو بەگەرمی

باوەشی پیاکردم و نە من.

دەستیگرتم و بردمییە ژوورێکی گەورەوە کە تائەو کات دەرگاکەیم نەکردبووەوە، ژوورێکی گەلەک پۆشتە و پڕ لەئەساسی گرانبەها و سەیر کە لەوەوبەر نەمبینیبوون. پێیگووتم «سەیرت لێنەیە... هەمووشتێک گۆڕاوە، ئێستا ئێمە حوکمدەکەین». وشەی حوکم لەدەنگیدا زرینگەیەکی سیحراوی هەبوو. بەجۆرێک لەجۆرەکان دەیزانی من هیچ شتێک دەربارەی ئەو دونیا تازانە نازانم، ئەو تاکە کەسێک بوو دەیزانی زیندووم و دیلم. هەموو شتێکی دەربارەی شوێنی دیلی و گوزەرانم دەزانی. بەهێمنی پیاوێکەوە کە قسە لەغەمێکی قووڵ بکات، گووتی «زۆر بیرم لێکردوویتەوە، زۆر... دۆزینەوەی تۆ ئاسان نەبوو، تا ئەو نامە بچوکانەت بۆ بنێرم، دەبایە شتێکی زۆر خەرجبکەم... پارەی خەیاڵی... بەڵام دەبوایە تۆ بزانیت من دەزانم زیندوویت... بزانیت لەیادم نەچوویتەوە... شتێک لەوەفای خۆمت بۆ نیشاندەم».

یاقوبی سنەوبەر نەیدەزانی دوای بیستویەک ساڵ دیلی هەموو قسەیەک لەسەر وەفا و بێوەفایی بێمانایە...

ئەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا، قووڵترین هەناسەیەک بوو تا ئەوکات لەژیانمدا بیستبێتم. دەیگووت«دەزانم تۆ ناتەوێت بیر لەو شەوە بکەیتەوە، منیش نامەوێت... هیچ کەسیش لەمن و تۆ بەولاوە حیکایەتی ئەو شەوە نازانێت... هیچ کەس... من بیستویەک ساڵە نهێنی ئەو شەوەم هەڵگرتووە... وەک خۆی... وەک خۆی». من دوای ماوەیەکی درێژ بۆ یەکەمجار پێدەکەنیم و دەمگووت «یاقوبی دۆست... من و تۆ هیچ نهێنییەک لەنێوانماندا نییە، هیچ نهێنییەک... شتەکان دەبایە هەروابن... تۆ سەرۆک بوویت... تۆ لەمن گرنگتربوویت».

وەک یەکێک ئازارێکی گەورەی لەناوەوە هەبێت بەزەحمەت پێدەکەنی و

دەیگووت «لەمێژە کەس پێینەگووتووم یاقوبی دۆست... لەمێژە... چەند ساڵە؟». من دەستم دەخستە سەر دەستی و دەمگووت «بیستویەک ساڵە... بیستویەک». هەناسەیەکی هەڵدەکێشا و دەیگووت «بەڵێ... بەڵێ بیستویەک ساڵە... بیستویەک». دەیویست باسی ئەو شەوە بکات کەمن گیرام، هەردووکمان پێکەوە لەماڵێکی چکۆلانەدا ئابلۆقە درابووین، یان دەبایە هەردووکمان بگیرێین، یان دەبایە یەکێکمان لەپێشەوە بمێنێتەوە و بەرگریبکات تا ئەوی دیمان لەدواوە بۆسەکە دەشکێنێت و دەربازدەبێت. ئەو شەوە دەستم خستە سەرشانی و ماچمکرد و پێمگووت «من دەمێنمەوە. من تا تۆ دەربازدەبیت وێڵیاندەکەم... ئیتر من و تۆ یەکدی نابینینەوە، ئاگات لەسەریاسی سوبحەدەم بێت». ئەوە دواهەمین رستەی من بوو. ساڵانێکی زۆر لەگوێمدا دەزرینگایەوە... دەکرا من دەربازبم، فرسەتی رزگاربوونم لەفرسەتی رزگاربوونی ئەو گەورەتربوو، بەڵام ئەو سەرۆک بوو، من جێگرێکی بووم لەهەرە نزیکەکان. دواجار دەبوایە هەموو شتێک بکەمە فیدای ئەو تا بژی.

ئەو نەهاتبوو باوەشم پیابکات، دەیوویست پێمبڵێت کە دەبێت لەو کۆشکەدا بمێنمەوە، گووتی «دەرەوە کەس تیاناژی، مرۆڤی پاک و بەدەروەست ناتوانێ لەدەرەوە بژی، دەردێکی پیس دونیای گرتۆتەوە، دەردێک نەناوی هەیە نەوەسف... تۆ پێیبڵێ تاعوون، چی ناودەنێیت ویستی خۆتە، بەڵام تۆ لێرەبە... تادەکرێت لێرەبە... لێرە لەهەر جێگایەکی تر سەلامەتترە». کەمێک تەماشایکردم و بەتێرامانێکی سەیرەوە گووتی «بمبورە... کەگووتم تۆ یەکێکی لەئێمە، تۆ یەکێک نیت لە ئێمە... نا... تۆ یەکێک نیت لەئێمە، تۆ بۆنی پاکییت لێدێت، کە هاتیتەدەرێ، کە تێکەڵ بەو دونیایەی ئێمەبوویت خودا دەزانێت چیت لێدێت و چی ڕوودەدات... تۆ تەنیا خۆتی، نە یەکێکیت لەئێمە و نە یەکێکی لەوان، تۆ تەنیا خۆتی، موزەفەری سوبحەدەمیت و بەس.

دوانـەوە تـۆ مردوویـت... مـن نەبێـت هیـچ کـەس نازانێـت کـە تـۆ ماویـت... تـۆ لەمێـژە نـاوت لەهیـچ شـتێکدا نەمـاوە، مـن خـۆم هێـدی هێـدی نـاوی تـۆم لەهەمـوو شـتەکان دەرهێنـا، تـۆم لەهەمـوو قەرزێـک پاککـردەوە، لـە هەمـوو قەرزێـک... هیـچ دەفتەرێـک نییـە نـاوی تـۆی تێدابێـت، لـە هیـچ لاپەڕەیەکـی مێـژووی ئـەم وڵاتـەدا نـاوی تـۆ نایـەت... تـۆم لـە هەمـوو پیسـییەک پاراسـت... تۆ نیـت... موزەفـەری سوبحدەم، دەرەوە بـۆ ژیانـی تـۆ دەسـتنادات... مـن هەمـوو چیـرۆک و سـەربوردەکانم وا ڕێکخسـتەوە تـۆی تیانەبیـت... هیـچ کـەس بـاوەڕت پێنـاکات... هیـچ کـەس... هیـچ کـەس نازانێـت تـۆ شـەوێک لەشـەوان هاوڕێـی مـن بوویـت و ژیانـی خـۆت کردۆتـە فیـدای مـن... ئەوانـەی ئـەو چیرۆکـە دەزانـن یـان مـردوون یـان کۆچیانکـردووە یـان لەیادیانچۆتـەوە، هیـچ کـەس نازانێـت».

بەئارامـی قسـەیدەکرد، دروسـت نەمدەزانـی دەڵێـت چـی، بـەڵام وابـوو هەرگیـز دروسـت نەتدەزانـی بـاس لەچـی دەکات. توانـای هەبـوو گوناهەکانـی خـۆی لەبەرگـی بەخشـندەیی و گەورەییـدا بخاتـەڕوو. وەک هەمیشـە لـە هـەر جێگایەکـدا دەردەکـەوت کپییەکـی قووڵـی لەگـەڵ خۆیـدا دەهێنـا، هێمنـی و غەمێکـی سـەیر. دوای ڕۆیشـتنی دەبایـە هەمیشـە بیریکەیتـەوە، ئـەو هەمـوو شـتەکانی دەخسـتە سـەر هـەوای بیرکردنـەوە، هەتـا گوڵـەکان و باڵنـدەکان و درەختەکانیـش دوای تێپەڕینـی ئـەو بیریاندەکـردەوە. هێمنـی و کپـی و قووڵاییـە تاریکەکانـی نـاو دەنگـی جـۆرە ئاڵۆزییەکیـان دروسـتدەکرد، وەک ئـەوەی نیوەشـەوێکی تاریـک مەسـتانە لـە پێچاوپێچـی باغێکـدا ونتبـکات. کـە قسـەیدەکرد بـەردەوام وام هەسـتدەکرد لەنێـوان کۆمەڵێـک بـاغ و فـوارە و کۆمـی گـوڵاودا ونبـووم. فێنکییەکـی سـەیر لـە وشـەکانیدا هەبـوو، وەک ئـەوەی دوور لـە تاڤگەیـەک وەستابیت و«بـا» پرشـنگی ئـاوت بـۆ بێنێت، وەک ئـەوەی لەژێـر درەختێکـدا خەوتبیـت و شـەماڵ بەمـاچ خەبەرتبکاتـەوە، بـەڵام دیوێکـی تاریکیـش لـە قسـەکانیدا هەبـوو، بەشـێوەیەک لـە شـێوەکان لەنـاو

خۆتـدا ونیدەکـردی... هەمـوو وەختێـک دابەشـبوونێکی قـووڵ و بێئەنـدازە سـەختی لـە شـتەکاندا جێدەهێشـت، شـتێک بەئارامـی لـە بوونـی ئـەوەوە دەهـات و لەنـاو بوونـی تـۆدا نیشـتەجێ دەبـوو. شـتێک سـەرەتا نـازک و ئاسـایی دەردەکـەوت، وەک فڕیـن و دابەزینـی بولبولێـک لـە باغێکـەوە بـۆ باغێکـی تـر... وەک وەرینـی گەڵایـەک لـە چڵێکـی بـەرزەوە بـۆ سـەرزەوی... بـەڵام کـە تێدەپـەڕی ژانێکـی خەنجەرئاسـای جێدەهێشـت، ژانێکـی نادیـار، ژانـی لەیەکتـر تێنەگەیشـتنی مـرۆڤ، ژانـی ئاڵۆزی و تێکەڵاوبـوون و گومان... مـن هەسـتمدەکرد دەچێتـە هـەر جێگایەکـەوە دوای ئـەوە بـۆ چەندیـن شـەو هیـچ شـتێک لـەو شـوێنەدا ناخەوێـت، سـەرەنجمدەدا کـە دەڕوات، دوای گوزەرکردنـی چەندیـن شـەو باڵنـدەکان و درەختـەکان و گوڵـەکان ناخەون.

ئـەو سـاڵەهای سـاڵ منـی لەنـاو خۆمـدا ونکـرد... ئـەو بەیانییـە کـە بینیمـەوە، وەک خـۆی بـوو. بەهێزتـر و دڵڕەقتـر و بێباکتـر دیاربـوو لـە جاران، تێنەدەگەیشتم چـی لـە پیاوێکـی شکسـت و بێپاشـەڕۆژی وەک مـن دەوێـت، بـۆ لـە کۆشـکێکدا هەڵیدەگرێـت؟ لێمدەپرسـی «یاقوبـی دۆسـت... مـن بـەدەردی هیـچ شـتێک ناخـۆم، منیـش لـە دوای لـە یادچوونەوەیەکـی گـەورەدا دەگەڕێـم، بیسـتویەک سـاڵی نـاو لـم، مـن شـەو و ڕۆژ خەریکـی سـڕینەوەی یادەوەرییەکانـم بـووم، بیسـتویەک سـاڵ پارچەپارچـە خـۆم و شـەو و بـا، خـۆم و سـەحرا و هەتـاو، یـادگاری ژیـان و وێنەکانـی ئـەو ڕابوردووە کورتەمـان سڕیوەتەوە... مـن لـەوە لاوازتـرم بتوانـم ئـازادی خـۆم بەکاربهێنـم، لەمـن مەترسـە... بیابـان فێرتـدەکات هیـچ شـتێک داوانەکەیت... هیـچ شـتێک. مـن لـە مێـژە ڕۆحـی زاهیدێکـم هەیـە... زاهیدێـک تەنیـا تەماشـاکردنی لـم تێریـدەکات».

ژیانـی وەک سـەرۆکێکی هەمیشـەیی، هەنـدێ ڕەفتـاری ئاسـایی مرۆڤـی تیـا نەگۆڕیبـوو. یەکێـک بـوو دەیتوانـی بـێ ئـەوەی ویقـاری خـۆی تێکبـدات گاڵتـە بەشـتەکان بـکات، دەسـتی دەخسـتە سـەر نێوچاوانـی و دەیگـووت «تـۆ

هەمیشە زاهیدبوویت... هەمیشە... من لە سەروەختێکی زووەوە تۆم وەک زاهید تەماشاکردووە... لە مێژە وەک دەروێشێک نیگای تۆم کردووە».

ئەوەحەقیقەتێکی گەورەبوو، تاڵترین و دژوارترین ڕاستی ئەو ساتانەی ژیانی من بوو، من تەنیا بەسەحرا دەژیام، من بیابانم بەس بوو، بەڵام ئێستا گەلێک دووربووم، نەمدەزانی چی لەو ئازادییە لەناکاوە بکەم کە بێ هیچ پرسیارێک پێشکەشیانکردبووم. یاقوبی سنەوبەر دەیزانی من لە چیدا دەژیم، بەهێمنی و قووڵییەکی سەیر دەیگووت «ئازادی دەمانکوژێت... گەر ئاگادارنەبین دەمانکوژێت». بۆ ساتێک لە ساتەکان واهات بەخەیاڵمدا کەئەو دەیەوێت لەئازادی بمپارێزێت... واهات بەخەیاڵمدا نایەوێت «ئازادی» لەگەڵ خۆیدا بمبات و ونمبکات. خۆی هیچی نەگووت ئەوەنەبێت جار دوای جار لەناو ڕستەکانیدا بوەستێت و هەناسە هەڵکێشێت و لە قووڵاییەکی بێئەندازە دوورەوە سەیربکات و بڵێت «نازانم... نازانم زاهیدەکان دەبێت بۆ کوێ بچن؟». لای هەردووکمان ئاشکرابوو کە وندەبم، ئەو خەیاڵی لای من و لای ڕابوردووش بوو، خەیاڵی لای من و لای شتەکانی تریش بوو، هەستمدەکرد، ئەویش لەو باغە ساردو سەیرانەی خۆیدا ونبووە. بەجۆرێک لەجۆرەکان من لە وەهمی ئەوەدا دەژیام کە لەڕابوردوو ڕزگارمبووە... من پێمگووت «خۆشحاڵم کە کەس نازانێت زیندووم، من هیچ چاوەڕوانییەکم لەهیچ شتێک نییە، هیچ کەس قەرزارباری من نییە... نا یاقوبی سنەوبەر، هیچ کەس قەرزار باری من نییە، بەڵام پێمبڵێ بۆ منت هێنایە ئەمماڵەوە... بۆ هیچ کەسێک نابینم... کێ منی تا ئێرە هەڵگرت».

کەمێک بەتێفکرینەوە دەیگووت «بۆ تۆم هێنایە ئەم میوانخانە دوور و لاچەپەک و جەنگەڵییە؟ گەلەک قورس و گرانە بتوانم وەڵامتبدەمەوە». سەیری دەستەکانیم دەکرد و دەمزانی ڕاستدەکات. لەسەرەتاوە وابوو، کە قسەیدەکرد من سەیری دەموچاویم نەدەکرد، بەڵکو سەرەنجی دەستیم

دەدا، یان تەماشای شتەکانی دەوروبەریم دەکرد. توانایەکی گەورەی لەگۆڕین و یاریکردن بەدەموچاودا هەبوو، کەسانی تر هەموو سەرەنجی خۆیان دەخستە سەر ڕوخساری، لەبەرئەوە هەرگیز تێنەدەگەیشتن ڕاستدەکات یان درۆ، تەنیا کەسێک بووم دەمزانی کاتێک قسەدەکات دەبێت سەیری کوێی بکەم. ئەو ڕۆژە کاتێک سەیری دەستەکانیم کرد ڕاستگۆبوو. نەیدەتوانی بۆم ڕوونبکاتەوە من لەو میوانخانەیەدا چیدەکەم... بۆدەبێت لەوێبم؟ یەک لەدوای یەک دەیگووت «تاعونە تاعوون، یان هەر دەردێکی کوشندەی ترە کە تۆ بەرگەی ناگریت». سەیری هاتوچۆکەیم دەکرد بەناو ژوورەکەدا و دەمزانی خۆشحاڵە و بێباکیشە لە ئازادیم... خۆشحاڵییەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو یادگارییە دێرینانەی نەیدەویست لە یادیبکات، بێباکییەکەشی دەگەڕایەوە بۆ بێتاقەتی و پیربوونی لەناو هەموو ئاوات و ئارەزووەکانیدا. بەجۆرێک لە جۆرەکان هەردووکمان لە یەکدەچووین، ئەو تا ئەوسەری ئەوسەر لەگەڵ خەونەکانی خۆیدا ڕۆیشتبوو، ئەو خەونە کۆن و سەیرانەی جارانی گەنجێتیمان... منیش بەدیوێکی دیکەدا تا ئەوسەری ئەو سەر هەموو ئەو دونیایەم لەخۆمدا سڕیبووەوە. هەردووکمان بەدوو ئاڕاستەی جیاواز ڕۆیشتبووین من لەناو سەحرایەکی گەورە و ئەو بەناو ژیانێکی جەنجاڵ و دەوڵەمەنددا، بەڵام لەوسەرەوە لە یەک خاڵدا یەکمان گرتبووەوە. من ماوەیەک دواتر کە لەشوێنێکی دی و لەژێر کاریگەری کۆمەڵێک هەست و نەستی دیکەدا بینیمەوە، پتر بۆمدەرکەوت کە ئێمە لەیەکدەچین، زیاتر زانیم من دیوێکی خەوتووی ئەوم و لەخەو هەستاوم و نامەوێت بخەوم. وەک ئەوەی ڕۆحم بخوێنێتەوە بەغەمگینی گووتی «هەندێ جار سەرکەوتن و مردن وەکو یەکە». هەستمدەکرد حیسابی تارماییەکم بۆدەکات، حیسابی مردوویەک... ئەو منی لەهەموو جێگاکاندا کوشتبوو لەیادەوەریدا نەبێت. بەسەرسامییەوە سەیریکردم و گووتی «حەزدەکەم لەسەر مردن قسەت لەگەڵدا بکەم».

بەکەمێـک بێزارییـەوە گووتـم «مـن لەمـردن نەهاتوومەتـەوە». بـۆ ئـەوەی دڵـی مـن بداتـەوە لەسـەرخۆ جگەرەیەکـی دەرهێنـاو دایگیرسـان و بێئـەوەی مـژی لێبـدات لەسـەر تەپڵەکێکـی زیـو بەجێیهێشـت و گووتـی «هەردووکمـان بەجۆرێـک لەجـۆرەکان لەمردنـەوە دێینـەوە... بیابان و سیاسـەت هەردووکیان یـەک شـتن، دوو زەویـن هیچیـان تیاناڕوێـت». کەقسـەیدەکرد دەچـووە بـەر پەنجـەرەکان، هەسـتمدەکرد، قسـە لەگـەڵ شـتێکی دوورتـردا لەمـن دەکات. شـتێک دەکەوێتـە ئەودیـو بوونـی هەردووکمانـەوە. وەک بەدەسـت برینێکـی گـەورەوە بناڵێنێـت، کەمێـک بەخرۆشـان و نائارامییـەوە گووتـی «موزەفـەری سوبحدەم... هاوڕێـم ناتوانـم بتفەمـەوە نـاو ئـەو ژیانـە پیسـە... تـۆم لەوێـدا بـۆ تەماشـاناکرێت... تـۆ یەکێـک نیـت لەئێمـە».

هەمیشـە منـی لـەدەرەوەی شـوێن و کاتـەکان وێناکردبوو، منی خسـتبووە دونیایەکـی جیـاواز لەهەمـوو دونیـاکان، ئێسـتا منـی هێنابوو تا هەمیشـە لەناو شانشـینە خەیاڵییەکانـی ئـەودا بمێنمـەوە. دونیایەکـی بـۆ دروسـتکردبووم بگونجێـت لەگـەڵ یادگارەکانـی ئـەودا. بەهێمنـی گووتـی «لێـرەدا پیردەبیـن... مـن و تـۆ... پیردەبیـن و لـەم پەنجەرانـەوە سـەیری دونیادەکەیـن و بیردەکەینـەوە... ئێرەشـوێنی مـن و تـۆ دەبێـت، لـەم پەنجەرانـەوە تەماشـای گـەردون دەکەیـن، پێکـەوە واز لەهەمـوو شـتەکان دەهێنیـن، دەبینـە دوو زاهیـد... شـەو ڕۆژ قسـە لـە ئەسـتێرە و درەخـت و باڵنـدەکان دەکەیـن... ڕۆژێـک دێـت زمانـی هەموویـان فێردەبیـن، پێکـەوە ژیانمـان تەرخاندەکەیـن بـۆ تێگەیشـتن لەگوڵ... بـۆ تێگەیشـتن لـەو ڕووناکییـە سـەیرانەی کـە شـەو لـەدوورەوە دێـن... ئاورێـک لەڕۆحمـان دەدەینـەوە... تـۆ وەک خـۆی بەپاکـی هەڵیگـرە و منیـش هەمووشـتێک دەکـەم تـا پاکیبکەمـەوە». بـۆ یەکەمجاربـوو کـە قسـەیکرد، پـەردەکان لەرینـەوە، هەنـدێ لـەو گەڵایانەی لـەدەرەوە دەفڕین ئاڕاسـتەی خۆیـان گـۆڕی، باڵنـدەکان ڕۆیشـتن و خامۆشـییەکی لەنـاکاو دونیـای داگـرت. خـۆی بەماندوێتییـەوە سـەری دانەوانـد و بەزەردەخەنەیەکـی

گاڵتەجارەوە گووتی «بیرتە ئەی دۆست بیرتە... دەمانگووت کەشۆڕش سەرکەوت، خەڵوەتێک دروستدەکەین، ژیانێکی خنجیلانە و پاک، هەموو هێزی خۆمان تەرخاندەکەین بۆ تامکردنی جوانییەکانی سروشت... ئا... ئا... هەموو هێزی خۆمان... بۆ تامکردنی جوانی گوڵ... جوانی شەو... جوانی ئەو شتانەی کە کەس جوانیان نابینێت... بیرتە... بیرتە ئەی دۆست؟».

من گووتم «هیچم بیر نییە.... هیچ شتێک من گەلەک ماندووبووم تا هەموو شتەکانم لەژیانی خۆمدا سڕییەوە... گەر هەموو شتێکم لەخەیاڵی خۆمدا نەکوشتایە سەحرا دەیکوشتم... سەحرا باج لەسەر وردترین و نادیارترین وێنە دادەنێت... یاقوبی من، یاقوبی دۆست زۆری ویست تا جارانم لەخۆمدا دەرکرد، شەو لەدوای شەو دانیشتم و بەهێمنی وەک لەدڵی چۆلەکەیەکدا نەشتەرکاریبکەم هەموو ئەو شتانەم لەسەرمدا دەرهێنا... ئەوانە نەیاندەهێشت بخەوم... نەیاندەهێشت بیربکەمەوە، وەک لەفرمێسکی باڵندەیەکدا، ئەستێرە هەموو ڕووناکییەک دەربهێنێت... هەموو ئەو شتانەم کوشت کەفرمێسکەکانی منیان پڕکردبوو لەیاد. بیستویەک ساڵ لەناو لمدا دیلبیت ناتوانیت یادی هیچ بکەیت... تێدەگەیت... ناتوانیت... لم ناهێڵێت یادی هیچ شتێک بکەیت... تێدەگەیت... ناهێڵێت». وامدەگووت و دەگریام، وەک چۆن لەشەوە ساردەکانی بیاباندا دەگریام. سەرم دەخستە ناو دەستمەوە و دەگریام. بێئەوەی تێمبگات، ئەویش سەریدەخستە ناو دەستی و دەگریا.

نەماندەزانی بۆ دەگرین، بەهێوری فرمێسکەکانمان دەسڕی و هەریەکەمان لەجێگای خۆیەوە بەساردی سەیری چاوی ئەوی دیکەمان دەکرد، چاوانی من چاوانی باڵندەیەک بوو، تەماشای ئاسۆ دوور و زەرد و ڕووتەنەکان سووتاندبووی، چاوانی ئەویش چاوانی گورگێک بوو تێربووبوو لەیاریکردن.

لەساتێکدا هەستمکرد نازانێت بۆچی هاتووە بۆلام، نازانێت لەکوێوە دەستپێبکەینەوە، بەڵام بەو شێوازە سەیرو ئاڵۆز و پڕ حیکمەتەی خۆی تێیگەیاندم کە دیلم.... تێیگەیاندم دەرەوە دەمکوژێت و لەوێ ناتوانم لەهیچ شتێک تێبگەم. بەئارامی و زەبر و بێڕەحمییەوە گووتی «تۆ لێرە دەبیت... ئەم شوێنە شوێنی خەیاڵەکانمانە... ئەو جێگایەیەکە چەندەها ساڵ خەونمان پێوە دەبینی». ئینجا تەماشایکردم و گووتی «گەر لێرە بڕۆیتەدەرێ، هەموو ژیانت دەکەویتە دوای شتێک کەنایدۆزیتەوە... بیابان شتێکی پێبەخشیویت... تەنیایی شتێکی قووڵتر و پڕ ماناتری لەشتەکانی ئێمە پێشکەشکردویت... گەر بڕۆیتە دەرێ هیچ نادۆزیتەوە... هیچ... تۆ دەستت بەگەورەیدا ڕاگەیوە، بیستویەک ساڵ تۆ لەخەڵوەتێکی گەورەدا ژیاویت... مەیەرەدەرێ... ئەی دۆست مەیەرەدەرێ... شتەکان چەشنێک پارچەپارچەبوون بەکەس کۆنابنەوە». هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتییەوە «مەیەرەدەرێ، بەدوای ئەو شتانەدا بگەڕێیت کە نایاندۆزیتەوە...»

ئەو قسانەیکرد و ویستی بڕوات، من لەجێگایەکی نزیکدا لەدەرگاکەوە گرتم و گووتم «یاقوبی دۆست، ئەوەی بتوانێت قەدەری دیلی هەڵگرێت دەبێت باری ئازادیش هەڵگرێت... من نەمردووم، دەشمەوێت تێبگەم و دڵنیابم کە دەژیم... ساڵەهای ساڵ من هەموو ڕۆژێک بۆ ژیانی خۆم شەرمکردووە، سەیری شەو و سەراب و تارماییەکانم کردووە و هاوارمکردووە«من دەژیم... هێشتا دەژیم... دەژیم». نا یاقوبی هاوڕێ و دۆست... سەرۆکی من، من و تۆ هیچ حیسابێک و خەونێکمان لەنێواندا نییە... یەک حیساب نەبێت... یەک حیساب، پێمبڵێ... سەریاسی سوبحدەم لە کوێیە؟»

ئاوەها... ئاوەها... دەرگام لەسەر تۆفانەکان کردەوە

# ٤

لاولاوی سپی و شادەریای سپی لەتەمەنێکی زووەوە سوێندێکی ئەبەدییان بۆ یەکدی خواردبوو هەتا مردن کەسیان شوونەکەن، قژیان نەبڕن، کەسیشیان بێئەوی تریان گۆرانی نەڵێت و لەکراسی سپیش بەولاوە هیچ ڕەنگێکی تر نەپۆشن. ئەو ڕێکەوتنە دەگەڕایەوە بۆ چوار ساڵ بەر لەو ئێوارەیەی تۆفانەکان هەڵیانکرد و محەمەدی دڵشوشەیان هێنا... بۆ ئەوکاتەی لەماڵی ئەو دوو خوشکەدا جەنگی گۆرانییەکان هەڵگیرسا، ئەودەم هەردوو ئەو دوو خوشکە تەمەنیان چواردە و پازدەساڵان بوو، هەردووکیان لەژێرەوە منداڵانە عاشقبوون، شەوڕۆژ لەبەر خۆیانەوە گۆرانیان دەگووت... تاکە گرفتێکی ترسناک لەپێشدەمیاندا ئەوەبوو کە کاتێک گۆرانییان دەگووت، هەرکەسە و گۆرانییەکی دەگووت بەگۆرانی ئەوی دی نەدەچوو... جەنگی گۆرانییەکان ماوەیەکی درێژی خایەند، هەندێ شەو تا گەرووییان خوێنی لێدەهات لەڕقی یەک گۆرانیان دەگووت... تاریک و ڕوون دەردەکەوت و ئەوان گۆرانیان دەگووت، کازیوە تێدەپەڕی و ئەوان هەریەک بەرابەری ئەویتر دەیخوێند، خۆرهەڵدەهات و وەک دوو جەنگاوەری عیناد و بێڕەحم شەکەتدەبوون و لەساتێکدا بێئەوەی هیچیان شکستی خۆی ڕابگەیێنێت پێکەوە دەوەستان و لەجێگاکانیاندا نیمچە مردوو دەکەوتن. کەس دروست نازانێت ئەو جەنگە چەندی خایاند، چەند وەرز ئەو دوو خوشکە شەڕیانکرد، چەند گەردەلوول و چەند تۆفان بەسەر شەڕەکانیاندا تێپەڕی. لەیەکێک لەئێوارەکانی ئەو

جەنگە درێژەدا شادەریای سپی نەخۆشکەوت، نەخۆشییەک زۆر لەمەرگ نزیکیکردەوە. تەنیا لاولاوی سپی بەتەواوەتی دەیزانی شادەریای سپی بۆ دەمرێت، بەجۆرێک لەجۆرەکان چیرۆکی عەشقێکی ناکام لەپشت نەخۆشی و دەردەکانی شادەریاوە بوو. بەهارێکی درەنگ بوو کە شادەریا لەبیمارستان کراسێکی سپییان لەبەرکرد و خستیانەسەر تەختێک بەرەو نەشتەرکارییەکی سەخت... بەیانییەکی تاریکی لم بارین بوو، بەدرێژایی شەو لم دەباری. ئەو بەیانییە بەر لەوەی شادەریای سپی بچێتە ژێر دەستی نەشتەرکارەکانەوە کە نە هیوای ژیانیان دەدایە و نە مەرگ، دەبایە لاولاوی سپی بگاتە لای و داوای لێبوردنی لێبکات و بەسەریدا بگری. ئەو بەدرێژایی شەو نەخەوتبوو، کە بەیانی بەچاوی پڕ فرمێسک و گەرووی پڕ حەسرەتەوە گەیشتە بیمارستان. شادەریا بەجلە سپییەکانییەوە چاوەڕوانیدەکرد، دوو خوشکەکە لەسروتێکی سەیری پڕ گریان و هەنسکدا، پڕ لەئامێزان و یەکدی لاواندندا، پڕ لەگەردنئازایی و سوێندخواردندا، بڕیاردەدەن هەتا مردن بێیەکتر نەژین، تامردن پێکەوەبن و یەکجۆر جل لەبەرکەن، هەتاهەتاشە قژیان نەبڕن و گەر جارێکیش گۆرانیان گووت پێکەوە بیڵێن. ژانی ئاشتبوونەوەکەیان بەجۆرێک بەجۆش و بەهێزبوو ئەگەر لەو ساتەدا تیمارپێچەکان شادەریای سپییان نەبردایە لەوانەبوو ئەو پەیمانانە زۆر درێژتر و ئاڵۆزترین لەوەی ئێستا هەیە... کە تیمارپێچەکان شادەریایان بەرەو نەشتەرکاری برد، لاولاو تا بەر دەرگاکە دەستی لەدەستیدا بوو، بەر لەوەی بچێتە ژووری بۆ ژێر نەشتەرەکان شادەریا بەلاولاوی گووت «سوێندم بۆ بخۆ هەتاهەتایە لەو پەیمانە پەشیمان نەبیتەوە... لاولاوی سپی بەچاوی پڕ فرمێسک و لەشۆڕشێکی دژواری سۆزو هەڵچووندا گووتی « سوێندت بۆ دەخۆم، هەتاهەتایە نەشوودەکەم، نەبێ تۆ گۆرانی دەڵێم، نەقژم دەبڕم و نە لەجلی سپی بەولاوە هیچ لەبەردەکەم». ئەوەسەرەتای ئەو پەیمانە جاویدان و هەتاهەتایە بوو کەئەو

دوو خوشکە ساڵ دوای ساڵ لەگەڵ خۆیاندا کێشیدەکەن.

ژیانی ئەو دوو خوشکە ژیانێکی ئاڵۆز و پڕ نهێنی بوو، دوای ئەوەی شادەریای سپی لەبیمارستان هاتەدەرێ، لەشەوێکی ڕەشەبا و خۆڵ بارانی هاویندا سوێندیان تازەکردەوە، بەزمانی دڵدارەکانی ئەو ڕۆژگارانە پەیمانێکی نەبەدییان بەست و بەخوێنی خۆیان مۆریانکرد و خستیانە شوشەیەکی ڕەش و لەجێگایەکدا کە تەنیا خۆیان دەیانزانی لەبن درەختێکی هەناردا شاردیانەوە، درەختێک دواتر دەبێت بەئاوێنەی درەختێکی دیکە، کە لەجێگایەکی دیکەدا پیاوێک بەناوی نەسیمی شازادەوە ڕواندویێتی.

ئەوەی شتەکانی بەئاقارێکی ترسناکدا برد ئەو بڕوا سەیرەبوو کە سەروکاری جادوویەک لەپشت ڕەفتاری ئەو دوو خوشکەوەیەوە، سیمایان لەسیمای کچانی تر نەدەچوو، تەلیسمێک و نیگایەکی نائاسایی لەسەیرکردنە سارد و هێمن و نەگۆڕەکانیاندا بوو. کەسەیری شتێکیان بکردایە بەزەحمەت چاویان لەسەر دەجولاند، بێئەوەی دلڕەقبن، سەیرکردنە نەگۆڕ و تیژ و بڕندەکانیان هەموو دڵێکی ناڕەحەتدەکرد. بەراورد بەقەوارەی ڕوخساریان چاویان گەورەتر لە چاوانی ئاسایی دەینواند، کە تەماشاتدەکردن هەستتدەکرد جگە لە دەسەڵاتی نیگایان هیچی تر نابینیت. گەر بیانویستایە پڕیاندەکرد لەساردی و کەمتەرغەمی، گەر بشیانویستایە لێوان لێویان دەکرد لەپاکی و منداڵی. جلە سپییەکانیان لەگەڵ ئەو قژەکێوییە درێژەیان کە بەجۆرێکی نائاسایی و خێرا درێژدەبوو، نیگای سیحربازێکی پێبەخشیبوون کە کەس بەدروستی نەیدەزانی سیحرەکەیان چییە. تاکە دوو کچێک بوون جلی دیاریکراوی قوتابخانەیان لەبەرنەدەکرد، بەسیپاڵە سپییەکانیانەوە دەچوون بۆ پرسەکان، هەردووکیان باڵایان وەکو یەک بوو، لەئاهەنگەکانی شووکردن و ژنهێنانیشدا جلەسپییەکانی ئەوان بەزەحمەت لە جلی بوکەکان جیادەکرایەوە. شتێکیان تیابوو بەئاسانی نەدەشکا... ئەو شتەش بێدەنگییە سەیر و قووڵەکەیان بوو.

لەڕاستیدا لاولاوی سپی و شادەریای سپی نەدڵڕەق بوون و نەسیحرباز، بەڵام سروشتی نیگاکردنیان و دەرکەوتنیان بەو جلانەوە ئەو جۆرە خورافەتانەی لەسەر دروستکردن، ئەو خەیاڵانەی ئەودەم خۆیان بێئەوەی ناڕەحەتبن گەورەتریاندەکرد و پڕپاندەکرد لەئەفسانەی تر. سەردەمانێک هەردووکیان خوودەدەنە تەماشاکردن و تێگەیشتن لەبورجەکان، دەکەونە فێربوونی هونەرەکانی خوێندنەوەی دەست، لەئاهەنگ و شێوەنەکاندا سەیری دەستی خەڵک دەکەن، زۆرجار بێئەوەی هیچ بڵێن دەکشێنە دواوە، خودی ئەو بێدەنگییە کە دەرەنجامی بێئاگایی و نەزانین بوو لە هونەرەکانی ئەستێرەناسی و دەستگرتنەوەدا، وەک بێدەنگییەکی شەڕانی دوو کچ تەماشادەکرێت کە چارەنوسی ڕەشی خاوەن دەستەکان دەبینن، بێدەنگییان وەک بێدەنگی سیحربازێکی ڕەش تەماشادەکرێت، کە گومان، دوودڵی و نائاسودەیی جێدەهێڵێت... سروشتیان وەک دوو کەس کە وەک ئەوانی دی خۆناگۆڕن و سەیرناکەن و ڕەفتارناکەن گۆڕینی بۆ دوو نامۆی ڕاستەقینە. ئەوان وەک دوو کچی گۆشەگیر گەورەدەبن، دوو کچ پیاوان خۆیانیان لێدەپارێزن، نەوەک لەبەر ئەوەی جوان نین، بەڵکو لەبەر ئەوەی هێزێک لەچاویاندایە پیاوان لێیدەترسن و خۆیانی لێوندەکەن... هەردووکیان لەوە بە تواناتربوون پیاوان بتوانن ئاسان سەیری نیگایان بکەن. شتێکی قووڵ و دەنگێکی دووریان تیابوو لەگەڵ خواستی ئەو پیاوانەدا نەدەگونجا کەتەنیا دەرەوەی ئافرەتیان بۆ داگیردەکرێت. خودی ئەو لاوازییە وایکرد تادەرکەوتنی محەمەدی دڵشوشە هیچ پیاوێک لەو دوو خوشکە نزیک نەکەوێتەوە. بەڵام ئەو پەیوەندییە سەیر و ئاڵۆزەی خۆیان لەبری هەموو شتێک بوو، بەیانیان کە لەخەو هەڵدەستان بەر لەبەرچایی پێکەوە گۆرانییەکی نوێیان دەگووت. لەژیانی ئەواندا گۆرانییەکان شێوەی جۆرێک لەنوێژیان وەرگرتبوو. ئەوان کچی ئەو سەردەمە سەیرەبوون، باوەڕیان بەخودا نەبوو، بەڵام باوەڕێکی قووڵیان بەگۆرانی هەبوو.

هیچ کەس نازانێت محەمەدی دڵشوشە چۆن عاشق بوو؟ ئەو دوو کیژە دونیایەکیان هەبوو تەواو جیاواز لەدونیای محەمەدی دڵشوشە کە لەسەرەتاوە ڕقی لەهەموو ئاڵۆزی و تەلیسمێک بوو و حەزی بەدونیایەکی شوشەیی دەکرد، دونیایەک شتەکان ئەمدیوەوە و دیویان ببینرێت. ئەو ژیانێکی هەبوو تەواو جیاواز لەژیانی ئەو دووخوشکە، جیهانیان دووجۆرە جیهانی لەیەک دووربوو... گەر خیانەتی تۆفانەکان نەبووایە نەدەکرا بەیەکبگەن، بەڵام محەمەدی دڵشوشە باوەڕێکی گەورەی بەتۆفانەکان هەبوو... بڕوایەک دواجار بەرەو قەدەری تاریکی خۆی هەڵیگرت.

محەمەدی دڵشوشە... گەنجێک بوو لەناو خەیاڵەکانی خۆیدا دەژیا، کۆمەڵێک کلیلی هەبوو خۆی دروستیکردبوون، کلیلی ژیان و کلیلی مردن، کلیلی تەنیایی و کلیلی عەشق، کلیلی نهێنییەکان و کلیلی بێدەنگی، کلیلی هاوڕێتی و کلیلی ڕق، کلیلی خەون و کلیلی حەقیقەت. سەردەمانێک کە باوکی لەچیا دەبێتە یەکێکە لەخەباتگێڕانی سەرسەختی ئازادی ئەو وەک هەتیوێک لەشار گەورەدەبێت. بەڵام ڕۆژێک چاودەکاتەوە و ئەو منداڵی پڕ لەناز و دەلالی شۆڕشێکی سەرکەوتووە... دوای سەرکەوتنی شۆڕش و گەڕانەوەی شۆڕشگێڕان بۆ ماوەیەک دەبێتە بەختیارترین گەنج، لەئاهەنگ و کەرنەفالەکاندا دەبینرێت، لەوانەیەکە لەبۆنەکاندا گوڵ دابەشدەکەن، هەمیشە پێکەنینێکی گەش لەسەر سیمایەتی، بەڵام هەمیشەش تروسکەی ڕۆشنییەکی نائاشکرا لەنیگایدا دەدرەوشێتەوە. نیگاو چاوی لەوەڕوونترن نهێنیان تیابێت، چاوو سیمایی لەکانییەکی ساف دەچن کە هەموو شتێک لەبنیاندا دیارە، سادەیی و ڕوونی و دەرکەوتنی هەموو شتێک لە بیلبیلەکانیدا دەیگۆڕنە سەر یەکێکی سەیر، یەکێک کەنامۆبێت بەدونیایەک سەرتاپای لەسەر نهێنی دروستکراوە. دوای ماوەیەکی درێژ کەباوکی بەسەرکەوتوویی بەخۆی و چەک و بۆنی عارەقی هەورازەکانەوە دادەبەزێتە شار و یەکەمجار

لەئامێزی دەگرێت، تەماشای چاوی دەکات و بەترسەوە دەڵێت «ڕوونییەک لەچاوتدایە، سپیتر و سەیرترە لەهەموو ئەو شتانەی من بینیومن». ئەوە سەرەتای ئەو سەردەمەیە کە ژیانی دەبێتە کۆشکێکی بللور، کۆشکێک لەشوشەیەکی نازک، دەبێتە شانشینێک دیوارەکانی لەئەستووری بلقێکی بێڕەنگ و ڕووندان کە هەموو شتێکی تیا دەبینرێت. محەمەدی دڵشوشە لەسەردەمێکدا گەورەدەبێت شتەکان هەمووی نهێنین، دونیا بەزوڵمەت و تاریکی دەدرەوشێتەوە. ئەو لەسالانی تاریکی شۆڕشدا لەدایکدەبێت، لەسەردەمی دیوار و گونێی خۆڵ و ژێرزەمینی ئەستوور و دەرگای داخراودا. لەسەردەمێکدا هەموو بەنهێنی ئیشدەکەن... دەوڵەت بەنهێنی نەیارەکانی سەردەبڕێت و نەیارەکان بەنهێنی دەژین و هاتوچۆدەکەن. لەو سالانەدا ژیان دەبێتە دروستکردنی دیوار و تاریکی، هەمووان خەریکی دروستکردنی دیوارن، نێوانی ماڵەکان، نێوانی کوچەکان، نابەینی مرۆڤ و مرۆڤ و نابەینی مرۆڤ و ئاسمان، مرۆڤ و گوڵ، مرۆڤ و مانگ، مرۆڤ و شەو، مرۆڤ و پاسارییەکانی بەیانی... هەموو شتێک دەبێتە بەربەست، ئادەمیزادەکان بەجۆرێکی بێمانا دەکەونە سەر ئارەزووی بڵندکردنەوەی دیوار، ژیان دەبێتە خەڵوەتێکی هەمیشەیی، مرۆڤ لەپشت دیوارەکانەوە نەبێت ناتوانێت بیربکاتەوە. ئەوکات ئەو منداڵی خۆی لەباوەشی دایکێکی ترساودا دەباتەسەر، منداڵێکە بەردەوام لەم ماڵەوە بەنهێنی دەیبەن بۆ ئەو ماڵی تر. بەردەوام خۆی و دایکی لەو ترسەدا دەژین دەوڵەت بیانگرێت و ڕەوانەی بیابانەکانی باشووریان بکات. ئەو لەو کاتەوە دەبێتە منداڵێکی نهێنی، لەدەرەوە ناوی ڕاستەقینەی خۆی بەکارناهێنێت، نابێت کەس بەڕوونی و لەبەر هەتاودا و بەوجۆرەی کە خوڵقاوە بیبینێت. زوو زوو ماڵ یا کۆڵان یا شارەکەیان دەگۆڕن. محەمەدی دڵشوشە، لەدونیایەکی وادا کە پڕە لەنهێنی و خۆشاردنەوە گەورەدەبێت، گەورەبوونێک لەگەڵ خۆیدا ئارەزوویەکی نهێنی و شاردراوەی بەرەو گەڕان هەڵگرتووە، ئەو

کات ژیانی ڕۆژانەی محەمەدی دڵشوشە گەشتێکی سەیرە بەدوای بینیندا، بەڵام هەستدەکات ناتوانێت ببینێت، هەستدەکات لەدیوار زیاتر هیچی تر نییە تەماشاییکات. ڕۆژێک دەگاتە ئەو ڕاستییە غەمگینەی دواتر ڕێگاو مانای ژیانی دیاریدەکات، کەدەبێت ژیانێکی هەبێت ڕوون وەک شوشە، ژیانێک لە هەموو لایەکەوە ببینرێت، ژیانێک هیچی لەژیانەکانی دیکەی ئەو سەرزەمینی تاریکییە نەچێت. دەبێت کلیلێک بدۆزێتەوە دەرگاکان بخاتەسەر پشت، دونیا ببێتە دونیایەکی ڕوون، دونیایەک دیوارەکانی هیچ نەشارنەوە، مرۆڤ چ شتێکی نەبێت هەڵیگرێت، نهێنییەکانی هەموویان دەرکەون، تەلیسمەکان برەوێنەوە.

لەگەڵ هەموو مۆتەکە تاریک و قورسەکانی منداڵیدا محەمەدی دڵشوشە وەک گەنجێکی خۆشڕوو دەمێنێتەوە، گەنجێک کە ڕاستییە بچوک و سادەکان لەچاویدا دەدرەوشێنەوە. کەباوکی دەگەڕێتەوە، دوای ساڵێک لەڕاپەڕین دەبێتە یەکێک لەبارۆنە گەورەکانی دەسەڵات و جاهوجەلال... دەیەوێت لەبری ئەو ساڵە دوورودرێژانەی لێکدابڕان، پاداشتێکی گەورەی کوڕەکەی بداتەوە، شتێکی بۆبکات هەتاهەتایە خۆشبەختیبکات، شەوێکی مانگەشەو پێیدەڵێت « داوای شتێک بکە، هەر شتێک ئیرادەی مرۆڤ بەسەریدا بشکێت، تۆ بڵێ و من بەفەرمایشتی وەردەگرم». محەمەدی دڵشوشە دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، نیوەڕۆیەکی هەتاو دەچێتە لای سلێمانی مەزن و پێیدەڵێت، من یەک ئارەزووم هەیە، یەک ئارەزووی بچوک، خانوویەکی چکۆلانەم دەوێت لەشوشە، مەرج نییە سەرتاپای لەشوشەبێت، بەڵام بەجۆرێک بێت لەهەر لایەکەوەسەیرتکرد هەموو لاکانی دیکەی دیاربێت. لەو شەوەوە نەخشەی ئەو خانووەچکۆلە و سەیرە سەر هەڵدەدات کە لەیەکێ لەگەڕەکە هێمن و بەرزەکانی شاردا دروستدەکرێت. خانوویەک لەشوشەیەکی تەنکتر لەشوشەی کاسێکی بادە، ڕوونتر و ناسکتر لەپیاڵەیەک. خانوویەکی چکۆلانەلەسەر بەرزاییەکی بچوک لەنێوان کۆمەڵێک باڵاخانەی

گـەورەی کۆنکرێتـدا، پایەکانـی لەئاسـن و بەشـی هەرەگـەورەی دیوارەکانـی لەشوشـەن، خانوویەک لەهـەر جێگایەکـەوە تەماشـاتبکردایە، هەمـوو سـوچ و کەلێنەکانـی ئـەوماڵـەت دەبینـی، محەمـەدت دەبینـی لەسـەر کورسییەکەی خـۆی، قەفـەزی خاڵـی کەوەکانـت دەبینـی، تابلـۆی هەڵپەڕکێیەکـی کێویـی، گوڵـی هەڵگیـراو لەئـاودا، شوشـەی ڕەنگاوڕەنگـی لـم، فەرشـێکی ئاوریشـمی شـین کـە پڕبـوو لەنیـگاری ژێـر دەریـا و لـەدوورەوەڕا شـێوەی گۆمێکـی بەخشـیبووە ماڵەکـە.

بەیانیـان هەمـووان محەمەدیـان دەبینـی لەپشـت شوشـەکانەوە بەرچایـی ئامـادەدەکات و بەدەنگـی بـەرز گۆرانـی دەڵێـت، لەپشـت دیوارەکاڵەکانـی خۆیـەوە دادەنیشـێت و وەک نیشـتەجێی نـاو حەوزێکـی ماسـی ژیانێکـی ئاویـی دەژی.

ئـەو ویسـتە سـەیر و قووڵـەی بـۆ بینیـن، بـۆ تێگەیشـتن لەهەموو شـتەکان بـەرەو زانیـن و ڕوانیـن لەزیندەگـی نـاوەوەی کەسـەکان دەیبـات، دەیەوێـت قووڵتریـن و تایبەتیتریـن نهێنییـەکان ببینێـت. ئـەو حـەزە کوشـندەیەی بـۆ ڕوونـی و ڕووناکـی وادەکات بکاتەسـەر نهێنـی گەورەتـر لەخـۆی، وادەکات قسـەکانی پڕبـن لەچیرۆکـی سـەیر دەرهـەق بەژیـان و حەقیقـەت، بـەڵام هاوڕێکانـی نەبێـت، ئـەو کـوڕە منداڵانـەی لێـرەو لـەوێ لەکوچەکانـی بـازاڕدا دەیانناسـێت، کـەس وەک شـەیدایەکی ڕاسـتی تەماشـای نـاکات، بەڵکـو وەک گەنجێکـی چاوچنـۆک بـۆ زانیـن... ئـارەزووی بـۆ ڕوونـی و ڕوانیـن وادەکات ڕاسـتگۆییەکی کوشـندەی تیابێـت، بێئـەوەی لەوەبـگات کـە حەقیقـەت چەنـد کوشـندەیە، بێئـەوەی تێبـگات کـە هەمیشـەتاریکییەک لەودیـو شـتەکانەوە دەمێنێتـەوە، نهێنیگەلێـک کـە هەرگیـز بـۆ ئـەو ڕووننابنـەوە.

ئـەو بەیانییـە دوای گەڕانـەوەی لەماڵـی خوشکەسـپییەکان بەژانەکانـی سـەر سـینەیەوە هەسـتا، هەسـتیکرد لەکونێکـی چکۆلانـەی سـەر دڵییـەوە تنـۆک تنـۆک خوێنێکـی گـەش دێتـە دەرێ. بـەدەم ئازارەکانییـەوە لەپێـش

ئاوێنەیەکی گەورەدا کراسەکەی داکەن و تەماشای ئەو برینە چکۆلانەیەی کرد کە زۆر لەسەرخۆ و بەهێمنی خوێنی لێدەهات، خوێنێک دەنیشتە سەر جلەکانی و تەڕیدەکرد. ئەوەی لەو خوێنەدا سەیربوو، نەئەوەبوو دەمی زەخمێکی گەورەبۆ خۆی بکاتەوە و بێتەدەرێ، نەئەوەش بوو بوەستێت و سارێژبێت. لەو بەیانییەوە بەردەوام پەڵەیەک خوێن بەسەر سینەی محەمەدی دڵشوشەوەیە... هەمیشە خوێنێکی تەڕ کە دڵۆپ دڵۆپ و بەوچانێکی پڕ ژان دێتەدەرێ و دەتکێتە سەر کراسەکەی، کراسێک یەکێک لەسەرپاسەکان لەکۆنە بۆیکڕیوە. خوێنێکی بێتەفسیرە. چەندە لۆکە و شاش و برینبەستی بنایەتەسەر، بەئارامی کۆدەبووە و شاشەکانی تەڕدەکرد و وەک پەڵەیەکی گەورە لەسەر سنگی دەردەکەوت. ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەو خوێنەوە گەڕایەوە بۆماڵی دوو خوشکەکە. وەک ئەوەی پێشوەخت یەکێک هەواڵی گەڕانەوەی ئەوی پێدابن، هەردووکیان لەبەردەم هەمان ئەو پەنجەرەیەدا چاوەڕوانیاندەکرد، پەنجەرەکەیان کردبووەوە و نیوەی لەشیان هێنابووەدەرێ، «با» تا دوور دوور قژیانی دەبرد. محەمەدی دڵشوشە واهاتە پێشچاوی کە قژیان تێکەڵ بەهەورەکان بووە، دەیبینی پاساری و پۆلی کۆتر بەناویاندا تێدەپەڕن. لەبەردەرگاکەوە هاواریدەکرد«لاولاوی سپی دەمەوێت بتخوازم... تۆ ڕازیت». هەردووکیان بەو چاوەساردانەوە تەماشایاندەکرد، بەئارامی وەک ڕەوینەوەی هەورێک زولفە ئەفسانەییەکانیان دەبردەوە ژوورێ، پەنجەرەکەیان دادەخست و پەردەکانیان دادەیەوە و و بێئەوەی هیچ بڵێن لەو دیو ئەو پەردە ئەستورانەوە تەماشای محەمەدی دڵشوشەیان دەکرد، کەخوێنی سەر دڵی خۆی نیشاندەدان و دەیگووت«ئەوەزامی ئێوەیە».

ئەو ئێوارەیە محەمەدی دڵشوشە بەشکستێکی ترەوە گەڕایەوە بۆ ماڵێ، ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی ئێوارە تاڵ و غەمگینەکانی مردنێتی، ئێوارەیەک بوو پڕ لە نەسیمی شێداری ئەو هەورە غەمگینانەی بە

بارانــی زۆرەوە دێــن و دەڕۆن. دەچێتــەوە ماڵــێ و لەپشــت پەنجەرەکانــەوە تەماشــای بارانبارینــی بێوچــان دەکات، هەســتدەکات لەشــوێنێکی دییــەوە، لەجێگایەکــی نازکتــرەوە درزێکــی دیکــە بۆتەدڵــی، هەســتدەکات خوێنێکــی زیاتــر و گەشــتر لــەو برینــە بچوکانــەوە دێنــەدەرێ کــە نەشــتەرێکی نەبینــراو و نادیــار دروســتیدەکات، خوێنێــک دەزانێــت نەزیفــی شــکانی دڵــی خۆیەتــی. تــا شــەو پتــر تێدەپەڕێــت ژانەکانــی گەورەتردەبــن، بەتەنیــا دەســتدەگرێت بەدڵییــەوە و بەنــاو بــاران و هەورەبروســکە و تاریکییــدا کوچــە بــە کوچــە بــەرەو ماڵــی خوشــکەکان دادەگەڕێتــەوە کــە هەمیشــە بــەو نیــگا ســاردو ســەیرەوە لەپشــت پەنجەرەکانەوەســەیریدەکەن. محەمــەدی دڵشوشــە درزە بچوکەکانــی دڵــی خــۆی حیســابدەکات و دەزانێــت ئەمــە پێشــبڕکێیەکە لەنێــوان کات و مردنــدا، لەبــەردەم دەرگاکــەدا دەوەســتێت و دەســتدەگرێت بەدڵییــەوە، خوێــن لەژێــر پەنجەکانییــەوە دەتکێــت و تێکــەڵ بەبــاران دەبێــت، بەدەســتە خوێناوییەکانــی دەکێشــێت بەدەرگاکانــدا و هــاوار لــەدوو خوشــکەکە دەکات، لــەو دیــو پەردەکانــەوە ســێبەری خۆیــان و شــەپۆلی شــەکاوەی قژیــان دەبینێــت، دوو کەســن بێدەنــگ لــەو دیــوەوە تەماشــای بــاران و محەمــەدی دڵشوشــە دەکــەن کــە دەڵێــت «لاولاوی ســپی گــەر خۆشــتنەوێم دەمــرم...».

ســەرتاپای ئــاوە، وەک باڵدارێکــی چکۆلانــە و خوســاوەباران لەســەرتاپای دەچۆڕێــت، دڵۆپــەکان وەک هــەزار تنــۆک لەزێــڕی تــواوە لەســەر ڕوخســاری دەدرەوشــێنەوە. بــەڵام ئــەو دوو کچــە هیــچ ناکــەن جگــە لــەوەی لەپشــتەوە بەهێمنــی تەماشــایبکەن. محەمــەدی دڵشوشــە دەیەوێــت بەکلیلەکانــی خــۆی ئــەو دەرگایانــە بکاتــەوە، بــەڵام ناکرێنــەوە. لەبــەردەم بــاران و بەدەســتی خوێناوییــەوە یەکەیەکــە هەمــوو ئــەو کلیلانــە تاقیدەکاتــەوە، بــەڵام ســوودی نییــە، دەیەوێــت بەدیوارەکانــدا هەڵزنێــت و ناتوانێــت، دەچێتــە ســەر درەختــە نزیکــەکان و لەوێــوە هــاواردەکات، بــەڵام جگــە لەدەنگــی بــاران گوێــی لەهیــچ دەنگێکــی دی نییــە، جگــە لەدرەوشــانەوەی ڕووناکــی لەســەر فرمێســکەکانی

خـۆی هیچـی تـر نابینێت.

شـەو ئاوادەبێـت، محەمـەد بـە لیتـە و بـاران و خوێنـەوە دەگەڕێتـەوە ژوورەکـەی خـۆی، بـەو هەمـوو بارانـەوە، بـەو هەمـوو خوێنـەوە دەگەڕێتـەوە مـاڵ، سـات دوای سـات پتـر دڵـی دەشـکێت، کەلێنـی نێـوان مـەودا شوشـەییەکانی گەورەتردەبـن. لەگـەڵ خۆرهەڵاتـدا لەنـاو خوێـن و بـاران و فرمێسـکەکانی خۆیـدا خـەوی لێدەکەوێـت و لەخەویـدا خـەون بەدرەختێکـەوە دەبینێـت کەنـاوی دواهەمیـن هەنـاری دونیایـە.

شـەو لەگـەڵ دەسـتپێکردنەوەی بارانـدا بەبێدەنگـی دەگەڕێتـەوە کوچـەی خوشـکە سـپییەکان، ئـەوان هەمیشـە لەوێـن لەپشـت پەنجەرەکانـەوە چاوەڕێیدەکـەن. دەچێتـە حەوشـە گەورەکەیـان، بەهێمنـی چەنـد جارێـک بـەدەوری ماڵەکەیانـدا دەسـوڕێتەوە و دەگەڕێتـەوە... ئیـدی تێدەگات ئـەو کوشـتەی پێشـبڕکێیەکە لەنێـوان ئیزرائیـل و زەمەنـدا.

بـەردەوام خوێنـی لێـدەڕوات، ئـەو شـەوە ناگەڕێتـەوە بـۆ مـاڵ، بەڵکـو بەزامەکانـی سـەر سـنگییەوە دەچێتـە یەکێـک لەمەجلیسـە گەورەکانـی سـلێمانی مـەزن، مەجلیسـی سیاسـەتمەدارێکی گـەورە کـە پـڕە لەوەزیـر و بەڕێوەبـەر و هارونـە تازەکانـی بـازاڕ. سـەرەتا پاسـەوانەکان نایناسـنەوە، ئـەو پێیاندەڵێـت «مـن کـوڕی ئـەوم، کـوڕی سـلێمانی گـەورەم». گەنجێکـی خوێناوی و خوساوەو ماندووە، ڕەنگێکـی هەیـە بەڕەنگـی مردووان دەچێـت، کـە دواجـار سـلێمانی مـەزن بانگیدەکاتـە ژوورێ نایناسـێتەوە... هیچی لەکوڕە دڵشوشـەکەی خـۆی ناچێت. کوڕێکـی نەخـۆش و لاواز کەچاوەکانـی بەقووڵـدا چـوون و بـەدوای خۆیـدا ئـاوو خوێـن ڕادەکێشـێت، شـوێنپێ سـوورەکانی لەسـەر فـەرش و کاشـی و کومبـارەکان جێدەهێڵێت. لـەژوورەوە لەگـەڵ هەموو زامەکانیـدا بەپێـوە دەوەسـتێت و بەهێمنـی دەڵێـت «کەسـتان بینیـوە بـەو جـۆرە بمرێـت؟». هەمـوو ئەوانـەی ئـەو شـەوە لـەوێ دەیبینـن چیرۆکـی ئـەو کـوڕە دەزانـن کـەوەک ڕوەکێکـی زسـتانە لـەدوو ژووری چکۆلانـەی شوشـەدا

دەژی، ئاگاداری ئەو ویست و برسێتییە سەیرەی ئەون بۆ نهێنییەکان... ئەو شەوە لەوە زامدارتر و ڕوخاوتربوو کەس سڵی لێبکاتەوە. لەسەر کورسییەک ڕووتیاندەکردەوە و دەیانگۆڕی، لۆکەو برینبەستی نوێیان دەخستەسەر ئەو زامە چکۆلانەیەی سەر دڵی، وشکیاندەکردەوە. بەدرێژایی ئەوکاتە، ئەو چیرۆکی ئەو خۆشەویستییە کوشندەیەی دەگێڕایەوە کە تۆفان تووشیکردبوو، ناوی دوو کچی دەهێنا هیچ یەک لەپیاوانی ئەو مەجلیسە نەیانبیستبوون، شەوێک بوو لەشەوی حکایەتەکان دەچوو. ئەو شەوە «ئیکرامی کێو»یش لەوێ بوو، ئەو پیاوە باڵابەرزەی بێئەوەی ڕوتبەیەکی سوپای هەبێت، چاکەتی ئەفسەرەکانی لەبەردەکرد، پیاوێکی بێدەنگ، بەڵام چالاک بوو. ئەو شەوە ئەو تاکەکەسێک بوو تا بەیانی لەگەڵ محەمەدی دڵشوشەو باوکیدا مایەوە. دەمەو بەیان، بەرلەوەی خۆرهەڵبێت، لەفاسیلەیەکی کورتی نێوان بانگی بەیانی و خەوتنەوەی بانگبێژەکاندا، سلێمانی باوک و ئیکرامی کێو لەماشێنێکی شینی چکۆلەدا چوون بۆ خوازبێنی ئەو کیژە، ئەوە زووترین خوازبێنی دونیابوو، هیچ کچێکی دیکە لەوەبەر لەپێنجی بەیانیدا نەخوازرابوو. ئەو بەیانییە دایکییان دەرگاکەی کردەوە، ژنێکی چکۆلانەو ترساوبوو کەتەواو لەژێر ڕکێفی کچەکانیدا دەژیا. سلێمانی گەورە و هاوڕێکەی بەهێمنی چوونە ناو ماڵەکەوە و لەسەر دوو کورسی چکۆلانە دانیشتن، دیاربوو یەکێک بەر لەچەند ساتێکی کەم سۆبایەکی داگیرساندبوو و دوکەڵی یەکەم ساتی ئاگرەکە هێشتا لەژوورەکەدا بوو. ئەو دوو کیژە بەدوو چاوی ماندووەوە لەژوورێکی دییەوە هاتنە ئەمدیوەوە، هەردووکیان دوو دەست جلی سپییان لەبەردابوو، پێدەچوو ئێستا لەئاهەنگێکی نهێنی هاتبنەوە، دوو شاڵی سپی درێژیان دابوو بەسەر شانیاندا و بەدەنگێکی سارد و وشکەوە بەخێرهاتنی میوانەکانیان کرد. پڕبوون لەتەلیسم و تاریکی، سلێمانی گەورە لەتەمومژی ئەو بەیانییە ساردەدا بەئەسپایی کەوتە قسە

و گووتـی «من باوکـی محەمـەدی دڵشوشـەم، هاتـووم پێتانبڵێم کـە محەمـەد دەمرێـت، هـۆی مردنەکەشـی کینـە و بێوەفایـی نییـە، بەڵکو عەشـقە... مـن ڕامواپـە عەشـق شـتێک نییـە شایسـتەی ئەوەبێـت کـەس بـۆی بمرێـت، مـن ڕانەهاتـووم کـەس ببینـم لەبـەر خۆشەویسـتی بمرێـت، مـن بەدرێژایـی ژیانـم سـەروکارم لەگـەڵ مردنـدا بووە، ئیشـم لەگـەڵ ئەوانـەدا بـووە کـە بەجۆرێـک لەجـۆرەکان بەمردنـەوە خەریکـن... بـەڵام ئەمشـەو مەسـتدەکەم کوڕەکـەم لەبـەر هۆیەکـی سـەیر دەمرێـت، هۆیـەک بەخەیاڵمدا نەهاتـووە مایـەی مـەرگ بێـت. حەزدەکـەم بزانـم کامتـان نـاوی لاولاوی سـپییە؟». لاولاوی سـپی لەشـوێنی خـۆی هەڵدەسـتێت و دەڵێـت «مـن لاولاوی سـپیم...». سـلێمانی مـەزن دەڵێـت «گومانـم نییـە کـە تـۆ کیژێکـی جوانـی، بـەڵام حەزناکـەم کـەس بـەو جـۆرە بمرێـت، بـەو شـێوەیە سـووکایەتی بەئینسـانییەتی بکرێـت و ئـاوا بمرێـت... مـن دەمەوێـت بتهێنـم بـۆ کوڕەکـەم بۆئـەوەی نەمرێـت».
لاولاوی سـپی بەهێمنـی لەشـوێنی خـۆی دادەنیشـێت و بەدەنگێکـی نـزم، بـەڵام نەگـۆڕ و جەسـوور دەڵێـت «بمبـورە، مـن شـووناکەم...». سـلێمان بەمەراقێکـی کوتوپـڕەوە هەڵدەسـێت و دەڵێت «گـەر مەسـەلەکە پەیوەنـدی بەژیانـی یەکێکـەوە نەبایـە کـە دەمرێـت، هیـچ کـەس لـە بەیانییەکـی وازاوودا نایـەت بـۆ داواکردنـی دەسـتی کیژێـک... تـۆ هەقتـە بڵێیست نـا... هەقتـە مـن هیـچ هێزێکـم نییـە، بیسـەپێنم بەسـەرتا... ئـاە چ شـەوێکی سـەیرە کـە مـن لـەم مەلابانگانـەدا دەبێـت تیاتـا بپاڕێمـەوە شـوو بەکوڕەکـەم بکەیـت، چ خوازبێنییەکـی سـەیرە کـە عەقـڵ قبووڵـی نـاکات، گـەر تـۆ لـە دڵـەوە ڕازی نەبیـت هاتنـی مـن مانـای نییـە، لەبەرئـەوەی دەزانـم گـەر تـۆ لەقووڵایـی دڵتـەوە دوای مەلـی ئـەو عەشـقە نەکەویـت کـە ئـەو هەڵیـدەدا، سـوودی نییـە... ئـاە کیـژی مـن، مـن هیـچ دەسـەڵاتێکم نییـە، هەڵبـەت گـەر شـتێکی تربایـە دەمتوانـی شـتێک بکـەم، گـەر لەشـکرێک بایـە دەمتوانـی بەچەنـد گەنجێکـی بەتوانـاوە بەریـان پێبگـرم، گـەر لووتکـەی شـاخێک بووایـە بـۆی

هەڵدەزنام، بەڵام ئەمە لەو شتانە نییە... من هێندەت پێدەڵێم کە ئەوە تاکە کوڕی منەو بەهۆی تۆوە دەمرێت... منیش بەرابەر تۆ هیچم بۆناکرێت... بیربکەرەوە... تا ئێواریێ بیربکەرەوە، چونکە کاتمان نییە، تێدەگەیت کاتمان نییە، ئەمە شەڕێکی ناڕەوایە لەگەڵ کاتدا... شەڕێکی ناشیرین و ناڕەوایە، بەد و بێدادە، بەد و بێدادە» هەڵدەستا و ئاماژەیەکی بچوکی دەدایە ئیکرامی کێو کە بەقەڵافەتە ئەفسانەییەکەیەوە هەڵدەستا و دەیگووت «جگە لە تکا هیچی ترمان نییە... خانمانم جگە لە تکا هیچی ترمان نییە» لاولاوی سپی بەدەنگێکی نزم کە بەئەستەم دەبیسترا دەیگووتەوە «من شووناکەم... هەتاهەتایە شووناکەم».

بەیانییەکی زۆر ساردە، کە لەو ماڵە دێنەدەرێ هەردووکیان چاویان پڕە لەفرمێسک، سلێمانی مەزن لەمێژە نەگریاوە، بەڵام دڵنیایە کوڕەکەی بەجۆرێکی بێمانا دەمرێت... تا کات تێبپەڕێت دڵی محەمەدی دڵشوشە پتر دەشکێت، ئەو بەیانییە دەیبەنەوە بۆ ماڵە شوشەکەی، پزیشکەکان نە دەزانن چییەتی و نە تێیدەگەن، لەپێخەفەکەیدا دەخەوێت و بەردەوامیش خوێنی لەبەردەڕوات، دەخەوێت و خەو بەدرەختێکی هەنارەوە دەبینێت لەسەر لووتکەیەکی دوور. ئێوارەیەکی درەنگ میوان و سەرپەرستەکانی ئێزندەدات و پێیاندەڵێت باشبووە و چیتر پێویستی بەچاودێری نییە. ئەو شەوە دەیەوێت بەر لەمردن لەهەموو شتەکان تێبگات، دەیەوێت نهێنی ئەو خۆشەویستییە ناکامەی خۆی بزانێت، سەربەرزدەکاتەوە تێدەگات هەتا لەدوا ساتەکانیشدا ویستێکی قووڵ بەرەو بینین دەیبات. شەو دادێت و ئەو لاواز و کەنەفتە، لەڕوخساری تارماییەکی زەرددا دەگەڕێتەوە بەر دەرگای کیژەکان... وەک هەمیشە بە ئاسانی دەچێتەوە حەوشەکەیان، لەبەر پەنجەرەکەدا دەیانبینێت و تەماشای ئەو نیگا غەمگین و زەردەیان دەکات کە بە ساردی لەو دیو شوشەکانەوە تەماشایدەکەن. تکایان تیادەکات پەنجەرەکە بکەنەوە و قسەی لەگەڵدابکەن، بۆیەکەمجار

پەنجەرەکە دەکەنەوە و لاولاوی سپی بەدەنگێکی غەمگین پێیدەڵێت «محەمەدی دڵشوشە، بمبورە، کاغەزێک لەبن ئەو هەنارەدایە... هەڵیگرەو برۆ... هەڵیگرەو وازمان لێبهێنەو برۆ». محەمەدی دڵشوشە لەبن ئەو هەنارەوە سەریەرزدەکاتەوە و مانگ دەبینی، لەسەر ڕۆشنایی تریفەکاندا سەرەنجدەدات ئەو درەختەی لەژێریدا وەستاوە هەر درەختی خەونەکانێتی، لەهەمانکاتدا گوێی لەو مۆسیقا دوورە ئاسمانییە دەبێت کە مۆسیقای ئەستێرە و تریفەکانیانە، هەمان ئەو مۆسیقایەیە کە لەمنداڵییەوە هاوڕێی خەونەکانێتی، لەساتێکدا چاولێکدەنێت و تێدەگات ئەم هەنارەی لەبنیدا وەستاوە جگە لە ئاوێنەیی درەختێکی دیکە هیچی دیکەنییە. لەویادا ئەو نامەیە دەدۆزێتەوە کە دەستنوسی پەیمانێکی دێرینەی خوشکە سپییەکانە، پەیمانێکی جەهەنەمییە، پەیمانی دوو خوشکە هیچ مێزێک نایشکێنێت. لەگەڵ خوێندنەوەی دێرەکانیدا دونیای محەمەدی دڵشوشە سەرتاپا هەرەسدەهێنێت، وشە بەدوای وشە درزەکانی دڵی گەورەتردەبن و دێر لەدوای دێر دڵی دەبێتە مشتێ خۆڵ، وشە لەدوای وشە هەموو ئەو دونیا شوشەیەی ئەو دەشکێت، ئاوێنەکانی دەشکێن، سندوقە شوشەکانی دەشکێن، دیوارەشوشەکانی ماڵەکەی درزدەبەن، بەرێگادادێت و بەردەوام ئەو پەیمانە دەخوێنێتەوە، لەگەڵ هەموو خوێندنەوەیەکدا گوژمی ئەو خوێنەی لەدڵییەوە فیچقەدەکات و دێتەدەرێ گەورەتر دەبێت. بەکوچەکاندا دێت و تا دێت پتر خوێنی لەبەردەڕوات. خەڵکی دەیبینن وەک تارماییەک بەرێگادا دەڕوات و دەستێکی لەسەر دڵێتی و بەدەستەکەی دی ئەو پەیمانە دەخوێنێتەوە، یەکەمجارە خەڵکی پیاوێک ببینن خوێن وەک کانی لەسینەی هەڵبقوڵێت و هەر بڕوات و بخوێنێتەوە. لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا، شوشەکانی خانووەکەی پارچەپارچە دەکەونە خوارەوە، شتە شوشەکانی دەشکێن و بەردەبنەوە و دەبنە تۆز، کەدەگاتە بەردەمی خانووە شوشەکەی، خۆی لەناو تەپوتۆزی شکستی شوشەکاندا

دەدۆزێتـەوە. لەگـەڵ هەمـوو گوژمێکـی خوێنـدا، لەگـەڵ بەربوونـەوەی هەمـوو پارچەیەکـی دڵـی خۆیـدا پارچەیەکـی گـەورەش لەدیـوارەکان بەردەبێتـەوە و دەشـکێت، کلیلەکانـی لەدەسـتیدا دەبنـە بۆدرەیەکـی سـپی و نـەرم، سـندوقی نهێنییەکانـی دەبـن بەتـۆز. دەچێتـە سـەر پێخەفەکـەی و دەسـتدەگرێت بەدڵییـەوە و لـەژوور سـەرییەوە چڵـی درەختێکـی هەنـار دەبینێـت، گوێـی لـە ورد و خاشـبوونی شـتەکانە، ئـاگای لەتـۆزی کوشـندەیی شوشـەیە کـە بـای شـەو بەدونیـادا دەیپرفێنێت. چـاو لێکدەنێـت و گوێـی لـەدوا هـارەی ئـەو ئاسـمانە شوشـەییەی ژوور سـەری خۆیەتـی کـە لە سـەرەوەڕا هەرەسدەهێنێت و بەرلـەوەی بگاتـە زەوی دەبێتـە تۆزێکـی چڕ و با لەگەڵ خۆیدا دەیبات. سەر بەرزدەکاتـەوە ئـەو چڵـە هەنارەدەبینێـت، ئـەو هەنـارەی دەیویسـت لەژێریـدا بمرێـت. دەسـتی بەرزدەکاتـەوە لـە سـەرەوەڕا دەسـت لـە لقـە خەیاڵییەکانـی دەدا، کـە لـە وڕێنەکانـی مردنیـدا لەسـەر مەرگـی سـەوزبووە. لـە دوورەوەڕا سـیمای فریشـتەیەک لـە قووڵاییـە دوورەکانـی ئاسـمانەوە دێتەخـوارێ، بـەر لـەوەی ئـەو فریشـتەیە بگاتـە لای و دەسـتی بگرێـت، فریـای ئـەوە دەکەوێـت دەسـتبدات لـەو خوێنـەی وەک فـوارە لەبـەر دڵـی دەڕوات. لەنـاو خەراباتـی ماڵەکـەی خۆیـدا ئـەو کاغـەزی پەیمانـە لـە دەسـتی بەردەبێتـەوەو بادەیبـات. لـە هەمـان ئـەو ساتەدا فریشـتەیەکی ڕوخـۆش و دەم بەپێکەنین لە ئاسـمانەوە دەسـتیدەگرێت و دەڵێـت «محەمـەدی دڵشوشـە چۆنـی. هەمـوو شـتێک تـەواو، هەمـوو شـتێک تـەواو هەسـتە بـا بڕۆیـن...». ئـەو بەئارامـی هەڵدەسـتێت و دەڵێـت «بەڵـێ هەمـوو شـتێک تـەواو... دەسـتمبگرە بابڕۆیـن...» فریشـتەکە بەپێکەنینـەوە دەسـتی دەگرێـت و وەک دوو کۆتـر لـە تەپوتـۆزی جەنگەڵێـک هەڵبێـن، بەنـاو تەپوتـۆزی مردنێکـی شوشـەییدا پێکـەوە ڕووەو نادیـار دەفڕن. مردنێـک دواتـر هەمووومـان لەنـاو تەپوتـۆزە ساردەکەیدا ونەبیـن. مردنێـک بەشـێکی هەمیشـە نادیـار و نهێنـی دەمێنێتـەوە و بەشـێوەیەکی ترسـناک تێکـەڵ بەهەنـدێ حەقیقەتـی تاڵـی دیکـەی ئـەم چیرۆکـە دەبێتـەوە.

## ٥

کە لێمپرسی سەرپاسی سوبحدەم لە کوێیە، بە ئەسپایی وەڵامیدامەوە و گووتی«مردووە... سەرپاسی سوبحدەم مردووە». گووتم «دەمەوێت بزانم چۆن مردووە؟ هەقی خۆمە بزانم چۆن مردووە». وەڵامی نەدامەوە و گووتی کاتێکی دیکە دەگەڕێمەوە و کاتمان دەبێت باسی هەموو شتێک بکەین.

من چاوەڕوانی ئەوە نەبووم سەرپاسی سوبحدەم ببینم، وام حیساب کردبوو هەتاهەتایە لەسەحرا نایەمە دەرێ... هیچ شتێکم دەربارەی دەرەوە نەدەزانی، بەڵام هەستێک لەدڵمدا پێیدەگووتم لەو کاتەوەی تۆ دیلیت بێشومار جەنگ هەڵگیرساوە، بێشومار خەڵک مردوون، مانەوەی منداڵێکی بێ دایک و باوکیش لەسەردەمێکی وا سەختدا ئەستەمە.

دوای ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمجار پرسیاری سەرپاسی سوبحدەمم هێنایە پێشێ. یاقوبی سنەوبەر چەند ڕۆژێکی درێژ تەنیا جێیهێشتم، من جگە لە چەند پیاسەیەکی کورت بەدەوری ئەو میوانخانە سەوزەدا هیچی دیکەم نەکرد، ئارەزوویەکم نەبوو دووربکەومەوە، لەڕاستیدا نەمدەزانی بەرەو کوێ و بەچ ئاڕاستەیەکدا بڕۆم، چەند ئێوارەیەک بەناو درەخت و چۆم و چەمەنزارەکاندا ڕۆیشتم و نەگەیشتمە هیچ، سروشت بەجۆرێکی سەیر دەیترساندم، توانای گوێگرتنم لەدەنگی باڵندەکان نەبوو، بیری سەداو دەنگی لمم دەکرد. هەستمدەکرد هاوارەکانی ناو لم بەژیانی

مـن ئاشـناترن، هێزمەدایـە خـۆم و جـار دوای جـار بـەرەو شـوێنی قووڵتـر دادەبەزیـم، بـەڵام پێنەدەچـوو ئـەو درەختانـە کۆتاییان هەبێـت، وادیاربـوو هەتاهەتایـە درەخـت دەمبەخشـێت بەدرەخـت. ڕۆژێـک وا هاتـە پێشـچاوم وەک ئـەوەی ئـەو خانـووە لـە ناوەنـدی ڕێوێڵکەیەکـی گـەورەدا دروسـتکرابێت، لەنـاو ئەندازەیەکـی دەسـتکرد و ئاڵـۆزدا، بەجۆرێـک ئـەوەی بێتـە ئـەم خانـووە بێئـەوەی کـەس پاسـەوانیبکات، دەربازبوونـی بـۆ نەبێت. ڕۆژێـک بڕیارمـدا بـڕۆم و هەمـوو شتێک تاقیبکەمـەوە، بـەڵام جگـە لـە سـوڕانەوەیەکی بێهـودە لەنـاو چەنـد بازنەیـەک دارو درەختـدا هیچـی تـرم نەکـرد، وامهەسـتدەکرد ئـەوەی ناهێڵێـت دەربازبـم دەسـتبەرداربوونی خۆمـە لـە ئـازادی... مـرۆڤ لـەدوو دۆخـدا پێویسـتی بەهیـچ پاسـەوانێک نییـە، ئـەو کاتـەی ئـازادی لـەدەرەوە مانایەکـی نامێنێـت ئـەو کاتـەش کـە لەزینـدانـدا هەسـت بەئـازادی دەکات. مـن بـە هـەردوو وێسـتگەکەدا گوزەرمکردبـوو، لەسـاتێکدا هەسـتمکردبوو کـە ئازادییەکانـی دەرەوە لـەلام چ سـەنگێکیان نەمـاوە، هەستیشـمکردبوو لەزیندانەکەمـدا سەربەسـتییەکی ڕەهـام هەیـە. ئـەو ڕۆژانـە کـە لەنـاو دارو درەختەکانـی دەوری ئـەو میوانخانەیـەدا دەسـوڕامەوە، هەمـان هەسـتم هەبـوو، ئـازادی چیتـر لای مـن ئـەوە نەبـوو بێمـەدەرێ و بـڕۆم و شـارو خەڵـک و زەمینـی تـر ببینـم، بیسـتویەک سـاڵ زینـدان ئـەو جـۆرە ئازادییەی تیاکوشـتبووم. لەزۆوریشـەوە لـە خەڵوەتەکانـی خۆمـدا بیـرم لەهەمـوو ڕووناکـی و دەیجورێـک دەکـردەوە، بەدەنگـی بـەرز قسـەم لەگـەڵ خۆمـدا دەکـرد، دەنگـی خـۆم تاکـە دەنگێک بـوو هەسـتم بەئاشـناییدەکرد لەگەڵیـدا... پێموایـە ئەوانـەی زۆر لەگـەڵ خۆیانـدا دەدوێـن، هێـدی هێـدی دەبنـە دیلـی دەنگـی خۆیـان، منیـش بووبـووم بەدیلـی خـۆم. دواتـر تەنیـا چیرۆکـی سەریاسـی سـوبحەم منـی لـەو پێوەندانـە ئازادکـرد.

دوای تێپەڕینـی چەنـد ڕۆژێـک گەڕایـەوە... بمبـوورن... مـن هەسـتێکی

ئەوتـۆم بـۆ زەمـان نەمابـوو، نەمدەزانـی شـەو و ڕۆژەکان حیسـاببکەم. دواجـار کـە گەڕایـەوە، کەمێـک لەجـاری پێشـوو پیرتـر بـوو. لەهەمـان ئـەو شـوێنەوە دەسـتمان پێکـردەوە کـە دواجـار تیاوەسـتاین. دوای سـڵاوێکی کـورت گووتـی «سەریاسـی سـوبحدەم مـردووە... دروسـت نازانـم چـۆن، بـەڵام مـردووە. بمبـورە مردنـی ئەویـش مردنێکـی ئاڵـۆز و بێتەفسـیرە». سـەیری منـی دەکـرد و دەسـتی دەخسـتە سـەر یەکـێ لـەو شـتە کریسـتاڵ و درەوشـاوانەی ژوورەکـە و دەیگـووت «نازانـم کـەی و لەکـوێ مـردووە. ئـەو ساڵانەی ئـەو تیـا مـرد، تەفسـیریان نییـە، ئـەو بیسـتویەک سـاڵەی کـە تـۆ تیایـدا لەزینـدان بوویـت دەکرێـت هەمـووی هەڵگریـت و لەتابووتێکـدا فڕێیدەیـت، جگـە لەمـردن هیچـی تـری تیـا نییـە... ناتوانـم هیـچ مردنێـک تەفسـیربکەم، ناتوانـم هیـچ لەدایکبوونێکیـش تەفسـیربکەم، هەمـوو ئـەو شـتانە بـێ هیـچ لۆژیکێـک ڕوویانـدەدا... بـەڵام مـن دڵنیاتدەکەمـەوە کـە بەتەنیـا نەژیـاوە و نەمـردووە، لەگـەڵ ئەوانـی دیـدا بـووە، بـەڵام بوەسـتە... نـا، وامەزانـە ئاسـانە لەگـەڵ ئەوانـی دیـدا بژیـت و بمریـت... ئاسـان نییـە... دروسـت نازانـم ئـەو دواجـار کێیـە و کـێ بـووە و لەچـی چـووە، بـەڵام زۆربەیـان مـردن، ئەویـش لەگـەڵ ئەوانـدا بـوو... دڵنیـام لەگـەڵ ئەواندا بوو، وەک پێتدەڵێـم مـن لەهیـچ شـتێک دڵنیانیـم، لەبەرئـەوەی ناتوانـم دڵنیابـم، یـان ناکرێـت دڵنیابـم. شـتەکان دواجـار بـە ئەندازەیـەک تێکەڵاوبـوون هیـچ کـەس ناتوانێـت دڵنیابێـت، وەک شـەترەنجێک کـە تێـدا دروسـت نەزانـی کامـە داشـی تۆیـە... وەک شـەترەنجێک لـە نـاکاو چاوبکەیتـەوە و بڕوانیـت هەمـوو داشـەکان بوونەتـە سـپی یـان ڕەش و نەزانیـت دەسـت بـۆ چـی بەریـت، بـەڵام موزەفـەری سـوبحدەم بـۆی مەگـەڕێ، مـن تەنیـا کەسـێکم کـە زۆربـەی حەقیقەتـەکان دەزانـم... تەنیـا کەسـێکم. لەگـەڵ ئەوەشـدا ناتوانـم شـتەکانت پێبڵێـم، لەبـەر ئـەوەی لەشـەترەنجێک دەچێـت هەمـوو داشـەکانی بووبێتنـە یـەک ڕەنـگ، مـن تەفسـیرێکم نییـە، دڵنیابـە لەخۆشـم

نابـوورم ، دەبوایـە مـن تەفسـیرم هەبایـە، بـەڵام نیمـە... موزەفـەری سـوبحدەم، هاوڕێـم مـن و تـۆ قـووڵ قـووڵ لـەو گوناهـەدا چەقیویـن، منیش و تـۆش... بـەڵام دڵنیابـە ئـەو مـردووە، کـەی و چـۆن و لەکـوێ؟ لێممەپرسـە، نـا لێممەپرسـە... نازانـم...».

سـەرجەمی قسـەکانی کۆمەڵێک مەتەڵ و تەلیسـمی ئاڵۆزبوون. لێمپرسـی «ئـەوان کێـن ؟ ئـەو لەگـەڵ کێـدا مـردووە؟». گووتـی «لەگـەڵ ئەوانـدا، ئەوانـەی وەک خـۆی وابـوون، لەگـەڵ هاوڕێکانیـدا... لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە لـەو سـەردەمەدا مـردن». کەمێـک وەسـتاو خەندەیەکـی تـاڵ کەوتـە سـەر لێوی، تۆزێـک بیریکـردەوە و بەڕوخسـارێکی لەسـەرخۆوە گووتـی «ناکرێـت لەوە زیاتـرت پێبڵێـم، لـەوە زیاتـرم نییـە. بـۆ ئـەوەی لـەوە تێبگەیـت دەبایە لێرەبوویتایـە، دەبایـە لەگەڵمـدا بوویتایـە، دوائـەوە بزانیـت و نەزانیـت هیـچ ناگۆڕێـت... هیـچ... بـەڵام تـۆ لـەو دەرگایـەوە مەیـەرەوە ژوورێ، تـۆ بۆیـە لێرەیـت تـا لـەو دەرگایـەوە نەیەیتـە ژوورێ، بـا مـن و تـۆ جـۆرە پیرییەکـی تـر بژیـن، پیـری دوو پیـاو کـە خۆیـان بـۆ بیرکردنـەوە حیکمـەت تەرخاندەکـەن... بۆیـە تـۆم هێنایـە ئێـرە تـا لەشـوێنێکی تـرەوە بێیتـە نـاو ژیانـەوە، شـوێنێک پەیوەنـدی بـەو ڕابـوردووەوە نەبێـت، شـوێنێک پەیوەنـدی بـە ئێسـتاوە نەبێـت... پەیوەنـدی بەژیانـی ڕۆژانـە و مـردن و شـۆڕش و سیاسـەتەوە نەبێـت... گوێبگـرە موزەفـەری سـوبحدەم، ئـەی دۆسـت، مـن دەمەوێـت لەدەرگایەکـی تـرەوە بڕۆیـن، مـن و تـۆ لەدەرگایەکی تـرەوە بڕۆیـن، ژیـان هـەر ئـەم دەروازەیـەی نییـە... تـۆ تاکـە کەسـێکی لـەدەرەوەی ئـەم زەمانـە هەڵگیراویـت، تـۆ دیـل نەبوویـت، بەڵکـو تـۆ کەسـێکی دوور لەپیسـی ئـەو ڕۆژە نابووتانـە هەڵگیراویـت، وەک هەڵگرتنـی شـتێک لـە بەفـردا، وەک شـاردنەوەی قوتوویـەک زێـڕ... دەمتوانـی دەسـاڵ لەمەوبـەر بەرتبـدەم، دەمتوانـی بتگۆڕمـەوە بەئەفسـەرێکی گـەورەی دەوڵـەت. سـەردەمانێک سـەدان ئەفسـەری دیلمـان لەبەردەسـتدا بـوو،

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە هەزاران سەرباز و پلەدار و ئەفسەری گەورەگەورە دیلی من بوون. ئەو کات ئاسان دەمتوانی بتگۆڕمەوە، بەڵام دەبایە بمهێنایتایەتەوە بۆ ئێرە، بۆ ناو سیاسەت، بۆ ناو پیسی و چڵپاوی ژیانی ڕۆژانە، دەبایە بمهێنایتایەتەوە تەماشای پیسییەکان بکەیت، ئەوەی لەبیابان فێریبوویت بیرتبچێتەوە... من پارەیەکی زۆرم خەرجکرد تا تێگەیشتم تۆ وەک دەروێشێک لەبیاباندا دەژی، جێگایەک نەبوو بەرتبدەم، دەبایە وەک یاقووتێک هەرزان فرۆشتبکەم، دەبایە بتغەمەوە ناو شەڕەکان، ئەو شەڕانەی من و ئەوانی دی دروستمانکرد و دەبێت دروستیبکەین. تۆ زێڕێکی دەگمەنی ڕۆژە پاکەکانیت، تۆ تاکەکەسێکی بیستویەک ساڵە گوناهێکت نەکردووە، ئازاری باڵندەیەکت نەداوە، شەڕێکت نەکردووە. ئێمە شەڕ کردینی بەکۆمەڵێک ڕمووزن... شەڕ و شەڕو هەمیشە شەڕ، بەیانیان شەڕ، نیوەڕوان شەڕ، ئێواران شەڕ... نا وا مەزانە من بەدرێژایی ئەو ماوەیە بیرم لەئازادکردنی تۆ نەکردۆتەوە، هەتا جارێک هەموو شتێک تەواوبوو، دەبایە بتگۆڕمەوە بەچەند ئەفسەرێکی باڵا، ئەو شەوەی دەبوایە ئیمزای خۆم بخستایەتە سەر کاغەزەکان، هەموو گیانم دەلەرزی... جێگایەک نەبوو پاکی تۆی تیاهەڵگرم، تۆ خۆت هیچ لەپاکی خۆت نازانیت، وەک منداڵێک کە هیچ لەپاکی خۆی نازانێت... گەر تۆشم بهێنایەتەوە وەکو ئەوانت لێدەهات وندەبوویت».

بەنائومێدی و سەرزەنشتێکی قووڵەوە گووتم «ئاوەها کەواتە دەتتوانی ڕزگارمبکەیت و هیچت نەکرد، دەکرا نەهێڵێت بیستویەک ساڵ لەو سەحرایەدا برزێم و فەرامۆشتکردم. من ئەو سەحرایە کردمی بەلم، لمێکی ڕووت، لمێک بەهیچ شتێک کۆناکرێتەوە». گووتی «نا، ئەو دەم نەمدەتوانی ڕزگارتبکەم، ڕزگارکردن شتێکە و بەربوون لەزیندان شتێکی دیکەیە، من دەمتوانی بەرتبدەم، وا بکەم بگەڕێیتەوە، بەڵام

تـۆ یەکێـک نیـت لەئێمـە... تۆدەبایـە نەگەڕێیتـەوە ناومـان... دەبێـت تەنهابیـت... نازانـم تێمدەگەیـت یاخـود نـا؟ بـەڵام تـۆ دەبێـت تەنهابیـت، دەزانـم حوکمێکـی سـەختە، ئازادییەکـی گرانـە، بـەڵام گـەر تەنهـا نەبیـت هەمـوو شـتێکمان لەدەسـتدەچێت».

بەکورتـی یاقوبـی سنەوبەر دەیویسـت، مـن و ئـەو لەو کۆشـکە سـەوزەدا پێکـەوە بژیـن، پێکـەوە خەریکـی حیکمـەت بیـن، پێکـەوە هـەزاران سـەعات قسـە لەسـەر گـەردون و ئاسـمان و مـردن و خـودا بکەیـن، ئـەو لەساڵانی شۆڕشـدا کاتێکـی زۆری بـۆ زیندەگـی و ژیانـی خـۆی تەرخانکردبـوو، لـەدوای ڕاپەڕینیـش هەمـوو لەزەتەکانـی دونیـای تاقیکردبـووەوە. ئـەو هەمـوو عومـری خـۆی بـۆ حوکمکردنـی دونیـا تەرخانکردبـوو، بەجۆرێـک کاتـی نەبووبـوو بیـر لەماهیەتـی بکاتـەوە... ئـەو واهەسـتیدەکرد هەمـوو ڕوکەشـەکانی ژیانـی ناسـیوە بێئـەوەی بـگات بەجەوهـەر و مانـای.

ئـەو ماوەیـەی مـن لـەو خانـووە سـەوزەدا ژیـام، هەسـتم بەئـازادی نەکـرد... زۆر ئێـواران دەهـات، پێکـەوە دوو کورسـیمان دەبـردە نـاو دەرختـەکان، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەوکات مـن هێشـتا هەر لەسـەوزایی دەترسـام، بـەڵام دانیشـتنم لەگـەڵ ئـەودا لەزەتێکـی گـەورەی هەبـوو. مـن لەسـەحرا فێـری جۆرێـک لەدڵنیایـی بووبـووم... ئەویـش لەگـەڵ هەمـوو جەبەڕوتـی خۆیـدا، لەگـەڵ ئـەو ناکۆکییـە سـەیرانەی ناویـدا، لەگـەڵ ئـەو سـیما جیاوازانەیـدا، لەگـەڵ هەمـوو پەشۆکانێکیشـدا کـە دروسـتیدەکرد، شـتێک لـە دڵنیایـی دەدامـێ، دڵنیاییـەک سـەرچاوەکەییم بـۆ نەدەدۆزرایـەوە. ئـەو ئـەو بـاوەڕەی تیـا سـەوزدەکردم کـە مـن کەسـێکی پاکـم، دووریـم لـە کارەسـات و جەنگـەکان خاوێـن ڕایگرتـووم. ئـەو دەیویسـت ئـەو پاکییـە بکەینـە شـتێکی هەتاهەتایـی، خەڵوەتێـک دروسـتبکەین، هەردووکمـان ئیلهامـی لێـوە وەربگریـن. جـار دوای جـار کـە دەگەڕایـەوە، زیاتـر حـەزی

لەهێمنی و بیرکردنەوەدەکرد... خودی ئەو ماڵەسەوزە جەنەتێک بوو بۆ بیرکردنەوە. نا... منیش دەزانم لەدوای ڕاپەڕینەوە سەرۆک و وەزیر و سیاسەتمەدارەکان، ئەوانەی لەدەفتەری سیاسی حیزبەکاندا کاریاندەکرد هەموو خەڵوەتی تایبەتیان دروستدەکرد، هەموو میوانخانەی خۆیان هەبوو، شوێنی خۆیان لەشارەکان و دەرەوەی شارەکان هەبوو، بەڵام ئەو خانووە نیشتەجێ و ئارامگایەکی تایبەت بوو لەئارامگاکانی ئەو... من دواتر زانیم ئەو دەیەها جێگای دیکەشی هەیە، ئەو چەندین شوێنی تری هەیە... ئەو وەک هەموو سەرکردەکانی دوای ڕاپەڕین وەک پاشاکان دەژیا، بەڵام هەندێ شەو ترسێکی لەناکاو، پرسیارێک کە وەڵامی نییە، ئازارێکی سەختی ویژدان هەڵیدەگرت و بەپەشۆکاوی دەهات بۆلای من... ئەو منی دانابوو تا هەر کاتێک دەنگی جەستەو ویست و ئارەزووەکانی ئارامبوونەوە، هەر کاتێک ڕۆحی هاتەقسەبێت و شتێک لە منەوە فێربێت.

من بۆ ئەو شتێک بووم کەسی دیکەنەیبوو، شتێک هیچ سیاسەتمەدارێکی دۆست و هیچ حوکمدارێکی دوژمنیشی نەیانبوو، ڕۆحلەبەرێک نازانێت لەو ساڵانەدا چی بووە، کەسێک زاردەکاتەوە قسە لەسەر لم و ئەستێرە و باو بێدەنگی دەکات. ئەو نەیدەویست تەنیا دەسەڵات و هێز و لەزەتەکان موڵکی خۆی بن، دەیویست جوانی و پاکی و حیکمەتیش بکاتە موڵکی خۆی. من درەنگ زانیم کە ئەو دەیەوێت هەموو شتەکان بۆخۆی بن... هەر شتێک نەبروایە بەبەشێک لەو شتانەی ئەو ڕکێفیاندەکات، فەرامۆشیدەکرد. ئەو تەنیا جەنگاوەرەکانی نەدەکڕی، تەنیا وەزیرەکانی نەدەکڕی، تەنیا ئەرزە و شەقام و خانووبەرەجوانەکانی نەدەکڕی، ئەو بەدرێژایی ئەو ساڵانەی دوای سەرکەوتن هەموو شتێکی بردبوو بۆ خۆی، بۆ هاوڕێکانی. خودایە چ سەروەتێکی سەیری هەبوو، پیاوە شاعیرەکان و ژنە شاعیرەکانیشی

کڕیبـوو... پیـاوە پەیکەرتاشـەکان و ژنـە نیگارکێشەکانیشـی کڕیبـوو... ئەندازەیارەکان و مـەلای مزگەوتـەکان... باغـی هەبـوو تەنیـا بـۆ بولبـول، باغیشـی هەبـوو بـۆ جنسـی دیکـەی باڵنـدەکان... باغـی هەبـوو تەنیـا بـۆ شـەراب و مەسـتی، باغیشـی هەبـوو بـۆ سـەما، کۆشـکی هەبـوو بـۆ خـۆی و هاوڕێکانـی، بـۆ داوەتـی ئەفسـانەیی کـە هەمـوو خواردنـە سـەیرەکانی دونیـا دەهاتنـە سـەر سـفرەی. لـەو نـاوەدا هەنـدێ سـات دەهاتـە پێشـێ کـە تیایـدا لەهەمـوو شـتێک بێزاردەبـوو، ئـەو کاتانـە سـوار ماشـێنەکەی دەبـوو و دەهـات بـۆ لای مـن. ئـەو شـەوەی کـە پێمگـووت دەمەوێـت بـڕۆم و دونیـا ببینـم، بێئـەوەی هیـچ بڵێـت بەهێمنـی گـووتـی «ناتوانیـت... مـن و تـۆ لێـرەدا پیردەبیـن و دەمریـن».

مـن لەسـەرەتای بەهـارەوە تـا کۆتایـی هاوینێکـی زۆر گـەرم لـەو ماڵـەدا ژیـام، پڕبـوو لەسـەدان کاسـێتی فیدیـۆی هەمەچەشـنە. لەهـەزاران کتێـب. لەخواردنـی هەمەڕەنـگ کـە خـۆم ڕۆژانـە ئامادەمدەکـردن. بـەڵام دەمویسـت بـڕۆمـە دەرێ. شـەوێک چەندیـن بـار ئـارەزووی ئـازادی خـۆمـم بـۆ یاقـوب بەیانکـرد، بەدڵتەنگییـەوە گـووتـی « تـۆ بـاوەڕت بـەم هێمنییـە هەیـە؟... هـا پێمبڵـێ، تـۆ وادەزانـی گـەردون هەمـووی ئـەم هێمنـی و مۆسـیقا و ئارامییەیـە؟ تـۆ لـەم ژوورەدا گـوێ لەدەنگـی باڵنـدەکان دەگریـت و پێتوایـە دەکرێـت هیـچ کەسـێکی تـر ئاوەهـا شـاهانە بـژی؟».

مـن قسـەکانیم پێبـڕی و گـووتـم «یاقوبـی دۆسـت، مـن بیسـتویەک سـاڵە لـە هێمنـی و بێدەنگیـدا دەژیـم... نـا پێممەڵـێ مـن شـاهانە دەژیـم، تـا بێدەنگـی هەبێـت مـن دیلـم... تـا ئـەم ئارامییـە بێسـنوور و گـەردونـی و بێقـەرارە لـەدەورم بێـت مـن دیلـم... یاقوبـی سـنەوبەر... ئـەوان منیـان لەنـاو بێدەنگیـدا زینـدانکـرد... مـن زۆر بیـرم لێکـردەوە، ئـەوان نـە ئەشـکەنجەی منیـان دا، نـە لێیانپرسـیمەوە، سـزاکەیان ئەوەبـوو هەتاهەتایـە لەبێدەنگیـدا بژیـم... تـا بێدەنگـی هەبێـت مـن دیلـم». لەنـاکاو وەک

ڕاستییەکم پێبڵێت کە نامەوێت تێیبگەم، کەمێک دەنگی بەرزکردەوە و گووتی «بەڵام تۆ دیلی چی بوویت... دیلی شەو بوویت، دیلی بیابان، دیلی گەردون، دیلی ئەو ئەستێرانەی هەمیشە کاتت هەبووە سەیریانبکەیت... موزەفەری سوبحدەم، من شەوێک لەگەرمەی جەنگدا، لەگەرمەی خوێنرشتندا، هێزەکانی خۆم بەرەو بەرزاییەک دەجوڵاند، لەو کاتەدا سەرم بەرزکردەوە و ئاسمانم بینی... ملیۆنەها ئەستێرەم بینی... بچوکی خۆمم بەراورد و بەرامبەر بەگەردون بینی... شوێنی خۆمم لەناو ئەو دونیایەدا بینی... ئەوکات بیرمکردەوە من ساڵەهای ساڵە ئەستێرەم نەبینیوە... ساڵەهای ساڵە کاتی ئەوەم نەبووە بیر لەئاسمان بکەمەوە... سەیری مانگ بکەم... نا... ئەو ساتە تێگەیشتم من نیوەی ئەم جیهانەم دۆڕاندووە... من عومرم دەڕوات و کاتی ئاوڕدانەوەم نییە لەو شتانەی لەسەروو ئەم شەڕ و کوشتارەوەن... ئەو شەوە سەری خۆم دا بەبەردێکدا و هاوارمکرد«چ وشەیەکی ساختە و بێمانا و فێڵبازە وشەی دونیا»... موزەفەری سوبحدەم ئەوشەوە ئێمە جەنگمان بردەوە، بەڵام من دۆڕابووم... بەجۆرێک دۆڕابووم هیچ وەخت پێشتر بەزینی وام بەخۆمەوە نەدیبوو... نا نامەوێت بدۆڕێم. شەوێک بیرم لەوەکردەوە خەڵوەتێک دروستبکەم... خەڵوەتێک لەجێگایەکدا بتوانم هەموو شتەکان لەیادبکەم و خۆم تەرخانبکەم بۆ لەزەت وەرگرتن لەشەو و بێدەنگی و سروشت... شوێنێک بمگێڕێتەوە سەر شوێنی خۆم، وەک ئادەمییەکی بچوک لەناو گەردونێکی گەورەدا... تۆ خۆشبەختیت... ئێمە هەموو دیلبووین، بەڵام تۆ بەختەوەرترینمان بوویت... موزەفەری سوبحدەم تۆ تێناگەیت چەند قورسە من بتوانم ببمەوە بەئادەمییەکی بچوک لەناو گەردونێکی گەورەدا... موزەفەری سوبحدەم فێرمکە چۆن ببمەوە بەئادەمییەکی بچوک، چۆن بگەڕێمەوە سەر ئەسڵی خۆم؟».

تا دەمرم قسەکانیم لەبیرناچێتەوە، ئەو دەیویست بچێتەوە سەر

ئەسڵێک کە هەستیدەکرد لێیزەوتکراوە، بەڵام تاکە شتێکیش بوو نەیدەزانی چۆن دەستی بکەوێتەوە. ئەو دەیتوانی هەموو شتێکی هەبێت، هەموو شتێک، بەڵام نەیدەزانی چۆن ئەو شتانەی لەناو خۆیدا لەدەستیداوە بەدیبهێنێتەوە. من ئێستا کە لەم شەوی پڕئەستێرەیەدا ئەم چیرۆکە بۆ ئێوەدەگێڕمەوە، لەکاتێکدا گوێمان لەشەپۆلەکانی ئاوە، سوێندتان بەو شەپۆلانە بۆ دەخۆم کە یاقوبی سنەوبەر لەسەرەتای سەرەتاوە دەیویست خۆی لەهەموو شتەکان ئازادبکات، دەیویست شتە زیادەکانی ژیانی فڕێبدات و وەک زاهیدێک بژی، بەڵام نەیدەزانی چۆن. ڕۆژێک بەشکستەوە گووتی «موزەفەری سوبحدەم، فێرمبکە چۆن وەک دیلێک بژیم، چۆن وەک دەروێشێکی سەحرانشین بژیم... فێرمبکە بتوانم دوور لەدەسەڵات و سامان و لەزەت و ئافرەت بژیم، فێرمبکە». سوێندتان بۆ دەخۆم لەسەرەخۆ دانەوی و دەستی ماچکردم و فرمێسکە گەرمەکانی ڕژانە سەر دەستم و گووتی «ئەی دۆست... فێرمبکە... فێر». ئەو هەموو ساڵانەی من یاوەریبووم ساتی وەها ڕاستگۆییم لێنەدی بوو. من پێمگووت «یاقوب، من ناتوانم هیچت فێربکەم، ساڵگەلێکی دووروودرێژیی تەنیایی دەتوانێت ئەوەت فێربکات نەوەک من. من ناتوانم ئەوەت فێربکەم، من خۆم فێرنەبووم، ماوەیەکی زۆریش بەهەموو توانای خۆم شەڕم لەگەڵدا کردوە، نەمویستووە بەو جۆرەبم. ساڵانێکی دووروودرێژ حەز و ئارەزوو لەناوەوە دەیکوشتم، یاقوبی سنەوبەر تۆ لەو عەزابە گەورەیە تێناگەیت کەساڵ دوای ساڵ بیر لەبینینی گوڵێک دەکەیتەوە، لەزیندانێکدا دادەنیشیت لەناوەڕاستی دەریایەکی بێسەروبنی لمدا و بەخەیاڵ دەژیت، بەخەیاڵ سێو دەخوێت، بەخەیاڵ هەنار دەگریت بەدەستەوە... شەوان هەیە هەموو ژیانی خۆت دەگۆڕیتەوە بەبۆنی هەنارێک، یان نیوەشەو لەخەو ڕادەچڵەکێیت و دەبینیت ژوورەکەت پڕبووە لەبۆنی هەرمێ، بەدەم وڕێنەوە هەڵدەسیت

و بیری ئاو دەکەیت... سەیرترین شت لەسەحرادا ئەو دەبەی ئاوەیەکە بۆتدەهێنن، بەو ئاوەدا دەزانیت دونیا ماوە، بەو ئاوەدا دەزانیت کە دوور لەتۆ دەریا هەیە، شەپۆل هەیە... یاقوب بیهێنە پێشچاوی خۆت، من هەموو ڕۆژێک بەر لەوەی قومێک ئاو بخۆمەوە بەسەعات بۆنمدەکرد، کێ دەڵێت ئاو بۆنی نییە، چ گەمژەیە کە دەڵێت ئاو بۆنی نییە، من لەگەڵ ئەو ئاوەدا بۆنی هەموو دونیام دەکرد، بۆنی ماسیم دەکرد، هێندە قووڵ بۆنمدەکرد دەگەیشتمە سەر شاراوەترین و نهێنیترین بۆنەکانی ناو دەریا... ساڵەهای ساڵ ئارەزووەکانت دەتکوژێت، تا ڕۆژێک دێت تێدەگەیت دەتوانیت بێهیچ بژیت، تێدەگەیت سەرتاپای ئەو شتانەی حەزت لێیانە سەرابن، تێدەگەیت قورسایی شتەکان لەقووڵایی خۆتان، ئەوە ئەو ساتەیە کە دەتوانیت ئیتر بیر لەئارەزووەکانت نەکەیتەوە، ئیتر دەبێت خەیاڵەکانت بەشێوەیەکی دی دروستبکەیتەوە... یاقوب ساتێک هەیە نازانم کەیە، نازانم لە چ وێستگەیەکی ئەو هەموو ژان و تەنهاییەدایە، ساتێکە زیندان و خەڵوەت بەجۆرێک تێکەڵدەبن ئیدی بۆت جیاناکرێنەوە، ئیتر نازانیت تۆ دیلیت یان دەروێشیت، لەناکاو لەهەموو شتێک ئازاددەبیت لە هەموو قورساییەک، قورسایی ژیان خۆی نەبێت... من ناتوانم کەس فێربکەم، ئەو ساتەچییە و چۆنە... ساتێکە زمان تیا ئیشناکات... وەسف ناکرێت، بەڵکو وەک ڕۆشناییەک لەناوەوە هەڵدەقوڵێت».

بەدرێژای ئەو کاتەی من قسەمدەکرد ئەو دەستی گرتبووم و دەگریا، ئەو لەبەردەممدا چۆکی دادابوو و سەری خستبووە سەر دەستم و فرمێسک بەسەر ڕیشەسپییەکەیدا دەهاتەخوارێ و دەیگووت «فێرمبکە... فێر». پێم سەیربوو ئەو دیلێتی منی لەئازادی خۆی لا باشتر بوو. من ئەو کات بەتەواوەتی نەمدەزانی چییە، هیچ شتێکی تەواوەتی لەسەر خۆی و نهێنییەکانی پێنەگووتبووم. نەمدەزانی ئەو چەند گەورەیە...

بەڵام دڵنیابووم بێزارییەکی قووڵی لە دڵدایە. من نامەوێت سوێندتان بۆ بخۆم، بەڵام دڵنیاتاندەکەم کە یاقوبی سنەوبەر دەیویست شتێکی تر بۆ خۆی سازبکات، شتێک لەهەموو قورساییەکان ئازادیبکات... ئەو لە ئەستێرەیەک دەچوو بە کێشێکی مەزنتر لەکێشی خۆی بارکرابێت، ئەستێرەیەک شتەکانی سەری بەری درەوشانەوەی لێبگرن. ئەو کاتەی من بینیم باوەڕی بەهیچ شتێک نەبوو، دەیویست پارچەپارچە ژیانی خۆی ئاسانبکات تا ئەو ڕۆشناییەی لەناوەوەیەتی دەرکەوێت، ئەو شەوە کە نوشتایەوە و دەستی ماچکردم پێمگووت «ژیان ڕۆشناییەکە لەناو سندوقێکی داخراودا، ئەو سندوقەش دەشێت لەناو کۆمەڵێک سندوقی دیکەدا بێت، هەرکات ویستت ژیان دەرکەوێت، دەبێت لەتاریکییەوە دەریبهێنیت، هەموو ئەو بەرگ و پۆشاک و توێکڵانەی لێداماڵیت... یاقوب من نازانم تۆ چیت و چیت هەیە... بەڵام لەشی خۆت کەمێک سوکبکە... بارە قورسەکانت دانێ، زێرە زۆرەکەی کۆڵت فڕێدە و مەلەبکە». ئەو شەوە تا ماوەیەکی درێژ توند دەستەکانی گرتبووم و دەگریا، من باوەڕم بەفرمێسکەکانی کرد، دواجار گووتی «دەمەوێت سەرلەنوێ ژیان دەستپێبکەمەوە، بەڵام بەجۆرێکی تر و لەشوێنێکی ترەوە... بەڵام ئەفسانەیە، ئەفسانە، خەیاڵێکی پووچە، وانییە... خەیاڵێکی بێسود و پوچە، ناکرێت لەسەرەتاوە دەست پێبکەینەوە، موزەفەری سوبحدەم دەکرێت لەسەرەتاوە دەستپێبکەینەوە؟». چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد پێیبڵێم بەڵێ، بەڵام بەساردی یەکێکەوە بیەوێت دڵی ئەویتر بشکێنێت گووتم «نازانم تۆ لەچی ڕادەکەیت... نازانم، بەڵام کەس ناتوانێت لەسەرەتاوە دەستپێبکاتەوە، هیچ خەڵوەتێک مرۆڤ لەدونیا ئازادناکات، من بیستویەک ساڵ لە لمدابووم و دونیاش هەمیشە بەدوامەوەبووە». بەئارامی پێکەنیم و دڵڕەقانەتر گووتم « هەمیشە شتێک هەیە، بەرەو دوا دەتگێڕێتەوە... شتێک لەتوانای مرۆڤ گەورەترە، یاقوبی من لەو

سەحرایەدا یەک شت فێربووم، ئەویش ئەوەیە، مرۆڤ گیانلەبەرێکە نابێت شتەگەورەکان لەبیربکات». بەدەم ژانێکی گەورەوە گووتی «تۆ لەخۆت ڕاتنەکردووە، تۆ لەخۆت هەڵنەهاتوویت، تۆ لەجێگایەکی تەنک و لە لیخناوێکی بچوکی ژیانەوە بەرەو جێگایەکی قووڵتر مەلەتکردووە».

من لەمێژبوو دەمزانی زیندان و سەحرا منیان گۆڕیوەتە سەر مەلەوانێکی گەورە، بەڵام ئێستا کە ئازادبووم، نەمدەزانی چیبکەم، ئایا تا هەتاهەتایە لە بنی ئەو دەریا قووڵەدا بمێنمەوە یان بێمەدەرێ. یاقوب دەیویست لە تەک مندا بێتە ناو ئەو دەریایە، دەیویست من نەیەمەدەرێ و دەستی ئەویش بگرم بەرەو قووڵاییە بێقەرار و بێکەنارەکان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ئارەزووە قووڵەدا کەڕووە و بێدەنگی و تەنهایی و خامۆشبوون ئاڕاستەیدەکردم، دەنگێک لەناوەوە بەرەو دونیا بانگهێشتیدەکردمەوە، پرسیارێک کە هەرگیز نەمتوانیوە لێیڕاکەم، پرسیارێک هەردەم بەرەو دونیای دەیگێڕامەوە ئەوەبوو «سەریاسی سوبحدەم لەکوێیە؟ لەکوێ؟».

ئەگەر سەریاسی سوبحدەم نەبایە ژیانی من بەجۆرێکی دیکەدەبوو، من لەقووڵترین و تاریکترین شوێنی ژیانمەوە هاوارێکم دەبیست، هاوارێکی گەورە. دەنگی گریان و پاڕانەوەو مردنێکم دەبیست، لەخەونەکانمدا هەرجارە و بەجۆرێک بانگیدەکردم، هەندێجار هەستمدەکرد یەکێک لەڕەشەبایەکی دوورەوە، لەناو تۆفان و بارانێکی بێمرووەتەوە بانگمدەکات، هەندێجاریش هەستمدەکرد لەناو گێژەڵوکەیەکی لمەوە. دەنگێک بوو هەستمدەکرد تۆفان دەیبات، هەندێجاریش هەستمدەکرد تینوێتی دەیخنکێنێت، یەکێک بوو من هەرگیز ڕوخساریم نەدەبینی، تارماییەک بوو وەک ئەوەی لەتاریکیدا لەپشت پەردەیەکەوە وەستابێت، دەنگی لەوێنەکەی دوورتربوو، هەندێ شەو دەنگەکان وادەهاتنە گوێم وەک ئەوەی قریشکەیەک بن لەبنی دۆزەخەوە، هەندێ جار لەبری یەک

کەس، سەدان کەسم دەبینی، بۆنی خوێنم دەکرد. بۆنی هەناسەی سووتاو... هەر جارێکیش لەخەو هەستابامایە سەریاسی سوبحەدەمم بیردەکەوتەوە.

مردنی سەریاسی سوبحەدەم ئەو ئارەزووەی تیا بزواندم سەر لەو دەریای لمە بهێنمەدەرێ.

ئیدی شەوێک بەیاقوبی سنەوبەرم گووت من دەڕۆم و دەمەوێت دونیا ببینم.

٦

ئـەو ڕۆژەی محەمـەدی دڵشوشـەیان لەنـاو خەراباتـی شوشەسـتانەکەی خۆیدا دۆزییـەوە، ئیدی ئـەو خوشکانە ناوبانگێکی گەورەیـان پەیداکرد و ژیانیشیان سـەر لەبـەر گۆڕدرا، بـەوەدا هـاوڕێ و دۆستی ڕاستەقینەیان کەمبـوو، هەفتەیـەک دواتـر هەواڵـی مردنەکەیـان زانـی. نیوەڕۆیەکـی بـاران بـوو، سـلێمانی گـەورە بەخـۆی و پاسـەوانەکانییەوەهات، لـەدوای ئـەو خوازبێنییـە سـەیرەی بەربەیانـەوە ئیـدی نەیانبینیبـووەوە. کیـژەکان ونبوونـی لەنـاکاوی محەمـەدی دڵشوشـەیان بەمێنـد نەگرتبـوو، هەردووکیـان لـەو باوەڕەدابـوون، ئـەو پیاوانـەی لەنـاکاو دەردەکـەون، لەناکاویـش وندەبـن، ئەوانـەی تۆفـان دەیانهێنـن تۆفانیـش دەیانبـات. سـلێمانی گـەورە کـە هەرگیـز مردنـی کوڕەکـەی بیرناچێتـەوە، بەخـۆی و مشـکییە شـین و کەپـووە کێویـی و ددانـە زیوەکانییـەوە، بـەو لاجانـە سـپییەدرێژانەوە، بـەو کوڵەباڵـە باکورییـە زەردبـاوەوە دابـەزی و ڕوخسـەتی هاتنـە ژوورەوەی خواسـت و لەهەمـان هۆڵـی سـارد و چکۆلـەی بەربەیانـی خوازبێنیـدا لەسـەر هەمـان کورسـی دانیشـت. لاولاوی سپی هەر بەسـەرەنج تێگەیشـت محەمـەدی دڵشوشـە مـردووە، سـاڵانێک دواتـر کـە لەبـەر تەختـە ڕەشـێکی بچوکـدا و لەنزیـک گەرمـای کورەیەکـی داگیرسـاوی زسـتانەدا باسـی ئـەو سـاتەی دەکـرد، دەگریـا. بـەڵام ئـەوی کات کـە مردنـی ئـەو کوڕەی لەدید و هەناسـەی ئـەو پیـاوەدا خوێنـدەوە،

سەرسام وەستا و هیچی نەکرد... سلێمانی مەزن بەخودایەکی کێویی دەچوو تازە لە چیاکانەوە هاتبێتەخوار، ڕوخسارێکی توکنی هەبوو، لەبەر تووک بەئەستەم دەموچاوی دەبینرا، نێوگوێچکە و سەر کەپووشی تیسکی ڕەشبوون... دیاربوو چەندین ڕۆژە نەخۆی شتوە، نەریشی تاشیوە و نەپێکەنیوە. ئەو هاتبوو پێشنیارێکی چکۆلە و سەیری پێبوو کە لەوەوبەر نەبیسترابوو. بەهێمنی هەواڵی مردنی محەمەدی دڵشوشەی پێگووتن. چاوەڕوانی نەدەکرد خوشکەکان بلەرزێن و بگرین و شێتانە شیوەنبکەن، ئەو لەگەڵ سەبای یەکەم بەیانیدا تێگەیشتبوو کەچاوی ئەو دوو خوشکە لە چاوی دوو باڵندەی بێباک دەچێت. سلێمانی مەزن هاتبوو تا بەلاولاوی سپی بلێت، ئەو ئامادەیە موچەیەکی مانگانەی بۆ ببڕێتەوە بە مەرجێک هەموو هەفتەیەک ڕۆژێک بچێتە سەر گۆڕی محەمەدی دڵشوشە. دوا ئاواتی ئەوەبوو کوڕەکەی لەگۆڕەکەدا ئاسوودەبێت. ئەو ڕۆژە بە لاولاوی سپی گووت «بەڵێ محەمەدی دڵشوشە مرد... نا وامەزانن من ئەو ناوەم لێناوە، من لەهەموو کەس کەمتر دەمناسی، من و ئەو بەیەک غەریببووین... ڕۆژگارێکی سەیرە باوکان بە کوڕەکانیان نامۆن. مردنی مردنێکی سەیربوو، ناسکترین دڵی هەبوو لەم هەرێمەدا، هەموو خەڵک دەڵێن گوناهی تۆیە، دەڵێن جورمی ناڕەوای لاولاوی سپییە، بەلام دەزانم گوناهی تۆ نییە، ئەو دڵێکی هەبوو بەرگەی هیچ شتێکی نەدەگرت، هیچ شتێک، ئەو دەبایەوا ناکام، خێرا، بێمانا بمرێت... دڵێکی هەبوو ڕوونتر لەهەر ئاوێنەیەک، سافتر و سپیتر لەهەر شوشەیەک، وەک جامێکی تەنک و ناسکی شەراب بەدەست مەستێکەوە لە کوچەیەکدا سەرتاپای هەڵنووتسان و ساتمەکردن بێت... دواجار کە بینیم ئەو ڕوخساری ساقییەکی هەبوو، بەپیاڵەیەک بادەوە، بەلام بەکۆت و زنجیر و پێوەندێکی

زۆرەوە لـە دەسـت و قاچەکانیـدا... کـە بینیـم زانیـم دەکەوێـت. وای چ ڕۆژگارێکـی سـەیرە، تیفلـەکان وەک باوانیـان ناڕوێنـەوە... لەتـۆوی گوڵێـک گوڵێکـی تـر دەڕوێـت... لەهێلکـەی باڵندەیـەک تەیرێکـی تـر دێتـەدەرێ. مـن لێتـان ناشـارمەوە، مـن پیاوکوژبـووم، مامۆسـتای مـەرگ بـووم، هەرگیـز نەمدەزانـی لەسـایەی منـدا منداڵێـک گەورەدەبێـت لـە هیـچ تاقیکردنەوەیەکـی مردنـدا دەرناچێـت... بەهەرحـاڵ نەمتوانـی دوا ئـارەزووی بۆ جێبەجێبکـەم، ئـەو دەیویست نهێنییەکـی بـۆ ئاشـکرابکەم کـە چیتـر داوەکانـی لەدەسـتی منـدا نەبـوون؛ نەدەکـرا هیـچ بڵێـم، چونکـە ژیـان و مردنـی پێوەبەندبـوو. ئێسـتا ئـەو لەوێیـە، خەڵکـی هەرگیـز لەتـۆ تێناگـەن و لێتنابـورن... ڕانەهاتـووم بـۆ ڕەحـم و بەزەیـی بپاڕێمـەوە... ڕانەهاتـووم. مـن لـەو شاخانەدا پیربـووم، شـۆڕش بـەدوای شـۆڕش، شـەڕ بـەدوای شـەڕ، ئێسـتاش هیـچ شـتێک بەڕێکـی نـاڕوات، بـەڵام چەنـد ڕۆژە چـاوە پـاک و ڕوونەکانـی لەپێشـچاومن، وەک چـۆن بـەر لەمردنـی شـەوێکی تۆفـان بـەو هەمـوو خوێـن و بارانـاوەوە هـات و خـۆی کـرد بەمەجلیسـمدا، چاوەکانـی پێیدەگووتـم، تـۆ باوکێکـی بێسـۆز و بێدڵیـت، دەیگـووت دڵـی مـن لەشوشـەیە و دڵـی تـۆ لەبـەرد... شـەوێک سـەر سـینەی هەمـووی خوێـن بـوو، قـژی وەک قـژی قەلەندەرێـک کـە هەمـوو تۆفانـی دونیـای دیبێـت، قەلەندەرێـک لەئاوێکـی مەزنـی دابێـت، مەزنتـر لەهـەر ئاوێـک کـە مـن لەزیندەگیمـدا بینیومـە... یەکێـک داوای گەوهەرێـک بـکات لـەدەرەوەی دەسـتی ئینسـان، گەوهەرێـک بەمـن ڕاوناکرێـت. لاولاوی سـپی، مـن هـەردەم بـاوەڕم هەبـووە دونیایەکـی تـر لەودیـو مەرگـەوە هەیـە، لەگـەڵ هەمـوو خراپییەکانمـدا بـاوەڕم بەژیانێکـی تـر هەیـە دەکەوێتـە ئەودیـو ئـەم ژیانـەوە، جـۆرە بڕوایەکـی وا بـۆ هەمـوو بکـوژ و پیاوکوژان ئاسوودەیی پێیـە، جـاران دوای هەمـوو کوشـتوبڕییەک، وەک شـێت دەکەوتمـە شـاخ. چ شـتێک لـەوە بەدتـر

نییە هەستبکەیت کۆتاییت بۆ کەسێک داناوە، کۆتایی وشەیەکی قورس و ڕەزاگرانە... باوەڕم بە دونیایەکی تر هێنا تا هەستنەکەم ئەوانەی لەبەردەستی مندا مردن زیندوونابنەوە... باوەڕم بەوەهێنا قوربانییەکانی خۆم لە ژیانێکی دیکەدا دەبینمەوە، ئەوان کۆتاییان نەهاتووە، هیچ کەس کۆتاییناییەت، هیچ شتێک کۆتاییناییەت... لاولاوی سپی تۆش لەدونیایەکی تردا محەمەدی دڵشوشە دەبینیتەوە، دڵنیام ئێستا لەوێوە چاوەڕێی شتێکە، هەستدەکەم مردووەکان لە ئێمە زیاتر چاوەڕواندەکەن... ئێستا چاوەڕوانمانە، ئەوان بەهەمان ئەو سۆزەوە دەژین کە لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن... لاولاوی سپی من موچەیەکت بۆدەبڕمەوە، هەموو هەفتەیەک یەک سەعات بڕۆرە سەر گۆڕەکەی... یەک سەعات و هیچی تر». دوو خوشکەکە بەدرێژایی گوێیاندەگرت و هیچیان نەدەگووت، کە ئەو لەقسەکانی تەواوبوو، شادەریای سپی بەحەسرەتەوە گووتی «نەمانزانیوە محەمەدی دڵشوشە مردووە، سەرەخۆشیت لێدەکەین و خودا لێیخۆشبێت و سەبوریتبداتەوە، بەڵام باوکی محەمەد ئەو شەوێک هات و چەند جارێک هاواری لە ئێمەکرد و ئیدی نەگەڕایەوە، هاتەحەوشەکە و ئێمە دەرگامان نەکردەوە، چونکە قەول نییە لەئێوارەیەکی درەنگدا سێ ئافرەت دەرگا لەغەریبەیەک بکەنەوە، ئەو یەکەم جار لەڕۆژی لافاوەکەدا دەرکەوت، ئەو ڕۆژیش گەر لافاو نەبایە دەرگامان نەدەکردەوە، بەڵام لەکاتی لافاودا خەڵکی دەبێت یارمەتیدەری یەک بن... ئێمە دوو کچیین شووناکەین... هەتاهەتایە شووناکەین، ئەگەر بڕیاربێت ئاسمان بەسەر زەویدا بڕوخێت و زەماوەندی ئێمە ڕایگرێت دیسان شووناکەین، لەگەڵ ئەوەشدا من بەلاولاوی سپی دەڵێم گەر چوونی تۆ بۆ سەر گۆڕەکەی دەتوانێت ئاسوودەیبکات... بڕۆ... بڕۆ... من نابم بەڕێگر لەڕێگاتدا». لاولاوی سپی بەترسەوە گووتی «بەمەرجێک

تۆش لەگەڵمدا بێیت... بەبێ تۆ ناڕۆم، من سەرقەبرانم نەبینیوە... تۆش وەرە لەگەڵمدا».

دوو خوشکەکە ئەو دوو ئەمریمەنەنەبوون کە وەسفیاندەکردن، کاتێک دەکەوتنە قسەکردن، گەلەک پرشنگ و جوانیت تیادەبینین. ئەو ڕۆژە سلێمانی مەزن کەمێک ئاسوودە لەو ماڵە چووەدەرێ، کەسانێک سەیریان لێدەهات باوکێک بەو چەشنە لەگەڵ بکوژی کوڕەکەیدا مامەڵەبکات، بەڵام سلێمانی گەورە لەو باوەڕەدا نەبوو لاولاوی سپی کوڕەکەی ئەوی کوشتبێت، ئەوەی محەمەدی دڵشوشەی کوشت نازکی ئەو دونیا شوشەییەی خۆی بوو کە بەرگەی بچوکترین گێژەنی نەدەگرت.

ڕۆژێکی باڕەش بوو، جوانترین جلی سپی خۆیان لەبەرکرد و ڕۆیشتن بۆ سەر گۆڕی محەمەدی دڵشوشە،«با» قژیانی لەگەڵ خۆیدا بۆ دووردوور دەبرد، کە بەو جلانەوە لەناو گۆڕەکاندا دەرکەوتن گۆڕستانەکە تەواو خامۆش و چۆڵ بوو... گردێک بوو بەهەزاران کێلەوە، ڕەشەبا بەشێوەیەکی دڕندە گەمەی بەهەموو شتەکان دەکرد، بۆنی مەرگ دەهات، مەرگێک کە «با» ئارامی و ئاسوودەییە مەزن و بێکەرانەکەی خۆی لێسەندبووەوە...«با» مردووەکانی دەجولاند، هیچ کەس بەقەبرستانەکەوە نەبوو، هەردوو خوشکە سپی پۆشەکە بە ئارامی چوونە سەر گۆڕەکەو بەدەنگێکی کز کە هیچ کەس گوێی لێنەبوو بەمردووەکەیان گووت «بمانبورە». هەردووکیان لە شوێنە سارد و زەمهەریرییەکانی ڕۆحیاندا خۆیان بەبێگوناه دەزانی، بەڵام لەو جێگایانەدا کە سۆز و بەزەییان شەپۆلیدەدا هەستیان بە گوناهێکی بێئەندازە گەورەدەکرد. ئەو ڕۆژە پێکەوە لەسەر گۆڕەکەی دەستیان بەگۆرانی گووتن کرد... لەگەڵ سەدای دەنگی

ئەواندا ئاسمان تاریک و گۆڕەکان ئارامتربوونەوە، پێدەچوو لەمێژبێت هیچ کەس لەو گۆڕستانەدا گۆرانی نەگووتبێت. کە تەواوبوون هەستیان بەئاسوودەییەکی قووڵکرد، هەستیان بەکزبوونی باو هێمنی ئێوارە و کپی و مەستی درەختەکان کرد، شتێک لەهەوای گۆڕستانەکەدا گۆڕدرا، پاش ئێستێکی زۆر کورت لە ناکاو لەنابەینی گۆڕەکانەوە، لەپشت یەکێک لەکێلەکانەوە، گەنجێک هەستایە سەرپێ و گووتی«خانمان چ دەنگێکی خۆش و سیحراویتان پێوەیە... من بەدرێژایی ژیانم گوێم لەدەنگی وا خۆش و ئەفسوناوی نەبووە، چ سەدایەک و چ نەغمەیەک و چ ئاوازێک!!». دەرکەوتنی هێندە سەیر و لەناکاو بوو دوو خوشکەکە کەمێک پەشۆکان و ماوەیەکی ویست تا ئارامبوونەوەو بەهێمنی سەیری چاوی یەکیان کرد و گووتیان «سوپاس، زۆر سوپاس، بەڵام هەستناکەین دەنگمان هێندەخۆشبێت». کوڕەکە بەهێمنی لەو دوو خوشکە سپیپۆشە نزیکبووەوە و گووتی «من ناوم سەریاسی سوبحدەمە... لەو کاتەوەی گۆرانی دەڵێن گوێم لەدەنگتانە، قسەم لەسەر دەنگ خۆشیتان نییە، من لەوەوبەر زۆرکەم گوێم لەدەنگی ئافرەت بووە، بەڵام ئەوەی لەگەڵ مەلاکاندا دوو کچی وەک ئێوەش لەسەر مردووەکان گۆرانی بڵێن، چاکترە... پێتانوایە گۆرانی دڵی مردووەکان خۆشدەکات؟». شادەریا گووتی «نازانم گۆرانی مردووەکان بەختیاردەکات یان نا، ئەمەگۆڕی محەمەدی دڵشوشەیە، دوو هەفتە لەمەوبەر مرد، عەشق کوشتی، ئێستا ئێمە لێرەین تا داوای لێبوردنی لێبکەین و کەمێک دڵخۆشی بدەینەوە...».

بەوجۆرەسەریاسی سوبحدەم و خوشکە سپییەکان یەکتریانناسی. لەئێوارەیەکی ڕەشەبادا، لەسەر گۆڕێک، لە نابەینی هەزاران کێلدا. شەوێک بوو وەک ئەمشەو باران و ڕەشەبا، وەک ئەمشەو کە پێدەچێت دەنگی دەریا نەهێڵێت قسەبکەین... ئێستا نامەوێت بەدرێژیی باسی

ئـەو یەکـدی بینینەتـان بۆبکـەم، هێنـد هەیـە ئـەو ڕۆژەگەلـەک خێـرا تێپـەڕی، خوشـکەکان لەترسـی ئـەوەی نەبا دووبـارە چیرۆکێکـی دیکـەی وەکـو ئـەوەی محەمـەدی دڵشوشـە دووبارەبێتـەوە، بێئـەوەی دەرفـەت بـەو کوڕەبـدەن زۆر لەگەڵیانـدا بدوێـت بەخێرایـی لەگردەکـە هاتنەخـوارێ و ونبـوون... ئـەو ڕۆژە ئـەو دوو خوشـکە لەشتێک ڕایاندەکرد کـە دەربـازی نییـە، بـەڵام ئـەوەی ڕێکـەوت دروسـتیدەکات گـەر بەشـێک بـوو لـە چیرۆکێکـی بێدەرو دەربەسـت، چیرۆکێـک کـە قـەدەر دەیچێنێـت، چەنـد بـەری پێبگریـت هەمیشـە لەشـێوەی ڕێکەوتـی دیکـەدا دووبارەدەبێتـەوە. ئـەو ئێوارەیـە سەریاسـی سـوبحدەم لـە نابەینـی کێلەکانـدا وەسـتاو بەزەردەخەنەیەکـەوە تەماشـای ئـەو دوو خوشـکەی کـرد کـە وەک لەچارەنـوس ڕابکـەن بەپرتـاو دادەبەزیـن.

یەکبینینـی سەریاسـی سـوبحدەم لەگـەڵ خوشـکەکاندا بەشـێکی ڕێکەوت بـوو، بەشێکیشـی ڕێکـەوت نەبـوو... ئـەوەی دەبایـە سـەریاس بێتـە ئـەو قەبرسـتانەو بچێتـە سـەر گـۆڕی محەمـەدی دڵشوشـە ڕێکـەوت نەبـوو؛ دڵشوشـە یەکێـک بـوو لەنزیکتریـن هاوڕێکانـی سـەریاس. بـەڵام ئـەوەی لـە ئێوارەیەکـی ڕەشـەبادا بێـت و هاتنـی هـاوڕێ بێـت بەدەرکەوتنـی دوو کیـژی باڵابـەرزی سـپیپۆش، ڕێکەوتبـوو. سەریاسـی سـوبحدەم ئـەو زەمـان لـەو سـەرقەبرانەدا هاوڕێیەکـی زۆری هەبـوو، لـەو تەمەنـی گەنجییـەوە ژمارەیـەک لـە هاوڕێکانـی لـەو گۆڕسـتانەدا خەوتبـوون، هەندێکییـان لـەو منداڵانەبـوون لـە سـەردەمانی پێـش ڕاپەڕینـدا کوژرابـوون، هەندێکـی دیشـیان لـە جەنـگ و پێکدادانـە ڕۆژانەکانـی دوای ڕاپەڕینـدا. سـەریاس و محەمـەدی دڵشوشـە هەردووکیـان لـە سـەرەتای دۆزینـەوەی نهێنـی هـەرە گـەورەی ژیانیانـدا بـوون. بـەڵام چ نهێنییـەک... چ نهێنییـەک؟ مەپرسـن... تکاتـان لێدەکـەم لێگەڕێـن و مەپرسـن. ئـا ئەمشـەو غـەم ناهێڵێـت قسـەبکەم، سـەیرکەن ئاسـمانیش دەڵێیـت لـە دڵـی منداییـە

دەگری. ئاه... ئەمشەو تۆفانەکانیش نامێڵن قسەبکەین... دەریاش ئەمشەو لەسەرخۆی نییە... من چیتر حەزدەکەم سەیری تاریکی و ڕەشێتی بێئەندازەی دەریابکەم... لێمگەڕێن... من ئەمشەو ئارەزووێکم نییە بەردەوامبم... هەرچی پەیوەندی بەنهێنی سەریاسی سوبحەدەم و محەمەدی دڵشوشەوە هەیە بۆ شەوێکی دی... لێمگەڕێن با سەیری زوڵمەتی بێسنووری دەریا بکەم و بگریم... خۆم لەگەڵ ژانی ئەم ئاوەدا ڕاژەنم و بگریم.

## ٧

شەوێک غەریبەیەک منی لەو میوانخانە دوور و فەرامۆشەدا دۆزییەوە... شەوێکی تاریک بوو گوێم لەکرانەوەی لە ناکاوی پەنجەرەیەک بوو، دەنگی شکاندنی هەندێ شت، تیشکی چرایەکی دەستی لەخوارەوەڕا کەوتە سەر پەردەی پەنجەرەکەم و لەپشتەوە لەناو درەختەکاندا سێبەری پیاوێکی گەورەم بینی. یەکێک بوو شارەزا، دەیزانی لەکوێوە دێت بۆ کوێ دەچێت. من پێموابوو ئەو کۆشکە سەوزە لەجێگایەکدایە کەس دەستی ناگاتێ، بەڵام دەرکەوتنی ئەو پیاوە ترس و گومانێکی کتوپڕی خستەدڵمەوە، پیاوێکی زەبەلاح بوو، تا ئەو کات لەژیانمدا کەسێکی دی وەها گەورەم نەبینیبوو، کاتێک هەستیکرد من لەوێم بەچرپەیەکەوەگووتی «تۆ کێیت؟». من بەئارامییەوە بەرابەری وەستام و گووتم «من کەس نیم، تۆ کێیت... نێرەشوێنی منە... من شەش مانگە لەمماڵەدا دەژیم... تۆ چ کەسێکی، میوانیت یان ڕێگات ونکردووە... دۆستیت یاخود بۆ شتێکی دیکە دەگەڕێیت؟» بەخۆی و چراکەیەوە لێم نزیکبووەوە، من ئەو کات لەقاتی سەرەوەی ماڵەکەدا لەژوورێکی نیمچە تاریکدا دەخەوتم، کە هاتمەدەرێ لەسەر پێپلکەکان وەستابووم و ئەویش لەسەر یەکەم پلە لە دوانهۆمی خوارەوە بەچەکێکی سەیرەوە کەپێشتر نەمبینیبوو وەستابوو، لەگەڵ ئەو قەدو قامەتە گەورەیەدا دەموچاوێکی منداڵانەی هەبوو، بەرگێکی ئەفسەرانەی لەبەردابوو، سەرشانەکانی پڕبوون لەنیشانە و

ئەستێرە. هەستمکرد نازانێت چیم وەڵامبداتەوە... نایەوێت هیچم پێبڵێت. بەدەنگێکی کەمێک بزرکاو و ساردەوە پرسی «تۆ چیت... پاسەوانیت، یان میوان؟ میوان شەش مانگ لێرەدا نامێنێتەوە، ئێرە کۆشکێکی خاڵییە. کاتی خۆی من سەرپەرشتی دروستکردنی ئەم جێگایەبووم... شوێنێکی نهێنییە بۆ پاشەڕۆژێکی دوور دروستکراوە. تۆ چیدەکەیت لێرەدا؟». بینینی من لای ئەو شتێکی کوتوپڕبوو، هەرگیز مەخلوقێکی دیکەی وەک منی نەدیبوو، چاوەڕێی ئەوەنەبوو لەشەوێکی وادا ڕێکەوتی کەسێک بکات ریشی تا بەرپێی درێژبووبێت و پرچی وەک دەروێشەکان تا سەر کەمەری شۆڕبووبێتەوە، بەخۆی و کتێبێکەوە، لەشوێنێکی وا سەیر و ناجێدا لەدیسداشێکی عەرەبیدا کە جلی ساڵەهای ساڵی بیابانیشی بوو، دەرکەوێت. من بەهێمنی گووتم « من دیلم... دیل». کەمێک وەستام و بەئەفسوسێکی گەورەوە گووتم «من بیستویەک ساڵە دیلم... من کەسێکی ڕاستەقینەنیم، تارماییم، من نیم و نەبووم». سەیرێکی دەوروبەری کرد و بەپارێزێکەوە پرسی «دەتوانم دانیشم و قسەبکەین؟». ئەو کات نەیدەزانی من چەندە خۆشحاڵم ئادەمییەک ببینم، نەیدەزانی بیستویەک ساڵە من جگە لە یاقوبی سنەوبەر و پاسەوانەکانی سەحرا کەسێکی دیم نەبینیوە، تێنەدەگەیشت من باس لەچی دەکەم. سەرەتا بەچاوێکی پڕگومانەوە تەماشایکردم، وەک شێتێک لە منی ڕوانی یان وەک سەرلێشێواوێک گەمە بە وشەکان بکات. بەهەردووکمان گڵۆپەکانمان داگیرساند و لەسەر دوو قەنەفەی ڕەش بەرامبەری یەک دانیشتین. سەیرێکی وردی ژوورەکەی کرد و گووتی «هەموو شتەکان وەک خۆیان وان... وەک ئەو کاتەی پێنج ساڵ لەمەوبەر جێمهێشتن و کلیلەکانم دایەدەست یاقوبی سنەوبەر. ئەو کات ترسێکی گەورەمان لەداگیرکردنەوە هەبوو... لەوە دەترساین ڕۆژێک لە ڕۆژان هەموو شتێک بدۆڕێنین و لەسەرەتاوە دەست پێبکەینەوە». وەک ئەوەی لەناکاو شتێکی بیرکەوتبێتەوە، بەدوودڵییەکەوە تەماشایکردم و

گووتی «تۆ چیدەکەیت لێرە... خودایە، هیچ کەس ئێرە نازانێت من و یاقوبی سنەوبەر نەبێت... تەنیا من و ئەو ئێرە دەزانین؟». شەوبوو، نەمدەویست بەخێرا هەر نهێنی و ڕۆشناییەکم هەیە ئازادیبکەم... وەک یەکێک بەدەوری پرسیارەکاندا پێچبکاتەوە، بێئەوەی وەڵامیبدەمەوە پرسیم «تۆ ڕوخساری منداڵێکت هەیە، کەچی لەشت لە لەشی ئیبلیسێکی پیر دەچێت. تۆ لەوە منداڵتر دیاری ببیتە هاوڕێی سەرۆکەکان... لێممەگرە، من گومانت لێدەکەم». کەمێک ڕاماو گووتی «من منداڵ نیم، بەرەو سی و پێنج هەڵدەکشێم،... دەموچاو درۆزنترین بەشی ئینسانە». گووتم «چیدەکەیت لێرە، کێ تۆی ناردوە بۆ ئێرە، بۆ بەنیوەشەوێکی وا تاریک هاتوویتە ئەم جەنگەڵ و دونیا شێت و هەراشە، چیت دەوێت، بۆچی دەگەڕێیت؟». بەغەمگینییەکەوە سەری دانەواند و گووتی «من ئیکرامی کێوم... هاتووم بۆ هاوڕێیەکم دەگەڕێم». تەماشای چاومی کرد و بێئەوەی بترسێت گووتی «بۆ دۆستێکم دەگەڕێم هەموو دونیای بەدوادا گەڕام و نەمدۆزییەوە، بۆ هاوڕێیەکی منداڵێم دەگەڕێم لەناکا و لەشەوێکدا ونبوو و ئیتر نەمانبینییەوە... سا دەزانم ئەو ونیکردووە... ئەو». بەسەرسامییەوە پرسیم «ئەو کێیە؟». گووتی «یاقوبی سنەوبەر... سەرۆک».

سوێندتان بەو ئەستێرە پاکانە بۆدەخۆم کە ئەمشەو لەم دەریایەدا ڕێنماییماندەکەن... سوێندتان بەم کەشتییە بۆ دەخۆم کەمان و نەمانمان بەحیکمەتی کەشتییەوانەکەیەوە بەستراوە، کە ئەو ساتەساتێک بوو لەساتە تاڵەکانی ژیانی من، شتێک لەناوەوەم، لەو جێگایەدا ویژدان و هەقیقەت بەیەکدەگەن هاواری لێکردم، دەنگێک کە بەدەنگی برینداری‌ێک دەچوو لەبادا بگری، من نەمدەزانی کێیە ونبووەو کێ ونیکردووە، بەڵام وەک ئەوەی بای شەو هەناسەی قوربانییەک لەگەڵ خۆیدا بێنێت، دونیا پڕدەبوو لە سێبەری کەسانی بریندار... شەو پڕدەبوو لە هاواری دوور...

پڕدەبوو لە ناڵەی ئەو مردووانەی ساڵگەلێک لەبیابان گوێم لێدەگرتن. وەک ناڵینی ئەو مردووانە دەهاتنەگوێم کە شەو و ئەستێرە لەناو لمدا ئەشکەنجەیان دەدان. وەک ئەوەی هەست بەو دەنگانە بکات لەگوێمدا، وەک ئەوەی ئەو دیمەنە تاریکانە ببینێت لەچاومدا، بەدوودڵییەکەوە گووتی «تۆ باوەڕناکەیت، چونکە تۆ هاوڕێی ئەویت، ئەو کلیلی ئێرەی داوەتە تۆ... تۆ دۆستی ئەویت و نایناسیت». ئەو سات هەموو دونیا، هەموو ژیان وەک مەتەڵێکی گەورە دەهاتەبەرچاوم. گووتم «تۆش دوژمنی ئەویت... لەدوای خراپەی ئەویت. گوێبگرە، من نە دۆستی ئەوم و نە دۆستی تۆ، من بیستویەک ساڵە لە بیاباندا دەژیم... بیستویەک ساڵ لە زیندانێکی دوورو گەرم و ترسناکی بیاباندا بووم... من لەدەرەوەی هەموو شتێکم، من نیم، من نەبووم، من چیرۆکێکی ترم هەیە، کە نەچیرۆکی تۆیە، نەچیرۆکی ئەو، من نە لە دونیای تۆ دەزانم و نە لە دونیای ئەو... من دیلم و کارم بەشەڕەکانی ئێوە نییە».

ئیکرامی کێو وەک تێنەگات باسی چیدەکەم گووتی «من بەدوای هاوڕێیەکمدا دەگەڕێم... هەموو شوێنێکی بۆگەڕام، هەر جێگایەکم شک بردبێت بەنهێنی چووم، دوا جێگا ئەم کۆشکەبوو، بەڵام کەس لێرە نییە... ساڵ لە پشتی ساڵ دەڕوات و لەگەڵیشیدا هاوڕێکانم دەڕۆن. ئایا هەریەکێک لەئێمە مافی ئەوەی نییە هاوڕێیەکی زیندووی هەبێت؟ سا وامەزانە من کەسێکی خراپم، یا دەمەوێت یەکێک ئازاربدەم، من لە شۆڕشیشدا چەندم توانی بێت ڕۆحی خەڵکم ڕزگارکردووە». بەهێمنییەوە لێمپرسی «ئەی دەتوانیت ڕۆحی من ڕزگاربکەیت ؟». دیمەنێکی سەیری هەبوو لەیەکێک دەچوو لە ڕاوشکار هاتبێتەوە، یان یەکێک لەو هەردانە دوای نێچیرێکی خەیاڵی کەوتبێت و بۆ چاخواردن لای دابێتە لای شوانێک... کە وامپێگووت، بەسەرسامییەوە سەیریکردم و پرسی «لە چی ڕزگارتبکەم؟ لە کێ؟». من لە یەکەم دەقیقەوە جۆرێک ئاشناییم

لەگەڵدا پەیداکردبوو، کەسێک بوو پاکی و هێزی تیابوو، ئەو تفەنگ و جلەسەربازی و لەشە زەبەلاحەی وایان لێنەکردبوو ببێتە پیاوێکی ترسناک، زیاتر لەمنداڵێک دەچوو یاریبکات. دوو کەس بووین تەواو جیاواز، دەموچاوێکی سپی و گەورەی هەبوو، بەشێوەیەک ڕیش و سمێڵی تاشیبوو ئاسەواری موویەک بەڕوخسارییەوە نەبوو، برۆکانی ڕەش و تەنک و باریک بوون، لێوەکانیشی بێئەندازە ئەستوور و پڕخوێن، لەشی بەئەندازەیەک گەورەبوو دەیتوانی من وەک دوو چڵ ئێسک کۆبکاتەوە و بمخاتەوە سەر شانی و بەرەو هەر جێگایەک دەیەوێت بمبات. من زیاتر و سەیرتر لەو تەماشامدەکرد، بەجۆرێک سەیرمدەکرد دواتر شەرمم لەنیگای خۆم دەکرد. تا ئەوکات ئولفەتم بەبینینی مرۆڤەوە نەگرتبووەوە، هەر ئەو تەماشا سەیر و نهێنیبڕانەش بوو یادەوەرییە ماندووەکەمیان بەشێوەیەک تیژکردەوە بتوانم شەوێکی وەک ئەمشەو لێرەدا سەیری ئاوبکەم و بەسەرهاتی ئەو ڕۆژانەشتان بۆ باسبکەم. ئەو شەوە کە بەئیکرامی کێوم گووت «دەتوانیت ڕۆحی منیش ئازادبکەیت؟». پرسیارێک بوو لەقووڵایی دڵمەوە دەهات. من پێشتر بیرم لەوە کردبووەوە کە دەبێت ڕۆژێک لەڕۆژان، شەوێک لەشەوان یەکێک دەرکەوێت و بەو دارستانەدا بڕوات و چاوی بەو ماڵەبکەوێت و بێت بۆ لام و بپرسێت «تۆ کێیت؟». من ئەوەم لە خۆم پرسی بوو «دەکرێت چارەنوسی خۆم بدەمە دەست غەریبەیەک؟». دەکرێت ڕۆژێک یەکێک ببینم لەپێشدەم ئەو دەرگایەوە دەڕوات و بانگیبکەم و بڵێم «هۆ تۆ ئەی برای ڕێبوار، برادەری گەڕیدەم، وەرەو ڕزگارمکە». من هێدی هێدی نائومێدبووم لەوەی یاقوبی سنەوبەر دەستمبگرێت و وەک ئادەمییەک بمگێڕێتەوە بۆ دونیا، دڵنیابووم ئەو منی بۆ هەتاهەتایە لەویادا دەوێت... من بەشێوەیەک لەشێوەکان دیلی خولیا فەلسەفییەکانی ئەوبووم. ئەو شەوە کە بەئیکرامی کێوم گووت ڕزگارمبکە، بڕوایەکی تەواوم هەبوو بڕۆم و لەو سەر عەردەبەرین و

گەورەیـەدا دوای چارەنوسـی سەریاسـی سـوبحدەم بکـەوم، بـڕۆم و تێبگـەم لـەو بیسـتویەک سـاڵەدا دوور لـە مـن چـی ڕوویـداوە... نـا وامەزانـن مـن بـۆ شـتێک ڕوومکـردەوە دونیـا، وامەزانـن تەماحـم لەشـتێک بـوو... مـن دەمویسـت بـڕۆم و قورسـایی ئـەو هەمـوو سـاڵە دووروودرێژانـەی سـەحرا لەسـەر شـانم سـووکبکەم... مـن وەک بینەرێـک گەڕامـەوە، وەک یەکێـک بیەوێـت دوا گەشـتی خـۆی ئەنجامبـدات و بمرێـت، وەک کۆنەباغەوانێـک بیەوێت دوا نیـگای باغێـک بـکات کـە لەتەمەنێکـی زووەوە نەیبینیـوە. مـن ئـەو شـەوە بەهێمنـی بەئیکرامـم گـووت «لـە لـم ڕزگارمبکـە... لەسـەحرا... لەسـەحرا». دڵنیابـووم تێمنـاگات، بەنیـگای منداڵێکـەوە لێیپرسـیم «ئـەی یاقوبـی سـنەوبەر چـی لێدەکەیـت؟». بێئـەوەی وەڵامـی پرسـیارەکەی بدەمـەوە پێمگـووت «مـن نـاوم موزەفـەری سـوبحدەمە دەمەوێت لەبێدەنگی ڕزگارم بێـت». کەوامگـووت، تفەنگەکـەی دانـاو گووتـی «خودایـە، موزەفـەری سـوبحدەم، یەکێکـە لەشـەهیدە زۆر کۆنەکانـی شـۆڕش... تـۆ دەڵێیـت چـی؟ موزەفـەری سـوبحدەم لەمێـژە مـردووە». مـن گووتـم «ڕاسـتە... ڕاسـتە مـن لەمێـژە مـردووم... بـەڵام ئایـا مـرۆڤ هەقـی ئـەوەی نییـە جارێکـی تـر زیندووبێتـەوە و بـژی؟». دەبووایـە هەمـوو شـتێکی بـۆ ڕوونبکەمـەوە، نـا وامەزانن نیازێکـی خـراپ یـان ویسـتێکی تایبەتیم هەبووە، بەڵام هەستمکرد تێمنـاگات، نازانێت باسـی چـی لەگەڵـدا دەکـەم. شـەوێکی درێـژ تـا بەربەیـان گوێـی لێگرتـم و مـن گوێـم لێگـرت، ئاسـان نەبـوو تێبـگات. موزەفـەری سـوبحدەم ناوێکـی دێریـن و کـۆن بـوو، پێدەچـوو یەکێـک بێت لـەو ناوانـەی کەمـرۆڤ جارێـک دەیبیسـتێت و ئیـدی بـەر گوێـی ناکەوێتـەوە، دیاربـوو حیکایەتێکـی کۆنـی لەسـەر مـن بیسـتووە، بـەڵام دروسـت نەیدەزانـی چییـە. ئـەوەی بـەلاوە سـەیر نەبـوو مـن دوای بیسـتویەک سـاڵ هاتـووم و دیلـی ئـەو کۆشـکەم، بەڵکـو ئـەوەی بـەلاوە سـەیر بـوو مـن ئـاگاداری هیـچ نیـم. قسـەی لەسـەر کۆمەڵێـک شـەڕدەکرد نەمبیسـتبوون، باسـی هەنـدێ شـاری دەکـرد کـە

سەردەمانێک شاری لەو جۆرەبوونیان نەبوو، منیش قسەم لەسەر هەندێ شار و گوند دەکرد ئەو ناویانی نەبیستبوو، لەو ماوەیەدا سەدان شار و گوند خاپوربووبوون... کاتێک باسی وێرانبوونی هەندێ جێگای دەکرد، هەڵدەستام و بەچەپۆک دەمکێشا بەسەری خۆمدا، باسی کاولبوون و مردنی لەناکاوی سەرتاپا نیشتەجێکانی شوێنێکی تری دەکرد، وەک شێت دەکەوتمە لێدان لەخۆم، تێنەدەگەیشت بۆ من بەوێرانبوونی ئەو شارانە، بەکاولبوون و مردنی دەستەجەمعی خەڵکانێک کەنایانناسم وا سەرسامم. نا... دۆستان نا... وامەزانن ئیکرامی کێو کورێکی دڵرەق یان بێرەحم بوو، ئەو پیاوێکی بێئەندازە دڵگەرم و دۆستدڵ بوو، گەنجێکی بەرەحم بوو، من سوێندتان بەم ئاوە بۆ دەخۆم عەیبێک لەئینسانییەتی ئەودا نەبوو، بەڵام لەسەردەمێکدا گەورەبووبوو مرۆڤ سەرسامی خۆی بە کارەساتەکان لەدەستدابوو... ئەو بەدرێژایی شەو چیرۆکی کاولبوون و مردن و جەنگەکانی بۆ دەگێڕامەوە و من وەک با ڕامژێنێت لەئازاردا خۆم ڕادەژەن، وەک کەشتییەکی کۆن بمدات بەو بەرەو بەری دوو کەناردا، لەنێوان مردن و زیندووبوونەوەدا ئەوبەرەوبەرم دەکرد. ئەو قسەی لە دونیایەک دەکرد چ شتێکی لەو جیهانە نەدەچوو کەمن جێمهێشتبوو، من لەناگای خۆمدا وەک بەهەشتێک تەماشای ئەو دونیایەم کردبوو، ساڵ دوای ساڵ لمم کردبوو بەسەر ڕەنگەکانیدا تا لەیادم بچێتەوە و جوانییەکانی ئازارم نەدەدەن، بەڵام ئەوەی ئەو باسیدەکرد جەهەنەم بوو. شەو تا بەیان ئەو چیرۆکی خاپووربوون و وێرانی دەگێڕایەوە لەخەرابێکەوە بۆ خەرابێکی تر، لەمردنی لەناکاوی دەیان هەزار مرۆڤەوە بۆ مردنی دەیان هەزاران مرۆڤی تر... تا خۆر هەڵدەهات ئەو قسەیدەکرد، یەک لەسەر یەک چیرۆکی هەرەسی شارەکانی دەگێڕایەوە، چیرۆکی کۆلێرا و تاعوون، چیرۆکی لە ناکاو تەفروتونابوونی هەزاران خێڵ و عەشرەت و تایەفەی سەیر سەیر، قڕانی باڵندە، بەسەرچوونی سەدان چەشنی گوڵ،

کەوتن و کوژانەوەی هەزاران ئەستێرە، لەدایکبوونی شارگەلێکی دیکە لە خۆڵەمێشی شارەکانی تر. بەیانی دەهات و من بێئاگا خۆم ڕادەژەن، ئەو بەردەوام بەو دەنگەسارد و قووڵ و هێمنەی قسەیدەکرد، نەهەستی بەترس دەکرد، نە بەبێباکی، یەکێک بوو هەموو کارەساتەکانی بینیبوو، ئەو سیما پاک و منداڵانەیەی لەگەڵ ئەو چاوانەیدا نەدەگونجان کە هەستمدەکرد پڕن لە دوکەڵ. بەڵام هێندەی تیشکی بەیان دەرکەوت، وەک تارماییەک لەڕووناکی بترسێت، شتەکانی هەڵگرت و بەپەلە ڕۆیشت. من پێمگووت «بەجێممەهێڵە، لەگەڵ خۆتدا بمبە... ڕزگارمکە، تۆ ناڵێیت من ڕۆحلەبەرکان ڕزگاردەکەم... ڕزگارمکە... من ئێشم زۆرە... دەبێت زۆر شت بزانم». ئەو لەسەرم نەوەستا، لەبەردەرگاکەوە بەپەشۆکانێکەوە، لەپەشۆکانی باڵندەیەکی گەورە دەچوو لەترسی گوللەیەک هەڵفڕیبێت گووتی «موزەفەری سوبحدەم، نابێت کەس بزانێت من لێرەبووم... لەوانەیە مردنی لەدوا بێت... من دەگەڕێمەوە بۆ لات... ئێستا گەلێک درەنگە... دەبێت بڕۆم...». وای گووت و لەودیو دەرگاکەوە ونبوو.

سەرەتا وەک تارماییەک دەهاتەبەرچاوم، من لەو ساڵە دوور و درێژانەی ناو لمدا گەلەک سەربوردی دیکەی وەهام دیبوو، شەوانێک هەستابووم و مەخلوقاتێکم بینی بوو لەسەر سەرم وەستابوون و قسەیان بۆ کردبووم، هەستابووم و مرۆڤم بینی بوو لەڕەنگی ئاو، لەڕەنگی گێژەنئاسای با، لەڕەنگی بللوری ڕەش، لەشێوەی کەفی سپی، هاتبوون و قسەیان بۆکردبووم، باسی با و مانگ و قیامەت و خۆڵ و بارانیان بۆ کردبووم... کە دەڕۆی بۆ ساتێک من هەر حیسابی ئەو تارمایيانەم بۆکرد، وامدەزانی هەموو ئەو شەوە جگە لەوڕێنەیەک و ترسێک و خەیاڵێکی ڕەش زیاتر هیچی تر نییە. بەڵام چەند سەیر بوو بۆ شەوی دووهەم لەگەڵ هەڵهاتنی تاریکیدا گەڕایەوە، هەمان ئەو جلانەی لەبەردا بوو، هەمان ئەو تفەنگەی پێبوو، هەمان ئەو کاسکێتە سەوزەی لەسەردا بوو. لەبەردەرگاوە

پێیگووتم «ئازادیت بۆ چییە، چ کارت بەئازادی هەیە... ئێمە ئازادی چی بۆ هێنایـن، بەتەمای چیت لەئازادی؟». پێدەچوو بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بیری لەمن کردبێتەوە. من پێمگووت «دەمەوێت بەدوای سەریاسی سوبحەدمدا بگەڕێم... تکایە تۆ هەموو شتێک دەزانی... تۆ هەموو دونیا گەڕاویت، لەهەموو جێیەکی ئەم مەملەکەتە بوویت، پێمبڵێ ناوی سەریاسی سوبحەدمت نەبیستووە؟ تۆ ناڵێیت هەریەکێ لەئێمە هەقی ئەوەی هەیە کەسێکی زیندووی هەبێت؟ تۆ خۆت عەوداڵی دۆستێک نیت کە بەدویدا هاتوویتە ئەم دارستانەوە؟ سەریاسی سوبحەدم کوڕم بوو». کە باسی سەریاسی سوبحەدمم لەگەڵدا کرد ڕەنگی گۆڕا، بەتێفکرینەوە پرسی «سەریاسی سوبحەدم کوڕی تۆ بوو؟ بەڕاست کوڕی تۆ بوو؟». من گووتم «من ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ دونیا، گەر حەزبکەم تێکەڵ بەو ژیانەی ئێوە ببمەوە بۆ سەریاسە... سەریاسی سوبحەدم کوڕی من بوو... تۆ دەیناسیت... وانییە، دەیناسیت؟». بەغەمێکی قووڵەوە گووتی «نا نایناسم... من سەریاسم نەناسیوە و هەرگیزیش نەمبینیوە... بەڵام دەزانم مردووە... سەریاسی سوبحەدم مودەتێک لەمەوبەر کوژرا... من تەواوی حکایەتەکەی نازانم، بەڵام خەڵکانێک دەناسم هەموو چیرۆکەکەی دەزانن...». ئەوە یەکەمین سەرەداوی من بوو، وەک پیاوێکی زەلیل گووتم «ئیکرامی کێو، بمبەرەدەری... من دەمەوێت بچمە سەر گۆڕەکەی... من دەبێت لێرە بڕۆمەدەرێ، یارمەتیمبدە». گەنجێکی سەیربوو گووتی «بەڵام دەتەوێت بچیت بۆ کوێ؟... سا تۆ هیچ کەسێک لەم دونیایەدا ناناسیت، شوێنێک نییە ڕووی تێبکەیت،ماڵێکت نییە بۆی بگەڕێیتەوە، هاوڕێیەکت نییە بتگرێتەخۆی، ناوت لەجێگایەکی دونیادا نییە، تۆ بەمردوو حیسابیت، دواتر یاقوبی سنەوبەر لەهەر جێگایەک بتگرێت ژیانت دەکاتە جەهەنەم... منیش جێگایەکم نییە بتبەم». وەک دەروێشێکی تووڕە بەنائارامی هاوارمکرد «بەڵام زەویم هەیە، شەوم هەیە، ڕۆژ و سێبەر

و لمم هەیە، دونیا بەهەموو گەورەیی خۆی لەبەردەممدایە، هەزاران کێڵگە هەیەنانم دەدەنێ، هەزاران درەخت هەیە دەمشارنەوە، هەزاران ڕەشەبا هەیە ونمدەکەن، من ڕەفیقی گەردونم، ڕەفیقی ئەو ئاسمانە گەورەیەم، ڕەفیقی تریفەم، ڕەفیقی ڕەشەبام». بەهێمنییەوە گوتی «تۆ نازانیت، دەتدۆزێتەوە... لەهەموو شوێنێکدا کەسی خۆی هەیە... بێفایدەیە». من پڕ بە شەو هاوارمکرد «ڕاستە من دۆستم نییە، هاوڕێم نییە، هیچ جێگایەکم نییە ڕووی تێبکەم، بەڵام درەختێک دەبێت بمگرێتە خۆی، ئاوێک دەبێت بمگرێتە خۆی، ئەشکەوتێک دەبێت هەڵمگرێت و دەرم نەکات، من تەنیا لەسەر دەفتەرەکان مردووم، تەنیا لەبەردەم ئەو قانونانەدا مردووم کە حوکمی دونیا دەکەن، من لەبەردەم خەزێنەی سروشتدا نەمردووم، لەحیسابی ئاو و باڵندە و درەخت و هەورەکاندا نەمردووم، لەم گەردونەدا بەشێکم هەیە... لەو گەنمەدا کە ئێستا دەڕوێت شتێکم دەکەوێت، لەو ئاوەدا کە بەشی کرم و مێشووله و گورگەکانی تیایە بەشم هەیە، لەو هەنارەدا کەئێستا دەڕسکێت، لەمیوە دوورەکاندا بەشم هەیە... من بەو ئەندازەیە ڕووتنیم... شتێک هەیە دامدەپۆشێت و دەمشارێتەوە، شتێک هەیە نانی خۆیم لەگەڵدا بەشدەکات...». ئیکرامی کێو بەهێمنی گوێیدەگرت و دەیگووت «دەسا بزانە ئەو ڕۆژەی تۆ لێرە دەچیتە دەرەوەشتەکان دەگۆڕێن، تۆ دەچیتە ناو شەڕێکی گەورەوە، بۆ ئەوەی بچیتە شەڕەوە دەبێت پێشتر پەناگایەکت ئامادەکردبێت... گوێبگرە موزەفەری سوبحەدەم، من سا دەمەوێت یارمەتیتبدەم، بەڵام تۆ سەقفێکت دەوێت، چوار دیوارت دەوێت، ژوورێکت دەوێت. تەبیعەت هەموو شتێکی تر دەدات بەئینسان، سروشت، با، شەو ، باغ هەموو شتێکت دەدەنێ، ژوور نەبێت... تۆ کەلێرە دەچیتەدەرێ پێویستت بەژوورێکە... سا ئینسان بێ ژوور لەسەگێکی پیس بەدترە، سروشت هەموو شتێکمان دەداتێ تا دواجار خۆمان بتوانین ژوورێکی پێدروستبکەین... هەمووی

ئـەوەی سروشـت بەئینسـانی دەبەخشـێت دواجـار بـۆ ئەوەیـە خـۆی بتوانـێ ژوورێـک دروسـتبکات...». مـن گووتـم « کـێ دەڵێت من پێویسـتیم بەژووره... مـن بیسـتویەک سـاڵە لـە ژوورێکـدام... مـن دەمەوێـت هەتـا هەتایـە لـە ژێـر بـاران و تریفـەدا بژیـم، هەتـا هەتایـە... جگـە لـە گـەردون هیچـی تـر نەدوێنـم». کەمێـک وەسـتاو دڵۆپەیـەک عارەقـی ماندووبـوون بەتەوێڵییـەوە بـوو، لـە ئەسـپێکی گـەورە و ئـارام دەچـوو لـە ئێوارەیەکی گـەرمـدا، بەجۆرێک شـانی کورکردبـوو و لەبـەر پەنجەرەکـەوە تەماشـای تاریکیـی دەکـرد، وەک ئـەوەی ماڵاوایـی لەشـتێک بـکات، ئـەو هەسـتی بەگەرمـا و خنـکان دەکـرد و مـن هەستم بەسـەرما دەکرد، کەئاوڕیدایـەوە تێگەیشتم قـووڵ بیردەکاتـەوە، هەرکاتێکیـش بیریبکردایەتـەوە چـاوی دەنووقانـدو عارەقـی دەردەدا، گووتـی «ئەمشـەو کاتـی تەفسـیرکردنی ئازادیـی نییـە... هێشـتا زووە تەفسـیری ئـازادی خـۆت بکەیـت، ئینسـان هەمیشـە لـە تەفسـیری ئازادییەکانـی خۆیـدا پەلـەدەکات». لـەو شـەوەوە مـن کەوتمـەوە نـاو ئـەو گوناهانـەی یاقوبـی سـنەوبەر نەیدەویسـت مـن تێیبگـەوم. ئـەو پاکبـوو، ئـەو هەمـوو سـاڵە لـە جەنـگ پاکێتییەکـی بێئەنـدازە درەوشـەداری لەدڵیـدا نەسـڕیبووەوە، ئـەو ڕوخسـارە دێـو ئاسـاو گەورەیـەی، ئـەو هێمنییـە سـەیرەی کـە لـە نـاکاو دەپەشـۆکا، هەمیشـە لـە پێشـچاومە، لـە هـەر کوێیـەک بووبێتـم، شـەو بـەر لـەوەی بنـووم یادمکردۆتـەوە، تادەمـرم لـە هـەر کوێـم، شـەوان بـەر لـەوەی بنـووم یادیدەکـەم، بەیانیـان بەرلـەوەی لەجێگاکەمـدا هەسـتم یادیدەکـەم، هـەر کۆترێـک و کوکوختییـەک ببینـم یادیدەکـەم، هـەر ئاوێکـی سـاف ببینـم دەڵێـم لـەو دەچێـت... ئـەو لـە یەکێـک دەچـوو خـودا لەگـەڵ دروسـتکردنی ڕۆحیـدا ماندووبووبێـت. دواجـار بەپێکەنینێکـی نـەرم، لـە پێکەنینـی یەکێـک دەچـوو شـەو بەکوچەیەکـدا تێپەڕێـت و لـە تاریکیـدا ونببێـت گووتـی «مـن هەقـم بەئازادییـەوە نییـە، بـەڵام گـەر بتبەمـە دەرەوەو سـا بەرگـەی شـەو و ڕەشـەباو تۆفانـت نەگـرت، هیـچ درەختێـک جێـگای

نەکردیتەوە، هیچ تریفەیەک نەیشاردیتەوە، ئەوسا چی... ئەوسا دەچیت بۆ کوێ؟». بێئەوەی بوەستم هاوارمکرد «دەچمەوە بۆ سەحرا... بۆ ناو لم... یان بۆ مەر خەڵوەتێکی هەتاهەتایی... گوێبگرە، ئیکرامی کێو، من گەشتێکم هەیە و دەبێت بیکەم... وەزیفەیەکم هەیە و دەبێت جێبەجێیبکەم... شتەکان وەهان، حیکمەتێک هەیە لەوەدا من بیستویەک ساڵە نەمردووم... حیکمەتێک هەیە من لێرەم... حیکمەتێک هەیە من و تۆ لەم شوێنەدا بەیەکدەگەین... ئەمە قەدەر نییە، شتێکی لەقەدەر سەیرترە، شتێکی ئەندازەییتر و نەخشێنراوترە... گەر تۆش نەبیت شەوێکی تر لە ساڵیکی تردا، ڕێبوارێک لێرەوە دەڕوات، ڕاوچییەکی وێڵ لێرەوە تێدەپەڕێت و من بانگیدەکەم و دەڵێم ئەی دۆست، ئەی برا لەگەڵ خۆتدا بمبە... بەهێمنی گووتی «تا سا دوای ئەو خەیاڵاتە مەکەوە، تەنیا من و ئەو دەزانین بێینە ئێرە، ئەوەی دێتە ئێرە لەناو درەختەکاندا وندەبێت... شتێک نییە ناوی قەدەر بێت، ئەم ماڵە پەناگای نهێنی ئەوە، پەناگای هەرەنهێنی و سەیری ئەوە. ماوەیەک من تەنیا کەسێک بووم جێی بڕوای بم، ڕۆژگارێکی زۆر کورت، سا هیچ کەس تا سەر شوێن بڕوای ئەو نییە... ئەو ماوەیە وەک گێلێکی گەورە سەیریدەکردم... گێلێک کە دەکرێت لەسەر ئالیکی ئەسپەکانی، لەسەر هەرزنی بولبول و کاهووی کەروێشکەکانی سزاییدەیت، چەند ساڵ لەمەوبەر تازە شۆڕش سەرکەوتبوو، من زۆر نەبوو پاسەوانی بووم، لەو باوەڕەدا نەبووم کەس بیەوێت بیکوژێت، ئەو لەگەڵ هەموو دەوڵەتەکانی دونیادا ڕێکبوو، هەموویان وابوون، هەموویان لەگەڵ هەموو دەوڵەتەکانی دونیادا ڕێکبوون. شەوێک لەسەر مردنی یەکێک لە کەروێشکەکانی هێندە سزایدام، تا گریام، پێشتر نەگریابووم، سا لە هیچ یەکێک لە شوێنە سەختەکانی جەنگ و لە ژەهرباران و لە شەڕە دەستەویەخەکاندا هێند ئازار بەئینسانییەتم نەگەیشتبوو... من ڕقم لێیەتی، ئەو و هاوڕێکانی

هەموو شتێکیان برد بۆ خۆیان... هەموو شتێک، یەک نهێنی هەیە بۆ ئێمەماوەتەوە، یەک شت هەیەئەوان دەستیان ناگاتێت، ناوەوەی دڵمانە... ناوی ناوەوە... وامەزانە سروشت بتوانێت بتشارێتەوە، ئەو لە سروشت بەهێزترە... فەرمانڕەواکان، حیزبەکان لەسروشت بەهێزترن».

ئەوکات نەمدەزانی باسی چیدەکات، پێموابوو مەراقێکی ڕەش وادەکات بەو شێوە غەمگین و نائومێدە قسەبکات، مەراقێک لەگەڵ ئەو دەموچاوە گەش و نیگا تیژو بەرینانەیدا نەدەگونجا، کە ڕوخساری کەسێکیان پێبەخشیبوو لە دوای فڕینێکی درێژ لەناو باغێکدا نیشتبێتەوە. مەراقەکەی مەراقێک نەبوو تێکەڵ بوغز بووبێت، بەڵکو مەراقێکی تەنک و ڕوون بوو وەک مەراقی ماسییەک. ئەو شەوە سەرەتای لەدایکبوونێکی دیکەی هەردووکمان بوو، ئەوخۆی دەیگووت «شەڕێک لەم مەملەکەتەدا نەماوە، مرۆڤ بەویژدانی ئاسوودەوە بچێتەناوی...». دواتر هەستمکرد ئەو لەکۆمەکی مندا دەگەڕایەوە بۆ خەیاڵەدێرینەکانی دەربارەی دونیایەک بتوانێت جەنگی جوانی تیابێت. پیاوێکی زۆر زانا نەبوو، کوڕی شارۆچکەیەکی خاپوورکراوبوو، ماوەیەک لەچاپخانەیەکی نهێنی لەچیا کاریکردبوو، لەویادا ئەو گەنجانەی ناسیبوو کەدواتر بەشێوەی جۆراوجۆر یان مردبوون یان ونبووبوون یان ڕوخساری خۆیان ونکردبوو، بەڵام فریشتەیەک لەناویدا سەلیقەیەکی تیژ و زمانێکی سیحراوی پێبەخشیبوو. ڕۆژێک بڕیاریدابوو بچێتەشەڕی وردەوە. کەسێکی بچوک بوو، بیرکردنەوەی زۆر خستبوویە سەر ئەو حەقیقەتەی هیچ سوپا و لەشکرێک بەو دروستناکرێت، لەبەرئەوە لێرەو لەوێ بۆ جەنگی بچوک دەگەڕا، دۆستایەتی نزیکی لەگەڵ هەندێ لەسەرۆکەکاندا ڕێگای کۆمەکی هەندێ ڕۆحی ئەشکەنجەکێشیان بۆ مەیسەرکردبوو... وەک هەر گەڕۆکێکی نائاسوودە لەدوای ئەوانە دەگەڕا کە ئینسان دەتوانێت بەشتێکی بچوک دڵنەواییان بداتەوە، وەک چۆن سارد و بێدەروەست چیرۆکی خاپوور و وێرانییەکانی بۆ گێڕامەوە هەمان شێوەسارد و بێهیچ شانازییەک چیرۆکی

ئەو کەسانەی بۆ گێڕامەوە کە لەتۆفان و برسێتی و زیندان و پەلامار ڕزگاریکردوون. کە قسەیدەکرد چاوەکانی مات، بەڵام پڕبوون لەبولێڵی نهێنییەک قووڵتر لە ئیدراکی تایبەتی خۆی.

ئەو شەوە ئیکرامی کێو ڕێگای نەدام لەو ماڵە بێمەدەرەوە، لای ئەو چ شتێک لەوە ترسناکتر نەبوو مرۆڤ ماڵی نەبێت، ئەوە شتێک بوو لەگەڵ مندا تەواو ناکۆک کە جگە لە ڕۆیشتن و پێدەشت و ژێر باران و بەر بروسکە حەزم بەشتێکی تر نەدەکرد، نا وامەزانن من ترسم نەبوو، من لە هەموو شتێک دەترسام... ئەو شەوە کە بەئیکرامی کێوم دەگووت، حەزدەکەم ڕووت لەناو باغێکدا بژیم کە هەرگیز باران تیا خۆشنەکاتەوە، لە ناخەوە دەلەرزیم ، بەڵام من کەسێک بووم بەرگەی ترسم دەگرت... ئازایەتی ئەوەنییە نەترسین، بەڵکو ئەوەیە بەرگەی ترسەکانمان بگرین.

بەر لەبەربەیان ئیکرامی کێو تفەنگەکەی هەڵگرت بڕوات، پێیگووتم «تا جێگایەکت بۆ نەدۆزمەوە تیا پشووبدەیت، ناگەڕێمەوە...»... ئەو شەوە ڕۆیشت و دەبایە من ئیدی چاوەڕێبکەم... چاوەڕوانییەک سەرەتای زیندانی هێنایەوە یادم، ئەو ساڵانەی دیلێکی بێئەزموون بووم و هەفتە و مانگەکانم بەخەیاڵی ئازادی دەژمارد... زۆری ویست تا فێربووم چاوەڕوانەکەم... ئاە چ هونەرێک لەوە سەختتر نییە خۆت فێربکەیت، چاوەڕوان نەبیت... خودایە... خودایە... ئینسان چ مەخلوقێکی پڕ لەچاوەڕوانییە... چ مەخلوقێکە لاوازە لەبەردەم فیتنەی ئەو مزگێنییەدا کەهەرگیز نایەت و دەبێت تاقیامەت چاوەڕوانیبکات... من ئەمشەو بەئێوەدەڵێم ئینسان مەخلوقێکە بێچاوەڕوانی هیچ نییە. بێچاوەڕوانی دەڕوخێت، بێچاوەڕوانی هەتاهەتایە کۆتایی هاتووە.

# ٨

با بگەڕێینەوە بۆ لای خوشکە سپییەکان... ئەو خوشکانەی ئەگەرچی بێئەندازە جوان بوون، بەڵام کەسانێک خۆشیان نەدەویستن. هۆیەکانی ئەو کینەیە گەلەک زۆربوون، خوشکانی سپی دوو کەسی ئاسایی نەبوون، ئەو چیرۆکە سەیرانەی لە سەریان بڵاوبووەوە، لە چیرۆکی هیچ ئافرەتێکی تر نەدەچوو. هەموو ئەو شتانەی لە دوای مردنی محەمەدی دڵشوشە روویاندا بە جۆرێک لە جۆرەکان وێنەیەکی سەیری لەسەر دروستکردن، ئەو گۆرانییەی جارێک لەسەر گۆڕەکەی محەمەدی دڵشوشە گووتیان، ڕۆژانی دواتر بەدەنگی بەرزتر دووبارەیانکردەوە، بەڵام هەر ئەوەنەبوو لەسەر گۆڕی ئەو کوڕە گۆرانی بڵێن، بەڵکو لە هەندێ جێگای دیکە و هەندێ کاتی دیکەدا گۆرانیان گووت کە نەدەبایە گۆرانی تیا بڵێن.

ئەو چیرۆکە سەیرانەی لەسەر خوشکە سپییەکان بڵاوبووەوە پەیوەندییەکی گەورەیان بەم چیرۆکەی منەوە هەیە. ئەو چیرۆکانەبوون ژیانێکی تەنهایان بۆ ئەوان دروستکرد، تەنهاییەکی هێندەقووڵ و شکێنەر کارێکی کرد دواجار خولیای دروستکردنی برایەکی خەیاڵی بکەوێتە سەریانەوە. هەمووتان بومەلەرزەکانتان لەیادە، ئەو دوو هەفتەی ترس و بێخەوی و مردنەتان یادە کە شەوی چەند جارێک زەوی وەک مردوویەکی تووڕە لە ناوەوە ڕایوەشێنێت دەلەرییەوە، ئەو شەوانی گومان و بێڕەحمیەتان لەیادە کە سەدان هەزار مرۆڤ، لە

سەر شەقام و شۆستەکان جێگای خەوتنیان ڕادەخست و سەیری ئەستێرە و مانگ و گەواڵە هەوری بێڕۆحیان دەکرد کە وەک بای دۆزەخ بیانبات غەریب و خەستە بەئاسماندا ڕووە و نادیار دەچوون. ئەو بومەلەرزانەی چاوشارکێیان لەگەڵ ژیاندا دەکرد، وندەبوون، دونیایان ئارامدەکردەوە، شەویان خامۆشدەکرد، سوکناییان بەدڵەکان دەدا، ئاسوودەگییەکی نهێنیان دەبەخشی تا کەم کەم خەڵکیان ناچاردەکرد، باوەڕ بە دیوارەکانیان بهێننەوە، خەڵکیان ناچاردەکرد لەزەوی و ئاسمان و درزە نادیارەکانی ناو مەلەکوت نەترسن و بگەڕێنەوە ژێر سەقفەکانی خۆیان، بەڵام هێندەی بەدڵنیایی و ئاسوودەوە دەچوونە ژووری، وەک مارێکی مەکرباز گەمەیەکی شەیتانی بکات، دووبارە دەکەوتنەوە ڕاژەنینی دونیا. من لەوێ نەبووم دروست نازانم پشووی نێوان بومەلەرزەکان چەند درێژبووە، بەڵام ئەوانەی لەشادەریا و لاولاوی سپییدا بۆ سیفەتی شەیتانیانە دەگەڕان، ئەوەیان بەلاوە سەیربوو کە هەمیشە بەر لە ڕوودانی بومەلەرزەکان بەچەند دەقیقەیەک خوشکە سپییەکان لەماڵ دەهاتنەدەرێ... وەک ئەوەی ئەوان کاتی بومەلەرزەکان بزانن، وەک ئەوەی سەعاتێکی سیحراوی لەناویاندا بێت، یان ئەهریمەنێک بە چرپە کاتی بومەلەرزەکانیان لا بەیانبکات. لە دوای چلهەمین لەرینەوەی بێئامانی دونیا، چیرۆکی ئەو کیژە سیحربازانەی خەبەرداری نهێنی زەمینلەرزەکانن لە هەموو دونیادا بڵاوبووبووەوە... لەو شەوانەدا چیرۆکێک لەدایکبوو، کوچە بە کوچە ڕۆیشت، بازاڕ بە بازاڕ دونیا گەڕا، چیرۆکی دوو خوشک کە پەیوەندییان بەخێو و شەیتانەکانەوە هەیە. دوو خوشک دەنگیان توانای سڕکردنی باڵندە و پەپولە و مرۆڤەکانی هەیە، دڵ هەلاهەلادەکەن، لە گۆڕستانەکاندا دەگەڕێن و گۆرانی دەڵێن. ئەو چیرۆکە کردنی بەدوو کەسی تەنیا... ڕۆژێک ئاوڕیاندایەوە و سەیریانکرد ئەوان لەو سەر

زەمینـەدا هاوڕێیەکیـان نییـە، وەک دوو چۆلەکـە خۆیـان لـە تەمتومانێکی بێئەنـدازە بەرینـدا بدۆزنـەوە، بفـڕن و لەباغـی پـڕ لـە نەمامـی دوژمنـدا بنیشنەوە، سـەیربکەن و ببینـن سـوبح و ئەسـتێرە دوژمنیانـە، ئاوەهـا تەنهابـوون و لـە نهێنـی تەنهایشـییان ناحاڵیبـوون.

لاولاو و شادەریای سپی دوو مەلی بێدۆسـت بـوون. ئەوەشـی وایدەکرد چیرۆکەکانیـان هەمیشـە تازەبێـت، ئـەو دەرکەوتنـە بەردەوامەیـان بـوو. ئـەوان لـەو کیژانـە نەبـوون لەماڵـەوە سـرەوت بگـرن. تـا تەنهاییـان قووڵتربایـە، تـا بێکەسـتر بوونایـە زیاتـر دەهاتنـەدەرێ. وەک ئـەوەی لـە گەڕانـە بێوچانەکانیانـدا، لـە کوچەتاریکەکانـدا، لـە شـەقامە خامۆشـەکاندا بۆ شـتێک بگەڕێن، تـاوای لێهـات لـە هەمـو سـات و کاتـە سـەیر و بێمانـا و ناوەختەکانـدا دەبینـران، بەشـەو لەسـەر گـۆڕەکان و بەیانیـان زوو لەسـەر شـەقامە سـارد و خاڵـی و بێڕۆحەکانـدا دەردەکەوتـن... وەک دوو ڕۆحـی کـپ و بێدەنـگ، دوو ڕۆحـی تـا هەتاهەتایـە پێکەوەگرێـدراو.

لەگەرمـەی ئـەو دەردی تەنهاییـەدا سەریاسـی سـوبحدەم جارێکـی دی دەرکەوتـەوە. نـا تکایـە، خەیاڵتـان بـۆ هیـچ نـەڕوات... حەزدەکـەم لەسـەرەتاوە خاترجەمبـن کـە هیـچ ڕۆژێـک سەریاسـی سوبحدەم و ئـەو کچانـە عاشـقی یـەک نەبـوون، خاترجەمبـن ئـەم چیرۆکـەی من دەیگێڕمـەوە خاڵییـە لـە عەشـق. نـا وامەزانـن مـن پیاوێـک لەبیابانـەوە هاتـووم و لـم پیریکردووم و وەک ئەو کەسانەی لە قاتی سـەرەوەی سینەماکان بەخەیاڵی ڕاحەتـی خۆیـان فلیمـەکان سانسۆردەکەن، ماچـەکان دەردەهێنـن و وێنـەی پـڕ سـیحر و حیکمەتـی جەسـتەجوانەکان دەبـڕن، منیـش ئاوەهـام... نـا... دۆسـتانی مـن، ئـەی ئەوانـەی نازانیـن سبەی لەسـەر چ زەمینێـک دەگیرسـێینەوە... دڵنیابـن ئـەم چیرۆکـەی مـن چیرۆکـی عەشـق نییـە. کـە جارێکـی دی سەریاسـی سـوبحدەم دەرکەوتـەوە، هـەردوو خوشـکەکە دڵنیابوون، کـە گەنجێـک بـە ڕوخسـارێکی وا تـۆزاوی و ڕەشـەوە مەترسـی

عەشقی لێناکرێت. تا مەڵێن موزەفەری سوبحەدەم بیستویەک ساڵ لە ناو لمدا بووە، ناحاڵی و بەدبەخت و نابینابووە، لە دونیای ئێمەدا، لە دونیای پیاوانی بچوک و برینداری وەک من و ئێوەدا، مرۆڤ گەر بەکەڵکی عەشق بێت یان نەیەت هەر زوو خۆی دەناسێت، سەریاسی سوبحەدەمیش لە جنسی ئەو پیاوانەبوو کە خەیاڵیان بەلای عەشقدا ناچێت.

ئەو ئێوارەیەی سەریاسی سوبحەدەم چووە سەر گۆڕی «محەمەدی دڵشوشە» یەکێک بوو لە ئێوارە ئاساییەکانی ئەو. ئەو ژیانی خۆی بەپێی ئەندازەیەکی سەیر دابەشکردبوو، ئەو ماڵی لە ناو شاردا نەبوو، ژوورێکی گرتبوو لە یەکێک لە ئۆردوگاکانی دەرەوەی شاردا، لەکن پیرێژن و پیرەمێردێکی نەخۆش، ژوورەکەشی بەدیوارێکی تەختەکردبووە دوو ژوور، یەکەمیان ژوورێکی ئاسایی بوو، ڕووتەن و خاڵی لە هەموو شتێک فەرشێک و دۆشەکێک و عەلادینێک و دۆلابێکی حاجەت نەبێت، ژوورەکەی دیکەشی، سەیرترین شوێنێک بوو من لە ژیانمدا دیبێتم، هەڵبەت من چەندین ساڵ دوای مردنی چوومە ئەو ژوورەوە... شتەکان هەندێکی لە شوێنی خۆیان نەمابوون، هەندێک دزی فەقیرحاڵ بەشێ لە کەلوپەلەکانیان بردبوو، ئەوەی بەهایەکی هەبوو ئەو پیرێژن و پیرەمێردە مەزاتیانکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک چوومە ئەو ژوورە هەستی ئەوەم هەبوو بۆنی غەریبی ئەوی لێدێت، بۆنی ژیانی کوڕێک لە تەمەنی گەنجیدا کوژرابوو، یەکێک جیهان لە تەمەنی گوڵدا جێهێشتبوو. ئەوەی نیشانەیەکی دەربارەی خۆی و کاراکتەر و شێوازی ڕەفتاری دەدامێ ئەو وێنە سەیرانەبوو کە بەدیواری ئەو ژوورەدا هەڵیواسیبوون، من غەم لەوە دەخۆم گەنجێک بوو، بێئەندازە سەیر و قووڵ لە خەیاڵێکی نێرانەوە گلابوو، وێنەی سەر دیوارەکان، زۆربەیان دیمەنی ئەو پیاوانەبوون بەسەر ئەسپ

یـان ماتۆڕەوەبـوون یـان لەڕاکێتـی درێـژەوە سـەیری دەرەوەیـان دەکـرد، سـەدان وێنـەی یاریزانەکانـی کاراتـێ و ئەکتـەرە هینـدی و پاڵەوانـە ماسولکەدارەکانی لەشسـازی. سـندوقێکی کاسـێتی هەبـوو جگـە لـە چەنـد دانـە کاسـێتێکی شـکاو هیچـی دیکـەی تیانەمابـوو.

ئـا... بوەسـتن و داوام لێمەکـەن چیتـر بێباکانـە لـەم حکایەتـەدا بڕۆمـە پێشـێ، شـەوە و هەمووومـان لەدەریایەکـی گەورەدایـن... خودایـە هەستدەکەم زۆر تەماشـاکردنی دەریـا لەشـەودا خەیاڵـی ئینسـان نەخۆشـدەخات... مـن لەکویادابـووم... باسـی چیـم دەکـرد، ئـا... قەراربوو باسـی ئـەو دوو دونیایـە بکـەم کـە سەریاسـی سـوبحدەم تیادەژیا، ئـەو دوو دونیا جیاوازە، ئـەو لـەو ژوورە خەیاڵییـەدا کـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان پڕبـووە لەشـتی سـەیر سـەیر، وەک کیلـۆی کێشـانە، تـەرازووی شـکاو، هەنـدێ دەسـتکێشـی کـۆن، گۆڤـاری دێریـن و سـەیر سـەیر، ڕەسـمی جانـەوەری خەیاڵـی، تاقیکردنەوەیەکـی بێئەنـدازە سـەبورانەی نوسـینی نـاوی خـۆی بەخەتـی جیاواز، ئـا... گـەر مـن ئـەوەم نەدیبایـە لەوانەبـوو گومانێکـم لادروسـت بێـت، بـەڵام کارتۆنێکـی بێئەنـدازە مـەزن لەسـەر دیوارەکـە بـوو، شـێی یـەک بـەدوای یەکـی زسـتانە ساردەکان حەرفەکانیـان کاڵکردبـووەوە، بـەڵام بەکاڵـی دەتبینـی دەسـتێکی سـەبرناس، سـەدانجار لەسـەر ئـەو کارتۆنـەی نوسـیوە «سەریاسـی سـوبحدەم... سەریاسـی سـوبحدەم... سەریاسـی سـوبحدەم». وەک یەکێـک بترسـێت لـەوەی نـاوی خـۆی یادبچێتـەوە، یـان بیەوێـت بەجۆرێـک لـە بـەردەم خۆیـدا ڕایگرێـت حورمـەت و کەرامەتێکـی بـۆ دروسـتبکات. لـەو شـوێنەدا خـەوی بەهێـز و مانـاو جوانییـەوە بینیبـوو. لـەو ژوورەوە دەسـتی بەوەکردبـوو ببێتـە «مرۆڤێکـی مـەزن»، هـەر لەویاشـدا لەمانـای خـۆی و نهێنـی ناوەکـەی ڕامابـوو.

سـەریاس و خوشکەسـپییەکان لەپاسـێکی شـکاودا کـە دەچـوو بـۆ

گەڕەکێکی باکوری شار یەکتریان بینییەوە. خوشکەکان ئەمجارە لە ناو بۆ گاز و عارەق و میوەی ژنانی عەبابەسەردا بەهێمنی سڵاویان لێکرد، ئەوکات قژی بەمۆدی ئەو ڕۆژانەبڕیبوو، بەڵام بەجۆرێک لاواز و بێجورم و سووتاوبوو سەرەنجی کەسی ڕانەدەکێشا. وەک هەمیشە بەدەنگی بەرز قسەیدەکرد، بەدەنگی بەرز پێدەکەنی، کراسێکی شەکەریی یەخە سپی لەبەردابوو، لەگەڵ پانتۆڵێکی سپی دەڵب وکۆن. دیمەنی کەسێکی ڕووتەڵەی هەبوو، بەڵام ئەوانەی ناسیویانە دەزانن لەگەڵ ئەو فەقیرییە بێسنوورەیدا ڕۆژێک وەک هەزارێک ڕەفتاری نەکردووە. کە لە پاسەکە دابەزین بەخوشکە سپییەکانی گووت «هیچ خۆش نییە ئینسان لە پەرپووترین پاسی دونیادا بچێت بۆ گەڕەکە خۆشەکانی باکور». گەلەک حەزی لە پیاسەی گەڕەکەکانی باکور بوو، ئەو دوو خوشکە گووتیان «هەموو پاسەکان پەرپووتن». ئەو بەپێکەنینەوە گووتی «هەموو پاسەکان بێکەڵکترین پاسی دونیان...». ئەو ئێوارەیە سەریاسی سوبحەدەم و خوشکەکان ماوەیەکی کورت پێکەوە ڕۆیشتن، لەو ماوەیەدا سەریاس دەرفەتی ئەوەی هەبوو وەڵامی ئەو پرسیارە سادانە بداتەوە کە کچان لەو جۆرە بۆنانەدا دەیپرسن، وەکو ئەوەی چەند خوشکت هەیە، چەند برات هەیە، لەپۆلی چەندی، باوکت ئیشی چییە؟ سەریاس گووتی نەخوشکم هەیە نەبرا، نەدایک، نەباوک، نەمەکتەبیشم خوێندووە. دواتر کە سەریاس هەموو ئەو پرسیارانەی لێکردنەوە، ئەوان قسەیان لەمردنی باوک و بێ برایی خۆیان کرد، بەجۆرێک لەشانازیشەوە گووتیان «ئێمە لەخانەی مامۆستایانین». کەتەواوبوون سەریاس بەکەمێک شەرمەوە گووتی «من ئێوەدەناسم، ئێوە خوشکە سپییەکانن... من حەزدەکەم جارێکی تر گوێم لەدەنگتان بێتەوە». شادەریای سپی و لاولاوی سپی بەساردییەکی بێئەندازە ترسناکەوە گووتیان «نا حەزمەکە...

حەزمەکـە گوێـت لەدەنگمـان بێتـەوە، قـەت قـەت حەزمەکـە». کـە سەرپاسـی سـوبحەدم ڕۆی، هـەردوو خوشـکەکە لـەو سـاردی و ڕەقـی و کەمڕووییـەی خۆیـان پەشـیمانبوون. ئـەوان بەدەگمـەن پەشـیماندەبوونەوە، خودایـە ئێـوە نەتاندەناسـین، مـن تەنیـا کەسـێک بـووم ئـەو دڵـە سـافەی ئەوانـم ناسـی، دڵێـک بـوو وەک پەمـوو سـپی، دڵێـک وەک دڵـی پەرییـە موبارەکـەکان، کـە پەشیمانیشـدەبوونەوە مەپرسـن چ سـەیر و ترسـناک پەشـیماندەبوونەوە... دڵنیـام ئێسـتا یەکێکتـان دەڵـێ «بـۆ؟ بـۆ خوشـکە سـپییەکان پەشـیمانبوونەوە؟». پەشـیمانی ئـەو دوو خوشـکە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕەنگـی نەگبەتییـەک لـەو ئێوارەیـەوە سـێبەری لەسـەر ڕوخسـاری سەرپاسـی سـوبحەدم دیاربـوو. شـتێک لـەو گەنجەدابـوو دوای کەمێـک سـەوداو قسـەکردن هەمـوو کەسـێکی بـۆ خـۆی کێشـدەکرد، شـتێک مـن ناویدەنێـم «وزەی ژیـان». سـیحرێک دواجـار بـووە مایـەی کوشـتنیشـی. ئـەو بەخـۆی دەگـووت «فەقیرتریـن کـوڕی دونیـا». لەهەژارییەکـدا ژیابـوو وەسـف ناکرێـت، تاکەشـتێک ڕزگاریکردبـوو، ئـەو پێکەنینـەی بـوو، کـە نەشـەوی دەناسـی نـەڕۆژ، نەتریفـەی دەناسـی، نەهەتـاو، هەمیشـە و هەمیشـە ئامادەبـوو. ئـەو ڕۆژەی کـە خوشـکە سـپییەکان بەسـاردی و بێمەیلییەکـی گـەورەوە قسـەیان لەگـەڵ سەرپاسـدا کـرد، بـۆ شـەو تووشـی مەراقێکـی گەورەهاتـن. بەڵـێ... مـن لەسـەرەتاوە پێمگووتـن دڵـی مـەزن و بێسـنووری ئافـرەت وەک دوو ئەڵماسـی مـەزن لەسـینەی ئـەو دوو کچـەدا دەدرەوشـایەوە. ئـەو شـەوە وەختبـوو شـتێک ڕوویـدات، نزیـک لـە چیرۆکـی پێچەوانـەی محەمـەدی دڵشوشـەوە کـە تـا هەتاهەتایـە دەبێـت هەموومـان لـە تـۆزی مردنیـدا بژیـن... نـا عاشـق نەبـوون، بـەڵام سـێبەرێکی سـەیری ئـەو کـوڕە کەوتبـووە سـەر ویژدانیـان. شـەوێکی درەنگبـوو لەمـاڵ هاتنـەدەرێ و وەک بـەدوای سـەدای دەنگێکـی پەنهانـدا بـڕۆن، کەوتنـە دوای دەنگـی پێکەنینـی ئـەو، بـەڵام بـەوەدا بـەردەوام

سەدای قاقاکانی لە گوێیاندابوو، نەگەیشتنە هیچ جێگایەک... بەهەر شوێنێکدا دەڕۆیشتن گوێیان لە پێکەنینی سەریاسی سوبحدەم دەبوو، ڕوویاندەکردە هەر کوچەیەک ئەو پێکەنینە لەوێ بوو، بەڵام ئەویان لە هیچ شوێنێک نەبینی. دواجار بە خەیاڵێکی قورس و نائاسوودەوە گەڕانەوە ماڵ. گەر ئەو شەوەنەبووایە ئەم چیرۆکەنەدەبوو، گەر ئەو دڵتەنگی و نائارامییە نەبووایە من هیچم نەبوو ئەمشەو بیگێڕمەوە، یان لەوانەبوو شتێکی دی بگێڕمەوە خاڵی لەخوشکەسپییەکان، خاڵی لەشەوەسارد و چاوەسارد و دڵەناسک و پڕ میهرەکەیان.

کە شادەریای سپی و لاولاوی سپی نائاسوودەدەبوون، خرۆشێکی سەیریان لێدەئاڵا، کە دواتریش من ناسیمن، هەمان خرۆش و هەڵچوون و بێئارامییان تیابوو، هەر کاتێک شتێک دەیجوڵاندن شپرزەدەبوون، کوڵمەکانیان سوورهەڵدەگەڕا، پەنجەی خۆیان دەخوارد، بەچاو سەیری یەکتریان دەکرد، قژیان دەکردە پرچ و بەریاندەدایەوە... ئەوکاتانە چاویان کراوەتر و گەورەتر دەبوو، کەچی هەر سارد و بێڕەحمانە دەینواند. ڕۆژانی دواتر شادەریای سپی و لاولاو بۆ هەر کوێیەک چووبێتن، بەدوای سەریاسی سوبحدەمدا گەڕاون، لە خانەی مامۆستایان کە وانەیان دەخوێند، لەکاتی وانەکاندا سەدای پێکەنینەکەی ئەویان لە سالۆنە خاڵییەکانی خانەکەدا دەبیست، کە دەچوون بۆ تەوالێتی کچان لە ڕاڕەوەکەدا لەگەڵ خوڕەی سیفۆنی ئاودەستەکان وردەنگی چرپەچرپ و پێکەنینی کچاندا گوێیان لە دوا قاقای غەمگینی ئەو دەبوو. چەندین ڕۆژ بێوچان بەدوایدا گەڕان، نەیاندەزانی بۆ بەدوایدا دەگەڕێن، چ قسەیەکیان نەبوو بیکەن، بەڵام دەیانویست بۆ یەکجار بەمەیلی ئەو، بۆ ئاسوودەکردنی ئەو گۆرانی بڵێن.

دوای چەند هەفتەیەک ڕۆژێک لە مەیدانێکی گەورەی شاردا بینیان

عەرەبانەیەکی گەورەی ڕادەکێشا، عەرەبانەیەک چەندین فەردەپەتاتەی لەسەر بوو. بەوەدا دەیویست لە شەقامێکی سەرەوژووردا سەرییخات و بیگەیێنێتە نزیک دەرگای مزگەوتێک و لەگۆشەیەکی نزیک لە ماسیفرۆشەکانەوە ڕایگرێت، زەحمەتێکی زۆری سەرفدەکرد تا لەگۆشەیەکی عاسییەوە پێچی پێبکاتەوە، ڕاگیرییبکات و بیخاتەسەر پێ. ئەو ڕۆژە کە هەردووکیان بەسەرسامییەوە سەیریاندەکرد، گوێیان لێبوو یەکێک بانگیدەکات «مارشاڵ... مارشاڵ... جگەرەکانت لەبیرچوو». ئەوە یەکەمجار بوو بزانن سەریاس فرۆشیارێکی ئاسایی ناو لەشکری دەستگێڕەکانە. هاوڕێکانی پێیاندەگووت «مارشاڵی عەرەبانەکان». گوێیان لێبوو بەتوڕەییەکەوە بە ئاوفرۆشێک دەڵێت «سەد ساڵ تینووم بێت، ئەو سەتڵە ئاوەی تۆ دوا سەتڵە ئاوی سەر ئەرز بێت... نایخۆمەوە... دەئیتر لاچۆ و وازم لێبێنە». چەند ساتێکی سەیربوو کە چوونە بەردەمی، پێکەوە بەدەنگێک پڕ لە نەغمەی گۆرانی پێیانگووت «نیوەڕۆت باش مارشاڵ». ئەو لەو ساتەدا بەردێکی بەدەستەوەبوو، دەیویست لەگەڵ پێنج کیلۆیی برادەرێکیدا بیکێشێت، تا بزانێت تەرازووی دروستە. ڕۆژێک پێشتر لە یەکێ لەو شەڕە ڕۆژانانەی نێو عەرەبانەکاندا تا توانیبووی پێنج کیلۆکەی خۆی هەڵدابوو. دواتر، دوای ئارامبوونەوەی شلۆقی و پێکدادانەکان چەند بۆی گەڕابوو نەیدۆزیبووەوە، هاوڕێکانی پێیاندەگووت «ماڵخراپ، وا هەڵتدا... ئێستاش لە ئاسمانە». بۆ ساتێک وا پەشۆکابوو، وەک ئەوەی کوێر بووبێت و خوشکەسپییەکان نەبینێت، وەڵامی ئەوانی نەدایەوە و گووتی «گوو... گوو... سەخیفترین بەردی دونیا، نیو کیلۆی زیاتر کەمە... ئێستا بەچی شت بکێشم؟». لەو قسانەدا سەری بەرزکردەوە و چاوی بە خوشکە سپییەکان کەوت، لەچاوتروکانێکدا هەموو خۆشی و ئاسوودەیی و ڕووگەشی دونیای تێکەڕایەوە و

گووتی «خانمان لوتفتان هەیە، بمبوورن... حەزمنەدەکرد گوێتان لەو جنێوانەم بێت... بەڵام ئەمە بازاڕە، ئەگەر ئینسان جنێو نەدا دڵی دەتەقێ، بەڕۆژ جنێو نەدەیت ئێوارە بە مردووی دەتبەنەوە بۆ ماڵ». خوشکەکان بەو چاوەکراوانەوە کە ئەمجار پڕیانکردبوو لەمیهر، گووتیان «سەریاسی سوبحدەم... ئێمەزۆرت بۆگەڕاین». ئەو بەجۆرێک دەستەپاچەبووبوو دەیگووت «خۆشبن... سەلامەتبن... دەستتان ماچدەکەم...». تاساڵانێک دواتریش کە ئەو دوو خوشکە ئەو چیرۆکەیان دەگێڕایەوە لەویادا دەیاندایە قاقای پێکەنین، منیش هەمیشە لەویادا چاوم پڕدەبوو لە گریان... من درەنگ هاتمەدەرێ، تەواو بەدونیای عەرەبانەکان ڕانەگەیشتم، بەڵام دەتوانم کوڕێکی گەنج بهێنمە پێشچاوی خۆم لە جەنجاڵی بازاڕێکی گەورەدا، لەناو سەدا و دەنگەدەنگی هەزاران عەرەبانەدا، لەقیرەقیرەی سەدان فرۆشیاردا کە سێو و پیاز و تور و تەماتەکانیان هەڵدەکێشن، لەوەسفدا دەیانخەنە ئاستی جوانی پەرییەکان. ئا لەویادا بەشەرمێکەوە دوو کچ دەبینێت سڵاوی لێدەکەن، ئەو فەقیرترین کوڕی دونیایە... هیچ کەس نازانێت لەکوێوە هاتووە، خۆشی نازانێت کێیە، مەخلوقێکە نەناس، هێند دەزانێت ناوی سەریاسی سوبحدەمە، ناوێکی سەیر لەناو جەنگەلی بێڕەحمی ناوەکاندا. من وەک چۆن ئەمشەو لەناو شنەبای شەودا دانیشتووم و هەوای ساردی دەریا دەدا لەڕووم، سەدان شەوی تر دانیشتووم و بیرم لەو ساتانە کردۆتەوە... دەبێت سەریاسی سوبحدەم هەستی بەچی کردبێت، کەدوو فریشتەی بینیوە لەگەرمەی نیوەڕۆیەکی بازاڕدا، لەفەقیرترین جلی دونیادا، بەدیار بچوکترین عەرەبانەی دونیاوە وەستاوە؟ من دڵنیام ئەو چاوەڕوانی هیچ بووە، هەموو شتێک بەمن دەڵێت ئەو چاوەڕوانی هیچ بووە، تاکەشتێک زانیوێتی ئەوەبووە بڵێ دەمەوێت ببم بە «مرۆڤێکی مەزن». بەڵام

لەوە سادەتر و منداڵتریش بووە بزانێت «مرۆڤێکی مەزن» چییە. من دەزانم لەو ساتەدا کە ئەو کچانەی بینیوە، هەستی بەشورەیی کردووە، لە خۆی و لە دونیا، لەوەی ئەویش یەکێک نییە لە پیاوە ئاسوودەکان، یەکێک نییە لەوانەی حوکمی دونیا دەکەن، دونیایەک لە هەموو ڕستەکانیدا ئامادەبووە، دونیایەک پێیگوتووە «تەپاڵەترین دونیای ناو دونیاکان». سەرپاسی سوبحەدەم، زیتەڵترین و زۆرزانترین و خۆشڕوترین دەسگێڕی ناو سوپای عەرەبانەکان بوو، لەهەمان کاتیشدا بەدەرنەبوو لەهەندێ شەڕانگێزی، بەر لەکوژرانی بەسێ ساڵ دواهەمین ئامۆژنی دەمرێت، دەڵێم دواهەمین ئامۆژن، چونکەئەو پێشتر زنجیرەیەک ئامۆژنی هەبووە. لەگەڵ وێرانبوونی یەک لەدوای یەکی گوندەکاندا و دابەزینی پلەبەپلەدا لەچیا هەرە بەرزەکانەوە بۆ پێدەشتە هەرەگەرمەکان، ئەو ئامێزی گەلێک خێزانی دیبوو، هەر ژنێک نانیدابایە، جلی بشتبایە، پێیدەگووت ئامۆژن... لەدەساڵیدا بۆ ماوەیەک لەبنکەیەکی منداڵە هەتیوەکاندا ژیابوو، پێشتریش خوێندن و نوسین لەکن مەلایەکی چیانشین فێربووبوو. کە دواجار لەو ئۆردوگا گەرم و بێناوەدا لای ئەو ژن و مێردەگیرسایەوە، دەستیکرد بەو گەشتە درێژەی خۆی لەگەڵ هەموو ئەو پیشە سەیرو نزمانەی لەگەڵ توانا و ئیرادەی جەستەیدا نەدەگونجان... هەموو شتێکی دەکرد، شاگردی چێشتخانە، شاگردی فیتەر، کرێکاری بینا لەئۆردوگا تازەکاندا، فرۆشتنی ئاو لەسەر مەرزەکان، بارکردنی تایە بۆ سەر ترێلە قاچاغەکان، شتنی ئوتومبێل لەنزیکِ چێشتخانەیەکی سەر ڕێگاوە، گوو پاکردنەوە لەیەکەم نەخۆشخانەی ئەملیدا، عەلاگە فرۆشتن لەگوزەری سەوزەفرۆشەکان... سەرپاسی سوبحەدەم بەر لەوەی ئەو عەرەبانەدەستییە بکڕێت کە پێیدەگووت «سینەی کەژاڵ» هەموو ئەو کارانەی کردبوو. ئەوە سەرپاسی سوبحەدەم نەبوو ئەو

نـاوەی لەعەرەبانەکەنابـوو، بەڵکـو دەسـتگێڕێکی عاشـقی دیکەبـوو، ئـەو دەسـگێڕەی دی سـاڵانێکی زۆر شـەیدای کـەژاڵ ناوێـک بووبـوو، ئەویـش شـووی بەکۆنـە پێشـمەرگەیەک کردبـوو، کۆنـە پێشـمەرگەکەش حـەزی لەکیژێکـی تـر کردبـوو، کیژەکـەی تریـش حـەزی لەکوڕێکـی دی بـوو، کوڕەکـەی دیـش حـەزی لەکچێکـی دی بـوو ، وەک دەڵێـن ئـەو کیـژەش حـەزی لەپیاوێکـی خێزاندارکـردووە لەوڵاتێکـی تـر، کەئەویـش لای خۆیـەوە حـەزی لەژنێکـی دیکـەی منداڵتـر بـووە... ئـا بـەو جۆرەهەمـوو ناکامییـەکان لـەو عەرەبانـە بچوکـەدا کۆبووبوونەوە.«سـینەی کـەژاڵ» بچوکترین عەرەبانـەی دونیابـوو، مـن دواتـر ماوەیـەک بـۆی گـەڕام، بـەڵام زوو زانیـم لەهەڵمەتـی گـەورەی نەهێشـتن و پاکردنـەوەی عەرەبانەکانـدا شـکێنراوە.

یەکێـک بەبۆیەیەکـی شـین لەسـەر ڕووی پێشـەوەی عەرەبانەکـەی نوسـیبوو «سـینەی کـەژاڵ» لەخواریشـەوە بەهەمـان خـەت نوسـیبووی «ئەگـەر عەشـقم زوبانـی بـێ/ یاخـوا عومـرم زوو فانـی بـێ». لەلایەکـی دیکـەوە نوسـرابوو «ئـەم عەشـقە کـە وەک ئاگـری دەیجورە/دەیسـووتێنێ مورغـی دڵ بەبـێ خەتـا». ئـەو سـاڵەی سەریاسـی سـوبحەدم سـینەی کەژاڵـی کڕییـەوە، بڵاوبوونـەوەی عەرەبانـەکان لەچڵەپۆپـەدا بـوو، بـەو ئەندازەیـی یەکەمیـن ئێـوارەی دەسـتگێڕی سـەریاس، یەکەمیـن ئێـوارەی جەنگیشـی بـوو لەگـەڵ پۆلیسـەکان و چاوەدێرەکانـی شـارەوانیدا. ئـەو یەکێـک بـوو لـەو هـەزاران دەسـتگێڕە کـە بەیانیـان زوو بەعەرەبانەکانیانەوە دادەبەزینـە ناوەڕاسـتی شـارەوە. ڕۆژی یەکەمـی ئیشـکردنی ڕۆژێکـی تاریـک بـوو، لـەو ڕۆژەدا دەسـتگێڕەکان پۆلیسـێکیان لای ڕۆنفرۆشـەکانەوە کوشـت. پێشـتر سـەریاس کوشـتار و مردنێکـی زۆری لەنزیـک خۆیـەوە بینیبـوو، بـەڵام یەکەمجاری بوو ئاوا دەست لەخوێنی مردوویـەک بدات، سـێ دەسـتگێڕ بەسـێ بـۆری ئاسـن، تـا مـەرگ لەپۆلیسـێکیان دابـوو کـە

دواجـار لەنـاو قووتـووی شـیر و تایتـی فـەل و سـابوونە تورکییەکانـدا مێشکی پڕابـوو. ئـەو ڕۆژە ژاوەژاوێکـی مـەزن لەهەمـوو بـازاڕدا پەیدابـوو کـە دەوڵـەت هەمـوو عەرەبانـەکان دەسـوتێنێ، لـەو شـەوەوە سـەریاس و کۆمەڵێـک دەسـتگێڕی تـر لەمەیدانێکـی چۆڵـدا، عەرەبانەکانیـان هەڵدەگرت دەیانپاراستن و پاسـەوانیان دەکردن. ئـەو ماوەیـە سـەریاس بەدەگمـەن دەگەڕایـەوە ژوورەکـەی ئـۆردوگا، زۆربـەی شـەوان لـەو مەیدانـەدا لەژوورێکـی تەنەکـەدا دەخـەوت.

ئـەو ڕۆژە خوشـکە سـپییەکان ماوەیەکـی درێـژ لەبـەردەم عەرەبانەکـەدا وەسـتان، باسـی ئـەو پەشـیمانییەیان بۆکـرد کـە دوای دواهەمیـن یەکبینینیـان هەسـتیان پێکـردووە. هەردووکیـان بەغەمگینـی قسـەیاندەکرد، بـەڵام چرپـەی دوو کچـی عەیـار لەدەنگیانـدا بـوو. هەندێ لـە فرۆشـیارەکانی ئـەو دەورە گوێیـان لەقسـەکانیان بـوو، مۆسـیقای لـەو چەشـنەیان لەهیـچ دەنگێکـی دیکـەدا نەبیسـتبوو. دوو کچەکـە ئاواتیـان خواسـت وەک خوشـکی خـۆی سـەیریانبکات، پێشـیانگووت گـەر حەزبـکات دەتوانـن گۆرانـی بـۆ بڵێـن. ئـەو ڕۆژە سـەریاس بەجـۆرێ پەشـۆکابوو هیچـی نەگـووت، کەخوشـکە سـپییەکان ڕۆیشـتن بەجۆرێـک لـە خـۆی وەڕزبـوو، تاسـی تەرازووەکانـی فڕێـداو بەدەنگێکـی هێمـن و پـڕ نائومێدییـەوە گووتـی «ئـەم زمانـە نەگبەتـەی مـن، ئـەم دەموپلـە بەدبەختـەی مـن، قـەت وا شـەل و شـەوێڕ و کـڕ و کـپ نەبـووە...». ئـەو پێیوابـوو ئـەو شـەرم و تێکچـوون و سـڕبوونە کوتوپـڕەی، سـەرەنجێکی بەدیـان لای خوشـکانی سـپی جێهێشـتووە، بـەڵام بەپێچەوانـەوە، ئـەو شـەوە خوشـکانی سـپی تـا بەیانـی پێکەنیـن، تەریقـی و تێکچـوون و شـەرمی ئـەو کوڕە بەجۆرێکـی سـەیر خرۆشـاندبوونی، پێشـتر کەسێکیان نەبینیبـوو بـەو جـۆرە بشـڵەژێت. بـەڵام ئـەو سـادەیی و شـەرمە کوتوپـڕە کـە لەسەریاسـدا بینیـان مایـەی دڵنیاییەکـی گەورەبـوو، دواجـار وەک

خۆیــان گووتیــان، ئــەوان بــەدوای برایەکـدا دەگــەڕان، ئــەو شــەوە کـە لەپێکەنینـدا خەریکبـوو دەمــردن، دەمەویەیــان کاتێـک دونیـا بــەرەو ڕووناکــی دەگەڕایــەوە، شــادەریای ســپی و لاولاوی ســپی بڕیاریانـدا، سەریاســی ســوبحدەم بکەنــە بــراو هاوڕێــی هەمیشــەیی خۆیــان. ئیـدی بەئارامـی و خۆشـییەوە باوەشـیان بەیەکداکـرد و دەسـتیان بەقـژی یەکدا دەهێنــاو لەبــەردەم ئــەو پەنجەرەیــەدا کەبــای ســوبحی دەهێنـا تێــر هــەوای پــڕ لەئاونگــی بەیانیــان هەڵدەمــژی، بەزەدردەخەنەیەکــەوە کــە نیــوەی خەنــدەی مــرۆڤ و نیوەشــی لــە خەنــدەی پەرییــان بــوو بێئــاگا لەهەمــوو ئــەو ڕۆژە ســەیرانەی چاوەڕێیانــدەکات دەخەوتــن.

# ٩

ئیکرامی کێو دوای سێ هەفتە گەڕایەوە بۆلام.

مـن لـەو ماوەیـەدا فێربـووم چاوەڕێبکـەم، ئێسـتاش پەشـیماننیم لـەوەی ئازادیم بەهەمـوو ڕوکارە سەقەرئاساکانییەوە قبوولکـرد. پەشـیماننیم لـەوەی ئامێـزم بـۆ دونیـا کـردەوە و گووتـم مـن زینـدووم و تەحەمولـی زیندوێتـی خـۆم دەکـەم. دەکـرا مـن لـەو بێدەنگییـەدا وەک خەڵوەتنشـینێکی بێئـاگا لەجیهـان، وەک یەکێـک کـە تـا دوا ئەندازەبـاری ژیانـی خـۆم سـووککردبوو بمێنمـەوە... بـەڵام دوای بیسـتویەک سـاڵ دەمویسـت، دووبـارە هەمـوو شتێک تاقیبکەمـەوە. ئـەو شـەوە کـە ئیکرامـی کێـو گەڕایـەوە، ڕوخسـارێکی گەنجانـەی هەبـوو، لەجارانـی پێشـوو ڕووخۆشـتر و ئارامتربـوو. لەیەککاتـدا گەورەتـر و منداڵتریـش دەهاتـە پێشـچاوم... گەورەتـر بەجەسـتە، کـەوەک بێچـووە دێوێـک هەمـوو ژوورەکـەی پڕکردبـوو، لەهەمانکاتیشـدا نیـگاو جوڵـەو سـەرەنجی منداڵێکـی هەبـوو لەکەنـار گۆڕەپانێـک تەماشـای کۆمەڵێـک منداڵی دی بـکات.

ئیکرامـی کێـو بەمەرجێـک منـی هێنایـە دەرەوە بتوانـم خـۆم بپارێـزم، لەشـتێک دەترسـا کەئـەوکات بەتەواوەتـی نەمدەزانـی چییـە؟ شـەوێک بـوو تاریـک، مانـگ دیارنەبـوو، پێدەچـوو خـۆی بەئەنقەسـت جـۆرە شـەوێکی وای هەڵبژاردبێـت. بەخـۆی و کاسـکێت و تفەنگەکەیـەوە لەژوورەکـەدا هاتوچۆیدەکـرد، دەیگـووت تـا درەنـگ دەبێـت چاوەڕێبکەیـن... ئـەو کات

هیچی پێنەگوتم، تەنیا قسەی لەسەر خۆی دەکرد. دەیگووت «من چەندین ساڵ خزمەتی شۆڕشم کرد... کوشتن نەبێت هەموو شتێکم بۆ کرد... زۆرجار پەشیمانم و زۆرجاریش پەشیماننیم... موزەفەری سوبحەدەم پاکی دوو هەستی جیاوازت دەداتێ، جارێک واهەستدەکەیت هیچ نیت و لاوازیت، پاکییەکەشت پاکی کەروێشکێکە لە ناو گەلەگورگێکدا، هەندێ کاتی تریش نا، هەستدەکەیت تۆ لەو هەموو شەڕ و پیسییەت داوە و هەر پاکیت... دەڵێیت سا چاکە، سا جوانە، سا من شتێکی ساف و مەزنم کردوە... موزەفەری سوبحەدەم شۆڕش درۆیەکی گەورەیە، تۆ بەختەوەریت، تۆ شۆڕشگێڕ بوویت بێئەوەی شۆڕش بکەیت... ئەوەیان نیعمەتێکی خوداییە... وامهەستدەکرد کاتێک شۆڕش سەردەکەوێت بەهەشتێک بۆ خۆی لەزەوییەوە هەڵدەقوڵێ و دێتەسەر زەوی، کەچی لەدووەم بەیانییەوە، لەدووەم ڕۆژەوە کە دەموچاوت دەشۆیت و چاودەکەیتەوە، چاوت بەدەستپێکردنەوەی هەموو شتەکان دەکەوێت، من ڕۆژ بە ڕۆژ لەدایکبوونەوەی ئەو شەیتانەم بینی، شەیتانێک سەرەتا شتێکی چکۆلانەیە، یەکەمجار دەڵێیت سا قەیچێکا، ئەو شەیتانە بەشێکە لە هەموومان، شتێکی بچوکە و بەشێکە لە سروشتی هەر ئایەمییەک... بەڵام تۆزەتۆز دەبینیت گەورەدەبێت، دەبینیت هەموو شتێک دەبات... هەموو شتێک». کەوایدەگووت دەوەستا و لەپەنجەرەکەوە سەیریدەکرد، چاوانی هێندەکرابوونەوە واتدەزانی دەیەوێت بەسەر دەریایەکی گەورەدا بڕوانێت. هەستمدەکرد شۆڕش شتێکی مەزنی لێسەندووە. پێمگووت «ئیکرامی کێو... تۆ ناتەوێت هیچ بەمن بڵێیت... من هەموو چیرۆکی خۆم خستەبەردەستت... بەڵام تۆ ناتەوێت هیچم بۆ بگێڕیتەوە... شتێکی ون لەژیانی تۆدا هەیە و لێمیدەشاریتەوە». گووتی «نا.. ژیانم شتێکی بەنرخی تیانەبووە تا زەوتیکەن... باس لەخۆم ناکەم، باس لە کەسانێکی تر دەکەم، کە بەڕێکەوت ناسیومن... موزەفەری سوبحەدەم،

من لەناو حیزبدا بووم، بەڵام مرۆڤ لە حاڵەتی ئاساییدا هیچ نابینێت، من بەرێکەوت هەندێ شتم بینی... سا ئینسان ئازادە، دەتوانێت هیچ نەبینێت... دەتوانێت تێپەڕێت و تەماشانەکات... من چەندین ساڵە بەو شێوەیە درێژە بەخەونەکانم دەدەم... دیلێک ئازاددەکەم، موچەیەک بۆ پیرێژنێک پەیدادەکەم، ڕێگای سەفەر بۆ گەنجێک دەدۆزمەوە، کەسێکی سەر بەهێزێکی تر دەشارمەوە، سا هەر شتێک مانایەکی هەبێت دەیکەم... شتێک یارمەتیمبدات لەمشەوە درێژ و تاریکانەدا تەنیا نەبم... شتێک کۆمەکم پێبکات و هەستبکەم دەژیم... من لە دوای ڕاپەڕینەوە زۆر تەنهام». وایگووت و لەبەردەممدا وەستا، خودایە چاوانی پڕبوون لەفرمێسک، لە گیانەوەرێکی ئەفسانەیی دەچوو لەنێوان کۆمەڵێک درەختدا پێکرابێت و چیتر نەتوانێت بڕوات. ئەو فرمێسکانەی لەچاوی ئیکرامی کێودا بینیم لەو فرمێسکانە جودابوون کە لە چاوانی یاقوبی سنەویەردا بینیم. ئەسرینی ئیکرام گریان بوو بۆ تەواوی دونیا، بەڵام ئەسرینی یاقوب فرمێسکی یەکێک بوو بۆ شتێک دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە، ئەسرینی یەکێک هەموو شتەکانی دەوری خۆی وێراندەکات و ئەو شتە نادۆزێتەوە کە عەوداڵێتی. فرمێسکی ئیکرام لە فرمێسکی یەکێک دەچوو بەدیار باغێکەوە وەستابێت و تەماشای پەژموردەیی و زەردبوونی گوڵەکانی بکات، ئەسرینی یاقوب گریانی پیاوێک بوو لەهەمان ئەو باغەدا لەپێناوی گەڕاندا بەدوای خونچەیەکی ئەفسانەیی و خەیاڵی خۆیدا پێ بەسەر هەموو گوڵەکانی دیکەدا بنێت. ئیکرام بەهێمنی هاتەبەردەمم و گووتی «لەدوای ڕاپەڕینەوە هەستدەکەم سوودم نییە... سەرەتا ویستم بخوێنم، بڕۆم و بەجۆرێکی تر دەست پێبکەمەوە، بەڵام زەحمەتە بەجۆرێکی تر دەستپێبکەیتەوە... موزەفەری سوبحدەم، سا هیچ شتێک لەوە زەحمەتتر نییە لەسەرەتاوە دەستپێبکەیتەوە... من شەوان لەسەربان دەخەوتم و بەدرێژایی ئەو مۆتەکە کۆنانە دەهاتنەوە

سەر سەرم، وێنەی ئەو درەخت و ماڵ و شارە خاپوورکراوانە هەمیشە لێرەمدا بوون... لێرە». وایدەگووت و بەدەستەگەورەکانی، ئەو دەستانەی چەندین جار لەدەستی من گەورەتربوون، ئاماژەی بۆ سەری خۆی دەکرد. شتێک لەشێتی لەبوونیدا بوو، بەڵام شێتێتییەکی ناوەکی و نەبینراو و هێمن. هەمیشە بە یەک شێوەزمان و دەنگ قسەیدەکرد، ئەوکاتەی دەگریا و ئەو کاتەی پێدەکەنی دەنگی وەک خۆی بوو. پێدەچوو مەخلوقێکی نەگۆڕ، شتێک بەجەوهەرێکی ئەبەدییەوە لەناویدا خەوتبێت، لەگەرویدا جۆرە گرییەک هەبوو وەک دەنگی ئاگرێک وەهابوو با بیگەشێنێتەوە. ئەویش لەڕابوردوویەک ڕایدەکرد... بەڵێ ، یارانی من، هاوڕێیانی ئەم سەفەرە تاریکەم بەشەو و دەریادا، من لەو ڕۆژەوەی لەناو لمەکانەوە هاتوومەتەدەرێ، یەک لەدوای یەک ئەو کەسانە دەبینم کە لەشتێک ڕادەکەن... سەیرکەن... سەیری خۆتان کەن ئێوەچین، جگە لە کۆمەڵێک خێو و تارمایی کە لەسەر کەشتییەک دانیشتوون و لەشتێک ڕادەکەن... شتێک ناوی نییە، ڕەنگی نییە، ناگیرێت و دەستەمۆناکرێت... ئیکرامی کێویش لە شتێک هەڵدەهات، بەڵام نەیدەزانی بەکویادا هەڵبێت، ویستبووی بڕوات و بەجۆرێکی تر دەستپێبکاتەوە، بەڵام بۆنی باروت و مردن نەیانهێشتبوو، بەشەو کە دەخەوت ئەو پیاوە هێمنەی ڕۆژ نەبوو، بەدرێژایی شەو هاواریدەکرد، وەک ئەوەی یەکێک بیخنکێنێت گەرووی دەگیرا، دەبووایە زووزوو هەستێت و دەموچاوی بشوات و بڵێت «وای خودایە... وای خودایە، ئەمەچ شەوێکە».

ئەو شەوە بەر لەوەی بڕۆین منی گۆڕی، یەکەمجارم بوو دوای چەندەها ساڵ جلێکی دیکەی جیاواز لەو دسداشەیەی زیندان لەبەرکەم. ئەو شەوە نەمویست ڕیشم بتاشێ، گووتم «لێمگەڕێ ئیکرامی کێو... با بەهەمان ڕوخساری زیندانەوە بگەڕێمەوەبۆ دونیا...». ئەو ساتەی منی هێنایەدەرێ چاوانی پڕبوون لەفرمێسک، گەشییەک و کرانەوەیەک

و جوانییەکی خودایی پەڕیبوونە سەر ڕوخساری، هەستمکرد لەتاریکیدا گەورەتر و پڕتر دەنوێنێت. شەوێک بوو سارد، من بۆ یەکەمجار کراسێکی سپی و شەرواڵێکی خۆڵەمێشی تێرم لەبەردابوو، جامانەیەکی کۆنیشم کردبووە ملم و کڵاوێکی چکۆلانەش لەسەر سەرم... لەبیرتاننەچێت من بیستویەک ساڵ بوو بەزەوی سەختدا نەڕۆیشتبووم، بیستویەک ساڵ بوو هەوراز و نشێوم نەبینی بوو... شەوێک بوو وەک ئەو شەوەی تیا گیرام، ئەو ساتەی ئیکرام دەستیگرتم و منی بەناو درەختەکاندا برد لەهەمان ئەو ساتە دەچوو کە کۆماندۆ سەوزپۆشەکان منیان دەستبەستکرد و هێنامیانە دەرەوە، کەبەناو دارەکاندا دەڕۆیشتین هەستم بەهەمان هەوای سارد، هەمان جریوەی ئەستیرە، هەمان ترس دەکرد. شەوێک بوو وەک هەمان شەو بێمانگ، بەڵام پڕ لەهاواری ئەستێرە. لەبیرتاننەچێت من لەو شەش مانگەدا چەند جارێک هاتبوومەدەرێ، هەموو دەرگاو دەروازەکانم تاقیکردبووەوە، بەڵام هەمیشە لەناو درەخت و دوندو خەرەندە عاسییەکاندا گیرمدەکرد و ناچار بەر لەوەی ڕێی گەڕانەوە ونبکەم دەگەڕامەوە. ئەوشەوە جیهان لەجاران بچوکتر دەهاتە پێشچاوم، من لەسەحرادا بەگەورەیی و کرانەوەیەکی بێئەندازە بەرین ڕاهاتبووم، هەستمدەکرد دەڕۆین و لەشوێنێکدا جیهان کۆتاییدێت... ئەو شەوە هیچ خەیاڵێکم نەبوو ئەو عەردەی من لەتاریکییدا بەسەریدا دەڕۆم، بەخاکی ترو دونیای ترەوە گرێدراوە. نەمدەزانی ماوەیەک دواتر لەشەوێکدا، لەکەشتییەکدا، لەدەریایەکدا کە ئێوەدەڵێن وەفای بۆ کەس نییە، سەربەرزدەکەمەوە و تێدەگەم ئەوەی لەبیابان فێریبووم چ حەقیقەتێکی گەورەیە، زەوی و ژیان چ یەکەیەکی پێکەوەگرێدراون. تێدەگەم ئەو لایەنە گەردونیانەی مرۆڤ، ئەو لایەنە گەورانەی کە بیابان و لم لەمندا زیندوویانکردەوە، وادەکەن ئاسوودەبم. وادەکەن لە ناوەڕاستی ئەم شەپۆلانەدا نەترسم، باوەڕم بەمردن نەبێت، بتوانم دەریا وەک دۆستێک تەماشابکەم، دەست لەم

دەریا بێئەندازەیە بدەم و هاواربکەم «ئەی دەریا ڕێنماییمان بکە...». کێ لەنێوە شەوێکی تاریک هاتۆتەدەرێ و لەتەختی ئەم کەشتییەوە هاواربکات و بڵێت «ئەی دەریا فریامانبکەوە...». من هەزاران شەو لەپەنجەرەی زیندانەکەمەوە هاوارمدەکرد «ئەی بیابان فریامکەوە... ئەی لم فریامکەوە». دڵنیابووم شتێک لەبیاباندایە گوێی لێمە، شتێکە وەک من و تۆ نییە، ئینسانێک نییە بەدوو چاو و دوو گوێچکە و دوو دەستەوە، بەڵام شتێکە لە هەموو لایەکەوە دێت، لەگەڵ هەوادا هەستی پێدەکەیت، لەگەڵ ڕووناکیدا بەرەو ڕووتدێت، لەگەڵ سێبەردا فێنکتدەکاتەوە، شتێکی نادیارە، بەڵام گەر چاوت لێکبنێیت دەیبینیت. من ئەو شەوەی لەوماڵە هاتمەدەرێ وامدەزانی لەسەر خاکێک وەستاوم لەسەر ئەم ئەستێرەیە نییە، ئینسان هەمیشە ئەوە لەیاددەکات کە لەسەر ئەستێرەیەک دەژی، ئەوە لەیاددەکات ماڵەکەی ئەو، کێڵگەکەی، باغەکەی بەشێکن لەگەردون، منیش ئەو شەوە کە هاتمەدەرێ ئەوەم لەیادکرد.

بەئیکرامی کێوم گووت «هاوڕێم، دونیا بۆ هێندە بچوکە» وەک ئەوەی لەتاریکیدا نەمبینێت وەستاو ئاوڕیدایەوە و گووتی «لەبەرئەوەی ئێمە خراپ تەماشایدەکەین...». ئیکرامی کێو ئەو شەوە نەیدەهێشت لەگەڵ خەیاڵەکانمدا بڕۆم، نەیدەویست هەست بەدڵنیاییبکەم، دەیگووت «دڵنیایی دەتکوژێت... موزەفەری سوبحدەم، دڵنیایی خەوت لێدەخات، وەک چۆلەکەیەک کە دڵنیایی کوێریدەکات و ناهێڵێت پشیلەکان ببینێت... سا من هەرگیز دڵنیانەبووم... هەرگیز».

کاتێک گەیشتینە ئەودیو درەختەکان، لەسەر بەردێک وەستاو دەستیکرد بەنوێژکردن. پێشتر نەمدەزانی نوێژدەکات، بەڵام نوێژەکانی سەیربوون، لەناکاو بێپەچاوکردنی وادە و کات و شوێنی نوێژ دەوەستا و ڕکاتێکی دادەبەست. دواتر ویستم باسی خودای لەگەڵدا بکەم، بەڵام نەهاتە ژێربار، هەرگیز ڕۆژێک لەڕۆژان باسی خودای نەکرد، وەک شتێک کوتوپڕ

لەخـەوی غەفڵەتـی هەسـتێنێ نوێژیدەکـرد. کـە زیاتـر ناسـیم سـەرەنجمدا هەنـدێ شـەو بێهیـچ سـۆنگەیەک، بێدەسـتنوێژ، بێبەرمـاڵ لەسـەر خـۆڵ و عـەرد و بەردەڕەقـەکان نوێژیدەکـرد. ئـەو شـەوە کـە تەواوبـوو بەدەنگێـک پڕبوو لەنهێنـی لێیپرسـیم «موزەفـەری سـوبحدەم... تـۆ دڵنیایـت سـەریاس، سەریاسـی سـوبحدەم کـوڕی تۆیـە، دڵنیایـت؟». بەئارامییـەوە پرسـیم «ئـەی تـۆ دڵنیایت کەسـێک هەیـە بتوانێـت منداڵـی خەیاڵـی بـۆ خۆی دروسـتبکات؟ کـێ هەیـە منداڵێـک بەخەیـاڵ بکاتـە کـوڕی خـۆی؟». پـاش ئیسـتێک گوتـی «مـن دەتبـەم بـۆ جێگایـەک ، لـەوێ هەمـوو چیرۆکـی مردنـی سەریاسـت بـۆ باسـدەکەن... دەزانـم ئـەو بەسـەرهاتە غەمێکـی زۆرت دەداتـێ، بـەڵام دواجـار تـۆ سـا هەمـوو دونیـات بـۆ چیرۆکێـک دەوێـت». ئـەو کات تێنەگەیشـتم بـۆ وادەڵێـت، وەکـو ئـەوە وابـوو بزانێـت شـەوێک لەشـەوان لەپاتـراوە لەگـەڵ ئێـوەدا سـوار کەشـتییەک دەبـم و لەنـاو دەریـادا وندەبیـن و شـەوان قیپتانـی کەشـتییەکە بـۆ ئـەوەی غافڵمانبـکات دەرفەتمـان دەداتـێ لەنێوان گەورەیـی ئاسـمانی و گەورەیـی دەریـادا ئـەم چیرۆکەتـان بـۆ بگێڕمـەوە. ئەوشـەوە وەسـتام و پێمگـووت « مـن نەڕاوکـەری حەقیقەتـم و ناڕاوکـەری چیـرۆک... مـن دەمەوێـت ئـازادی خـۆم بژیـم». لێتـان ناشـارمەوە ئـەو کات بەدروسـتی نەمدەزانـی ئـازادی یانـی چـی، لەسـاڵانی زینداندا فێربووبـووم ئـازادی ڕۆح لەئـازادی جەسـتە جیابکەمـەوە، دەشـبووایە جیابیکەمـەوە. ئـەو سـاڵانە فێربـووم ئـەوەی بەجەسـتە دیلـە دەتوانێـت بـەڕۆح ئـازاد بێـت، بـەڵام ئـەو شـەوی ئازادییـە هەسـتم بەهەقیقەتـی لەشـی خـۆم دەکـرد، هەسـتمدەکرد یەکەمجارە قاچەکانـم دەڕۆن و هێزێـک نییـە بیانوەسـتێنێ، بەربەسـتێک نییـە ڕایانگرێـت. ئـەو شـەوە وەک ئەوەبـوو خنکاوێـک دوای سـاڵەهای سـاڵ لەژێـر بەحـردا، لەژێـر بارسـتەقورس و سـەنگینەکانی ئـاودا، سـەرئاوکەوتبێت و سـینەی کرابێتـەوەو پـڕ بەگـەروی هـەوا هەڵمژێـت، بیهێننە پێشـچاوی خۆتان، ئەوانـەی لـەم زەریایـەدا خنـکاون، ئەوانـەی ئێسـتا لەژێـر ئـاوەوە تەماشـای

کەشـتییەکەی ئێمەدەکـەن، لەنـاکاو مێزێکـی خودایـی زیندوویانبکاتـەوە و سـەر لەدەریا بهێننـە دەرەوەو پڕ بەسنگیان هـەوا هەڵمژن، دەبێت هەست بـەچ خۆشـییەکی بکـەن؟ چ بەختەوەرییەکیـان هەبێـت؟ ئـەو شـەوەمنیش وابـووم، لەخنکاوێـکِ دەچـووم دوای سـاڵانێکی درێـژ سـەرئاو کەوتبـم و هـەوا هەڵمـژم. مـن ئەوشـەوەو شـەوەکانی دیکـەش ڕاسـتگۆبووم، دەمزانـی چ زەحمەتەڕۆحێکـی ئـازاد بنێمەوەسـەر سکەی ژیانێک پڕەلەدیلـی و ئـازار و کۆیلەیەتـی. دەمزانـی ئێسـتا چ ڕۆحـم و چ جەستەشـم ئـازادن، بـەڵام بەیـەک ڕانەهاتـوون، هەردووکیشـیان لەگـەڵ ئـەو شـەوو جەنگـەڵ و ئاسمانە بچوکانـەی دەوروبەرمـدا ناتەبـان. ئـەو شـەوە دەبووایـە هەرچـی دەنگێـک لەناوەوەمــەوە دێـت بێدەنگیبکـەم و لێگەڕێـم جەسـتەم بەجـۆری خـۆی بجوڵێـت و بـڕوات و سـەمابکات، وەک باڵندەیـەک کـە بەپڕتـاو لەقەفـەز دێتــەدەرێ و چرکـەی یەکـەم لەخۆشــی فڕیـن چەنـد جارێـک بەدەنگـی بـەرز دەجریوێنێـت، دواتـر بەهەمـوو تیـن و تـاوی خـۆی بەرزدەبێتـەوە تـا سـەرلەنوێ هەسـت بەباڵەکانـی خـۆی بـکات، لەوسـاتەدا هەمـوو ژیانـی، هەمـوو گۆرانییەکانـی، هەمـوو موعجیـزەی دەنـگ و ڕەنگـی لەباڵەکانیایەتـی، منیـش ئاوەهابـووم، هەمـوو مەعجیـزەی ژیانـم لەهەنگاوەکانمدابـوو. ئـەوەی مـن چیرۆکـی سەریاسـی سوبحەدەم دەبیسـتم، دڵتەنگینەکـردم، لەدڵـی منـدا مانـاو شـێوەکانی غـەم سـەیر گۆڕابـوون، چیتـر غـەم ئـەو هەسـتە سـادەیە نەبـوو بـۆ چارەنوسـی خـۆم و ئەوانـی تـر، بەڵکـو ئـەو مانـا قـووڵ و بێگـەردو نەگـۆڕە بـوو کـە لـە هەمـوو وجـوددا دەدرەوشـایەوە.

ئـەو شـەوە تـا بەربەیـان بەڕێـگاوە بوویـن، لـەو شـەوەدا نـە باڵندەیـەک دەفــڕی، نەگورگێـک دەیلورانـد، نـە مێشـوولەیەک گیـزەی دەهـات... کپییەکـی سامناکتر لـە کپـی سـەحرا باوەشـی پیاکردبـووم. مـن و ئێکرامـی کێـو ئـەو بێدەنگییەمـان نەشـکاند، دەڕۆیشـتم و سـەیری ئەسـتێرەکانم دەکـرد و لـە نیهانـی خۆمـدا دەمگـووت «مـن ئـازادم... ئـازاد».

ئیکرامی کێو وەک حورمەتی ئەو شەوە بزانێت، بڕوایەک بە وێنەی بڕوای ئەسپێک بەدەست و پاشووەکانی خۆی لە هەنگاوەکانیدا بوو... هێند گەورەبوو هەستمدەکرد نیوەی دونیای بۆ خۆی بردووە و نیوەکەی دیکەی بەخشیوە بەشتەکانی تر. من لەزەتێکی بێسنوورم لە ڕۆیشتن و هەواو و تاریکی دەبینی، ترسێکیش لەدڵمدابوو وەک ترسی مراوییەک بۆ یەکەمجار بە نێو تەقە و شریخەی گوللەی ڕاوکەراندا بفڕێت. هەندێجار بەبێدەنگی دادەنیشتین و پشووی کورت کورتمان دەدا، قسەمان نەدەکرد، ئەو زووزوو بەدەستەسڕێک عارەقەکەی دەسڕی... من پێویستیم بەهیچ قسەیەک نەبوو، وەک ماسییەک لەتۆڕی ڕاوکەرێکەوە بازیدابێتەوە بۆ ناو ئاو و دڵی هێشتا پڕبێت لەخورپەی مردنی خۆی... دەمزانی کەشەوو گەردون و ئەستێرەکان سەیرمدەکەن، سەیری ئازادی پیاوێک دەکەن هەموو هێزی خۆی کۆکردۆتەوە بگات بەشتێکی دوور.

من زیندان وایلێکردم نەتوانم بەدەنگی بەرز قسە لە شادی و ئازارەکانی خۆم بکەم،... ئەو بێدەنگییە مەزنەی شەویش ئەو هەوایەی پێدەبەخشیم کە شادییەکانی خۆم پڕکەم لەڕامان و بێدەنگی... دۆستان ئینسان هەر ئەوە نییە، بتوانێت غەمەکانی خۆی بکاتە تێفکرین و وردبوونەوە، دەتوانێت شادییەکانی خۆشی بگۆڕێتە سەر تێڕامان و خەیاڵ و بیرکردنەوە. تەنهایی و زیندان مرۆڤ فێردەکەن، سەماکانی بکاتە تێفکرین.

ئەو بەیانییە دوای شەوێکی پڕ هێمن گەیشتینە ماڵێک لە قەراغ گوندێکی بێدەنگدا و کیژێکی سپی پۆش بەڕەفتەیەکی ڕەشەوە لە گەردنیدا، جوانترین مەخلوقێک تائەوکات لەژیانمدا دیبێتم دەرگای لێکردینەوە. دوای شەوێکی درێژ لە بێدەنگی ئیکرامی کێو گووتی «شادەریای سپی بەیانیت باش... دواجار گەیشتین، ئەمە موزەفەری سوبحدەمە... ئەو پیاوەی زیاد لە بیستویەک ساڵە دیلە، ئەمەش یەکەمین بەیانی ئازادییەتی».

مــن بــەو پــرچ و ریــش و جەســتە لاوازەوە پتــر لەدڕندەیــەک دەچــووم نــەوەک لەمـرۆڤ. شـادەریای سپی پێشـتر کەسێکی نەدیبوو، ریشـی لەبـەر پێیدابێــت و پرچەســپییەکانی لــە کەمەریــدا و چــاوی پڕبێــت لەســێبەری برۆنزیانــەی بیابـان. من وەک لەبـەردەم مەرقەدێکدا بنوشـتێمەوە، لەبـەردەم جوانــی و پاکـی و گەورەیــی یەکــەم ئافرەتـدا نوشـتامەوە و گووتـم «ژیاننتـان پڕبێـت لەنـور خانـم... مـن موزەفـەری سـوبحدەمم ئەوەتـا تەماشـاکە، هەمـوو تاریکـی دونیـا بـەدوای خۆمـدا ڕادەکێشـم...»

وامدەگــووت و دەســتم بــۆ ئاســمان و بەیانــی و دواهەمیــن تەپوتــۆزی زوڵمــەت ڕادەکێشـا، وامدەگـووت و سـەیری بەرپێـی شـادەریای سـپیم دەکـرد، کــە پڕبــوو لــە ڕووناکیــی، ئــەوە ســەرەتای ئاشـنایی مـن بـوو لەگـەڵ ئـەو دوو کیــژەدا کــە تــا مــردن ژیانــی منیــان پڕکــرد لــە ڕووناکــی، وەک چــۆن دواهەمیـن ڕۆژەکانــی ژیانــی سەریاسیشـیان پڕکردبـوو لــە نــور و ڕۆشـنی.

## ١٠

سەریاسی سوبحدەم پێیاندەگووت «پرۆفیسۆری عەرەبانەکان». ئەو ئەو عەقڵە بچکۆلانەیە بوو لەناو ئەندازەی ئاڵۆز و پێچاوپێچی بازاڕەکاندا سەدەها دەستگێڕی منداڵی ڕێنماییدەکرد. دەسرێکی سووری دەبەست بەنێوچاوانییەوە، جگەرەیەکی تورکی بەدەستییەوە و گۆچانێکی چکۆلانە لەدەستیدا.

ئەوبوو منداڵە شیرفرۆشەکانی گواستەوە بۆ پشتی ئاسنگەرەکان، ڕۆنفرۆشەکانی لەپێش مزگەوتەکەوە تا نزیک مەیدانی مریشکەکە دوورخستەوە، ئەو بوو ئاوێنەفرۆشەکانی لەقەیسەرییەکان نزیککردەوە، دەرمانفرۆشەکانی لەبۆنی چڵپاوی بازاڕاوە تا سەر شۆستە پاکەکانی ناوەڕاستی بازاڕ جوڵاند و کردنی بەهاوسێی کتێبفرۆش و وێنەفرۆشەکان. ئەوبوو لەهەموو جێگایەکەوە دەروازەی دەدۆزییەوە بۆ هەڵهاتن و ڕاکردنی عەرەبانەکان. دەیان کەلاوەی کۆن و مەخزەنی چۆڵ و حەوشی خاپور و جێهێڵراوی کرد بەبنکە و حەشارگا، پاسەوانی شەوانەی دانا. ئەو خەوی بەوەوە دەبینی یاسایەک بۆ بازاڕ دابنێ، نەخشەی شارێکی تر و جۆرە دونیایەکی دی بکێشێت.

ئەوانەی لەنزیکەوە ناسییان دەڵێن توانایەکی ئەفسووناوی هەبووە لەسەر ڕازیکردنی هەموو کەسێک. سەدان منداڵ بوون ئەگەر ئەو عەرەبانانە نەبایە دەبوو ببن بەچەکدار، یان دەبایە بگەڕێنەوە بۆ

گوندە پیس و تاریکەکان، یان لەگەڵ کاروانێکدا ڕوویکەنەدەرەوەی وڵات. سەریاس لە هەرکەس زیاتر دەیزانی ژیانی ئەوان پابەندی ئەو گەمە سەیرەیە کە لە ئەندازەی ئاڵۆز و تێکەوڵاوی ئەو شارەدا دەیکەن. توانای قسەکردنی لەتەمەنی خۆی گەورەتربوو. شەوێکییان دوای جەنگ و جەدەلێکی دوورودرێژ ڕۆژنامەنوسێکی گەنجی هێنایە سەرڕا کە هیچ کەس لەم سەر زەوییەدا مافی ئەوەی نییە بەزۆر بیانگێڕێتەوە بۆ گوندەکان... شەوێک بوو تاریک، کاتێک ئەو ڕۆژنامەنوسە دەرکەوت، خۆی و هاوڕێکانی لەدەوری قۆری و مەقەڵییەکی پڕ ئاگر دانیشتبوون. ڕۆژنامەنوسەکە گەنجێکی ئێسک سوک بوو، بەڵام پڕبوو لەغروری ئەوانەی خەڵکی لادێیان وەک سەگ تەماشادەکرد. کوڕی بەڕێوەبەرێکی قوتابخانە و ژنە فەرمانبەرێکی بەڕێوەبەرایەتی بودجەبوو، بەدرێژایی ژیانی کراسی پاکی لەبەرکردبوو، تەمەنی لەکافتریاکانی زانکۆ و سەر کورسی بیرۆی ڕۆژنامەکاندا بردبووەسەر، گەنجێکی باریک بەقژێکی خاو و جووتێ چاویلکەی سپییەوە، کوڕێکی پوری لەمەخزەنێکی لۆریال لەفرایبورگەوە بەردەوام عەتری بۆ دەناردەوە. ئەو شەوە هاتبوو تا ڕیپۆرتاژێکی درێژ لەسەر ئەو «ئاژەڵانە بنوسێت کە لەجیاتی ئەوەی شار پیسبکەن، دەبێت کێڵگە بێنازەکانی کوردستان بکێڵنەوە». سەریاسی سوبحەدەم تاکە دەسگێڕێک بوو ڕۆژنامە بخوێنێتەوە. ساتێک سەروسەکوتی ئەو دەرکەوت، سەریاس لەنزیک مەقەڵییەکەوە کزەڵەیکردبوو. ڕۆژنامەنوسەکە بە کراسە سپی و پانتۆڵە جینزە تەسکەکەیەوە لەفەنتازیاکانی خۆیدا ڕۆڵی ڕیپۆرتاژکارێکی گەورەی دەبینی کە کارەکەی ناچاریدەکات بچێتە ناو شوێنی عاجباتی و لەگەڵ کەسانی سەیر و سەمەرەدا قسەبکات. سەردانی ئەوشەوەی بۆلای خاوەن عەرەبانەکان بەڕووداوێکی سەیر و ناوازەی ژیانی خۆی دەزانی. دەستگێڕەکان دەیانزانی ئەمجۆرە گەنجانە وەک حەیوان تەماشایاندەکەن. ئەو شەوە لەبەردەم ئەو ئاگرەدا

ڕۆژنامەنوسەکە قسەی لەسامانی کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاژەڵ کرد، سەریاس باسی لەسامانی مرۆڤ و سەروەتی بێناز و فەرامۆشکراوی ئەو هەزاران منداڵەکرد کە لەچوار ساڵییەوە بۆ پەیداکردنی نان دەڕژێنە سەر شۆستەکان. ڕۆژنامەنوسەکە باسی لەجوانی شارەکان و پاکی شۆستەکان و ڕێناسانی بۆ ئۆتۆمۆبیلەکان کرد، بەڵام سەریاس باسی لەجوانی ژاکاو و لەدەستچووی خۆی و ئەو منداڵانەکرد کە لەبەر نەبوونی ئاو دەبێت لەگواوەکاندا خۆیان بشۆن. ڕۆژنامەنوسەکە باسی لەگەڕانەوەی لادێییەکان بۆ گوندەکانیان کرد، سەریاس قسەی لەگەڕانەوەی مرۆڤ کرد بۆ ژیانێکی مرۆڤانە. ڕۆژنامەنوسەکە قسەی لەسەر ئەو کێڵگە وێرانانە کرد کە چاوەڕوانی دەست و پەنجەی ئەوان دەکەن، سەریاس قسەی لەو سەدان هەزار منداڵ و گەنجەکرد کە جارێکی دی نە لەشارەکان و نە لەگوندەکاندا ناتوانن ئاسوودە بژین.

ئێستا بیردەکەمەوە ئەوان ئەو منداڵانەبوون کە لەناو جوگرافیاکاندا سەریان لێشێوا... وەک ئێمە کە دە ڕۆژە لەناو ئەم دەریایەدا سەرمان لێشێواوە... ئەو شەوە کە سەریاس بەقسەی دەستگێرە منداڵەکان ئەو ڕۆژنامەنوسەی بەزاند، یەکێ بوو لەشەوە گرنگەکانی ژیانی، بۆ ڕۆژی دوایی لە لاپەڕەی ڕێپۆرتاژدا وێنەکەی لەگەڵ «سینەی کەژاڵ»دا بڵاودەبێتەوە، لەسوارچاکێکی کۆن دەچێت لەگەڵ ئەسپەکەیدا، لەو وێنەیەدا جگەرەیەکی «مۆر»ی درێژ بەلا لێوەوەیە، گوچانێکی گەورەی بەدەستەوەیە و بەزەردەخەنەیەکی گەورەوە تەماشای کامێراکە دەکات، ئەوە ڕونترین وێنەیەکی ئەوە من دیبێتم. ئەوەی سەیرە ئەوەیە ناوی سەریاسی سوبحەدەم، نە لە ڕێپۆرتاژەکە و نە لە ژێر وێنەکەدا نەهاتووە، ئێستا دەڵێم گەر بهاتبایە و ئەو ناوە غافڵنەکرابایە لەوانەبوو خێراتر ڕاستییەکان ئاشکرابن. لەو شەوەوە ئیدی هاوڕێکانی ناویان نا پرۆفیسۆری عەرەبانەکان. سەریاس لەو گەنجانە نەبوو حەزی لەپێکدان و شەڕ بێت

لەگەڵ پۆلیس و چاوەدێرەکاندا، بەوەدا پۆلیس و چاوەدێرەکانیش بەشێک بوون لەو خەڵکانەی دەبایە ئێواران نانێکی باش ببنەوە بۆ منداڵەکانیان، دەکرا هەریەکێک لەدەستگێرەکان شتێک بخاتەسەر بودجەیەک تا دڵی ئەوانیش دەستەمۆکرێت و لەگەڵیاندا دڵڕەق نەبن. هەموو ئەو منداڵانەی کە بەر لە چوار پێنج ساڵ لەمەوبەر لەسوپای عەرەبانەکاندا بوون، هەموو ئەوانەی ئەو سەردەمە بەشێک لەژیانیان لەسەر شۆستە و لەناو قوڕوچڵپاوی بازاڕدا بردۆتەسەر، دەزانن سەریاس ئەندازیاری ئەو ڕێکەوتنە نهێنییەی نێوان پۆلیس و ئەو منداڵانەبوو، کە ڕۆژنامەکانی ئەو زەمان بەگاڵتەوە پێیاندەگووتن «هەجیجییە مۆدێرنەکان».

دۆستان... کاتێک ئەمشەو ئێمە لەم سەر قەراغی کەشتییەوە قسەدەکەین، دەبێت ئەوەمان لەیادنەچێت بپرسین ئایا پۆلیسەکانی ئەو زەمانەش کێ بوون؟ هەر کۆمەڵێک منداڵ و گەنجی وەک سەریاس و دۆستەکانی بوون، ئەو هەرزەکارانەبوون کە دەیانوسیت ژنەکانیان جوانتر بەخێوکەن نەبا بکەونە سەرجادە و بەردەستی خاوەن بازاڕە گەورەکان، دەیانویست زووتر دەسگیرانەکانیان مارەکەن، نەبا یەکێک لە دوورەوە بێت و بیانبا و ئیدی هەتا هەتایە نەیانبیننەوە. ئەگەر شەوێک شتەکان ئاوەها تێکنەچوویایە دەکرا سەریاسی سوبحەدەم ببێت بەهاوڕێ و دۆستی ئەوانەی دواتر لە ئێوارەیەکی غەمگیندا دەیکوژن. ئەو ماوەدرێژەی سوپای عەرەبانەکان توانی بژی و خۆی لەدوژمنە بێشومارەکانی بپارێزێت و بچێتە ناو ستراتیژێکی سەیری دەرکەوتن و هەڵهاتنەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەریاسی سوبحەدەم و پۆلیسە گەنجەکان. شانۆیەک بوو بۆخۆی، دەبایە هەرکات ئەوان دێن و بەدارەکان دەکێشن بەعەرەبانەکاندا ئەوان بەکۆمەڵ بوروژێن و بیکەنە هەراو ڕووبکەنە شەقام و کوچە لاتەنیشتەکان. چ شانۆگەرییەکی زیرەکانەبوو کە تێکەڵەیەکی گەورەبوو لەڕاستی و درۆکردن، چ یارییەک

بوو کە هەمیشە درزێک لە نێوان یاساکانیدا دەمایەوە بۆ ئەوەی ژیانی دوو کۆمەڵە ئادەمیزادی غەمگین درێژە بەخۆیبدات و بەردەوامبێت. ئێستا هەموو دەزانین ئەو شۆستانە بۆ کەسانێک کە دونیایان لێبچوککرابووەوە دواهەمین شوێنی مان و نەمان بوون، ئەوانەی لەو وردەواڵانە بترازێت کە لەسەر شۆستەکان دەیانفرۆشت چ ئەگەرێکی دیکەیان بۆ ژیان نەدەبینی. سەریاسی سوبحەم لە هەرکەس زیاتر دەیزانی ئەوان لە چ بستەزەوییەکی بچوکدا گیریانخواردووە، لەچ ئەندازەیەکی شکاو و لەناو چ باریکەڕێیەکی ناو ئەو شارانەدا دەبێت بڕۆن، چ تاریکییەک چاوەڕێیاندەکات گەر بەوردی یارییەکان نەکەن. بەڵام بازاڕ جەنگەڵە و هەمیشەش وەک جەنگەڵ دەمێنێتەوە. ئەو ڕۆژانەی بەخۆی و عەرەبانەکەیەوە، کڕیارەکانی بەو دەنگە منداڵانەیەی خۆی بانگدەکرد جوانترین توری سەر زەوی بکڕن، بیبەر بخۆن ناسک و شیرینتر لە لوقمەقازی، دەنگی خۆی خوار و خێچ و درێژدەکردەوە و دەیگووت وەرن سەیری گەورەترین لاسکە سلقی سەر زەوی بکەن، خەیار بخۆن لەزاردا دەبێتە ئاوی زەمزەم، بەه بەه لەم هەڵوژەیە کە هی باغی خواگیانە لەبەهەشتەوە، هەرمێیەک حەزرەتی جوبرەئیل بەدەستی خۆی ناشتویێتی، هەنار، وەی وەی لەباجی هەنار بیخۆن کە کوێر چاکدەکاتەوە... ئا لێرەدا دەبێت بوەستن و ئاگاداربن، ئەو ڕۆژانەی سەریاسی سوبحەم هاواری لەهەنارێک دەکرد کوێر چاکدەکاتەوە، تەنیا قسەی لە میوەیەکی خەیاڵی نەدەکرد، بەڵکو قسەی لە چیرۆکێک دەکرد تەواو لە جەوهەری هەموو شتەکاندایە.«هەنارێک کە کوێر چاکدەکاتەوە». ئا... ئەمشەویش باسی «محەمەدی دڵشوشە» و «سەریاسی سوبحەم» و «ئەدیمی شازادە» و پەیوەندییان بەهەنارێکەوە کە کوێری چاکدەکاتەوە بۆ ناکەم... هێشتا زووە بەتەواوەتی بگەینە سەر چیرۆکەکەمان، پێدەچێت ئێمە گەلەک شەوی تر لە دەریادا بین، گەر خودا کۆمەکی پێکردین و چیرۆکەکەمان پچڕاو بەیانییەک

لەقەراغی مەملەکەتێک گیرساینەوە، گەر پۆلیسی کەنارەکان گرتیانین و لەیەکیان جیاکردینەوە ئەوا غەم لەوە مەخۆن کە کۆتایی ئەم چیرۆکەتان نەبیستووە، ئێوە ئەوەتان لە کۆتایی چیرۆکەکەدا، ئەم کەشتییە کۆتایی هەموو ئەو چیرۆکەیە. تا گەر بەیانی ئەم کەشتییە نوقم بوو و یەکێک لە سەرنشینانی بەمەلە گەیشتەوە سەر ئەرز دەتوانێت لەو شوێنەوەی من وەستاوم خۆی دەستپێبکاتەوە، من ئێستا دەتوانم بوەستم و هەر یەکێک لەئێوە درێژە بەو حکایەتە بدات، بەمەرجێ ئەم چیرۆکە دواجار لەم کەشتییەدا دوابیبێت. ئەم کەشتییە وێڵەی دەریا، ئەم کەشتییەی نەچارەنوسی دیارە و نەئاراستە. ئەو کەشتییەی نازانین لەچ دوورگەیەک و زەوییەک داماندەگرێت، تاکە کۆتایی هەموو ئەم چیرۆکەیە.

بەهەرحاڵ، هاوڕێیان... ژیانی سەریاسی سوبحەدم لەبازاڕدا بەشێکی ئازار و بەشێکی گەمەکردن بوو، ئەو دەبایە سەدان منداڵ لەگەڵ یەکدا رێکخات، دواجار ئەنجومەنێکی چکۆلانەیان دروستکرد... لەو ئەنجومەنەدا کۆمەڵێک هاوڕێی دڵسۆزی دۆزییەوە کۆمەکیاندەکرد.«ژینۆی مەخمەڵی» و «ئادەم مەرجان» دوو دۆستی نزیکی ناو ئەو ئەنجومەنە بوون، لەگەڵ ئەوەدا چەندەها شەو دەبوونە پاسەوانی عەرەبانەکان. ژینۆی مەخمەڵی ماسی دەفرۆشت، ئادەم مەرجان بللوری چرا. ئەوان لە سەریاس ئارامتر و نەناسراوتربوون، بەڵام لەئاشتکردنەوە و رێکخستنی نێو عەرەبانەکاندا لەسەریاس بەحیکمەتتر و هێورتر بوون. سەریاس هەندێجار لە ناکاو لەسروشتی خۆی دەردەچوو، ئارەزوویەکی سەیری شەڕ و پەلاماردانی تیا دەجوڵا. ئەو بێئاگای خۆی لەزۆربەی شەڕەکاندا بەشداریدەکرد، یەکێک لە کوشندەترین جەنگەکان ئەو شەڕەبوو کەلەنێوان دۆشاوفرۆش و پاکەتفرۆشەکاندا ڕوویدا و گەیشتە بەکارهێنانی دەمانچە، کاتێک سیان لەپاکەتفرۆشەکان یەکێک لە نەیارەکانی خۆیان بەسێ گوللە

لەئاودەستی مزگەوتێکی ناو بازاڕدا کوشت. ئەو ئێوارەیە شەڕ لەنێوان هێزە جیاوازەکاندا لە کلکەی قەیسەرییەکانەوە تا لای نوقڵفرۆشەکانی بەرخەستەخانەکە بڵاوبووەوە، لەو شەڕە گەرمانەدا کە ئیدی کەس بیری لای هێوری وعەقڵ نەبوو، سەریاسی سوبحدەمیش بەتەرازوو، شیشی قەپان، گوریسی قولاپدار شەڕیدەکرد. هەموو جارێک کیلۆکانی دەگرت بەدەستییەوە و کوێرانە بەسەر سەری شەڕکەرەکاندا حەوایدەدا. ڕۆژێک لەو شەڕانەدا بەدەمی چەمچەیەکی گەچکاری شوختێکی قووڵیان کردە ڕوومەتی.

لەساتێکدا هێشتا شەڕ گەرم بوو ژینۆی مەخمەڵی سەریاسی لەسەر دوو بلۆک دانا، پەڕۆ لە دوای پەڕۆ دەیخستە سەر برینەکەی، ئا لەوکاتەدا خوشکە سپییەکان وەک نیشتنەوەی لەناکاوی دوو فریشتە، وەک نیشتنەوەی کوتوپڕی دوو پەری لەئاسمانەوە لەبەردەمیاندا دابەزین.

دەرکەوتنی شادەریای سپی و لاولاوی سپی بەجۆرێک سەیر و کتوپڕبوو، چیرۆکی بومەلەرزەکانی هێنایەوە یاد... وەک ئەوەی سەعاتێکی نهێنی لەناوەوە وەختی ئەو برینەیان پێبڵێت، هەردووکیان ڕاستەوخۆ بەچەند دەقیقەیەک دوای زامداربوونی گەیشتنە لای سەریاسی سوبحدەم. ژینۆی مەخمەلی پەیتاپەیتا دەرمانێکی سووری دەخستە سەر برینەکەی و دەیگووت «دوێنێ شەو ئەم برینەم لەخەومدا بینی، لەدەموچاوی تۆدا نەبوو، لەسەر دەستی ڕاستی خۆم بوو». سەریاسی سوبحدەم کە نەیدەتوانی پێبکەنێت دەیگووت «سەخیفرین برینی دونیایە، تا پیر دەبم شوێنەکەی بەدەموچاوەوە دەبێت، وەک نیشانەی ئەم ڕۆژە ناخۆشە... ئەم ڕۆژەی مەیموون گووی کرد بەدەموچاومدا».

ئەو ئێوارەیە کە شەڕ بازاڕی بەهەمووان چۆڵکرد، دیمەنێکی ترسناکی دوای خۆی جێهێشتبوو. شەقام و کوچەکان پڕبوون لەعەرەبانەی شکاو، لەسەبەتە و نایلۆن و سنوقی هەڵڕژاوی میوە، لەئارد و دۆشاوی تێکەڵاوبوو،

لەخوێنی پلیشانەوەی مریشک و کۆتر و مراوی، لە کەروێشکی بەرەڵای ناو سڵق و سپیناغی ڕۆکراو بۆ سەر شۆستەکان. لەهەندێ منداڵی گریاو لەپشت دەرابەکانەوە. بەڵام دەرکەوتنی خوشکە سپییەکان، دیمەنێکی دیکەی بەخشی بەو خەراباتە، وەک دوو پەریزادە بەسەر گۆڕەپانی جەنگێکدا بڕوانن، لەشوێنی خۆیانەوە سەیری ئەو کاولکارییەیان دەکرد. ئەو ئێوارەیە لەتاکسییەکدا سەریاسی سوبحدەمیان برد بۆ بیمارستان، لەوێ کچە پزیشکێکی گەنج بەخۆی و چاویلکەیەکی ساف و بریقەدارەوە برینەکەی بۆ دوورییەوە. تا تەواوبوو بەکوردییەکی شکاو لێیدەپرسی «بۆ عەرەبانەکان واکردن... بۆ خەڵک فەقیر شەڕکردن... پێنج تەقەڵ جرح تۆ خیا×ـە کردومە... سێ حەفتە بەعد تۆ ×اغ سەلیم دەبێت». ئەو ئێوارەیە کە خوشکە سپییەکان لەگەڵ سەریاسدا هاتنەدەرێ، بۆ یەکەمجار، هەردووکیان دەستیان خستە ناو دەستی و پێیانگووت «ئێمە خوشکی تۆین... لەمڕۆوە تا هەتاهەتایە تۆ برای ئێمەیت، ئیتر خۆت ڕابهێنە... برا کە گیروگرفتی هەبوو دەچێت بۆ کوێ؟ دەچێت بۆلای خوشکەکانی. تۆش دەبێت بێیت بۆلای ئێمە...». پێشتر سەریاس خەوی بەڕۆژی ئاوەها سەیرەوە نەبینیبوو. ئەو بەهەتیوی تەواوەتی خۆی ڕاهاتبوو، دیارە سەریاسیش ڕۆژێک لەڕۆژان پرسیوێتی بۆ دایکم نییە، باوکم لە کوێیە، گەر خوشکم هەیە ناویان چییە، گەر برام هەیە بۆ نایانبینم؟ بەڵام نەگەیشتۆتە هیچ. ئەو دواجار دەکەوێت بەسەر تەلیسمێکدا کە بۆی چارەناکرێت، هەمان ئەو تەلیسمەی منیش کەوتمە ناوی و تا ئەمڕۆ بە تەواوەتی بۆم چارەناکرێت. یەکێ لەو مەرجانەی خوشکە سپییەکان بۆ سەریاسیان دانا، مەرجی خوشکایەتی بوو، ئەوان ئەو شەوە بەر لەوەی سەریاسی سوبحدەم ببەنەوە بۆ ماڵێ پێیانگووت مەرجی ئەم هاوڕێیەتییەیان ئەوەیە کە لە سنووری هەتاهەتایی خۆیدا بمێنێتەوە، پێیانگووت ئەوان لەو کچانە نین سەرەتا بەکوڕان دەڵێن

ئێوە وەک برامان وان و لەناویشەوە، لەدڵ و لەئارەزووەکانیاندا خولیای تر پەروەردەدەکەن، پێیاندەڵێن ئێوە کاکمانن و شەویش لەناو جێگادا خەیاڵی ماچ و ڕامووسان و هەموو شتەکانی تر دەکەن. ئەوان دوو کەسن سوێند و مەرج مانایەکی لەلایەن هەیە، قسە شەرەفێکی هەیە لە سەروو هەر شەرەفێکی ترەوە، هەرگیزیش غەدر قبوڵناکەن. ئەو شەوە بەنجی برینەکە تەواو سەریاسی بەرنەدابوو، کە هەناسەشی دەدا بۆنی دەرمانەکانی بیمارستانی لێدەهات، سێبەری شەپەکانی ئێوارەش هێشتا لەچاویدا دەهاتن و دەچوون. لەکوچەیەکی تۆزاوی باشووری شار، دوو مانگ دوای مردنی محەمەدی دڵشوشە، سەریاسی سوبحدەم کە دڵنیام هەمیشە ویستوویێتی خێزانێکی هەبێت، بەماندوویێتی ڕۆژێکی پڕ لەجەنگ و جەفەنگەوە، بە خوشکەکان دەڵێت « لەسەریاسی سوبحدەم مەترسن، ژیانم بەشی ئەوە ناکات کەس زویربکەم». ئەو شەوە کە یەکەم شەوی سەریاسی سوبحدەمە لەگەڵ خوشکەکاندا، تا شەو درەنگ خوشکە سپییەکان گۆرانی بۆدەڵێن، لەبەرچاویدا قژیاندەکەنەوە و دەیبەستن، زوونوو ئاوی بۆدەهێنن، دەستدەخەنە سەرناوچاوانی، کاتی حەبەکانی بیردەخەنەوە، گۆرەوییەکانی بۆدەشۆن، سەریاس بەدونیای ئەو کچانە سەرسامە. ئەو هەمیشە وا خەیاڵی کردبوو کە دونیای ناسکی کچان خۆشترین ژیانی ناو ژیانەکانە.

ڕێکەوتنێک بوو لەسەر داد و دادپەروەری دروستبوبوو، دوو خوشکی تەنیا کوڕێکیان دەکردە برا کە کەسی نییە. ئەو شەوە درەنگ وەخت شادەریای سپی و لاولاو نهێنی گەورەی ژیانیان بەسەریاس گووت، ئەوان تا هەتا هەتایە شووناکەن، قژیان نابڕن، بێیەکتر گۆرانی ناڵێن، لەسپیش بەولاوە ڕەنگی تر ناپۆشن. هەر ئەو شەوە هەر سێکیان پەیمانێکی تریان نوسی و بەخوێنی خۆیان مۆریانکرد، پەیمانی ئەوەی سەریاس بۆ هەتاهەتایە برای ئەوانە و جگە لەو هیچ کەسێکی دی تا مردن

نابێتە برایان. ئەو پەیمانە ناسکەی کە شادەریای سپی بەخەتی خۆی نوسیویەتی و سێ پەنجەی قشتیلە و چکۆلانە لە خوارەوەڕا مۆریانکردوە، ئێستاکێش لەژێر هەمان هەناردایە، تا هەتا هەتایە لەویاشدا دەمێنێتەوە.

کاتێک لاولاوی سپی پێیگووت با بڕۆین و ئەو پەیمانە بخەینە ژێر دار هەنارەکەوە، سەریاس کەمێک سەرسام تەماشای هەردووکیانی کرد. پێشتر لەشەوێکی دیکەدا پەیمانێکی دیکەی لەژێر هەنارێکی دیکەدا شاردبووەوە، هەنارێک لەو سەری دونیا... هەنارێک بێئەندازە لەو هەنارە دەچوو کە لەو حەوشەیەدا ڕوابوو، ئەمەدرەختی ناوێنەیی هەمان ئەو هەنارەبوو، کەساڵانێک لەوەوبەر بەربەیانێکی سپی ئەو ناوی نابوو «دواهەمین هەناری دونیا». تا هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە باسی ئەو پەیمانەی ترتان بۆبکەم، بەڵام دەتوانم سەرسامی منداڵێکتان بۆ بگێڕمەوە کە بەر لەو شەوە پەیمانێکی تری بەخوێنی خۆی مۆرکردبوو. سەریاس نەیدەزانی چۆن سەیری دووبارەبوونەوەی ئەو ڕێکەوتە سەیرانەبکات. بۆ دەبێت ژیانی ئەو بە هاوڕێکانییەوە بە پەیمانێکی نهێنی ببەسترێتەوە؟ بۆ دەبێت دوو خوشک بناسێت ئەوانیش بەعەهدێکی خوێنینی دڵ پێکەوە بەستراون؟ بۆ دەبێت لەم شەوە تاریکەدا بێتەدەرێ و پەیمانێکی دی ببەستێت، کە تا هەتاهەتایە ئەو بە دوو کچەوە دەبەستێت کە هێشتا نایانناسێت؟ بۆ لەو جەنگەڵە ترسناکەی دونیادا مرۆڤ پێویستی بەم سوێندە قووڵ و تاریکانە هەیە؟ دەڵێم قووڵ، چونکە جۆرە پەیمانێکە خاوەنەکانی لێیدەرناچن، تاریک چونکە هەمیشە شتگەلێک لەو پەیمانانەدا هەیە بەنادیاری دەمێننەوە، شتگەلێک پەیوەندی بەدۆخە زۆر نهێنییەکانی مرۆڤەوە هەیە. ئەو شەوە سەریاسی سوبحدەم هیچی دەربارەی پەیمانی یەکەمی خۆی نەدرکاند، بەڵام تێگەیشت مرۆڤ بۆ ئەوەی بڕوا بەبرای مرۆڤی بکات، پێویستی بەکۆمەڵێک عەهد و پەیمانی نوسراو هەیە. کە ئێستا لەو شەوە دەڕوانم پێموایە جۆرە هەوایەکی

فەلسەفی لە پەیوەندی ئەو سێ منداڵەدا هەبووە، ئەو شەوە تا درەنگ بیریان لەو ڕەفتارە سەیر و خۆپەسکەی خۆیان کردەوە « بۆ دەبێت مرۆڤ خۆی بە پەیمانێکەوە ببەستێتەوە؟». ئێستا دروست نازانم لەو شەوەدا چییان باسکردووە، بەڵام دەزانم ئەوان لەڕۆژگاری درۆکانـدا دەژیان، ڕۆژگارێک کەس لەسوێندی ئەوی تر دڵنیانەبوو، دواتر خوشکە سپییەکان بەمنیان گووت ئەوان دژ بەپەشیمانی و لاوازییەک لە کاراکتەری خۆیاندا کاریاندەکرد، بەڵام پێموایە ئەو پەشیمانی و لاوازییە بەشێک بوو لەکاراکتەری هەموو ئەو سەردەمە، مرۆڤ دەبوایە برای مرۆڤی بگرێت و بەشتێک ببەستێتەوە، خۆی بگرێت و بەشتێک ڕێکیبخات. ئەو شەوە کە خوشکەسپییەکان و سەریاس ئەو پەیمانەیان خستە قوتوییەکەوە و ناشتیان، لەناوەوەی خۆیاندا هێزێکی نادیاریان دەستەمۆدەکرد، ئەگەری خیانەتێکیان لەخۆیاندا دەخنکاند.

کە سەریاس بۆ بەیانی چاویکردەوە، بووبووە خاوەنی شوختی چەمچەیەکی گەچکاری و دوو خوشکی سپی سپی.

کە گەڕایەوە بۆ بازاڕ ژینۆی مەخمەلی و ئادەم مەرجان چاوەڕوانی چیرۆکی تریان دەکرد، خۆتان فەنتازیای هەرزەکاری شازدە و هەڤدەساڵ دەناسن، ئەوەی هەمیشەخەون دەبینن دوو ئافرەت بیانفڕێنێت و شەوێک تا بەیانی بیانگەوزێنێت و هەموو یارییە خەیاڵییەکانی ناو سەری خۆیان لەگەڵدا بکات، چ پیاوێک هەیە خەوی بەوەوە نەبینیبێت شەوێک ژنێک بیبات و تیا بپارێتەوە لەگەڵیدا بخەوێت. هەردوو ئەو دوو گەنجە شەرمن و خۆشڕوو و بەحەیایە کە لە دونیای عەرەبانەکاندا بالقبووبوون خالی نەبوون لەو خەیاڵە سەیرانە، هەردووکیان پێیان وابوو دوو فریشتەی سپی هاتوون و سەریاسیان فڕاندوە و تا بەیانی شەمزانویانە. بەڵام ئەوە یەکەمین جار بوو سەریاس بەوجۆرە بیر لەشەرەف بکاتەوە، ئەو ڕۆژە کێردی ماسی چاکردنەکەی ژینۆی مەخمەلی هەڵگرت و بەهەموو پولەکە

و لینجاو و زوخاوی سەریەوە بەرامبەر لووتی دوو هاوڕێکەی ڕایگرت و گووتی «ئەوەی بەیەک حەرف قسە بە لاولاو و شادەریا بڵێت دەیکوژم، ئەوە دواهەمین سەعاتی ژیانی دەبێت، یەعنی وەکو سەگ دایدەپاچم... ئەوان خوشکی منن».

تا ئێوارەی مردنی کەس باوەڕی بەخوشکایەتی سەریاس و کیژەسپییەکان نەکرد، بەڵام لەهەمان ئەو ساتەدا کە سەریاس لەسەر ڕانی ژینۆ خوێنی دەهێنایەوە، کاتێک سەدان عەرەبانچی هاوڕێ و دۆست لەسەرسەری دەگریان، گووتی «بمبەن بۆ ماڵی خوشکەکانم... بمبەن بۆ لای خوشکە سپییەکانم، دەمەوێت لەوێ بمرم...». تەنیا لەو دەقیقەیەدا هاوڕێکانی باوەڕیان بەوەهێنا کە چ پەیمانێکی پاک و شەریفانە لەنێوان ئەو و خوشکە سپییەکاندا هەیە.

بەر لەوەی ئەمشەو ماڵاوایتان لێبکەم و بخەوم، حەزدەکەم سەرەتایەکتان دەربارەی ئەو شتانە پێبڵێم کە دواتر شوێنێکی گرنگیان لەم چیرۆکەدا هەیە. شتێک نابێت لەیادیبکەن. لەو ماوەیەدا لاولاوی سپی و شادەریا هەموو هەفتەیەک دەچوون بۆ سەر گۆڕی محەمەدی دڵشوشە و لەوێ گۆرانیان دەگووت. هەر لەهەمانکاتیشدا سلێمانی مەزن ئەو پیاوەشاخاوییە ڕیشن و غەمگینە کە مووەڕەشەکانی لەتیسکی ژاکاوی ئاژەڵێکی نەخۆش دەچوون، هەفتانە بە ماندوێتییەکی زۆرەوە دەهات بۆ سەر گۆڕی کوڕەکەی. ئێوارەیەک سلێمانی مەزن هەردوو خوشکە سپییەکە و دایکیانی لەماڵی خۆیدا داوەتی خواردنێکی ئێوارەکرد. ماڵی بەرپرسێکی گەورەی دوای ڕاپەڕین، بەڵام بەڕۆحێکی غەمگین و نارازییەوە.

کەمبوون ئەو بەرپرسانەی دوای ڕاپەڕین ڕۆحێکی غەمگینیان هەبوو، سلێمانیش یەکێک بو لەو ڕۆحەدەگمەن و غەمگینانە. لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی وەک ژیانی هەموو سیاسییەکانی دوای شۆڕش، ڕەنگ و بۆیەکی پاشایانەی پێوەبوو، شەوان مەجلیسی پڕبوو لەو پیاوانەی دونیایان

بەڕێوەدەبـرد، بـەڵام هەسـتیدەکرد ڕۆژ دوای ڕۆژ ئـارەزووی بـۆ تەنیایـی گەورەتـر دەبێت. لـەدوای مردنـی دایکـی محەمەدی دڵشوشـە بیـری لەژنهێنان نەکردبـووەوە، ئـەو یەکێـک بـوو لەوانـەی بەبـێ ژنـی خـۆی ڕاهاتبـوو. ئـەو ئێوارەیـە کـە ئـەو دوو کچـە نەشـمیلەیەی لەسـەر مێـزی نانخواردنەکـەی خـۆی بینـی، کـە قژیـان لەپشـتی کورسـییەکانەوە وەک دوو فەرشـی ڕەش بەسـەر هۆرتـە فارسـییەکاندا بڵاوبووبـووەوە، هەسـتی بەزوڵمێکـی گـەورەی ژیـان کـرد، ئـەو هەمـوو تەمەنـی لەنێـوان پاسـەوانەکانی خـۆی و بۆنـی هەناسـە و عارەقـی سیاسـییەکان و جانتـای نهێنـی و پلانەکانـی کوشـتن و نامەنوسـیندا بـۆ حیـزب بردبـووە سـەر.

ئـەو وەک هاوڕێکانـی نەبـوو، ڕیزێـک مەعشـوقەی هەبێـت، هـەر وەک جارانـی خـۆی بـوو، پیاوێکـی کێـوی، بـەڵام لەنـاو دیکۆرێکـی تـازەدا.

خوشـکە سـپییەکان کاتێـک داوەتـی سـلێمانی گەورەیـان قبووڵکـرد، حەزیاندەکرد شـتی زیاتـر دەربـارەی محەمـەدی دڵشوشـە بزانن، بـەڵام ئـەو ڕۆژە بەهەنارێکـی شوشـەوە گەڕانـەوە، هەنارێـک دوای مردنـی محەمـەدی دڵشوشـە نەناسـێک دابوویـە دەست سلێمانی باوکـی. هەنارێک تاقـە شـتێک بـوو لـە دونیـا شوشـەییەکەی محەمـەدا نەشـکابوو، لەبـەر ئـەوەی لەقووڵایـی ئـەو هەنـارەدا نهێنییـەک خەوتبـوو محەمـەدی دڵشوشـە بـۆی نەکرابـووەوە، ئـەو هەنـارە نەبووبـوو بـە بەشـێک لەدونیـا شوشـەییەکەی ئـەو، لەبەرئـەوە لـەدەرەوەی یاسـاکانی ژیانـی ئـەودا، لـە دەرەوەی هەرەسـی دونیـای ئـەودا تاکە شـتێکی سـاغ بـوو لەشـوێنی خـۆی مابێتـەوە. کـە خوشـکە سـپییەکان ئـەو هەنارەیـان هێنایـەوە بـۆ ماڵـێ، تـەواو ئـەو قسـەیەی محەمـەدی دڵشوشـەیان لەیادکردبـوو کـە لـە ئێـوارەی تۆفانەکـەدا هـات و گووتـی «ئـەوە هەنـاری مـن نییـە، بەڵکـو هەنـاری نهێنییەکانـە». تـا ئـەو ڕۆژەی سەریاسـی سـوبحەم هـات و ئـەو هەنـارە شوشـەیەی لەنـاو دۆڵابـی کتێبەکانـی لاولاودا

بینـی و هاواریکـرد «خـوای عـەرزو عاسـمان چـی دەبینـم، ئـەوە هەنـارە شوشـەکەی منـە». تەنیـا لـەو سـاتەدا ئـەو دوو خوشـکە ئـەو پستە کـورت و سـەیر و ئاڵـۆزەی محەمـەدی دڵشوشـەیان هاتەوەیـاد. ئەوەئـەو سـاتەبوو کـە بـۆ یەکەمجـار لەسەریاسـی سوبحەمیان پرسـی"تۆ محەمـەدی دڵشوشـە چـۆن دەناسـیت؟ نهێنـی پەیوەنـدی تـۆ و ئـەو چییـە؟... گـەر ئەمـە هەنـاری تۆیـە بـۆ بـە تـۆ نییـە؟ گـەر ئەمـە هەنـاری ئـەو نەبـوو چیدەکـرد لای ئـەو؟».

ئاوەهـا خوشـکە سـپییەکان هاتنـە نـاو چیرۆکـە قـووڵ و ئاڵۆزەکانـی سەریاسـی سـوبحەمەوە. بێئـەوەی بزانـن کـە سەریاسـێک و سەریاسـێک و سەریاسـێکی دیـش لەدونیـادا هەیـە.

# ١١

ئەمشەو کاتی ئەوەهاتووە پێتانبڵێم سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشە چۆن یەکتریان ناسی.

لەو شەوەدا کە هەموو شار و گوندێکی باکوری بیابان، هاتنە دەرەوە و بەرەو چیاکان هەڵهاتن و لەسەر سنووری وڵاتەکانی دی کۆبوونەوە، سەریاسی سوبحدەم تەمەنی یانزەساڵ بوو. ئەو شەوە سەریاس لەهەر کەسێکی دیکەی دونیا خەیاڵی ڕاحەتتربوو، لەدوای ڕاپەڕین و بەر لە شکستی گەورەی هێزەکانی خەڵک و گەڕانەوەی تانک و زرێپۆشەکانی گاردی کۆماری، سەریاس ماوەیەکی سەیر ژیابوو، ئەو ماوەیەک بوو لەهەتیوخانەیەک دەژیا کە دەوڵەت پارەی بۆ سەرفدەکرد. ئەو چەند هەفتەیەی دەوڵەت نەما، خەزنەکان فەرهوودکران، قاسەکان شکێنران، خۆی و هاوڕێ هەتیوەکانی لە کوچە و کۆڵانەکانی شاردا، لەبەردەرکی شوراکان، لەبەر مزگەوتەکاندا سواڵی نانیان دەکرد. ئەو شەوەش کە ڕاپەڕین شکستیهێنا، سەریاس غەمی هیچ کەسێکی نەبوو، ئەو بێکەسترین کەسی دونیابوو، هەتا هاوڕێکانیشی ئەوانەی لە مەیتەم ناسیبوونی لەو سێ هەفتەیەدا بەجۆرێک پەرشوبڵاوبووبوونەوە هەواڵی کەسیانی نەدەزانی، ڕەنگە ئەو شەوە تاکە مرۆڤێک بووبێت کەسێکی خۆی وننەکردبێت، خەیاڵی لای ئادەمییەک نەبووبێت، هەروەها بەپێچەوانەشەوە کەسێک نەبووبێت بیر لەسەریاس بکاتەوە. لەو شەوە ترسناکانەدا کە ئینسان

هەمـوو دڵـی دەبێتـە پەرۆشـی بـۆ هـاوڕێ و دۆسـت و کەسـەکانی، لەنـاو سـەدان سـەدان هـەزار ڕۆحلەبەردا کـە بەچیـاو هـەردو نشـێواندا دەڕۆیشـتن و بـاران لێیدەدان هیـچ کەسـێک نەبـوو بیـر لەسەریاسـی سـوبحدەم بکاتـەوە. مـن ئێسـتا ئـەو منداڵـە چکۆلـە ڕەشـتاڵە نەناسـراوە دەهێنمـە پێشـچاوی خـۆم، بەخـۆی و هەنارێکـی شوشـەو توێشوویەک نـان و زەرفێـک خورمـاوە، بەژێـر بارانـدا دەڕوات و بـۆ یەکەمجـار هەسـت بەگەورەیـی بێکەسـییەکانی خـۆی دەکات. بـەڵام شادیشـە بـەوەی ئەوشـەو وەک منداڵانـی تـر دایکێکـی نییـە ونیبـکات، باوکێکـی نییـە بەدوایـدا وێڵبێـت، دەتوانێـت بەخەیاڵێکـی ئاسـوودە تـا ئـەو سـەری گـەردون بـڕوات و بگەڕێتـەوە.

بەدرێژایی شـەو باراندەبارێـت، ئـەو لـە سـەرەتای هەمـوو ڕێگایەکی تازەدا دەوەستێت، لەمەقسـەد و ئاڕاستـەی ڕێـگاکان دەپرسـێت، شـتێک لـە دونیـای ئـەو گونـدە خاپوورانـەی تیایانـدا گەورەبـووە هێشـتا لەخەیاڵیایەتـی. دەڕوات و تەماشـای ئـەو هـەزاران خێزانـە دەکات کـە لەلـۆری و پیـکاب و ماشـێنی بچوکـدا تەلفزیـۆن و یەخچـاڵ و ئازوقـە و قاپ و قاچاغەکانیان هێناوە، سـەیری ئـەو منداڵـە پێخاوسـانە دەکات کـە بەقـەراغ ڕێگاکانـدا دەڕۆن و هەندێجـار مینیـان پیادەتەقێتـەوە، سەیری ئـەو ژنـە پیرانـە دەکات بـە سـەری ڕووت لـە ژێربارانـدا دەگریـن و لەخـودا تورەدەبـن. ئـەو دایـک و کچانـە دەبینێـت کـە یەکـدی وندەکـەن و یەکـدی دەدۆزنـەوە، ئـەو پیرەمێردانـەی لەسـەر بـەردەکان دادەنیشـن و دەمـرن.

لـەو شـەوەدا مێردمنداڵێکـی دیکـەش کـە هـەر لەتەمەنـی سەریاسـدایە لەشـەقامێکی دیکـەوە دێـت، لەدایـک و باوکـی وندەبێـت، کۆمەڵێـک کلیـل ومەدالیـای بەدەسـتەوەیە، بەژێـر بارانـدا دەڕوات و یـاری بەمەدالیاکانـی دەکات، کلیلەکانـی هەڵـدەدا و دەیانگرێتـەوە و گۆرانـی دەڵێت. بێباکـە لەوەی دایـک و باوکـی ونکـردووە، خۆشـحاڵە لـەوەی بەتەنیایـە، نـە نانـی پێیـە و نـە پـارە، بـەڵام دڵێکـی شـادو سـاف و شوشـەیی پێیـە، ئـەو منداڵـە

کەس نییە جگە لە دۆستی دێرین و قارەمانی یەکەمی چیرۆکەکەمان «محەمەدی دڵشوشە». محەمەدی دڵشوشە تاکە منداڵێکە لەو تەمەنەدا دەڕوات و گۆرانی دەڵێت و بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە. ئەو شەوە شەوی بەختیارییەکانی محەمەدی دڵشوشەیە، کە خەڵکی لەدەرەوەی ماڵ و لەدەرەوەی نیشتەجێ نهێنییەکانی خۆیاندا تەماشادەکات و خۆشحاڵە بەوەی «قوونی دونیا» دەبینێت.

وارێدەکەوێت مێردمنداڵێکی کوێریش کە بەتەمەن وەک سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشەوایە، لەو تاریکیی و بارانەدا بوەستێت. کوێرێک کەس نازانێت لەکوێوە هاتووە، چۆن گەیشتۆتە ئەو ناوەڕاستی ڕێگایە، چی لەویادا ڕایگرتووە؟ کوێرێک لەژێر بارانـدا وەستاوە و هاواردەکات و دەڵێت «کێ کۆمەکمدەکات، کێ دەستم دەگرێت و لەگەڵمدا دێت... کێ دوای من دەکەوێت... کێ دەیەوێت ڕزگارمبکات و ڕزگاریبکەم... کێ دەیەوێت چاوم بداتێ و چاوی بدەمێ... کێ ڕۆشناییم دەداتێ تا ڕۆشنایی بدەمێ...». ئەو کوێرە«نەدیمی شازادە»یە کە بە پێچەوانەی ناوەکەیەوە هەژارترین کوێری دونیایە. هەزاران کەس بەتەکیدا تێدەپەڕن و کەسێک ناوەستێت گوێی لێبگرێت و یارمەتیبدات. ئەو لەو قەراغ ڕێگایەدا دەگری و تووڕەدەبێت، بەخەڵک دەڵێت «ئێوە میللەتێکن لە سەگ... ئێوە گووی سەر ئەم ئەرزەن... ئێوە تایەفەیەکن لە خەڵکی حیز و ترسنۆک». نەدیمی شازادە کە لە ناو گەداو سواڵکەرەکاندا گەورەبووبوو، هەموو جنێوە پیسەکانی دونیای دەزانی... ئەو شەوە تۆزێک دەپاڕایەوە و تۆزێک جنێویدەدا. جگە لە شەڕواڵێک هیچی دیکەی لەبەردا نەبوو، بەتانییەکی تەڕی دابوو بەسەر سەریداو هاواریدەکرد «ئەوەی یارمەتیمبدات، دەرگای ڕووناکی لێدەکرێتەوە... ئەوەی دەرگای ڕووناکی لێکرایەوە چارەنوسی خۆی دەبینێت... ئەوەی چارەنوسی خۆی ببینێت دەتوانێت خۆی لەبەڵا و موسیبەت لابدات » ئەو قسانە کە لەگەڵ

ڕوخسار و دەنگی منداڵانەی ئەودا نەدەگونجا، ڕستەگەلێک بوون لەزاری هاوڕێ سواڵکەرەکانییەوە فێربوبوو. لەناو هەموو ئەو هەزاران کەسەدا دوو کەسی تەنیا، دوو کەس کە ئەوانیش نەیاندەزانی لە چ ڕێگایەکەوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن دەوەستن و گوێ لەهاوارەکانی ئەو مێردمنداڵە کوێر و لاوازە دەگرن کە لەژێر لێزمەی بارانەکاندا، بێئەوەی گوێبداتە هیچ بەردەوام دەڵێت «یارمەتی کوێرێک بدەن بگاتە جێی مەقسەد، یەکێکتان ڕێگای خۆی بگۆڕێت و دەستمبگرێت، خودا تا هەتاهەتایە ئەجری ئەو چاکەیەی دەزانێت، ئەوەی ببێت بەدەلیلی داماوان، خودا لەڕۆژی قیامەتدا دەبێت بەدەلیلی...». ئەو دوو کەسەی دی ئەو دوو قەڵەندەرە چکۆلانەیە سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشەبوون کە وەک ئەوەی سەعاتێکی میقاتکراو لەسەر نائومێدی کۆیانبکاتەوە، لەیەککاتدا دەگەنە بەردەم نەدیمی شازادە.

ئاوەها سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشە لە شەوێکی باراندا، لە ژێر لێزمەیەکی بەخوڕدا لە نابەینی سەدان لۆری و ماشێنی پەککەوتودا، لە هاوارهاواری هەزاران ژن و کچدا، لە قیرەقیرەی ئەو پیاوانەدا کە دەترسان ڕۆژیان لێببێتەوە و سوپا بگاتە سەریان، لەبەردەم کوێرێکدا یەکتریان ناسی.

ئەو شەوە نەدیمی شازادەش بەخۆی و هاوارەکانییەوە، لە شەوێکدا هەقیقەت تا دوا ئەندازە خەیاڵی کوشتووە، تکایان لێدەکات یارمەتیبدەن تا بگاتە ژێر درەختێکی هەنار لەسەر ترۆپکی چیایەکی نزیک، هەنارێک دەبێت لەژێریدا بخەوێت و چاوانی چاکبێتەوە.

ئەگەر ئەو دوو کوڕە ڕۆحیان پڕنەبایە لە فەنتازیا، دوو منداڵ نەبوونایە حەزیان بۆ نهێنی و سەرکێشی لە هەر شتێکی دی گەورەتربێت، لە شەوێکی وادا کە ڕاستی ناشیرینترین ددانی خۆی لە جەستەی مرۆڤ گیردەکرد، نەدەکەوتنە گەڕان بەدوای درەختێکی ئەفسانەییدا، درەختێک

سەریاسی سوبحەدەم دواتر ناوی دەنێت «دواهەمین هەناری دونیا».

لەو شەوەدا کە هەموو خەڵک سەرقاڵی ڕزگارکردنی شتەبچوکەکانی خۆیانن، سێ مێردمنداڵ لە ژێر باراندا دەستدەکەن بەگەڕان لە دوای درەختێکی ئەفسانەیی. ئەو منداڵە کوێرە خۆی نەخشەیەکی دێرین و ڕوونی لە سەردایە، بەڵام بەبێ کۆمەکی چاوساغێک ناگاتە ژێر ئەو درەختە. ئەو شەوە بە سەریاسی سوبحەدەم و محەمەدی دڵشوشە دەڵێت «لەم جێگایەوە کە ئێمە تیا وەستاوین، هەزار هەنگاوی دیکە دەڕۆین، لەویادا دووڕیانێک هەیە، یەکێکیان شەقامێکی قیرتاوە و ئەوی تریان ڕێگایەکی قوڕ و لیتەیە، خەڵکی هەموو بەسەر شەقامە قیرتاوەکەدا دەڕۆن، ئێمە لاڕێگاکە دەگرین، دوای چوارسەد هەنگاو ڕێگاکە لێژدەبێتەوە بۆ ناو چەمێک، لەوێوە دەپەڕینەوە، ئەو چەمە بەزستانانیش ئارامە و هەڵناسێت، لەوێوە دەکەوینەوە ڕێگا و دوای بیست دەقیقە ڕۆیشتن دەگەینە ناو خەراباتی گوندێک کە تەنیا دار و پەردووەکانی ماون، لەوێوە بەناو گۆڕستانێکی بچوکدا تێدەپەڕین کە باوکم غەریقی ڕەحمەت بێت لەوێ نێژراوە، لەویادا فاتیحایەک ڕەوانەدەکەین و دەستدەکەینەوە بەڕۆیشتن، لەپشتی گۆڕستانەکەوە چیایەک دەستپێدەکات کە دەبێت بەسەریدا سەرکەوین، واتە تا دەگەینە دوا لووتکەی، لەوێکانە درەختێک هەیە، درەختێک دەبێت ئێستا گەورەبووبێت، گەر درەختەکە لەوێ بێت و گەورەبووبێت من لەژێریدا دەخەوم و کە هەستام چاوم چاکدەبێتەوە...».

بەوجۆرەسەریاسی سوبحەدەم و هاوڕێکانی لەو شەوی ترس و بارانەدا بەرەو دۆزینەوەی دواهەمین هەناری دونیا کەوتنەڕێ.

دواهەمین هەناری دونیا، هەنارێکی چکۆلانەیە لە کۆتایی لووتکەیەکدا کە بە پێچەوانەی ترۆپکی هەر چیایەکی تر، لەسەرەوەڕا وەک مەیدانێکی گەورەی جریتبازی تەختبۆتەوە، لەو تەختاییەدا یەک درەختی چکۆلانە

نێژراوە، لەبن ئەو درەختەوە چ شتێک نابینیت ئەستێرەنەبێت. نەسیمی شازادە«باوکی نەدیمی شازادە». چوار ساڵ بەر لەو شەوە، لەنیوەڕۆی فێنکی هاوینێکی کوێستاندا، بۆ نەدیمی دەڕوێنێت. دوای چاندنی ئەو نەمامە«کە نەسیم دەڵێت لە باغێکی سیحرییەوە هێناویەتی». ڕۆژێک لە کاتی گەڕانیدا بەدوای گژوگیای پزیشکییدا بۆ منداڵە کوێرەکەی، دوو پیاوی دەوڵەت لە ڕاوکەرانی مرۆڤ، لەوانەی بەئەندازەی ئەو سەرانەی دەیانهێنایەوە پارەیان وەردەگرت، نەسیم دەگرن و دەیکوژن، سەری لێدەکەنەوە، سمێڵی بۆ هەڵدەپاچن و لەتورەکەیەکی دەنێن و سەری بەنرخی سەری پاسدارێک دەفرۆشن. دواتر براکانی سەری نەسیمی شازادە بێگوێ بەڵام بەساغی بێئەوەی هیچی لێهاتبێت، لەحەوشی پشتەوەی دائیرەیەکی بچوک و سووتاوی ئاسایشدا لەناو سەدەها سەری دیکەدا دەدۆزنەوە. سەرێک دوای ڕاپەڕین، دوای ماوەیەکی درێژ لەو شەوەی نەدیمی شازادە و منداڵەکانی دی، بۆ دواهەمین هەناری دونیا دەگەڕان لەگەڵ لاشەکەدا یەکدەگرێتەوە و پێکەوە بە ئاسوودەیی دەچنە گۆڕێکی تازەوە.

ئەو شەوە نەدیمی شازادە، کە دەچێتە سەر گۆڕەکەی باوکی گەرچی دەزانێت ئەو لاشەیەی لەویادا خەوتووە جەستەیەکە بێسەر، لەگەڵ ئەوەشدا دوای خوێندنی فاتیحایەک بەباوکی دەڵێت «نەسیم، ئەگەرچی دەزانم تۆ سەرت نییە، بەڵام دەزانم تۆ گوێت لێمە، چونکە دەزانم ئینسان هەندێجار بەبێ گوێش دەتوانێت ببیستێت، وەک چۆن من زۆرجار بەبێ چاو دەتوانم ببینم... من ئێستا دێمەوە و دەچمەوە ژێر هەمان ئەو نەمامەی تۆ چەند ساڵ لەمەوبەر چاندت و گوتت کە گەورەبوویت وەرە ژێری و کەمێک بخەوە و چاوەکانت بکەرەوە دواتر دەتوانیت ببینیت... نەسیم ئەگەر درۆم لەگەڵدا بکەیت، ئیتر بڕوام پێتنامێنێ... نابێت درۆم لەگەڵدا بکەیت، ئەو هەنارە ئێستا گەورەبووە، من دوو ساڵە دەمەوێت بێم و ناتوانم، چونکە تۆ ئەو نەمامەت لەشوێنە حەرامەکاندا ڕواندووە،

ئاخـر نەدەکـرا لەجێگایەکـدا بیرِوێنیـت بکەوێتـە نـاو کێڵگـەو ئاوێکـی ئاسـاییەوە؟ نەدەبوایـە حیسـابی ئەوەبکەیـت مـن کوێـرم و ئاسـان ناگەمـە بن ئـەو هەنـارە...». سەریاسـی سـوبحدەم و محەمـەدی دڵشوشـە ئـەو شـەوە گوێیـان لەقسـەکانی نەدیمـی شـازادە دەگـرت و قاقـا پێدەکەنیـن، نەدیـم بێئـەوەی گوێبداتـە پێکەنینەکەیـان دەیگـووت «مـن بەکوێـری لەدایکبـووم، خـاڵ و مامەکانـم و سـواڵکەرەکان دەڵێـن ئـەوەی بەکوێـری لەدایکبێـت هیـچ دەربـارەی بینیـن نازانێـت، بـەڵام مـن دەزانـم وا نییـە، مـن هەمـوو شـتێک دەربـارەی بینیـن دەزانـم، لەبەرئـەوەی کوێرەکانیـش خـەو دەبینـن، لەخـەودا ئینسـان بەبـێ چـاو شـت دەبینیـت، بەچاوێکـی تـر کـە لـەژووری ژوورەوەیـە، واتـە لەشـوێنێکی تردایـە لەنـاو سـەری ئینسـاندا کـە جگـە لـە خـۆی کەسـی تـر نایبینێـت». ئـەو شـەوە نەدیـم بەرێـگاوە هەمـوو چیرۆکـی خـۆی گێڕایـەوە، بەسـەرهاتی منداڵێـک بەکوێـری لەدایـک بـووە و بـەردەوام بۆ ڕووناکـی دەگـری... منداڵێـک لـە منداڵیـدا هێنـدە گریـاوە باوکـی ناچارکـردووە دونیـا بـۆ دەرمانێکـی سـیحری تەیبـکات و پشـوو لەخـۆی ببڕێـت و شـار بـە شـار و گونـد بـە گونـد لەکۆڵیبـکات و بچێتـە سـەر پزیشـک و داڕوسـاز و سـیحرباز و مەرقەدەکانـی دونیـا. نەدیـم دەیگـووت «هەمـوو دەرمانەکانـی دونیـام تاقیکـردەوە، هەمـوو ئـەو مەرهەمانـەی ئینسـان دروسـتیاندەکات ناومنەتـە سـەر دیـدەم، چـی پـول و پارەیەکـم لـە سـواڵ پەیدادەکـرد دەمـدا بەدەرمـان... لێتانناشارمەوە حەسوودی بەهەرکـەس دەبـەم چـاوی هەبێـت». نەدیـم بەتانییەکـەی دەدا بەسەرسـەریدا و دەیگـووت «ئێمـەی کوێـر پێسـتمان زیاتـر هەسـت بەبـاران و سـەرمادەکات، کـە گووتیـان دەبابـەکان لەقـەراغ شـارن، کاتـم نەبـوو بگەڕێمـەوە و جلێکـی ئەسـتوورتر لەبەربکـەم... بیسـتوومە دەڵێـن سـوپا لەگوندەکانـی سـەر ڕێـگا، چـاوی سـاغەکانیان دەرهێنـاوە و کوێرەکانیـان کوشـتووە... ئێـوارە لەنـاو کوێرەکانـدا خەبـەر وا بڵاوبـوو کـە کوێـرەکان دەکـوژن... لەبەرئـەوە کاتـم نەبـوو بگەڕێمـەوە

و شتێکی گەرم لەبەرکەم، یەک چۆغەم لەبەردابوو، هێندە تەڕبووبوو لەنیوەی ڕێگا فڕێمدا، لەڕێگا کوڕێک ئەو بەتانییەی هەڵدایە سەرسەرم و گووتی «کوێرەی حیز، ئەمشەو لەسەرما وەک سەگ دەتۆپیت، بیگرە، من تاقەتی هەڵگرتنی ئەو هەموو بەتانییەم نییە، کە لە ئێران منت بینی بمدەرەوە»». سەریاسی سوبحەدەم و محەمەدی دڵشوشە پێشتر کەسێکیان نەبینی بوو هێندە قسەبکات، ئەو بێوچان لەچیرۆکێکەوە دەچوو بۆ چیرۆکێکی تر. زوو زوو دەوەستا و گۆچانەکەی دەدا بەبەردێکدا و بنەکەی لە قوڕی ڕێگا پاکدەکردەوە. هێند قسەیدەکرد ئاگایان لەڕێگا نەبوو، هەر چەند هەنگاوێک و نەدیم شتێکی نوێی دەگووت شارەزایی و دەستبالایی خۆی لە ڕێناسیدا بەیاندەکرد، جارێک دەیگووت «گەر ئێستا تاریکی و باران بهێڵێت ببینن دەبێت لەنزیک مازووە مۆرەوە بین، مازوویەکی عەجیبە دەڵێن کاتی خۆی دەرمانێکیان لێدروستکردووە، مایەسیری شاهەنشا و شابانووی پەڕاندوە» یان دەیگووت «لێرە بەدواوە ملەی هەوران دەستپێدەکات، هەر ساڵ سێ جار هەور دێتەخوارێ و وەک پشتێن لەشاخ دەئاڵێت... وادەڵێن، من دروست نازانم هەور چۆنە و چۆن لەشاخ دەئاڵێت... دەبێت ئێستا لەئاست ئەو پشتێنەیەدا بین».

منداڵێک بوو هەموو حکایەتی ڕێگاکانی لەبەربوو. بەقسەکردن ئەو بۆشاییەی پڕ دەکردەوە کە لە بینینیدا دروستبووبوو.

ئەوشەوە محەمەدی دڵشوشە و سەریاسی سوبحەدەم هێندەی قسەیان لەگەڵ نەدیمی شازادەدا کرد لە نێوان خۆیاندا شتێکی ئەوتۆیان نەگووت. دەمەوبەیان گەیشتنە سەر لووتکەیەکی ئێجگار بەرز، لووتکەیەک لە سەرووی هەورەوە، وەک دوورگەیەک لەناو دەریایەکدا هەرچوار دەوریان شەپۆلانێکی زیوین بوو لەهەور، یەکەمین تیشکی هەتاو لەسەرەوەڕا دەیدا لەوان و لەو بەحرە بێمەوداو سپییە کە جوانترین شتێک بوو تا ئەوکات

چاوی ئەو دوو منداڵە ببینێت. دونیا هێندە ساف و سپی و فێنک بوو، خۆر هێندەگەرم و دڵنەواز و خوێنبزوێن بوو، وەک ئەوەبوو منداڵان لە ئەستێرەیەکەوە فڕیبن بۆ سەر ئەستێرەیەکی تر. دونیای غەمگینی ژێر هەور چی لەو دونیا سەیر و بەرین و زیوینەی سەر ئەو لووتکەیە نەدەچوو، کە گۆڕەپانێکی گەورەی ڕووناکی بوو. شوێنێک بوو پێدەچوو بەردەکانی بەحوکمی هاوسێیەتییەکی ئەزەلی لەگەڵ هەور و ئاسمان و هەتاودا نەرمبووبێتنەوە. پێدەچوو ئەو زەوییە خودا بۆ فریشتەکانی دروستکردبێت تا لەسەفەری نێوان زەوی و ئاسماندا بۆ وچان بەکاریبهێنن. هێندەی بۆنی ئاسمانی لێدەهات، بۆنی زەوی لێنەدەهات. پێدەچوو لە مێژبێت ئینسانێک ڕێگای نەکەوتبێتە ئەوێکانە، پێدەچوو زەوی لەویادا کۆتاییبێت و مەلەکوت دەست پێبکات. بۆنێکی خودایی لەبەردەکان دەهات، بۆنێک لە بۆنی هیچ جێگایەکی دیکە نەدەچوو، بۆنی بەریەککەوتن و تێکەڵاوبوونێکی ناسک و بێئامان و بێکۆتایی زەوی لەگەڵ تریفە و هەتاو و هەوردا. ئەدیمی شازادە بەبۆندا نزیک و دووری خۆیانی لە لووتکەکە دیاریدەکرد. کە دەگەیشتنە ئەوێ ئەو نەیدەتوانی ئەو دەریا بەرین و ناکۆتایەی جوانی ببینێت، بەڵام لەگەڵ یەکەم هەنگاویاندا هاواریکرد خۆیەتی ئەمە تاقانە بستی بەهەشتە لەسەر زەوی. ئەو چوار ساڵ لەوەوبەر یەکجاری دی هاتبووە سەر ئەو لووتکەیە و بۆنی ئەو لووتکەیەی لەیادنەکردبوو. لە ناوەڕاستی ئەو ترۆپکەدا درەختێکی چکۆلانە، دار هەنارێکی سەرسام ڕوابوو. ئەوە ئەو ساتەبوو کە سەریاسی سوبحدەم گووتی «خوای گەورە سەیرکەن، ببێ و نەبێ ئەوە دواهەمین هەناری دونیایە، هیچ هەنارێکی تر نییە ئاوەها بەرز لە شوێنێکی ئاوا دووردا، لە کۆتایی دونیادا ڕوابێت». بەڵێ ئەوە دواهەمین هەناری دونیا بوو، لەو لووتکەیەدا کە زەوی تەواو دەبوو و ئیقلیمە بەرین و ئەفسوناوییەکانی خودا دەستی پێدەکرد. جێگایەک بوو، لەویادا دونیای ئێمە تەواو دەبوو دونیایەکی تر دەستی پێدەکرد. شوێنێک

بوو هەستێکی بێئەندازە سەیری بەکۆتایی و ناکۆتاش تیا دروستدەکردیت. ئەو هەنارە لەسەر تخوبی دوو مەملەکەت ڕوابوو، مەملەکەتی حەقیقەت و مەملەکەتی خەیاڵ، عەردی ڕاستی و ئاسمانی ئەفسانە.

لەسێ منداڵ دەچوون لە حەقیقەتی تاڵی ئەو ڕۆژی شکستە ڕایانکردبێت و ڕوویان لەزەمینێکی ئەفسانەیی کردبێت. سێ منداڵ کە هەڵزانانیان بەو شاخەدا بەرەو جێگایەکی بردبێتن لە دەرەوەی هەقیقەتی ژیان. ئەو ڕۆژە نەدیمی شازادە لەو بەر هەتاوەدا کە سیحری هەموو وەرزەکانی لە خۆیدا تێکەڵکردبوو، بەئومێدی ئەوەی چاکببێتەوە لەژێر دواهەمین هەناری دونیادا خەوت. سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشە لەسەر ئەو لووتکەیە بەرابەر دەریای بێسنووری هەور دانیشتن و هەریەکەیان چیرۆکی خۆی بۆ ئەوی تر گێڕایەوە. لەویادا بۆ یەکەمجار سەریاسی سوبحدەم هەنارەشوشەکەی گیرفانی دەرهێنا و بەمحەمەدی دڵشوشەی گووت لە منداڵییەوە ئەو هەنارە لەگەڵیایەتی، نازانێت چییە و مانای چییە، بەڵام شتێک لەساواییەوە فێری بووە ئەوەیە نابێت واز لەو هەنارە بهێنێت، نابێت بیفەوتێنێ و جێیبهێڵێ و فەرامۆشیبکات. هەنارێکی بێئەندازە جوان، ڕوون، درەوشاوە. ئەو بەیانییە کە تیشکی خۆر دەکەوتە سەر ئەو شوشەیە شەبەنگێکی چکۆلانەی تیشکی لەدەوری خۆی دروستدەکرد، محەمەدی دڵشوشە بەجۆرێک دەستی بە ڕووناکی هەنارەکە سووردەبوو، وەک ئەوەبوو دەستی لەخوێناوی باڵندەیەکدا شتبێت. لەو ساتەوە محەمەدی دڵشوشە مەراقێکی تیا دروستدەبێت چیرۆکی ئەو هەنارە شوشەیە بدۆزێتەوە. هێندەی ئەو تۆپە خڕ و ئەفسوناوییە دەگرێت بەدەستییەوە، دەزانێت نهێنییەکی قووڵ و گەورە لە پشت ئەم هەنارە دەستکردەوەیە. لە ساتێکدا کە سەرسام تەماشای ئەو دەریا ئەفسانەییەی هەور دەکات، چاوی جارێک لەسەر جوڵە و گۆڕانی بەرز و نزمییەکانی ناو هەورە و جارێک لەسەر سیحری ئەو هەنارە

شوشـەییەیە، لەویـادا بەسەریاسـی سـوبحدەم دەڵێـت «گـەر نەمـرم، نهێنـی ئـەم هەنـارە دەدۆزمــەوە».

ئـەو ڕۆژە لەکاتێکدا لەسـەر زەوی بـاران دەبارێـت و سـەدان هـەزار ڕەوکـەر بەڕێگاوبانەکانـی دونیایەکـی پـڕ لەشـەختە و لیتـەدا بڵاوبوونەتـەوە. سەریاسـی سـوبحدەم و محەمـەدی دڵشوشـە لەسـەروو هەورەکانـەوە، قسـە لەسـوود و زیانـی دۆزینـەوەی نهێنییـەکان دەکـەن. بەڵـێ دۆسـتان لـەو ساتەدا ئێـوە هەمووتـان لەژێـر بارانـدا بـوون، ئـەو دوو منداڵـە تاکـە دوو کەسێک بـوون لەژێـر هەتـاودا. ڕۆژێکـە ڕۆشـنی و سـپێتی و ڕووناکـی تونـد بەیەکیانـەوە گرێـدەدا. لـەو سـاتەدا کـە زەوی لەنـاو حەقیقەتـە خوێناوییەکانـی خۆیـدا ونبـووە، ئـەوان دەرگای ئەفسـانەیەک لـە خۆیـان دەکەنـەوە. ئەفسـانەیەک وەک هەموو ئەفسانەکانی دی ناتوانێـت تاسـەر مـرۆڤ لـەزەوی جودابکاتـەوە، بەڵام دەتوانێـت بیخاتـە سـەر خەیاڵاتێـک تـا مـەرگ هـاودەم و هاوڕێـی بن. ئـەو ڕۆژە سـەریاس جـار لـەدوای جـار دەڵێـت «ئەمـە دواهەمیـن هەنـاری دونیایـە ... هیـچ هەنارێکـی تـر نییـە لە شـوێنێکی وا عاسـی و بـەرزدا بڕوێت». ئـەو خەیاڵـەی کـە دونیـا لـەم لووتکەیـەدا تەواودەبێـت، وادەکات هەردووکیـان وەک درەختێکـی سـەیر و پـڕ نهێنـی تەماشـای ئـەو تاکـە هەنارەبکـەن کە لـە کۆتایـی زەمینـدا ڕواوە. ئـەو دوو منداڵـە لـە ژێـر ئـەو درەختـەدا هەسـتیان بەئارامییەکـی قووڵکـرد، ئارامییـەک جارێکـی دی لەهیـچ جێگایەکـی دیکـەی دونیـادا هەسـتی پێناکەنـەوە، ئارامییـەک کـە دەشـێت ئارامـی نزیکـی بووبێـت لـە خـوداوە، یـان هێمنـی دووری بووبێـت لـە مەترسـییەکانی زەوییـەوە، یـان ئاسـوودەیی دوو منـداڵ بێـت هەردووکیـان لەناخیانـدا دەزانـن زوو دەمـرن، سـەر بـەم زەمینەنیـن و وەک دوو فریشـتەی چکۆلانـە میوانێکـی ڕاگـوزەرن و دەبێـت بـڕۆن.

مـن پێموایـە هەمـوو ئـەو منداڵانـەی زوو دەمـرن ئولفەتێکـی قووڵتریـان بەئاسـمانەوە هەیـە.

هەموو ئەو بەختەوەرییە گەورەیەی ئەو دوو منداڵە لەو سەر ترۆپکی ڕووناکییە چەشتیان، شادیی و شوریکی تێپەڕبوو.

لەبیرتاننەچێت ئەو ڕۆژە ڕۆژی کوێری بوو. ڕۆژێک بوو ئینسان نەیدەزانی ڕووبکاتە کوێ، سەدان هەزار مرۆڤ لەماڵ و خانەی خۆیان ئاوارەبووبوون و هیچیان دەربارەی سبەینێ نەدەزانی. کەس نەیدەتوانی پێشبینی سەعاتێکی دیکەی ژیانی خۆی بکات، کەس نەیدەزانی چەند هەنگاوێکی دی لەکوێ خۆی دەدۆزێتەوە. ئەو سێ مێردمنداڵە لاوازە کە جودا لە هەمووتان چووبوونە سەر لووتکەیەکی بەرز لە سەروو هەورەکانەوە، بەدەرنەبوون لەو کوێرییە.

ئێستا کە بیردەکەمەوە دەبینم، ئەو منداڵانە هەر سێکییان بەجۆرێک لەجۆرەکان لە تاریکی و نەبینین هەڵدەهاتن.

ئەوە تەنیا نەدیمی شازادە نییە دژ بە کوێریتی خۆی شەڕدەکات، بەڵکو محەمەدی دڵشوشە و سەریاسیش هەمان شێوە لە جۆرە کوێرییەکی دیکە هەڵدێن.

کاتێک سەریاسی سوبحدەم لەگەڵ کوێرێکدا سەر لووتکەیەکی عاسی دەکەوێت، دەبێت جگە لە دیدە و بینایی بۆچی دیکە گەڕابێت؟ من دڵنیام ئەو شەوە لەناو ئەو لێزمەی باران و هەراو شڵۆغییە مەزنەدا کاتێک نەدیم لەسەر ڕێگاکان دەوەستێت و بەو دوو کوڕە دەڵێت کۆمەکیبکەن تا دووبارە ڕۆشنایی و بینین بدۆزێتەوە، هەردوو ئەو دوو قەڵەندەرە چکۆلانەیەش لەناخیاندا هەستیان بەوە کردووە کە ئەوانیش بەجۆرێک لە جۆرەکان پێویستیان بەدرەختێکە ڕۆشناییان بداتەوە.

کاتێک نەدیمی شازادە دوای خەوێکی درێژ لە خەوهەستا، چاوانی وەک خۆیان بوون، وەک هەمیشە کوێربوو، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک لە ئاسوودیی و ئارامی لە سیمایدا بوو. کە هەستا گوتی «نا هیچ

نابینم، وەک خۆمم، وەک هەموو ڕۆژەکانی دیکەی ژیانم کوێرم... بەڵام لەو کاتەوەی خەوتووم، قسەلەگەڵ باوکمدا دەکەم، ئەو هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردمەوە». کە قسەیکرد هێمنی و تەسکینییەکی قووڵ لە دەنگیدابوو. دوو مێردمنداڵەکەی دیکە، چاوەڕوانیاندەکرد بگری، سەر بدات بەبەردەکاندا، لقەکانی درەختەکە بشکێنێت، بەردەکان هەڵگرێ و بیگرێتە ئاسمان، کفریکات، هەنار ڕاوەشێنێت، سینگی خۆی زامداربکات، بەڵام نەدیمی شازادە بە هێمنی لقی هەنارەکەی ماچکرد و گووتی «تۆ درەختێکی موبارەکی...». ئەو ڕۆژە نەدیمی شازادە لە کاتێکدا لەگەڵ دوو هاوڕێ تازەکەیدا بەناو هەورەکاندا لە چیاوە دادەبەزین، لەڕێگا لەناو تەمێکی چڕدا کە ئەو نەیدەبینی چیرۆکی خەوتنی خۆی بۆ محەمەدی دڵشوشە و سەریاس گێڕایەوە، لەخەویدا باوکی هاتبووە ژێر ئەو هەنارە چکۆلەیە و پێیگووتبوو «نەدیمی شازادە، کوڕە چکۆلانەکەی من، ئەی شیرنترین کوڕی دونیا، دەزانم ئەو چەند ساڵەی دوای مردنی من چەند ناخۆش ژیاویت، پێم حەیفە لەدوای مردنی منەوە مەجبوربوویت دەست پانبکەیتەوە تا بژیت، مەجبوربوویت لەسەر شۆستە و ژێر هەیوانی مزگەوت و ناو کەلاوەکاندا بخەویت... تۆ خۆشەویسترین کوڕی دونیایت... ئیتر لە مەودوا دەبێت ئازاتربیت... تۆ ئێستا لەخەو هەڵدەستیت و چاوانت وەک خۆیەتی... نا... نەدیمی شازادە من درۆم لەگەڵ نەکردویت، تۆ ڕۆژێک لەڕۆژان دەبیتە خاوەنی دوو چاوی ڕوونتر و گەشتر لەچاوی ئینسانەکانی تر، بەڵام ئینسان بۆ ئەوەی دووبارە بینایی خۆی بدۆزێتەوە، دەبێت زۆر هەوڵبدات، ئینسان دەبێت بتوانێت زۆر شت تێبگات و زۆر زەحمەت بچێژێت تا بتوانێت ببینێت، بەڵام ڕۆژێک تۆ دەبیتە خاوەنی دوو چاوی ڕوون، مەرج نییە ئەو چاوانە وەک چاوی ئینسانەکانی تر بن، نا نەدیمە چکۆلانەکەی من، ئینسانەکان هەموو بەکوێری لەدایکدەبن... هەموو ئینسانەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە... چ کەسێک نییە، کە لەدایکدەبێت

بتوانێت ببینێت، وامەزانە ئەوانەی چاویان هەیە دەتوانن ببینن، چ شتێک لەدونیادا لەبینین زەحمەتتر نییە، دەکرێت ئینسان دوو چاوی گەش و ڕوونی هەبێت، بەڵام هیچ نەبینێت... نەدیم شازادە چکۆلەکەی من، من ناتوانم یارمەتیتبدەم، بەڵام ئەم هەنارە دەتوانێت یارمەتیتبدات، دەبێت ئەو بڕوایە لەخۆتدا دروستبکەیت کە ئەم هەنارە لە هەنارەکانی تر ناچێت... ئیتر مەترسە، تا کوڕی من... دەبێت لەو شەوەزەنگە نەترسیت کە لەناوتدایە، دەبێت نائومێدنەبیت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەناوەوەت تروسکایی و ڕووناکییەک دروستدەبێت، تا ڕۆژێک وات لێدێت بەبۆندا میوەی بەدو میوەی شیرین لە یەک جیابکەیتەوە، بەدەنگدا خواست و موراد و نهێنییەکانی دەروون ببینیت، بەهەناسەدا لە ئەسڵ و فەسڵی شت تێبگەیت. بەسەلیقە هەموو نەخشەی ڕێگاو بانەکان دێنە سەرتەوە، ئیتر کوڕی شیرینم قەت وننابیت، ئەگەر جێگایەکیشت لێگۆڕا دەچیتەسەر جێگایەکی تر کە لە جوانیدا لەوی تر کەمتر نییە... ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆ دەتوانیت ببینیت، بەڵام بەر لەوەی ببینیت دەبێت بگەڕێیت و مەعنای بینین تێبگەیت، حیکمەتی چاو فێربیت... نەدیم، ئەوانەی منیان کوشت چاویان هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی من ببینن، من لە پاوەنێکدا بۆ کۆمەڵێک گژوگیا دەگەڕام بیکەم بەدەرمان بۆ چاوی تۆ... وامەزانە ئەوانەی چاویان هەیە دەتوانن ببینن، هەروەختێک ماندووبوویت وەرەژێر ئەم درەختەوە، ئەم درەختە درەختی من و تۆیە کە هەردووکمان پێکەوە ڕواندومانە... ئەم درەختە ئاسوودەیت دەداتێ، بڕۆ دونیا بگەڕێ، وەک من باغ بەباغ عەوداڵی مەرهەم بە، قەت ماندوو مەبە لەوەی باوەڕبێنیت ڕۆژێک لەڕۆژان تۆش دەبیتەخاوەنی دوو چاو... ئەم درەختە درەختی بینینە... بڕۆ نەدیمی چکۆلانە، هەر وەختێک پێویستت بەمن بوو وەرە ئێرە و بانگمبکە... غەم مەخۆ من هەمیشە لێتەوە نزیکم...».

نەدیمی کوێر کە دەگەیشتە ئەویا دڵی پڕدەبوو لەگریان و دەیگووت

«ئەو لەگەڵمدایە... نزیکە لێمەوە».

ئەو ڕۆژە نەدیمی شازادە بەئیرادەیەکی ترەوە لەو شاخە دەهاتەخوارێ. لەکاتێکدا ئێوە هەموو چاوساغەکانی ئەم وڵاتە خۆتان ونکردبوو، ئەو کوێرە چکۆلانەیە باوەڕی بەنەبینینی خۆی لەباوەڕی ئێوە بەچاوی خۆتان گەورەتر بوو. کوڕێکی قژخاوی چکۆلانەبوو، بەجوتێ چاوی سپی و ڕوخسارێکی باریک و دوو لێوی ئەستورەوە، بەدەرنەبوو لەو ڕەنگزەردی و ژاکانەی هەر منداڵێکی بێناز لەو تەمەنەدا هەیەتی. وەک هەر چاوساغێک بەسەر بەردەکانی ئەو ڕێگا سەختەدا دادەگەڕایە دامێن و دەیگووت «ئا، ئەو درەختە درۆی لەگەڵدا نەکردووم. من ئێستا دوو شت دەبینم کە پێشتر نەمدەبینی... ئێوەو باوکم. بەهۆی ئەو درەختەوە ئێوەم بینی، بەهۆی ئەو درەختەوە باوکمم بینی... کەواتە درۆی لەگەڵدا نەکردووم».

ناتوانم وەسفی ئەو خۆشحاڵییەتان بۆ بکەم کە ئەو سێ کوڕە هەستیان پێدەکرد. دەبێت بەچ بەختیارییەکەوە لەچیا هاتبێتنەخوارێ؟. سەریاس و محەمەدی دڵشوشە خۆشحاڵبوون بەوەی نەدیم ئاسوودە و ئارامە و هەستدەکات شتێکی بینیوە. ئەوانیش سەرسامی ئەو دڵنیاییەبوون کە لەژێر دواهەمین هەناری دونیادا هەستیان پێکردبوو. لەدامێنی ئەو چیایەدا سوێنددەخۆن کە بگەڕێنەوە ژێر ئەو درەختە، بەڵام ئەو کات هیچیان نازانن کەی و چۆن و لەچ وادەیەکی سەیر و نهێنیدا دەبێت بگەڕێنەوە.

ئەو ڕۆژانەی لە دوی ئەو کۆچ و ڕەوە گەورەیەوە هاتن، هەر سێ ئەو منداڵە چەند هەفتەیەک پێکەوەژیان، چەند هەفتەیەک تا هەتاهەتایەکردنی بەهاوڕێیەکی هەمیشەیی. دروست نازانم چەند پێکەوەبوون، بەڵام دەزانم ئەوان وەک سەدان هەزار کەسی دیکە ئاوارەی سنوور نەبوون، بەڵکو لە خەرابات و کەلاوەی شارۆچکەیەکی ڕوخاودا مانەوە، لەوێ مس فرۆشێک کە گوێناداتە هیچ بەندوباوێکی دونیا، گوێناداتە گۆڕانی زەمان

و تێکچوونی زەمین، یەکێک کە لە هەموو سەردەمەکاندا بەدوای مس و فافۆندا دەگەڕێت، یەکێکە لەوانەی گەر پاشاکان بمرن ئەوان هەر بەدوای فاکی خۆیان دەکەون، میللەتەکان شکستبخۆن یان سەرکەون ئەوان لە خەراباتی سەرکەوتن و شکستیاندا هەر گەمەی خۆیان دەکەن، ئەو سێ منداڵە دەخاتە نیشەوە. پیاوێکی چکۆلانەی خڕ و موزەردە، بەلووتێک بەئەندازەی تەماتەیەکی گەورە، دوو چاوی هەیە بەچاوانی یەکێک دەچێت هەفتەیەک لەدۆزەخ بووبێت و گەڕابێتەوە. ناوی «عەباسی فافۆنە» کە یەکەمجار ئەو منداڵانە دەبینێت، پێیاندەڵێت گەر کۆمەکیبکەن، دەتوانن بەمانگێک سامانێکی گەورە کۆبکەنەوە. ئەو دەستی ئەو منداڵانە دەگرێت و دەیانخاتە ناو هەرێمێکی مەزن و بێکەرانەوە، هەرێمێک سێ ساڵە مرۆڤێک پێی تێنەخستووە، کێڵگەیەکیان نیشاندەدات و پێیاندەڵێت «هەشت ساڵی ڕەبەق لێرەدا جەنگ بووە، ئەم ناوچەیە پڕێتی لە هەزار قەوانی گوللەتۆپ، کە دۆڕاوەکان فریانەکەتوون کۆیانبکەنەوە و براوەکانیش نەگەیشتوونەتە سەریان، تێدەگەن ئەوەچ سامانێکە، چ سەروەتێکە... گەر بتوانین چەند هەزار گوللەتۆپێک کۆبکەینەوە هەر چوارمان دەوڵەمەند دەبین». پیاوێکەدەزانێت ئەو زەوییە پڕێتی لەسەدان هەزار مین، دەزانێت خۆی ناتوانێت توخنی ئەو ناوچانە بکەوێت، دەزانێت ئەو منداڵە نەشارەزایانە دەتوانن بێترس بچنە هەموو کون و کە لەبەرەکانەوە. نەدیمی شازادە هەر ڕۆژەی لەگەڵ یەکێکیاندا دەڕوات، ئەو تەنیا دەتوانێت لە هەڵگرتنی قەوانەکاندا کۆمەکیانبکات، لەو چەند هەفتەیەدا دەچنە ناو دەیان شوێنەوە کە لەدوای کۆتایی جەنگەوە کەس پێی تێنەخستوون، ئەو چیا و چاڵانە دەبینن کە پڕن لە لاشەی سەربازی کوژراو، ئەو مردووانەی ئێسکەکانیان لەناو بەدلە و پۆستاڵەکانیاندا جێماوە. ئەو لاشانەی مردوون و سەیری ئاسمانیان کردوە، دەمیانکردۆتەوە و مردن دڵۆپ دڵۆپ چۆتە گەروویانەوە، دەستیان بەرزکردۆتەوە هاوار لەخودا

بکەن و ڕۆحیان دەرچووە... سەریاسی سوبحەم و محەمەدی دڵشوشە ماوەیەک لەناو ئەو مردووانەدا ئیشدەکەن، ڕۆژانە سەدان قەوانی تۆپ لە گوێدرێژێکی نەخۆشی چکۆلانە باردەکەن و دەیگەێننە سەرجادە و عەباسی فافۆن لەتراکتۆرێکی کۆندا باریاندەکات و دەیانبات، ئەو ماوەیە هەر سێ منداڵەکە لەژێر چادرێکی چکۆلانەدا دەژین. لەو ماوەیەدا دەبنەسێ دۆستی هەمیشەیی، سێ منداڵن هیچ لەو یارییە ترسناکە نازانن کە دەیکەن، نازانن ئەوان چوونەتە ناو هەرێمی مردن و ئیدی تاهەتاهەتایە نایەنەدەرێ. ئەوان لەوێ لەناو پاشماوە و خەراباتی شەڕێکی دوورو درێژدا دەبنە هاوڕێ. لەو شەوانەدا سەریاس باسی منداڵی خۆی دەکات لەگوندەکان، لەسەر مەرزەکان، لە کەلاوەی موجەمەعە تازەکاندا، لەناو شۆفێر و خزمەتچی و ولاغدارەکانی سەر سنووردا. لەویادا کینەیەکی گەورەیان بەرابەر بەشەڕ تیا دروستدەبێت، لەویادا محەمەدی دڵشوشە دەڵێت «من لەعەشقدا دەمرم...». قسەیەک بۆ ئەو کات پێکەنیناوی و بێمانا دێتەبەر چاو و دوو هاوڕێکەی تا سنووری مردن پێیپێدەکەنن. لەویادا باس لەمۆسیقایەکی ئاسمانی دەکات بەردەوام لەگوێیدا دەزرینگێتەوە، بەستەی کلیل و مەدالیاکانی خۆیان نیشاندەدات و دەڵێت هەر یەکێک لەو کلیلانە کلیلی دەرگایەکی خەیاڵییە، ناوی کلیلەکانیان پێدەڵێت و قسەش لە دەرگایەک دەکات کە یەکێک لە کلیلەکانی لەباراندا دەیکاتەوە. لەژێر ئەو چادرەدا هەموو تێدەگەن ژیانی سەریاسی سوبحەم نهێنییەکی بێئەندازە ئاڵۆزە، لەو شەوانەدا ئارەزووی بێسنووری محەمەدی دڵشوشە بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن لەنهێنییەکان ئاشکرادەبێت، لەو شەوانەدا کە لەبەر ئاگرێک دادەنیشن، محەمەد دەڵێت «"حەزدەکەم هەموو شتێک لەسەر هەموو شتێک بزانم... بزانم تۆ کێیت؟ ئەو هەنارە شوشەیە چییە؟».

گومانم نییە ئەو خۆشەویستییە گەورەیەی لەو چیا دوورانەدا، لەناو

لاشـە و بـۆی مـردن و مەلمەسـی سـاردی قەوانـی گوللەتۆپەکانـدا پێدەگرێـت، تـا کۆتایـی لەگـەڵ ئـەو هـاوڕێ چکۆلانانـەدا دەمێنێتـەوە... ئەوکاتـەی محەمـەدی دڵشوشـە، لەڕەبییـە کۆنەکانـدا، لەچـاڵ و نشـێوی هەردەکانـدا بـۆ پاشـماوەی گوللەتـۆپ و گوللـەی هـاوەن و موشـەکی نەتەقیـوی فڕۆکـەکان دەگەڕێـت، باوکـی و دایکـی هەمـوو دونیـای بـەدوادا تەیدەکـەن و نایدۆزنـەوە، هەمـوو ڕۆژێـک پێشـمەرگە و پاسـەوانەکانی سلێمانی مەزن بەخۆیـان و تویۆتا پـان و جێبـە چکۆلەکانیانـەوە سـەرمەرزەکان دەگەڕێـن و جـاڕ بـۆ کوڕێکـی منداڵـکار دەدەن کـە دەترسـن لەکەندێـک یـان لاڕێگایەکـدا مردبێـت. ڕۆژێـک محەمـەدی دڵشوشـە لەگـەڵ منداڵـە کوێرەکـەی دۆسـتیدا لەکێڵگەیەکـدا و لەهەتـاوی فێنکـی بەهـاردا قەوانـی گوللەیەکـی بێئەنـدازە گـەورە بـۆ قەراغـی جادەیەکـی خـۆڵ دەگوێزنـەوە، لـەو کاتـەدا جێبێکـی ئەمریکـی خۆڵەمێشـیی لـەو شـەقامەوە تێدەپـەڕێ و یەکێـک لەپەنجەرەکـەوە هـاواردەکات «ئـەوە محەمـەدی دڵشوشـەیە... ئەوەتـا ئـەوە خۆیەتـی... خۆیەتـی». بەپرتـاو دوو کـەس لەجێبەکـە دادەبـەزن و بێئـەوەی هیـچ بڵێـن، باوەشـی پیادەکـەن و لەقەفرتێکانـی دەگـرن و دەیفڕێننـە نـاو ماشـێنەکەوە. نەدیمـی شـازادە جگـە لـە چەنـد هاوارێکـی کورتـی محەمـەد کـە دەڵێـت «دامنێـن، بەرمـدەن... بەرمـدەن... وازم لێبهێنـن» هیچـی دیکـەی گـوێ لێنابێـت.

ئەوەسەرەتای یەکەمین جیابوونەوەی ئەو سێ منداڵەیە لەیەکتر.

ڕۆژی دواتـر عەباسـی فافـۆن بـەدوو کوڕەکـەی دیکـە دەڵێـت «خوشـکێکم لەزێـدا خنـکاوە، مـن دەڕۆم بـۆ باشـور... کەهاتمـەوە حیسـابدەکەین».

ئیتـر کەسـیان عەباسـی فافـۆن نابیننـەوە کـە سـاڵانێک دواتر لـە هاوینێکی گەرمـدا لەکێڵگەیەکـی دووردا گوللەتۆپێکـی کۆنـی پیادەتەقێتـەوە و لەسـەر خـۆڵ و وردە بـەرد و دڕک و کەرتەشـی هاوینـدا پارچەپارچەدەبێـت.

# ١٢

لـەدوای مردنـی سەریاسـی سـوبحەم و پـەرش و بڵاوبوونـەوەی لەشـکری عەرەبانـەکان خوشـکە سـپییەکان جۆرێـک لـە گۆشـەگیری قـووڵ دەژیـن. دوای تەواوکردنیـان بـۆ خانـەی مامۆسـتایان، ئیکرامـی کێـو یارمەتیانـدەدا لەگوندێکی دوور ببن بـە مامۆسـتا، هـەر دووکیـان خانـووە چکۆلانەکەی شـار بەجێدەهێڵن و بەرەو گوندێکی باکوری شـار دەڕۆن، قوتابخانەکەیان بینایەکی نوێـی تـا ئەندازەیـەک گەورەیـە کـە یەکێـک لەڕێکخـراوە مرۆڤدۆسـتەکان دروسـتیکردووە... ئـەو بەیانییـەی مـن و ئیکرامـی کێـو لـە دەرگامانـدا، لەڕاسـتیدا لـە دەرگای ئـەو قوتابخانەیەمـان دەدا، کـە وادروسـتکرابوو لـە بەشـی پشـتەوەی جێگـەی خەسـتەخانەیەکی چکۆلانـەش ببێتـەوە، بـەڵام لەبـەر هـەر هۆیـەک بێـت ئـەو بەشـەی پشـتەوەی هەمیشـەبەچۆڵی مابـووەوە. ئـەو بەیانییـە کـە گەیشـتینە ئـەوێ و دەرگایـان لێکردینـەوە، مـاڵ و ئاوەدانییەکـی ڕوونـاک و تەواومـان بینـی... ئـەو دوو کچـە ژیانێکـی ئارامیـان بـۆ خۆیـان دروسـتکردبوو. جگـە لـە ئیکرامـی کێـو و هەندێجـار سـلێمانی مـەزن کەسـی دی هاتوچـۆی نەدەکـردن... ژیانیـان لـە ئامێـزی ئـەو سروشـتە گەورەیـەدا کەمێـک هێمنـی و ئاسـوودەیی پێبەخشـیبوون، لـەوێ بەجووتـە دەسـتیان دەگـرت و لـە نـاو بـاغ و سـەوزی و بێسـتان و کێڵگەکانـدا پیاسـەیاندەکرد و گۆرانیـان دەگـووت، بەیانیـان زوو پێکـەوە دەچوونـە ڕۆخـی چـەم و لەویـادا قژیاندەکـردەوە و لەسـەر بـەرد و سـەوزی و گیـا و شـەونمی

بەیانیاندا دەیاندایە بەر با... دوو سەیرترین قژیان هەبوو، من هەستدەکەم قژیان ناکۆتا درێژبوو، وەک تۆفانێک بوو لەوسەری دونیاوە هاتبێ و لەسەر سەری ئەوان ڕوابێت. عادەتێکی سەیربوو، هەموو شەوێک با بێت یان باران، بەفر بێت یان شەختە دەبایە بچنەسەر ئەو چەمە و لەسەر بەردەکان دانیشن و گۆرانی بڵێن. خەڵکی ئەو گوندە هەرگیز وەک دوو مامۆستا سەیریان نەدەکردن، بەڵکو وەک دوو فریشتە کە خودا لە شوێنێکی دوورەوە ناردبێتنی بۆ ئەو گوندە، پەیوەندییەکی سەیر و پڕ لە ئارامی و دڵنیاییان لەگەڵ گوندنشینەکان هەبوو. ئەوان بوونەوە دەلیلی من بۆ ناو دونیا. من سبەی شەو باسی ئەو دوو شەوەتان بۆ دەکەم کە سەرەتای گەڕانەوەی من و سەرەتای ونبونی منیش بوون، شەوێکیان پێیدەڵێم شەوی مردن و شەوێکی دیکەیان پێیدەڵێم شەوی زیندوبوونەوە. شەوی مردن ئەو شەوەبوو کە لەگەڵ خوشکە سپییەکاندا چووینە سەر گۆڕی سەرپاسی سوبحەدەم. ئەوە شەوی دووەمی ئازادیم بوو، ئێوارە هەردوو خوشکە سپییە کە هاتن و پێیانگووتم «سەرپاسی سوبحەدەم برای ئێمەبوو» ئەوان کۆی چیرۆکی ئەو ڕۆژە سەیرانەیان بۆ گێڕامەوە، حکایەتی ئەو پەیمانەیان باسکرد کە لەبن هەنارێکی دووردا لە شار هەڵیانگرتووە. سەیرترین شت لەلام ئەوەبوو کە زانیم سەرپاسی سوبحەدەم لەو پێدەشتە نزیکانەدا نێژراوە، لەناوەڕاستی تەختانییەکی گەورەدا، لە کێڵگەیەکدا لە گڵەسوور کە زەمانێک لەوەوبەر ڕاوکەرەکان کوڵەو بنەی ڕاویان بۆ کەو و کەروێشک و ڕێوی تیا دروستدەکرد.

سەیربوو کە زانیم ئەو کچانە هەموو هەفتەیەک دەچنەسەر ئەو گۆڕە تەنیایە... سەیربوو کە زانیم ئەوان بۆیە لەم گوندەدا بوونەتە مامۆستا، چونکە لە دواهەمین ئارامگای سەرپاسەوە نزیکە.

کە شتەکانیان باسدەکرد لەرەی گومانێک و زرینگەیەکی قووڵی دووردڵی لەگەڕویاندا بوو. تا گەر خۆیان نەیانویستایە هیچ کەسێک نەبوو

ڕازەکانیـان ببینێـت. لـە مردنـی سەریاسـەوە یەکـی دوو ڕەفتـەی ڕەشـیان بەسـتبوو بەگەردنیانـەوە و فڕێیاننەدابـوو. یەکەمیـن ڕۆژی یەکتـر ناسـینمان دەسـتیانکردە ملـم و گووتیـان « ئـەو برامـان بـوو... تـۆ گـەر دەتەوێـت دەتوانیـت لەگـەڵ ئێمـەدا بژیـت». مـن شـتێکی سـەیربووم بـۆ ئـەوان، وەک چـۆن مـن هیـچ ئادەمیزادێکـم نەبینیبـوو بەئەندازەیـەی ئـەوان ئەفسـونی کۆکردبێتـەوە، ئەوانیـش کەسـێکیان نەبینیبـوو ئاوەهـا ڕەنگی سـاڵانێکی دوور و درێـژی تەنیایـی هەڵگرتبێـت. مـن بۆنێکـم هەبـوو وەک بۆنـی ئەبەدییـەت، بۆنـی یەکێـک کـە لـە دەرەوەی زەمانـەوە هاتبێـت، یەکێـک لـە شـتێکی قووڵـدا لەگـەڵ ئەوانـدا تەبابـوو، ئەوانیـش بەجۆرێـک لـە جۆرەکان دوو کـچ بـوون دەیانویسـت لـە دەرەوەی دونیـا و شەڕوشـۆڕو سیاسـەت بژیـن. شـتێکی سـەیربوو بەلامـەوە کـە ئـەوان نـاوی زۆربـەی حیزبەکانیـان نەدەزانـی، گوێیـان لـە ڕادیـۆ نەدەگـرت، ڕۆژنامەیـان نە دەخوێنـدەوە... شـورایەکیان بەگۆرانی لە دەوری خۆیـان هەڵچنیبـوو، دواتـر زانیـم هەتـا گۆرانییەکانیشیان چ بـە وشـە و چ بەئـاواز گۆرانـی خۆیـان بـوون. سـیحربازنەبوون بـەڵام پێشـئەوەی ئـازار پێبـگات، بریـن نزیکبێتـەوە هەسـتیان پێدەکـرد. ئـەو ڕۆژەش کـە سـەریاس مـرد چەندەهـا جـار ئاگاداریانکـردەوە، بـەڵام بێسـوودبوو. پەیوەندیـان لەگـەڵ شـەیتانەکاندا نەبـوو، بـەڵام هەسـتدەکەم پەیوەندییـان لەگـەڵ هێزێکـی نادیـار و تەمـاوی سروشـتدا هەبـوو. بێئەنـدازە ئازادبـوون، لەوپـەڕی ئازادییـەوە جەسـتەی خۆیـان لەهەمـوو پیاوانـی دونیـا حەرامکردبـوو. ئـەو سـوێندەی بەمنداڵـی بـۆ یەکیـان خواردبـوو تەوقێـک نەبـوو کردبێتیانـە ملیـان، بەڵکـو هێدیـ هێـدی بووبـووە جۆرێـک لەشـێوازی ژیـان، جۆرێـک لەحەقیقـەت کە لـە بوونیـان جیانەدەکرایـەوە. دوو ئافـرەت بـوون بـێ هیـچ ئارەزوویـەک جگـە لـە ئـارەزووی سەربەسـتییە بچوکەکانـی خۆیـان، ئـارەزووی ئـەوەی شـەو بگەڕێن، نەترسـن، شـەرم لـە گۆرانییەکانـی خۆیـان نەکـەن. نەیاندەتوانـی لەیەکتـر جیاببنـەوە، ئـەو ماوەیـە کـە لەگەڵیانـدا ژیـام، لـە نزیکـەوە هەمـوو ئـەو

ڕەفتارە سەیرانەم تیابینین، دوو کچ کە سروشتی دوو ڕۆحی شەوگەڕیان هەبوو، بەیانیان لەو چەمەدا دەموچاویان دەشت، هەمیشە هەستمدەکرد کراسەسپییەکانیان پڕێتی لەقەترەی شەونم. منیش سەرەتا لە چاویان دەترسام، هیچ کەسێک نییە لە چاویان نەترسابێت، شتێک لە نیگایاندا بوو مردن و ئەبەدییەت و بەحر و ناکۆتای وە یاداەهێنایتەوە. نا، دوو کچ نەبوون تەفسیربکرێن... پیاوان بتوانن بیانخەنە ناو قاڵبی چیرۆک و فەنتازیاکانی خۆیانەوە. گەڕانەوەیان بۆ ئەو گوندە، ژیانیان لەناو ئەو منداڵانەدا هەڵهاتن نەبوو، بەڵکو خۆپاراستن بوو، خۆ بەهێزکردن بوو دژ بەترسێکی نادیار. دوو کیژ بوون هەڵهاتنیان نەدەزانی، بەڵکو دوو نهێنی بوون لە تەلیسمە گەورەکانی دیکەی ناو وجود جیانەبووبوونەوە. ژیانیان لە شاردا، قریشکەیەکی قووڵ و گەورەی سروشتی لەناودا نەخنکاندبوون. من هەستدەکەم هەموو شەوێک کاتێک دەستی یەکیان دەگرت و دەڕۆیشتن وەڵامی هاوارێکی دووریان دەدایەوە، هاوارێک لە توانای ئێمەدا نەبوو بیبیستین. مەرج نییە ئەو هاوارە لەیەک جێگا و یەک شتەوە هاتبێت، گرنگ ئەوەبوو ئەوان کە وێڵدەبوون بۆ شتێک دەگەڕان، هەستێکیان هەبوو کە دەنگێک لەدوور بانگیاندەکات، هەمان ئەو هەستەی من لە سەحرادا هەمبوو، هەمان ئەو هەستەی من لە بیاباندا گیرۆدەیبووم. لەوانەیە ئەو شتە گوڵێکی کێو بووبێت، برینی کوشندەی سەر سنگی باڵندەیەک بووبێت، هەناسەی زێڕینی پاسارییەک بووبێت، چریکەی بەردێک بووبێت کە شتێک هێنابێتییە زمان، نرکەی پارچەیەک زەوی بووبێت کە لە گێژبوون و ترس و مۆتەکەی درەختەکانی خۆی هەڵهاتووە. مرۆڤ چووزانێت کێ بانگیدەکات؟ ئینسان هەمیشە دەبێت ئامادەبێت، دەبێت گوێڕادێری ئەو چرپانە بێت کە لە سروشتەوە دێن. ئینسان جگە لە خزمەتکارێکی مەزنی ئەم گەردونە زیاتر هیچی تر نییە، ئەوەی سەروەری دونیا بێت مانای ئەوەی گوێبگرێت و

تێبگات، ئەو دوو خوشکەش گوێیاندەگرت و تێدەگەیشتن. لە شاریش بەو جۆرە ژیابوون، دوو خوشک کە لە تاریکە شەواندا بەخۆیان و جل و ڕەفتە سپییەکانیانەوە کوچە بە کوچە دەگەڕان. شارێک هەموو شەرەفی خۆی لە قفڵەکانی شەودا کۆکردبووەوە، شەرەفی خۆی لە دەرگا داخراوەکاندا دەبینییەوە، سەیربوو لەو شارەدا کە سیاسی چڵێس و بێڕەحم حوکمیاندەکرد، دوو کچ شەوان بەشەقامەکاندا پیاسەبکەن، دوو ئافرەتی سپیپۆش کە چاویان تیشکێکی تیایە پۆلیس، حەسحەس و پاسەوانی گەڕەک و بەرپرسی مەولیدەکانی شەویان دەترسان. کاتێک بەشەو دەگەڕان سەردانەکانیان وەک زەنگی بەدبەختی تەماشا دەکرا. تەقەی پێڵاوە بەرزەکانی خۆیان لەسەر ئەسفەلتی شەقامە بێدەنگەکان، لەسەر چیمەنتۆی شۆستەکان تینێکی زیاتری دەدانێ بڕۆن، هەندێجار وەک ئەوەی چاوەڕوانی شتێک بکەن پێکەوە لەسەر سوچێکدا بۆ تامکردنی جوانی شەو دەوەستان، ئەو دوو خوشکە حەزێکی بێسنووریان لە کوچە بێدەنگەکانی شاربوو... شەوێک دەستیان گرتم و منیان بردە ناو کوچە و کۆڵانە بێدەنگەکانەوە. شارێک بوو کپ، بەڵام هەندێکجار گەر هەندێ گڵۆپی تیا نەسووتابایە گڤەی غەمگینی ڕەشەباکان دەیکوشتیت. لەسەر سوچێکدا وەستاین و هەستمدەکرد لەبنی بێقەراری ئەو بێدەنگییەوە سەدایەک دێتەدەرێ، دەنگێک دێتەدەرێ کە دەنگی هەناسەی مەخلوقێکی برینداره، بەڵام چ شتێک نەبوو، جگە لە دەنگی شەو خۆی. ئەو کچانە جوانییەکیان لە کۆڵانەکانی شەودا دۆزیبووەوە، لەڕەگەزی هەمان ئەو جوانییەی من لەسەحرادا دۆزیبوومەوە. شار لای ئەوان بەهەندەسەی ماڵەکانی، بەو ئارامییە لەناکاوەی ئێواران، دەرگای جۆرە دونیایەکی دیکەی لەوان کردبووەوە. جگە لەو مندالانەی کە سەریاس لەناو عەرەبانەکاندا پێیناساندبوون، کەسی تریان نەدەناسی. خۆیان هەستیان بەو ڕق و نەفرەتە دەکرد کە لە قوتابخانە و بازاڕ

و چاوی دراوسێکانیاندا دەیانبینی، هەستیان بەو تفە دەکرد هەندێ لە دوکاندارەکان لە دوایانەوە هەڵیدەدەن، ئاگایان لەو ترسە بوو کە کوڕانی گەنجی لێدووردەخستنەوە. لە دوای مردنی «مارشاڵەوە» جگە لەو کورە منداڵانەی بێهوودە شەڕیان بۆ ئیمپراتۆریەتی عەرەبانەکانی خۆیان دەکرد کەسی تر خۆشی نەدەویستن. لەو هاوینە تاریکەدا کە سەریاسی تیا کوژرا ئەوان شەوانە دەچوونە مەیدانی عەرەبانەکانی شەو. دوو خوشک بوون لەگەڵ هەموو ویقار و هێمنیاندا کەسانێکی زۆر وەک شێت تەماشایاندەکردن. ئەوکات کە من گەڕامەوە سوپای عەرەبانەکان تەفروتونابووبوو، ژینۆی مەخمەلیمان لەسەر بینایەکی بەرز داگرت، لەوێ بەقەدی دیوارێکی بێئەندازە بڵندەوە محاجەرەیەکی بۆیەدەکرد. ئادەم مەرجانمان لەچێشتخانەیەکی پلەیەکدا بینییەوە، کڵاوێکی سپی لە سەردابوو، لەسەر سینییەکی بچوک کۆمەڵێک قاپە چەرەسی لەپێشدەم چەند کچ و کوڕێکی زانکۆدا دادەنا. کە من هاتمەوە ئەو دونیایە سەرتاپای گۆڕابوو، خوشکەسپییەکان منیان بردەئەو مەیدانەی دوو ساڵ پێشتر لە کاتی سەریاس و دوای مردنیشیدا لەوێ گۆرانییان گوتبوو. شتێکی سەیر، نەگونجاو، دوور لە هەموو یاسایەکی ئەو شارەبوو دوو کچی گەنج لە شەوێکی درەنگدا لە مەیدانێکی پڕ لە هەرزەکاردا گۆرانی بڵێن، بەڵام کوڕانی ئەو مەیدانە ئێستاش ئاوازی ئەو گۆرانییانەیان لە گوێدایە، هەمووش دەیانزانی دوو کچن لە ئاورنگ پاکترن، دوو کچن لە شەونم بێگەردترن.

کاتێک یەکەمجار بەدوای مارشاڵدا هاتنە ئەو مەیدانە، گەنجێک بە خۆی و کالیارێکی گەورەوە لە بندەستیدا ڕایکرد و گووتی «مارشاڵ، دوو فریشتە هاتوون بۆلات مەپرسە... دوو کچ دەڵێی لە ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارێ». سەریاس یەکسەر زانی شادەریا و لاولاوی سپی

هاتوون. ئەو شەوە شەوی ڕووخۆشی و پێکەنینە بە کەیف و بڵندەکانی سەرپاس بوو کە لە ساتەکانی غەمیشدا ئامادەگییەکی بێسنووری خەندە و قاقالێدانی تێدابوو. ئەو شەوەبوو لە پاشماوەی تەختە و کارتۆنی کۆن ئاگرێکی گەورەی کردەوەو چای لێناو بە پێکەنینێکی بەرز کە لە هەموو مەیدانەکەدا دەنگیدەدایەوە گووتی «شادەریا و لاولاو، ئەگەر بەڕاستی منتان خۆشدەوێت و وەک برای خۆتان سەیرمدەکەن... ئەمشەو گۆرانیمان بۆ بڵێن. شاشای گوڵ و لالای من، تا ئێستا هیچم لێداوانەکردوون، بە قسەمبکەن، ئەوە تەنیا داواکاری منە». ئەو دەیزانی ئەو منداڵ و گەنجانەی لەو گۆڕەپانەدا دەخەون و بەیانی زوو هەڵدەستن و دەکەونە ڕاکەڕاکە بەدوای پیکاب و لۆری عەلوەکەدا چ ژیانێکی ناخۆش دەژین. دەیزانی ژیانیان لە بەربەیانەوە تا ئێواری شەڕکردنە لەگەڵ سایەق، دوکاندار، کڕیار، پۆلیس و هاوڕێکانی خۆیاندا. هەندێجار بە غەم و زەردەخەنەیەک و سەربادانێکی منداڵانەوە بە ژینۆی مەخمەلی دەگووت «ناخۆشترین ژیانی دونیایە»... ئەو ئێوارەیە فرسەت بوو ئەو هەرزەکارە مەحرومانە کە زۆربەیان لە ژیانیاندا گوێیان لە کچێک نەبووبوو گۆرانی بڵێت، گوێ لە شادەریا و لاولاو بگرن کە سەرپاس دەیگووت دوو دەنگن لە زێڕ.

ئەو شەوە شادەریا و لاولاو پێکەوە تا درەنگ گۆرانییان گووت، نا وامەزانن ئەو گۆرانیانە چ شتێکی لە ڕێزو حورمەتی ئەو دوو کچانە لە دیدی منداڵان و گەنجانی دەستگێڕدا کەمکردۆتەوە، بە پێچەوانەوە لەو شەوەوە زۆربەی دەستگێڕەکان ئەو دوو خوشکەیان خۆشویست. ئەوە ژنانی کۆڵان، کچانی حەسوود و دووڕوو، پیاوانی دەرونپیس بوون ئەو چیرۆکە جوانەیان پیسکرد. ئەو شەوە کە شادەریا و لاولاو ڕۆیشتنەوە سەرپاس تا بەردەرگا لەگەڵیاندا هات، دیارە دەیزانی کە خەیاڵی ئەو

هەرزەکارانەی هاوڕێشی بەدەر نییە لە فەنتازیای ڕەش، بەڵام دڵنیابوو گۆرانی هێزێکی ئەوتۆ سیحراوی هەیە وادەکات ئەو گەنج و مێردمنداڵانە ڕێزی ئەو دوو فریشتەیە بگرن، کە بێئەوەی هیچ لە ویقاری خۆیان کەمبکەنەوە، بەوپەڕی ڕاستگۆیی گۆرانیان بۆ کۆمەڵێک خەڵک گووت، کەسانی تر نزم و بێحورمەت تەماشایاندەکردن.

لەدوای مردنی سەریاسەوە، زۆر شت لە ژیانی ئەواندا گۆڕا، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان خیانەتیان لەو پەیمانەی خۆیان نەکرد، جلە سپییەکانیان نەگۆڕی، تاکە شتێک کردیان ئەو ڕەفتە ڕەشەبوو کە بڕیاردەدەن وەک نیشانەی پرسەیەکی ئەبەدی، تاماون لە گەردنی نەکەنەوە.

لەدوای ئەو شەوەوە شادەریا و لاولاو چەندین شەوی تر دەچنەوە ئەو مەیدانە و گۆرانی دەڵێن، دڵنیاشن دەنگیان خۆشبەختییەکی گەورە لە دوای خۆی جێدەهێڵێت، لەو شەوانەدا دەبنە ناسیاوی ژینۆی مەخمەڵی و ئادەم مەرجان کە سەریاس بەدەم پێکەنینەوە وەک «دوو گەوهەری ناو شیاکە» پێشکەش بە کچە سپییەکانیان دەکات. دروست لەو دەمەدایە کە سەریاس بەردەوام قسە لەوەدەکات ببێتە مرۆڤێکی مەزن، لەو دەمەدایە ئارەزووی خۆشنوسین دەبێتە بەشێکی گرنگی ژیانی. کەس نازانێت گەر سەریاس بمابایە چۆن دەژیا، ئادەم مەرجان پێیگووتم «کوڕێک بوو پڕبوو لە مژدەی جوان، دەیوسیت دوای چەند ساڵێک ئیش عەرەبانەکەی بفرۆشێت و ببێتە خۆشنوس یان بپەڕێتەوە بۆ ئەوبەری شار و ببێتە کتێبفرۆش... خۆشترین ئیش لەلای کتێب فرۆشتن بوو... یەک ئاواتیشی هەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان فیدیۆیەکی هەبێت و سەیری فلیمە نوێکانی پێبکات».

گەر خوشکە سپییەکان نەبایە من ژینۆی مەخمەڵی و ئادەم مەرجانم نەدەدۆزییەوە، کە هەرکات باسیان لە سەریاس بکردایە چاویان پڕدەبوو لە ئاو، ئەو ڕۆژە ژینۆمان لە جلی بۆیەکردنەکەیدا بینییەوە، لە بەرمیلێکی

کۆن و ژەنگاویدا دەموچاوی شت و باوەشی پیاکردم و گووتی «خوای گەورە، سوبحانەڵا، سەریاس هەر نەیدەزانی باوکی هەیە... واتێگەیشتبوو باوکی پێش لە دایکبوونی ئەو مردووە». لەبەر ئەو هەتاوەدا باوەشی پیاکردم و گووتی «ئێستە کەس پێمناڵێت ژینۆی مەخمەڵی، ئەوە ناوێک بوو سەریاس بۆ منی تاشیبوو، ئێستا من ناوم ژینۆ فەیزوڵا سۆفییە». ئادەم مەرجان و ژینۆی مەخمەڵی هەموو شتێکیان دەربارەی دواهەمین ڕۆژی ژیانی سەریاس دەزانی، ئەوان لە بەیانییەوە تا کاتی ڕۆح دەرچوون لەگەڵیدا بوون.

لە دوای مردنی سەریاسەوە، شادەریا و لاولاو سەبووریەکی گەورەیان بەو دوو کوڕە شەرمنە دەهات. لە دوای مردنی سەریاس ماوەیەکی درێژ ئەو دوو خوشکە وەک دوو شێت، دوو کەس کە شتێکی گەورە لە ژیانیاندا ڕوخابێت هەموو شەوێک دەچنە ئەو مەیدانەو گۆرانی بۆ ئەو کوڕانە دەڵێن کە هەموویان بە غەمگینی لەدەوریان کۆدەبنەوە و هەندێکیان دەگرین و هەندێکیان سەردەخەنە ناو کۆشی خۆیان و لەگەڵیاندا گۆرانییەکان دەڵێنەوە.

کە مەیدانی عەرەبانەکان نەماو ئەو منداڵ و گەنجانە پەرشوبڵاوبوونەوە، خوشکە سپییەکان چەند جارێکی کەم ژینۆی مەخمەڵی و ئادەم مەرجان دەبینن، کاتێک لەو گوندە دوورانەش دەبنە مامۆستا ئیدی ماوەیەک لە یاد ئەو شارە دەچنەوە کە هەرگیز ناتوانێت لە نیگا و سەیرکردنەکانیان تێبگات.

کوشتنی مارشاڵ پەیوەندی بە هەموو ئەو جەنگ و پێکدادانە بەردەوام و ڕۆژانەیەوە هەبوو کە لە مەیدانی عەرەبانەکاندا ڕوویدەدا، کوشتنێکی بێمانا و بێتەفسیربوو، وەک هەموو کوشتن و دیلی و ئازارەکانی وڵاتی ئێمە بێهودە و پوچ بوو، دڵنیاتاندەکەمەوە گەر سەریاسی سوبحدەم لەو تەمەنە نازک و منداڵەنەیەدا نەبایە نەیدەهێشت وا سووک و ئاسان

و بێمانـا بمرێـت، بـەڵام مردنیشـی پەیوەنـدی بەسـەرچڵی و شـەڕانگێزییە کوتوپڕەکانی گەنجێکـەوە هەبوو کـە خـۆی لـە جەوهـەردا خـراپ و شـەڕانی نەبـوو. پەیوەندیشـی بـەو خەونەیـەوە هەبـوو دەربـارەی بوونـە مرۆڤێکـی مـەزن. مـن کـە دواتـر ژوورەکەیـم بینـی تێگەیشـتم کـە نیـگاو دیـدی ئـەو بـۆ مرۆڤـی مـەزن، زۆر پەیوەندیـدارە بـە دەسـەڵاتی ماسـولکە و زەبـری دەسـتەکانی ئینسانەوە، ئـەو لەسـەردەمێکدا ژیـاوە کـە مرۆڤـی مـەزن مانـای مرۆڤـی بەهێـز بـووە. ئـەو ڕۆژەش کـە دەمرێـت کـوژراوی ئـەو نمایشـەیە کـە خـۆی وەک منداڵێکـی جەربـەزە و چاونەتـرس و نەبـەز نیشـانبدات. ئـەو ڕۆژانـەی دەکەونـە پێـش مردنییـەوە، پـڕن لـە شـەڕ و پێکـدادان و زامداریـوون... وەک یەکێـک کـە سەرپەرشـتی ڕێکخسـتنی ئـەو دونیـا ئاڵـۆزەدەکات، بـەردەوام لەگـەڵ دەسـتگێڕ و دوکانـدار و ڕێبوارانـی دیکـەدا تووشـی کێشـەدەبێت. لـە مسـەری بـازاڕەوە دێـت و هەنـدێ شـەڕدەکات و لەوسـەرییەوە دەگەڕێتـەوەو هەنـدێ وردە جەنگـی دی بەرپـادەکات، بـەڵام دوای شـەڕەکان هەمیشـە پێدەکەنێ و بـە ویقـاری شـەرکەرێکەوە کـە برێکـی زۆر لـە شـەرەف لـە یاساکانیایەتی دەستدەکاتە ملـی غەریـم و حەریفەکان... بـەڵام ئـەو وردە شـەڕ و دەمبۆڵـەو زوێرییانـە هەرگیـز نـاوی ئەویـان وەک مارشاڵی عەرەبانـەکان و فەیلەسوفی شـەوە تاریکـەکان لکەدارنەکـرد، چونکە بەشـێکی ئاسـایی ئـەو دۆزەخـە جەنجاڵـەی نـاو بـازاڕ بـوون.

هەفتـەی پێـش مردنـی هەمـوو شـەوێک دەچێـت بـۆ ماڵـی خوشـکە سـپییەکان، لـە چیمەنەکەیانـدا دادەنیشـێت، حکایەتەکانـی بازاڕیـان بۆدەگێڕێتـەوە، شـەڕ و هـەڵای نێـوان دوکانـدار و عەرەبانەکانیـان بـۆ باسـدەکات، ماڵەکەیـان پـڕدەکات لـە دەنگەدەنـگ و قەرەباڵغییـەک کـە پێشـتر بـە خۆیـەوە نەدیـوە. خوشـکە سـپییەکان بـە کاکـە بانگیدەکـەن، بـە دیارییـەوە دادەنیشـن، لەگـەڵ پێکەنینەکانیـدا دەتریقێنـەوە، لەگـەڵ حکایەتەکانیـدا تێکەڵاودەبـن... قسـەکانی پێدەبـڕن و پرسـیاری لێدەکـەن.

ڕۆژێک بەر لە مردنی تکای تیادەکەن نەچێت بۆ بازاڕ، تیادەپاڕێنەوە شەو لەگەڵیاندا دانیشێ و چیرۆکەکانی منداڵی خۆیان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام سەریاس بەو خۆشکە پاکانەی پێدەکەنێ و دەڵێت «ڕۆژێک نییە من نەچم بۆ بازاڕ».

بەر لە مردنی ژیان لە بازاڕدا زۆر سەخت بووبوو... پۆلیسەکان ڕۆژانە دەگۆڕێن و جاردوای جاریش دڵڕەقتر و توندوتیژتر دەبن. ئەو بەیانییە وەک هەمیشە زوو عەرەبانە تەماتەکەی خۆی دەفرۆشێت و بە سینەی کەژاڵەوە بە بەتاڵی لە بازاڕدا دەسوڕێتەوە. سەعات دە لەگەڵ ژینۆی مەخمەڵیدا دەچن بۆ لای ئادەم مەرجان، کە کۆمەڵێک بللوری تازەی چرای بۆهاتووە و خەریکی دەرهێنانیانە لە پاکەتەکان، ژینۆ لە بەیانی زووەوە لەگەڵ ماسیفرۆشە بچوکەکانی تردا چاوەڕوانی وەجبەی تازەی ماسیدەکات و ماسیگرەکان نایەن، سەعات نۆ بێزاردەبێت و لەگەڵ سەریاسی سوبحەدەمدا لە ناوەڕاستی عەرەبانەکاندا دەمێنێتەوە و سەیری ئەو پەشۆکان و نیگا ساکار و ترساوەی سەریاس دەکات، کە پێدەکەنێ و دەڵێت «ماسیگرەکان نەمردبن؟» کەمێک سەیری ژینۆ دەکات و دەڵێت «چی دەبێت، گەر شەوێک هەموو ماسیگرەکان بمرن... هەموویان ببن بە ماسی یان لە ئاودا بخنکێن؟». ئەو ڕۆژە سەریاسە پڕە لەو جۆرە پرسیارە سەیرانە. بەلای ئاوفرۆشەکاندا دەڕوات و دەڵێت «گەر بەیانییەک لە خەوهەستاین و ئینسان چیتر تینووی نەبوو، ئاوفرۆشەکان بۆ کوێ دەچن؟». «گەر بەیانییەک ئینسان لە خەوهەستا و ئیتر هەرگیز برسینەبوو، مریشک فرۆشەکان چیدەکەن؟» «گەر ڕۆژێک ئەرز مانیگرت و ئیتر سێوی دروستنەکرد... سێوفرۆشەکان چی دەفرۆشن؟». ژینۆی مەخمەڵی پێیدەڵێت «ئەوەی تۆ باسیدەکەیت، لەم ژیانە و لەم شارەدا نییە و نابێت... ئینسان لێرە بەردەوام تینوویەتی و برسییەتی و حەزی لە سێوە». لە ژینۆی مەخمەڵی دەپرسێت «تۆ دواهەمین

هەناری دونیات بینیوە؟». ئەوە یەکەمجارە ژینۆ ئەو ناوە ببیستێت. دەڵێت «نا دواهەمین هەناری دونیا چییە؟» سەریاس پێدەکەنێ و دەڵێت «گەر مردم بمبەن بۆ ژێر دواهەمین هەناری دونیا... لەوێ مرۆڤ دەتوانێت بژی و بەختیار بێت، نە برسیشی بێت و نە تینوو». ژینۆی مەخمەڵی دەپرسێت «دواهەمین هەناری دونیا کوێیە؟ بەهەشتە یان چی؟». سەریاس بێئەوەی تەماشایبکات، بەدەنگێکی دوودڵ و غەمگین دەڵێت «نا بەهەشت نییە، بەڵام زۆر دوور نییە لە بەهەشتەوە». ژینۆی مەخمەڵی بە گومانەوە سەیریدەکات و دەڵێت «سەریاس هەر شتێک لە بەهەشت نەبوو، یەعنی زۆر زۆر دوورە لە بەهەشتەوە». سەریاس بە غەمێکی گەورەوە سەیریدەکات و دەڵێت «ڕاستدەکەیت، ئەوەی لە بەهەشتدا نەبێت، یەعنی زۆر زۆر زۆر دوورە لێی». سەعات یازدە لای ئادەم مەرجان گاڵتە بەو پلێتە ئێرانییە تازانە دەکەن کە مەرجان بە نرخی پلێتەی ئینگلیزی دەیانفرۆشێتەوە. لە یازدە و چارەکدا بۆ یەکەمجار «مەلیک دولبەر» بە خۆی و سێ پۆلیسی دیکەوە دەردەکەوێت. مەلیک دولبەر یەکێکە لە پۆلیسە هەرە دڵڕەقەکان، بەڵام یەکێکیشە لەو پیاوە ترسناکانەی مارشاڵ توانیوێتی دەستەمۆیانبکات. ئەو هەموو کۆتایی مانگێک مەعاشێکی تایبەتی لە دەستگێڕەکان دەسێنێت، سەریاسیش تاکە کەسە لە زمانی دەزانێت. مەلیک دولبەر خۆی ناوی عەبدولمەلیک شامراد هارون بوو، گەرمیانییەکی سەرسەخت بوو، بە ناوی ژنەکەیەوە بە مەلیک دولبەر بانگیاندەکرد، خۆی بە مەلیکی بازاڕ دەزانی... بەڵام هەموو دەزانن کە مەلیک دولبەر ژنەکەی خۆی دەبات بۆ بەرپرسێکی گرنگی دەفتەری سیاسی و کاربەدەستێکی گەورەی وەزارەت. چوار ڕۆژ بەر لەوە مارشاڵ نیوەی موچەی ئەو مانگەی داوە بە مەلیک دولبەر و گووتوێتی ئەوەی دەمێنێتەوە کاتێکی تر وەریدەگریت. سەعات یازدە و بیست دەقیقە مەلیک دولبەر بە توڕەییەوە دەگاتە بەردەم سینەی

کەژاڵ و نزیک لە بللورەکانی ئادەم مەرجان بە سەریاس دەڵێت «مارشاڵ ماوەیەکە فێری درۆ بوویت». سەریاس لەبەر خۆرەتاوی کوشندەی هاویندا بێئەوەی توڕەبێت تەماشایدەکات و دەڵێت «وانییە مەلیک دولبەر وانییە، ئەمڕۆ ناگاتە ئێوارێ پارەی خۆت وەردەگریت». مەلیک دولبەر دەڕوات و لەولاتر کۆمەڵێک دەستگێڕ دەداتە بەر دار و کۆمەڵێک سەبەتە هەڵدەگێڕێتەوە. لە یەک و نیودا مەلیک دولبەر پۆلیسەکانی هاوڕێی دەگەڕێنەوە و ئەوجارە لای ئاوفرۆشەکان ئاو دەخۆنەوە و دوو سێو لە سەبەتەی منداڵێک هەڵدەگرن و بە ئارامی دەڕۆن. سەعات دوو نیو دووبارە دەگەڕێنەوە و لەوسەری بازاڕ سندوقێک تەماتەی منداڵێکی یازدە ساڵە دەڕێژنە سەر جادەکە. منداڵەکە بە گریان دێت بۆ لای ئەنجومەنی عەرەبانەکان، مارشاڵ کە پێدەچێت ئەو ڕۆژە حەزی لە شەڕنەبێت بە منداڵەکە دەڵێت «هیچمان بۆ ناکرێت، وازبێنە با ئەمڕۆ بە سەلامەت بڕۆینەوە ماڵێ». سەعات سێ و نیو مەلیک دولبەر دووبارە بە خۆی و دارێکی درێژەوە دەگەڕێتەوە و کۆمەڵێک سەعاتفرۆش لەوسەری بازاڕ و کۆمەڵێک ڕۆنفرۆش لە نزیک مزگەوتەکەوە دەداتە بەر حەیزەران. سەعات چوار کۆمەڵێک عەرەبانچی لەدەوری مارشاڵ کۆدەبنەوە و دەڵێن گەر ئەمجارە ئەزیەتمانبدات، لێیدەدەین. سەعات چوارو نیو مەلیک دولبەر بە خۆی و دارێک و ژمارەیەکی گەورە لە پۆلیسەوە دێت و بە ڕیز لەوسەرەوە پیادێن و لەبەردەم سەریاسی سوبحەمدا دەکەونە شکاندنی بللورە تازەکانی ئادەم مەرجان. ئادەم مەرجان دەگری و خۆی دەدات بەسەر بللورەکانیدا و لەناو وردە شوشەکاندا دەکەوێت و مەلیک دولبەر و پۆلیسەکان لێیدەدەن.... لەوکاتەدا دەنگێک لە ناو دەستگێرە توڕەکانەوە بەرزدەبێتەوە و دەڵێت «ژنحیز وازی لێبهێنە»، کە ئەو وادەڵێت لە هەزار لاوە، لە هەموو سوچێکی بازاڕدا، لە هەمو کونجە بێدەنگ و فەرامۆشکراوەکانی ئەو دونیاوە، لە ئاسمانەوە، لە دڵی نادیارو

عارەقـاوی ئـەو عەرەبانـە کۆن و مانـدووو ژەنگاویانـەوە... بەیەکجار دەنـگ بەرزدەبێتـەوە «ژنحیـز وازی لێبهێنـە... ژنحیـز وازی لێبهێنـە... ژنحیـز وازی لێبهێنـە». ژینـۆی مەخمەڵـی کـە دوای چەنـد سـاڵ باسـی ئـەو سـاتەی دەکرد دەیگـووت «سـوبحانەڵڵا وەک ئـەوە بـوو، هەمـوو دونیـای ئێمـە، هەمـوو ئـەو شـتانەی ڕۆژێـک لـە ڕۆژان عـارەق و ماندوێتـی و تینوێتـی ئێمەیـان بینیـوە، ئـەو بەردانـەی ئێمـە پێمـان بەسـەردا نـاون و هەسـتیان بـەو ئـازارە کـردووە کـە لـە جەسـتە بچـوک و ماندووەکانمانەیـە، ئـەو ئەسـفەلتەی ئولفەتـی بـە بۆنـی هەناسـە و پیسـی ئێمـەوە گرتبـوو، ئـەو عەمـودە فەرامـۆش و خـوار و چەمیوانـەی کارەبـا... هەموویـان لەگـەڵ دەردی ئێمـەدا بـن».

ژینـۆ دەیگـووت «تـا ئـەو کاتـە مارشـاڵ هیچـی نەدەکـرد، بەبێدەنگـی و غەمگینییـەوە سـەیریدەکرد و نینۆکـی خـۆی دەخـوارد... دەسـتگێڕە وردەکان کـە هەمیشـە باوەڕێکـی زۆریـان بـە سـەریاس هەبـوو، دەیانگـووت «مارشـاڵ... مارشـاڵ بـۆ هیـچ ناکەیـت». بـەڵام وەک ئـەوە بـوو گوێـی لێنەبێـت. کـە مەلیـک دولبـەر ئـەو جنێوانـەی دەبیسـت تووشـی شـێتی و هیسـتریایەک دەبـوو مەپرسـن، پۆلیسـە منداڵەکانیـش هەمـوو وەکـو ئەویـان لێدەهـات، تـا ئـەو زیاتـر گوێـی لـەو جنێـوە بایـە زیاتـر لـە ئـادەم مەرجانـی دەدا، کـە هەمـوو گیانـی خەڵتانـی خوێـن بـوو، مـن و سـەریاس کشـابووینە دواوە و تەماشـاماندەکرد. سـەریاس بـەردەوام وەک منداڵێـک نینۆکـی دەخـوارد و بیریدەکـردەوە، دووجـار دەسـتیبرد بـۆ گیرفانـی شـەڕواڵەکەی، مـن دەمزانـی چەقۆیەکـی تـازەی پێیـە، چەقۆیەکـی دەسـکزەرد مـن خـۆم بـۆم کڕیبـوو... غـەوزی بەغـا بێئـەوەی ئـاگام لێبێـت و هیـچ بڵێـت لـە نـاکاو پەلامـاری پۆلیسـێکی منداڵـی دا و لـە سەرشـانەوە زامداریکـرد؟ کـە دەسـتگێڕەکان سەریاسـیان بینـی پەلامـاردەدا، ئـەوە نیشـانەی دەسـتپێکردنی شـەڕێکی گەورەبـوو. سـوبحانەڵڵا لـە ماوەیەکـی کورتـدا بـووە هەرایەکـی گـەورە. مـن خەریکـی ئەوەبـووم ئـادەم مەرجـان ڕاکێشـمە بـەر سـێبەرێک، کـە شریخەی

یەکـەم دەسـڕێژ بەرزبـووەوە و منداڵـەکان، عەرەبانـەکان، کڕیـارەکان و دوکانـدارەکان هەریەکەیـان بە کوچەیەکدا هەڵهاتـن. لـەو سـاتەدا ئاوڕمدایەوە و سەریاسـم بینـی دەسـتی لـە یەخـەی مەلیـک دولبـەردا بـوو، یەکێـک لـە کوچەیەکـی نزیکـەوە لـە نابەینـی هـەراو پاڵەپەسـتۆی عەرەبانەکانـدا هاواریکـرد «مارشـاڵ بیکـوژە... بیکـوژە». هاوارێـک بوو لـە حـەوت تەبەقـەی ئاسـمانیش دەبیسـترا، مـن ئەمـڕۆش دەڵێـم ئـەو هـاوارە نەبووایـە سـەریاس نەدەکـوژرا... هاوارێکـی هێنـدە ڕوونبـوو وەک هەقیقەتێکـی سـاف بەسـەر سـەری هەمووماندا فـڕی، قریشـکەیەک بـوو مەولانـام، چـی ڕێگەیەکـی بۆ سـەریاس نەهێشـتەوە، مـن تـا تینـم هەبـوو هاوارمکـرد « پرۆفیسـۆر ڕاکـە... پرۆفیسـۆر ڕاکـە». دەنگـی منـی ناسـییەوەو سـەیریکردم، چیتـر نەیدەتوانـی ڕابـکات، ئەوانـی دی هەمـوو هاواریاندەکـرد «مارشـاڵ بیکـوژە... مارشـاڵ بیکـوژە». ئێسـتاش لـە یادمـە کـە دەسـتی بەرزکـردەوە تـا چەقۆکـەی لـە دڵـی مەلیـک دولبـەردا بچەقێنێـت. هەموومـان تەماشـاماندەکرد، مسـتووی زەردی چەقۆکـەی لەبـەر هەتـاودا دەبریسـکایەوە، دوودڵ بـوو، ماوەیەکـی زۆر چەقۆکـەی بـە ئاسـمانەوە ڕاگـرت، بـەڵام دەسـتگیرەکان هەمـوو دەیانقیژانـد «مارشاڵ بیکـوژە... مارشـاڵ بیکـوژە». لـە سـاتێکدا دەسـتی دانەوانـد، مـن دڵنیـام دەسـتی بـە قەسـتی کوشـت نەهێنایەخـوارێ، نـا دەسـتی بـەو نیـازە داگرت چەقۆکـە فڕێبـداو بـە دەسـتووری هەمیشـەیی خـۆی تفێـک ڕۆبـکات و سـەری دانەوێنێت و بڵێت «سـەخیفترین ڕۆژی دونیایە». دروسـت لەو سـاتەدا دەسـتڕێژی دووەم کـرا، تـا ئەمـڕۆش کـەس نازانێـت کـێ ئـەو دەسـڕێژەی کـرد. پۆلیسـەکان دەڵێـن دەسـتگیرێک لـە نـاو قەرەباڵغـی عەرەبانەکانـەوە تەقەیکـردووە... شـێخی سـیراجەدین، سـەی مالیکـی دەهرنـاس، مـن ناتوانـم هیـچ بڵێـم، مـن لـە سـەریاس زیاتـر سـەیری هیـچ کەسـێکی تـرم نەکـرد... مەولانـام، هەسـتدەکەم یەکـە یەکـە هەمـوو فیشـەکەکانم بینیبێـت کـە پێکایـان، چـوار گوللـە بـوون، دووانیـان لـەلای چەپـی شـانی و یەکێکیـان

لەلای ڕاستی و یەکێکیش لەنێوان هەناو و سینەیدا. دەستگێڕەکان دەڵێن یەکێک لە پۆلیسەکان تەقەیکردووە، بەڵام کامە پۆلیس کەس نازانێت. کە کەوت بە دەنگێکی بەرز هاواریکرد «خوایە گیان کوژرام...». من یەکەم کەس بووم چوومە سەری و سەریم خستە سەر ڕانی خۆم. لەو کاتەدا پۆلیسەکان دەسڕێژ بەدوای دەسڕێژ دەیانکرد بەئاسماندا و دەیانویست خۆیان لە گەمارۆی عەرەبانەکان ڕزگاربکەن. ئادەم کە خۆی خەڵتانی خوێن بوو، نەیدەتوانی باوەڕ بەوە بهێنێت کە لە چاوتروکانێکدا سەریاس برینداربووە. من هاوارمکرد «یەکێک یارمەتیمبدات، بیگەێنینە خەستەخانە... » ئەو بە زەردەخەنەیەکەوە تەماشایکردم و گووتی «نا... نا، مەمبەن بۆ خەستەخانە، تکایە مەمبەن بۆ خەستەخانە، دەستتان ماچدەکەم مەمبەن بۆ خەستەخانە». سوبحانەڵا لەو کاتەدا چ سەر و ڕوخسارێکی جوانی هەبوو. لەو دەقیقەیەدا ئیدی دەستگێڕەکان کە هەموو هەراسان و شپرزە هاواریاندەکرد، هەندێکیان هۆشیان هاتبووە بەر خۆیان و دەهاتنە سەر سەریاس و باوەڕیان بەوە نەدەکرد بەوجۆرە پێکرابێت. من دەمقیژاند و فرمێسک لە چاوم دەهاتە خوارێ، دەمگووت یەکێک یارمەتیمبدات. ئادەم مەرجان کە نەیدەتوانی خۆی بەپێوە بگرێ، ئەویش لەگەڵمدا دەیقیڕاند، هەموو ئەوانەی لەسەر سەریاس کۆبووبوونەوە دەمانقیڕاند. خۆی دواجار دەستیگرتم و گووتی «بمبەن بۆ ماڵی خوشکە سپییەکان» من هاوارمکرد «دەتبەم بۆ لای دکتۆر...». سیان لە دەستگێڕەکان «سینەی کەژاڵ»یان لەناو عەرەبانە تێکەڵاو و بەیەکداچووەکاندا دەرهێنا و گووتیان بابیگەێنینە خەستەخانە، تاکسی ناگاتە ناو ئەم قەرەباڵغییە. من لەو دەقیقەیەوە هەستمکرد کە ئەو مردووە، جگە لەوەی یەکجاری دیکە تەماشایکردین و گووتی بمبەن بۆ ماڵی خوشکەکانم هیچی تری نەگووت. کە خستمانە سەر «سینەی کەژاڵ» و پاڵمان پێوەنا دوو سەد دەسگێڕ زیاتر لە ملولامەوە دەڕۆیشتن

و هاواریـان لەیـەک دەکـرد و دەیانگـووت «مارشـاڵ کـوژراوە... مارشـاڵ کـوژراوە». خـوای ئـەرزو ئاسـمان کـە لەسـەر عەرەبانەکـە پاڵکەوتبـوو لـە مرۆڤێکـی مـەزن دەچـوو، مەولانـام شـتێکی تیابـوو لـەو سەریاسـەی جاران نەدەچـوو، وەک ئـەوەی ئـەو سـات و کاتـەی مـردن کردبێتییـە مەخلوقێـک زەوی نەیکێشـێت و ئاسـمان هەڵینەگرێـت...».

ژینـۆ کـە چیرۆکەکـەی دەگێڕایـەوە زوو زو دەوەسـتا و دەیگـووت خودایـە بـە گوناهـی مەزانـە، خوایـە بـە گەورەیـی خـۆت ڕەحمـم پێبکـە، پێیوابـوو گێڕانـەوەی چیرۆکـی مـردن و ڕۆحکێشـان گوناهێکـی گـەورەی تیایـە، ئـەو لـە دوای مردنـی سەریاسـەوە باوەڕێکـی قووڵـی بـە خـودا هێنابـوو. هەندێکجـار دەوەسـتا و چاوانـی پـڕ دەبـوون لـە ئـاو و دەیگـووت «بەڕەحمـەت بێـت، ئەگـەر بمایـە ئێسـتا بـەم گریانـەی مـن پێدەکەنـی».

ژینـۆ دەیگـووت «کـە بردمانـە خەسـتەخانەکە واماندەزانـی مـردووە، بەپەلـە لێیـان وەرگرتیـن و بـەرەو ڕاڕەوێکـی تاریـک فڕاندیـان، سـەدان دەسـتگێڕ لەبـەردەم خەسـتەخانەکەدا کۆبووبوونـەوەو دەگریـان، تـا ئـەو وەختـە کەسـم نەدیبـوو هێنـدە خۆشەویسـت بێـت، هەمـوو سەریاسـمان بـە شـتێک دەبینـی گەورەتـر لـە توانـای خـۆی، هەمـوو ئەوەمـان بیرچووبـووەوە ئەویـش دەسـتگێڕێکی نەگبـەت و بەسـتەزمان بـووە. نازانـم هەموومـان لـە یەکـەم ڕۆژەوە بـە چـاوی شـتێکی تـر سـەیری ئەومـان دەکـرد، وەک ئـەوەی ئەسـتەغفرەڵا دونیامـان بـۆ دەسـتکارییکات، یـان شـتێک لـەو بابەتـە... نازانـم دوای دوو سـەعات کچێکـی چکۆلانـە لـە دەرگای قاوشـەکان هاتـەدەرێ و گووتـی «کەسـوکاری کێیـە؟ بابێـت وەرییگرێتـەوە». مـن گووتـم «مـن کەسـوکاری ئـەوم، مـن هەمـوو شـتێکی ئـەوم، بیدەنـەوە بـە مـن». سـوبحانەڵا کـە خـودا ئەجەلـی هەڵگـرت هەڵیدەگرێت، بـە حیسـابی مـردوو وەرمانگرتـەوە، بـەڵام نەمردبـوو، پێدەچـوو دکتـۆرەکان بەهەڵـەدا چووبـن یـان نەیانەوێـت تیماریبکـەن، لەبەردەرکـی خەسـتەخانەکە جارێکـی

تر چاویکردەوە و گووتی «پێمگووتن بمبەن بۆ ماڵی خوشکە سپییەکان» من ناوچاوانیم ماچکرد و گووتم دەتبەین بۆ ماڵی خوشکە سپییەکان، ئەو ئێوارەیە بە هەموو شاردا هێنامانەخوارێ، هەزاران دەستگێڕبووین بە خۆمان و عەرەبانەکانمانەوە شارمان شلۆغکردبوو. مەولانام خەڵکی دەیانپرسی کێ مردووە؟ ئێمەش دەمانگووت «پۆلیسەکان سەریاسی سوبحدەمیان کوشتووە، مارشاڵی عەرەبانەکان، پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان». کەس لەو شارەدا سەریاسی نەدەناسی ئێمە نەبێت... دۆستێکی نەبوو ئێمە نەبێت... هاودەمێکی نەبوو ئێمە نەبێت. کە گەیشتینە ماڵی خوشکە سپییەکان ئەوانمان بینی لە پەنجەرەکەیانەوە سەریان هێنابووەدەرێ و قژیان لە نهۆمی سەرەوە گەیشتبووە خواری خوارێ. یا غەوز... یا موجیبل دەعەوات... یا بارق و یا باری... چاویان پڕ بوو لە شێتی... لە حەسرەتێکی کوێر، لە شتێک کە هیچ کەسێکمان تا ماوین لە یادیناکەین... هەزارجار غەمگینتر لە هەر چاوێک تۆ دەشێت پێشبینیبکەیت، کە بەو قژە پەرشوبڵاو و سەیرەوە باوەشیان بە سەریاسدا کرد، بە ئەسپایی پێیگووتن «نەمردووم... هەڵمگرن و تاتەواو تاریکدەکات بمبەنە ژوورێ». من و ئادەم مەرجان وەستاین و بە دەستگێڕەکانمان گووت «سەریاسی سوبحدەم زیندووە، مژدەیەکی خۆش... مژدەیەکی خۆش، مارشاڵ ماوە... مارشاڵ نەمردووە، با دەوری چۆڵبکەین، بەڵکو پشوویدات، بەڵکو خودا شیفایەکی بۆ بنێرێت». زۆر بە زەحمەت دەستگێڕەکان ڕەوینەوە، زۆربەیان لە کۆڵانە باریکەکانی دەورویەردا بڵاوبوونەوە و لەسەر شەقامەکان دانیشتبوون و دەیانویست لە مان و نەمانی مارشاڵ دڵنیابن... دواجار من و ئادەم و خوشکە سپییەکان هەڵمانگرت و بردمانە ژوورێ، تا ئەو کات خوێنی لێدەڕۆی، وەکو ئەوەی لە نزیک مردنەوە قسەمان لەگەڵدا بکات گووتی «کە تاریک داهات، هەر پێنجمان پێکەوە دەڕۆین». یەکەمجار وامدەزانی

وڕێنەدەکات... بەڵام پاش کەمێک بە قورسی چاویکردەوە و دەستێکی خستە سەر سنگی و گووتی «نازانم چییە، ئازارێکی زۆرسەیر لە سەر دڵمدایە» کەمێک وەستاو بە زەحمەت زەردەخەنەیەکی گرت و گووتی «ژینۆ، ئەمشەو دەچین بۆ لای دواهەمین هەناری دونیا... من دەمەوێت لەوێ بمرم... عەفوومکەن بۆ هیچ کەسێکتانم باسنەکردووە... بەڵام ئەمشەو دەمبەن بۆ ئەوێ... لەوێ دەمنێژن... لەوێ... لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا... لەوێوە دەتوانم هەموو شتێک ببینم».

ئەو شەوە سەریاس لە پێخەفێکی گەرمدا پشوودەدات، هەندێجار چاویدەکاتەوە و دەڵێت «کە دونیا تاریک بوو پێمبڵێن... هەر پێنجمان پێکەوە دەچین بۆ ژێر دواهەمین هەناری دونیا».

ئازیزانم دەزانم ئەمەیان چیرۆکێکی کۆنە، دەزانم شتێکە لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونی مرۆڤەوە هاوڕێمان بووە. هەموو کەسێک لە خەیاڵ و خەونیدا ژێر درەختێک، لاپاڵی چیایەک، گوێ چەمێک، سووچی باغچەیەکی بۆ مردن لە هەر جێگایەکی دی پێباشترە. هەندێ کەس فاسیلەی نێوان مردن و هەستکردنیان بە مردن لەوە کورتترە، بوارێکیان هەبێت بیر لە شوێن و جێی مردن بکەنەوە، هەندێ کەس تا دوا سات باوەڕ بە مردنی خۆیان ناهێنن. من پێم شتێکی قەشەنگە مرۆڤ بیر لە شوێنی مردنی خۆی بکاتەوە، مافی ئەوەی هەبێت ئەو جێگایە هەڵبژێرێت، مافی ئەوەی هەبێت نەیەوێت لەگەڵ سەدان هەزار مردووی تردا بیخەنە گۆڕستانێکەوە. من پێموایە سەریاس بەرلەوەی بمرێت، شەوانێکی دوورودرێژ بیری لە مردنی خۆی کردۆتەوە. ئەو لەو سەردەمەدا ژیاوە کە مرۆڤ بەردەوام بیری لە مردنی خۆی دەکردەوە. کە ئەو ڕۆژە گوللەکان پێکاویانە، پێویستی بە بیرکردنەوە نەبووە لە مردن، بەڵکو دواجار هەموو خەیاڵی لەلای ئەوەبووە کوێ شایستەترین جێگایە، ژیانێکی سەیر و کورتی تیا دوایبهێنێت. دڵنیام هەموو شتەکانی وەک فلیمێکی کورت تەماشاکردووە،

لـەو فلیمانـەی لـە دوکانـی فیدیۆکانـدا یـان لـە سـالۆنی کـۆن و ڕزیـوی سـینەماکاندا دەیبینیـن، کاتێـک لەگـەڵ دەسـتگێڕەکانی هاوڕێیـدا دەچـوون و وەک ڕیزێـک گەنجـی بـە حورمـەت لـە ناوەڕاسـتی هۆڵەکـەدا بـە زەرفێـک گوڵەبەڕۆژەوە دادەنیشـتن و لـە کۆتاییەکانیـدا دەگریـان.

ژینـۆ کـە بـەو جلـە بۆیـاوی و دەسـتە سـپییانەوە قسـەی لـە مردنـی سـەریاس دەکـرد، ئـەو هەسـتەی هەبـوو کـە سـەریاس دەیوسـت مردنێکـی جـوان بمرێـت، مردنێکـی لایـەق بـە کەسێکـی مـەزن. ژینـۆ دەیگـووت «کـە دونیـا تاریـک داهـات. سـەریاس هێـزی دایـە خـۆی هەسـتێت، ئێمـە زۆرمـان لەگەڵـدا گـووت کـە دەبێـت پشـوویدات، بـەڵام بێسـوود بـوو، بەدەنگێکـی خەواڵـو و و لاواز، بـە سیمای یەکێکـەوە ئـازار نەمێڵێـت چاوی هەڵبهێنێـت، دەیگـووت «ئەگـەر لەگەڵمـدا نایـەن، دەڕۆم... بـە تەنیـا». ئـەوە دوا ئارەزووی ئـەو بـوو، دوا هیـوای بـوو. سـات لـە دوای سـات مردنـی خـۆی دوادەخسـت تا بگاتـە ئـەوێ... مـن جێبێکـی چکۆلانـەم لـەو نزیکانـەوە هێنـا. وای پێغەمبەر، تاجـی ئـەم دونیـا و ئـەو دونیـا، یـەک شـۆفێر چییـە ئامادەنەبـوو لەگەڵمـان بێـت، کـە دەیانزانـی بیمارەکـە لـە ماڵـی شـادەریا و لاولاوی سـپییە، وەکـو گورگیـان دیبێـت بەترسـێکەوە هەڵدەهاتـن، هەندێکیـان تفێکیـان ڕۆدەکـرد و دەڕۆیشـتن، یـان جنێوێکـی پیسـیان لـە زار دەکەوتـە خـوارێ و تێدەپەڕیـن، دواجـار شـۆفێرێکی پیـرێ جامانـە بەسـەر لەگەڵمـدا هـات کـە پێدەچـوو لـە شـەڕێکی گـەورەدا بێـت لـە نێـوان تەماحـی ئـەو پارەیـەی دەمخسـتە دەمـی و سـامی ئـەو ڕێگایـەی دەمخسـتە بـەری. هەر لە سـەرەتاوە دەلەرزی و دەسـتی سـوکانی نەدەگـرت، خوشـکەکان لەسـەرەتاوە دەرهـەق بـەو پیـاوە دوودڵ بـوون، بـەڵام عیلاجـم نەبـوو، بـە خوشـکە سـپییەکانم گـووت لـە شـەوێکی وا زوڵوماتـدا کـەس ناکەوێتـە ئـەو شـاخ و کێـوە... بـە زەحمەتێکـی زۆر سەریاسـمان لـە پشـتەوە لـە نێـوان ئـەو دوو کچـەدا دانیشـان و بەتانییەکمـان پێـدادا و مـن و ئـادەم مەرجانیـش لـە پێشـەوەبووین، ئـاە خـوای ئـەرز و

ئاسمان... ئادەم مەرجان لە پێشەوە بەردەوام دەگریا و کفریدەکرد، لەو شەوەوە ژیانی من و ئەو دوو ڕێگای جیاوازی گرت، لەو شەوەوە ئەو بوو بە کۆمۆنیست و من نوری خودا پەڕییە دڵمەوە.

ئادەم تا ئەو کات ئازارێکی سەختی دەچەشت، ئازارەکانی ئۆقرەیان بۆ نەهێشتبوو، بەڵام دەیوسیت تا دوا هەناسە لەگەڵ سەریاسدا بێت. گریانەکانی ئادەم هێندەی تر شۆفێرەکەیان دەترسان. کە سوار ماشێنەکە بووین، سەریاس چاوی نوقاندبوو و لێوەکانی بە جۆرێکی ترسناک شین بووبوونەوە و سیاهییەکی تەڵخ دەست و گەردن و پشت چاوەکانی داپۆشیبوو. خۆی بە شۆفێرەکەی گووت بمانبە بۆ ڕێی «سێوەزێ»، بۆ دامێنی «شێخەڵی هەرمێ شین». من دەمزانی ئەوێ چ جێگایەکی ترسناکە، ناوچەیەکە پڕە لە جەردەی شەو و تفەنگچی تاقکەوتووی ئەو گوندانەی پڕبوون لە شەڕەخێڵ و جەنگەعەشرەت. شۆفێرەکە دەڕۆیشت و دوودڵ بوو، خۆی کۆنە وڵاغداری ئەو دەوروبەرە بوو. دوای سەعاتێک ڕۆیشتن وەک خێوێکی لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا دیبێت وەستاو گووتی من چیتر لەگەڵتان نایەم. بە ترسەوە گووتی گەر دەتانەوێت دەتانگێڕمەوە بۆ شار و گەر ناشتانەوێت بگەڕێنەوە، ئا لێرە بوەستن و سەعاتێکی تر تراکتۆری قاچاغچییەکان سەردەکەون بۆ بارهێنان، لەگەڵیاندا سەرکەون.

یا حافیز و یا جەبار... خوشکە سپییەکان پڕ جنێویان کرد، ئادەم مەرجان گریا، من باوەشم بەسەریاسدا کردبوو و دەپاڕامەوە کە لەو چۆڵەوانییەدا بەو زەعیفانەوە جێماننەهێڵێت. بەڵام سوودی نەبوو، شتێک دەتگووت سێبەری تاعوونە بەسەرسەرییەوە دەفڕی، ترسێک لە تەماعەکانی گەورەتر بەری ڕۆحی گرتبوو. ئەو لەسەرەتاوە زیرەی لە هەموو شتێک کرد، لە جلە سپییەکانی ئەو دوو خوشکەی لە دوو فریشتەی تەریو دەچوون، لەو لایتە گەورانەی دەستیان، لەو هەموو خوێنەی بە سەریاسەوە بوو، لە گریانەکانی ئادەم، لەدەستی من کە

زوورزوو لە حەسرەتدا دەمگەست. ئێمەی لەو لاڕێگایە فڕێدایە سەرجادە، نسا... ئەستەغفروڵا... ئەستەغفروڵا... نەمانویست بگەڕێینەوە... من زوورزوو سەریاسم ماچدەکرد و دەمگووت «گەر بە کۆڵ بووە دەتگەێنمە ژێر دواهەمین هەنار». سەریاس لەو کاتانەدا بەجۆرێک دەکۆکی لەگەڵیدا خوێن لە برینەکانییەوە دەهاتەدەرێ، بەڵام کە ئارامدەبووەوە چاوی هەڵدەهێنا و دەیگووت «پێمبڵێن ئەستێرە دیارە یا دیار نییە؟». ئێمە دەمانگووت «ئەستێرە دیارە سەریاس، ئەستێرە دیارە». ئەو شەوە شەوی تاریکی و بێباکی و بێڕەحمی ئینسانەکان بوو، لەو شەوەدا من هەستمکرد کە خودا ئێمەی بەجێهێشتووە، هەستمکرد ئێمەی مرۆڤ بە شێوەیەک گومڕابووین خودا ئاوڕمان لێناداتەوە، مەرجان ئەو شەوە بۆ یەکەمجار قسەی لە ناعەدالەتی دەکرد. بە خۆی و برینەکانییەوە دەهات و دەچوو و دەیگووت «کێیە سوود لەم ناهەقییە دەبینێت... کێ؟». شەو درەنگ تراکتۆرێک لەدوور دەرکەوت، گەنجێک لێیدەخوڕێ هەموو دەست و مەچەکی خاڵ و نەخش و هێمای بێدینی بوو. کە لە ئاستماندا وەستا بەدەنگێکی بەرز، پڕ بە شەو پێکەنی و گووتی «مەیتتان پێیە... مار پێوەیداوە، یان ڕیخۆڵە کوێرەیەتی». وایدەزانی دەگەڕێینەوە بۆ شار، بە زەحمەت تێمانگەیاند کە بریندارێکمان پێیە دەیەوێت لەو چیایانە بمرێت. بە سەریاسی گووت «گەر دەمری بمرە، بۆ بەم نیوە شەوە دونیات هێناوەتە تو×اخ». بە دەنگی بەرز گووتی «من ناگەمە ڕێی ×ێۆەزێ» بەڵام گووتی تا ڕێگایەک دەمانبات «لەوێوە دەتوانین بە پێدەشتێکدا بڕۆین و بە ×ەعاتێک ڕێگا بگەینە ×ەر ئاو و لەوێوە تا «شێخەڵی هەرمێ شین» ×ەرکەوین». ئێمەی لە پشت تراکتۆرەکەیەوە سوارکرد و خۆی لە پێشەوە کەوتە گۆرانی گووتن. زوو زوو دەوەستا و دەیگووت «شەوێکی باشە بۆ مردن، باران نییە، من هەر تر×ی ئەوەم هەیە لە باراندا بمرم... کە× لەم مەملەکەتەدا بەقەد ×ایەقی

تراکتۆر دوژمنی باران نییە، هەر شوکور بۆ خوا کە باران نییە». ئەو شەوە کەسمان نەماندەزانی دواهەمین هەناری دونیا لە کوێیە. سەریاس دەیگووت کە گەیشتینە بناری چیا پێمبلێن. ئەو زۆر بەزەحمەت گوێی لەدەنگی ئێمە دەبوو، لە ناو تراکتۆرەکەوە ئیدی بە شێوەیەکی سەیر خوێنی لەبەردەڕۆی، دۆخی بەجۆرێکی ناهەموار تێکچوو، لەویادا خوشکە سپییەکان دیسانەوە گریان، هەستمدەکرد بیەوێت شتێک بڵێ، بەڵام وڕەی تراکتۆرەکە و گۆرانییەکانی شۆفێرەکە نەیاندەهێشت گوێمان لەو نوزە باریکە بێت کە لە گەرووی سەریاسەوە دەهات. دواجار لە ئاست کێڵگەیەکی بەریندا دابەزین، شادەریای سپی و لاولاو لایتەکانیان دەرهێنا، شۆفێرەکە بە ئێمەی گووت «من دووقات پارە لە مردووان دە×تێنم... چوار ×اڵە لەم ڕێگایەدا ئیشدەکەم و ئەوە قانونەکەمە، مردوو بە دوو قات دەبەم... لەبەرئەوەی هەموو ×ایەق تراکتۆرێک مردوو نابات... من بە شەرتی عی×رایل ئیشناکەم، کە بە خۆڕایی مردوو دەبەن بۆ عا×مان».

وای ئەی جیلوەی ڕۆشنی ئەسحابە و زاهیدان، شەوێک بوو منی گۆڕی... منی لەوە ئاگادارکردەوە ئێمەی بەشەر لەجەنگەڵێکی پڕ لە زوڵوماتداین... هەر چوارمان بەتانییەکەمان کردە دەستەبەرە و سەریاسمان خستە ناوی و بەو دەشتە کاکی بە کاکییەدا کەوتینە ڕێ. تاریکییەک بوو بێسنوور و بێحەد و بێمەودا، کەسمان نەماندەزانی دواهەمین هەناری دونیا لە کوێیە. کامە کێو دەشێت مەنزڵی دواهەمین هەناری دونیا بێت، کامە لاپاڵ دەبێت کێڵگە و مەزرای شێوە درەختێکی لەو جۆرە بێت، کامە درەخت دەشێت وەک دواهەمین درەختی جنسی خۆی تەماشاییکەین. دەقیقە لە دوای دەقیقە سەریاس بەدتردەبوو، زوو زوو داماندەناو دەمانپرسی سەریاس بۆ کوێ بچین، ئەو بە ئەستەم

چاوی هەڵدەهێنا و بە قووڵی نرکەیەکی زامداری لە گەروو دەهاتەدەرێ و نەیتوانی هیچ بڵێ. ئەو شەوە هەر دەڕۆیشتین و نەدەگەیشتینە هیچ، هەموو شتێ لە ئەڵقەیەکی بەتاڵ دەچوو، ئەو دوو کچە بەدرێژایی دەڕۆیشتن و دەگریان، کراسە سپییەکانیان لەناو درِک و داڵی ئەو کێڵگەیەدا هەلاهەلابوو... نازانم لەچ ساتێکدا ڕۆحی دەرچوو، وەک ئەوە بوو بزانێت ناگاتە ژێر دواهەمین هەناری دونیا، ناگاتە ژێر ئەو درەختەی هەموو ئاواتی ئەوەبوو لە ژێریدا بمرێت. نەگەیشتنی ئەو بەو درەختە نیشانەی نەگەیشتنی هەموومان بوو بە هەموو شتەکان، نیشانەی نەهاتنەدی گەورەترین و بچوکترین ئاواتمان بوو. ئێمە چوار کوێربووین، بەدەوری خۆماندا دەسوڕاینەوە، هەرگیز ڕووناکییەک، نورێک، ئیلهامێکی خودایی بە فریامان نەهات... ئێستاش کە بیر لەو شەوە دەکەمەوە تێدەگەم، کە دووریمان لە سەرچاوەی گەورەی هەر نورێکەوە ئێمەی لەو زوڵمەتەدا ونکرد. چوار کوێربووین... چوار کوێر.... ئەو لەو بەتانییەدا مردوو ئێمە بێهودە و بێئاراستە و بێئامانج بەو زەویەدا ونبووین، دواجار لە ناوەڕاستی ئەو دەشتە خاڵی و فەرامۆش و بێکەسەدا دانیشتین و بە دیارییەوە دەستمانکرد بە گریان. لە ناوەڕاستی ئەو دەشتەدا باوەشمان بۆکردەوە، ماچمانکرد، هاوارمان لە خودا کرد، لە ئاسمان، بەڵام جگە لە کۆمەڵێک قەڵەڕەش و مێشوولەی بێڕەحمی شەو هیچی تر بە هاوارمانەوە نەهاتن.

دوای شەوێکی دوور و درێژ لە دەستەپاچەیی و ونبوون لە ناوەڕاستی کێڵگەیەکدا دامانناً. هەر چوارمان تێر بەسەریدا گریاین، کچەکان وەک خوشکێکی ڕاستەقینە ماچیانکرد. نەمانتوانی بیگێڕینەوە، نەماندەویست دووجار بیکوژین، دەمانزانی ئێمە هەرگیز «دواهەمین هەناری دونیا» نادۆزینەوە، بەڵام پێمان باشبوو لە ڕێگای دواهەمین هەناری دونیادا

بینێژین چاکترە لەوەی کە بیبەینەوە بۆ گۆڕستانێکی نەیدەویست تیا بنێژرێت. ئەو شەوە هەر چوارمان بڕیارماندا لەو پێدەشتەدا بینێژین، ئەو لە ئێمە زیاتر کەسیتری نەبوو، ئیدی بەناو دەریایەکی بێئامان لە مێشوولە و زیکەزیکی سیسرکەکاندا ڕۆیشتم تا گوندێکم دۆزییەوە، لەوێ پاچ و خاکەنازێکم وەرگرت و بە تاریکیدا گەڕامەوە، شەوێک بوو هەرگیز تەواو نەدەبوو، دەیانجار لە هەموو شەوەکانی تری ژیانم درێژتربوو، تا دەهاتە تاریکتر و تۆختریش دەبووەوە. نازانم چ هەوایەک منی ئاڕاستەکرد، دەشتێک بوو خاڵی لەهەموو شتێک، هەتا درەختێکیشی تیانەبوو بتوانم بیکەمە نیشانە، بەڵام خودا لەو شەوەوە چووبووە دڵم و ئەو هیدایەتیکردم، ئەو دەستیگرتم و منی تا ئەو گوندە بردو لەوسەر دووبارە منی هێنایە، تا گەیشتمە ئەوێ هەستم پێدەکرد، کە گەڕاشمەوە هەستمکرد شتێک لەگەڵمدایە، ئەوە خودا بوو، خودای مەزن خۆی بوو. کە دەستی گرتم و منی برد... من دڵنیام خودا سەریاسی خۆشدەویست، کوڕێک بوو جگە لە کەمێک شەڕانێتی دڵێکی ساف و پاکی هەبوو، تەنیا من دەزانم چ حورمەت و ڕێزێکی خوداییشی بۆ ئافرەت هەبوو. خودا بیبەخشێت بە پاکییەکەی خۆی لەگەڵ جەمعی ئیمانداراندا... لەگەڵ جەمیعی ئەسحابەکاندا...

سوبحانەڵا... سوبحانەڵا کە گەڕامەوە خوشکە سپییەکان گۆرانییان دەگووت، گۆرانییەک بەردی دەهێنایە گریان، من لەدوورەوە ڕامکرد و دەستمکردە ملیان و گووتم «خوشکان، مەگرین، خودا لە گوناهەکانی دەبورێت، من دەزانم بەدرێژایی ئەو ڕێگایە من خودام لەگەڵدابوو... ئەو سەریاسی خۆشدەوێت، دڵنیام سەریاسی سوبحەدەمی خۆشدەوێت... پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمانی خۆشدەوێت» وامدەگووت و دەگریام. ئادەم مەرجان پاچەکەی وەردەگرت و بەهەموو ئازاری خۆیەوە یەکەم پاچی دەوەشاند، من بەدەم گریانەوە پاچەکەم لێوەردەگرت و دەموەشاند،

ئەو بەدەم گریانەوە پاچەکەی لێوەردەگرتم و دەیوەشاند... شەوێک بوو لە درێژترین شەوەکانی ژیانم، گۆڕێک بوو لایەقی ئەونەبوو، گۆڕێک بێکێل، بێهیچ شتێک، گۆڕێک شاهیدی مردنی غەمگین و سەیری ئەو بوو، دەمانشاردەوە و دەگەڕاینەوە... شەو کۆتایی نەدەهات. بڕیارماندەدا سبەی کێلی بۆ بهێنین، سبەی لەگەڵ دەستگێڕەکاندا چەندین پاس بگرین و بێینە سەر گۆڕەکەی و لە گوڵدا نوقمیبکەین... دەڕۆیشتین و دەگریاین، دەڕۆیشتین و دەگەیشتینەوە شار و خوداحافیزیمان لەیەکدەکرد و دەخەوتین، بەڵام دڵنیابن ئەو شەوە قەت دوایی نەهاتووە و دوایی نایەت».

# ١٣

لـه شـەوی دووەمـی ئازادیمـدا خوشـکە سـپییەکان بـۆ سـەر گۆڕەکـەی سەریاسـی سـوبحەم پێشـمکەوتن.

ئـەو شـەوەش نەمدزانـی کـە سەریاسـێک و سەریاسـێکی دیکـەش لـە زەویـدا هەیـە.

نامەوێـت وەسـفی ئـەو شـەوەتان بۆبکـەم، چونکـە وەسـفناکرێت. شـەوێک بـوو پڕبـوو لـە ڕووناکـی، هێنـد ڕوونـاک بـوو بێ هیـچ چرایـەک بـەو کێڵگـە خەوتووانـە ڕۆیشـتین. پێویسـتناکات لـە مـن بپرسـن هەسـتت بـە چـی دەکـرد؟. نـا غەمـی مـن تەنیـا غەمـی باوکێـک نەبـوو دوایـی بیسـتویەک سـاڵ زینـدان دەچێتـەوە سـەر گـۆڕی کوڕەکـەی، بەڵکـو غەمـی مرۆڤێـک بـوو لـە دوایـی ڕەنجێکـی زۆر دەهاتـەوە سـەر باغێکـی سـووتاو. دیلێتـی مـن و مردنـی پوچـی ئـەو، لـە بۆشـایی ئـەو کێڵگـە ڕووت و بێبەرهـەم و نەکێڵراوانـەدا تێکـەڵ بووبـوو. مانـگ لەسـەر ژیانـی بێهـودەی مـن و مردنـی بێهـودەی ئـەودا هەڵدەهـات، ئەسـتێرە لەسـەر نامـورادی مـن و ئـەودا دەدرەوشـایەوە، هەسـتمدەکرد نـە مردنـی ئـەو و نـە کۆیلەیەتـی دووروودرێـژی مـن چ شـتێکی لـەم جیهانـە نەگۆڕیـوە. مـن ئـەو شـەوە بیـرم لـە بەراوردکردنـی چارەنوسـی مرۆڤ بـە چارەنوسـی شـتەکانی دیکـە دەکـردەوە، مردنـی ئـەوم بـەم کێڵگانـە بەراوردەکـرد، مردنـی ئـەوم بـە بەرهـووت و چۆڵێتـی ئـەو زەوییـە بەپیـت و بەفەڕانـە

بەراوردەکرد. وەک ئەوەبوو لەناو بازنەیەکدابین هەموو شتێکی تیا مردبێت، وەک ئەوەی ژیان لەو سەر زەوییەدا هەرگیز سەوزنەبووبێت، تۆوێک بێت فرێدرابێت و نەڕوابێت، وەک ئەوەی ژیان باڵندەیەک بێت جارێک بۆ پشوو نیشتبێتەوە و ئیدی نەفرییبێتەوە. ئەوەی لەو شوێنەدا سەرەنجی منی ڕاکێشا بێدەنگی بوو، جێگایەک بوو جێ دەستی مرۆڤی پێوەنەبوو، گۆڕێک بوو لە شوێنێکدا دوور لە دەستی مرۆڤ، جێگایەک وەک ئەوەی شاهیدی فەرامۆشکردنی ئینسان بێت بۆ برای خۆی، جێگایەک وەک هەمان ئەو مەنفا سەیر و ڕووناکەی من لە ناو بیاباندا، گۆڕێک سارد و دوور وەک زیندانێک لە سەحرادا. نا وامەزانن من هەمیشە و هەمیشە لە ژێر کاریگەری ئەو ساڵە تاریکانەدا دەژیم و بیردەکەمەوە، وا مەزانن من تووشی ترس و وڕێنە بووم بۆیە ئەو گۆڕە بە زیندانەکەی خۆم لە سەحرا دەشوبهێنم. گۆڕێک بوو بچوک، وەک ئەوەی گۆڕی باڵندەیەک بێت. ئەو فەزا گەورە و بەرین و کپەی دەوری هێند فراوان بوو، مەودایەکی درێژی بۆ سێبەری کێلەکان جێهێشتبوو، هەستمدەکرد ئەو ئاسۆ بەرفراوان و بەرین و گەورەیە، بوارێکی بێئەندازە گەورەی بۆ ئەو مردووە جێهێشتووە بیر لە گەردون بکاتەوە. گۆشەگیرییەک بوو لەو جۆرە گۆشەگیرییەی مرۆڤ بە ئاکۆتاوە گرێدەدات. لەو ساڵانەی دواییدا جگە لە شادەریای سپی و لاولاو کەس نەچووبووە سەر ئەو گۆڕە. شەوێک بوو هەمیشە وەک شەوی مردن لە خەیاڵمدا دەمێنێتەوە. کە گۆڕەکەم بینی، نوشتامەوە و کێلەکانم ماچکرد، هاوارمکرد «سەریاسی سوبحدەم، من باوکتم گوێت لێمە من ئەوم، من موزەفەری سوبحدەمم، بیستویەک ساڵ لە مەوبەر کە من گیرام تۆ تەمەنت چەند ڕۆژێک بوو... تۆ منت نەبینیوە، هەرگیز بیریشت لە من نەکردۆتەوە، بەلام دەبێت ئەمشەو گوێم لێبگریت».

دوو خوشکە سپییەکە بە هێمنی لەولای گۆڕەکەوە لە سەر خاک و خۆڵی دڕکاوی ئەو دەشتە دانیشتبوون، من دوو ڕۆژ بوو لەگەڵیاندا بووم، بەڵام زۆربەی کات خەریکی حیسابی گۆشەگیرییەکانی خۆم بووم، نەمدەتوانی ئاسان لەگەڵ دونیادا بکرێمەوە. کە منیان لەو دۆخی شێوەنەدا بینی ترسان، من ئارامکردنەوە و گووتم «نا... نا... کچە ئەزیزەکانم من شیوەنناکەم... غەمی من غەمێک نییە شیوەن بە خۆی بگرێت... نا دۆستەکانم... من شتێک هەیە کە دەبێت بەم مردووەی بڵێم... شتێک هەیە کە دەبێت ئەو مردووە بیزانێت... من دەزانم ئەو دەمبیستێت... دەزانم لە ناو ئەم دەشتە بەرینەدا چاوەڕوانی شتێک دەکات، دەزانم لە ناوەڕاستی ئەم پێدەشتەدا هەموو چرپە و دەنگێکی ئینسان نرخی خۆی هەیە... دەشێت ئەو من نەناسێتەوە، بەڵام بەم هاوارانەدا تێدەگات یەکێک هەیە لە مێژە بەرەوپیری دێت... دەبێت تێبگات کە ئینسان لەم گەردونەدا تەنیا نییە... دەبێت ساردی و کپی ئەم دەشتە نەیترسێنێت... دەبێت بزانێت من بەرەوپیری ئەو ڕامکردووە... بیستویەک ساڵە من لە زیندانەکەمدا بەرەوپیری ئەو ڕادەکەم... دەبێت بزانێت چ زوڵمێکە دواجار لەم بەرهووتەدا بەیەکدەگەین... دڵنیام لەم بێدەنگییەدا هەموو هاوارێک دڵی ڕادەچڵەکێنێت».

گوێمدەنا بە گۆڕەکەوەو دەمگووت «خودای مەزن، ئەو گوێیلێمە... دەزانم گوێی لێمە... وەرن دەست لە گۆڕەکە بدەن دەجولێتەوە».

من دەستم دەخستە سەر ئەو گۆڕە و دەمبینی دەجولێتەوە، هەستم بە ڕۆحێک دەکرد دەیەوێت لە کۆت و زنجیرێکی ترسناک ئازادبێت، هەستمدەکرد هاوارێک و کڵپەیەکی قەتیس لەو گۆڕەدایە و دەیەوێت بێتەدەرێ.

من هاوارمدەکرد و ئەو تینوتاوەی ناو گۆڕەکەش تینی

دەسەند، خوشکەکان دەیانگرتم و دەیانگووت «موزەفەری سوبحدەم تۆ ئازاریدەدەیت... تۆ بەم هاوارانەت خەبەریدەکەیتەوە... کە خەبەریبێتەوە برینەکانی ئازاریدەدەن... بێدەنگ بە... موزەفەری سوبحدەم بێدەنگ بە».

من کەمێک هێوردەبوومەوە و دەمگووت «سەیرکەن. باوکێکی دەستخاڵی، کوڕێک کە مردنێکی پوچ مردووە لە پێدەشتێکی پڕ لە کەرتەشی و دڕک و خۆڵدا یەکدەگرنەوە... سەیرکەن تا چاو بڕکات قوببەیەک لە پوچی بەسەر سەرمانەوەیە، گومەزێکی مەزن لە هیچی، چەترێکی گەورە لە بێمەعنایی». لەو دەقیقەیەدا وامدەزانی کە من و سەریاس نە ڕابوردوومان هەیە، نە ئێستا و نە داهاتوو... ئەوەی منی دەترسان، ئەو چۆڵەوانیی و ڕووتەنە بێمەودایە، ئەو شەوە، ئەو ڕووناکییە بێڕۆح و بێپرشنگە بوو کە تیایدا بەیەکدەگەیشتین. من و ئەو هیچمان نەبوو بەیەکی بڵێین، هەریەکەمان بە شێوەیەک ژیابووین و مردبووین، قسەیەکمان نەبوو بیگۆڕینەوە، ئەو بێدەنگی و خۆڵ و بەرهووتە لەبری ئێمە قسەیاندەکرد. ئەو پوچییە مەزنەی من و ئەوی داپۆشیبوو، ئەو تەپوتۆزەی لە هەموو لایەکەوە دەهات، لە بری ئێمە هەموو شتێکیان دەدرکاند.

ئەو شەوە تێگەیشتم بزربوون و ئامادەگی مرۆڤێک چ کارەساتێک لە دوای خۆی جێدەهێڵێت، تێگەیشتم شوێنی مرۆڤ لەسەر ئەم زەمینە چ سەیرو گەورە و مەزنە، مرۆڤ کە جارێک لەدایکبوو، ئیدی بۆ هەتاهەتایە شوێنەواری لە ژیانی ئەوانی دیکەدا دیارە، ژیان چی نییە جگە لە زنجیرەیەکی هەتاهەتایی، نەپساو، نەپچڕاو. ئێمە لێرەدا لەم دەریا مەزنەدا ونبووین و ناگەینە جێ، بەڵام ئێستا ژیانی ئێمە، مردنمان، مانمان، نەمانمان بە ڕێگایەکی نەبینراو و نەبیستراو کار لەهەموو مەخلوقاتی سەر ئەم زەمینە دەکات، کار لە گوڵەکان دەکات،

کار لە باڵندەکان دەکات. مرۆڤ کە جارێک لەدایکبوو ئیدی دەبێتە بەشێک لە ڕیزێکی مەزن، دەبێتە ئەڵقەیەک لە زنجیرێکی ناکۆتا، هەر کات ئەڵقەیەک لەو زنجیرە دەپچڕێت، چەندەها پلپلەی دیکە لەو زنجیرە دەکەوێت، هەر کاتێک پلپلەیەک دەکەوێت، ڕوخساری هەموو ئەڵقەکانی دیکەو شوێنیان لە ناو زنجیرەکەدا دەگۆڕێت. ونبوون و مردنی مرۆڤێک ڕوخساری هەموو ژیان لەمسەر زەمینەدا بەجۆرێکی دی دروستدەکاتەوە... ونبوونی مرۆڤێک دەتوانێت ئەندازەی کۆی ژیان تێکبدات، دەتوانێت جوگرافیای پەیوەندییەکان بگۆڕێت. گەر من هەبوومایە، گەر من وەک مردوویییەک لەو سەحرایەدا کفن نەکرابامایە، دەشیا هەموو ئەو ژیانە بەشێوەیەکی دی بڕۆشتبایە. ئینسان ئەستێرەیەکە نابێت بهێڵین بکەوێت، چونکە ئەو بەتەنیا ناکەوێت. ئێستا کێ دەزانێت سەدای ئەم ونبوونەی ئێمە لە کوێی دیکەی زەمیندا دەنگدەداتەوە؟ کێ دەزانێت، کەی و لە چ زەمانێکدا یەکێک لە خۆڵەمیشی مردن و ونبوونی ئێمەوە هەڵدەستێت و دەبینێت ئەو گڕی کەوتنی ئێمە سووتاندوێتی؟.

ئەو شەوە تێگەیشتم شوێنی خاڵی من لەم جیهانەدا ئەم گۆڕەی دروستکردووە، بەڵێ، من پێتاندەڵێم و دەمەوێت گوێم لێبگرن، مردنی مرۆڤێک تێکچوونی هەموو هاوکێشەکانی ژیانە لەسەر ئەم ئەستێرەیە. من لە دوای خۆم زنجیرەیەکی بێمەودا ژیانم تێکدابوو. ئەو شەوە خوشکە سپییەکان تا درەنگ دەیانویست ئارامبکەنەوە، تێمبگەێنن کە منیش قوربانییەکم لە قوربانییەکان، منیش یەکێکم دواجار وەک هەموو ئەوانەی تووشی کارەسات دەبن و دەمرن، بەڵام من بەو پێدەشتانەدا بەرەڵادەبووم، دەکەوتمە لێدان لە سینەو بەرۆکی خۆم، دەکەوتمە خۆڵکردن بەسەر خۆمدا، پێڵاوەکانم دادەکەند و بەژێر ئەو تاریکییە لێڵ و ڕووزەرد و زەعفرانییەدا لە خوشکە سپییەکان

دووردەکەوتمەوە، وەک جانەوەرێکی زامدار ئەملوراند، بەسەر درک و بەردو پوش و پەلاشی ئەو شەوەدا ڕامدەکرد و سەیری ئەو بۆشاییە بێسنوور و بێرەحمەم دەکرد کە هەستمدەکرد، هەنگاو بە هەنگاو ئاسمانێکی فراوانتِرم بۆدەکاتەوە، نەوەک بۆ ئەوەی ئازادبم، بەڵکو بۆئەوەی وێڵبم و ونبم و دەرگای ونبوونەکانم تا ئەوسەری دونیا والابێت... ڕامدەکرد و گەردون لە ڕاکردنمدا گەورەتر و کراوەتر، بەڵام چۆڵتر و خاڵیتر دەینواند. هەستمدەکرد ئەوەی بیستویەک ساڵە تیا دیلم سەحرا نەبووە، سەرم بەرزدەکردەوە و پڕ بەو دەشتە مەزنە هاوارمدەکرد « خودایە ئەمەیە بیابان، ئەمەیە بیابان، ئەمەیە بیابان». خوشکە سپییەکان چیتر نەیاندەبینیم، من لەو وشکەخاکەدا، لەو زەمینە قڵیشاو و ماندووەدا ڕامدەکرد و لە خۆمدەدا، لەو گۆڕە دووردەکەوتمەوە و چنگ لە دوای چنگ خۆڵم بەسەر خۆمدا دەکرد، بۆ یەکەمجار تێدەگەیشتم ئازادیش چ بیابانێکی گەورەیە. گەڕانەوەی مرۆڤ لە ئەسارەت کاتێک مانای هەیە کە نەگەڕێتەوە سەر خۆڵێکی ڕووت، نەگەڕێتەوە سەر ئێسک و پروسکی ژیانەکانی تر...

ئەمشەو لەبەردەم ئێوەدا دان بەو ڕاستییەدا دەنێم، کە نەمتوانی قبووڵی مردنی سەرپاسی سوبحەدەم بکەم. ئەو شەوە کە وەک شێت وەک باڵدارێکی پیسخۆر، واشەیەکی بریندار بەدەوری ئەو گۆڕەدا دەسوڕامەوە و هاوارمدەکرد، تێگەیشتم کە ناتوانم مردنی سەرپاسی سوبحەدەم قبووڵبکەم، نەدەکرا مردنی ئەو بسەلمێنم، خۆڵمدەکرد بەسەر خۆمدا و پڕ بەو دەشتانە هاوارمدەکرد «ئەمە گۆڕی ئەو نییە، ئەو نەمردووە».

ئەمشەو پێشتاندەکەوم و دەڵێم من بەشداربووم لە هەموو یارییەکاندا، بەشداربووم لەوەی کە شەوێک تێگەیشتم من بۆ ئەوەی

بژیم، دەبێت باوەڕ بەو مردووە نەکەم کە لە بەحرێکی تەپوتۆزدا خەوتبوو، ئەو مردووەی یەکترمان نەدەناسی، بەڵام دەمزانی بێئەو من شتێکم نابێت بۆی بژیم... دۆستانی من، ئەی ئەوانەی نازانین ئەم کەشتییە بەرەو کوێمان دەبات. من دواجار دەستم خستە سەر ئەو گۆڕە و گووتم «باوەڕ بە هیچ حەقیقەتێک ناکەم، تۆ نەمردوویت، من دەگەڕێم و دەتدۆزمەوە». بیستویەک ساڵ زیندان فێریکردبووم باوەڕ بەهیچ ڕاستییەک نەکەم... ئێستا هەستدەکەم ئێمە هەموومان ئازادی خۆمان بە وەهم دەست پێدەکەین... ئاه خودایە، ئازادی هەرگیز لەوەهم جیانابێتەوە. نا لۆمەمەکەن... لۆمەمەکەن... گوناهی من وەک گوناهی هەموو ئادەمیزادەکانی تر بوو، وەک گوناهی هەمووتان بوو، هەموو ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ئازادیتان لە خەیاڵ پاکنەکردەوە.

لە شەوی دواتردا سەرتاپا ڕوخساری ژیانی من گۆڕا. من ئەو شەوە ناودەنێم، شەوی ژیان و زیندووبوونەوە.

لەو شەوەدا تێگەیشتم کەسەریاسێک و سەریاسێکی دیکەش لە دونیادا هەیە.

ڕیشەکانی چیرۆکی ئەو شەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک ساڵ لەوەوبەر، کاتێک محەمەدی دڵشوشە لەیەکێک لە ئێوارە پڕ سەفاکانی خۆیدا، گوێی لە گۆرانی داواکراوی یەکێک لە ڕادیۆ حیزبییەکان دەگرت، کاتێک گوێی لەو بەرنامەبێژە کچە بوو بەدەنگێک « بەزۆر نازکی دەکردەوە» دەیگووت «سەریاسی سوبحدەم، ئەم گۆرانییە بە وەستا مەجید، بەهێی ژنی و شیلانی کچیان پێشکەشدەکات، بە غەفووری ڕێحانە بەبۆنەی زەماوەندیانەوە، هەروەها بە هەموو

پێشمەرگەکانی کەرتی بیستویەک و مام عبداللە لە بازاڕی کۆنەکە...». محەمەدی دڵشوشە دڵنیابوو کە بە ڕاستی گوێی لەو ناوەبووە، دڵنیابوو کە سەریاسی سوبحەدەم گۆرانییەکی کامکارانی داواکردووە، بەڵام لەو کاتەوەی سەریاسی دەناسی دەیزانی کە ئەو کوڕێکی بێکەسە. دەیزانی ئەو هیچ کەسێکی ئەوتۆی نییە گۆرانی پێشکەشبکات، ئەوەش سەرەتای دەستپێکردنی تەلیسمەکان بوو. محەمەدی دڵشوشە دەیزانی ناوی سەریاسی سوبحەدەم ناوێکی هێند سەیر و ناوازەیە ناکرێت بە ئاسانی دووبارەبێتەوە. بەوەدا محەمەدی دڵشوشە منداڵی سەوداسەر و ئەڤینداری نهێنییەکان بوو، ئەو ئاماژە تێپەڕ و کوتوپڕ و خێرایە بەسبوو تا لەوێوە بەرەو دەریای ئەو تەلیسمانە بڕوات کە خۆشی و ئێمەشی تیا نوقمدەکات.

ئەو ئێوارەیە محەمەدی دڵشوشە بە ڕوخسارە سادە و ڕووخۆشەکەی خۆیەوە، بە مەدالیاکانی دەستییەوە، دەچێت بۆ گوزەری عەرەبانەکان و لە ناو دەنگەدەنگی دەمە و ئێوارەی میوەفرۆشەکاندا لەسەریاس دەپرسێت ئایا هیچ گۆرانییەکی لە هیچ ڕادیۆیەک داواکردووە؟ بەوەدا سەریاسی سوبحەدەم ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕادیۆشی نەبووە، بە سەرسامییەکەوە دەڵێت ئەو لە مێژە گوێی لەو جۆرە بەرنامانە نەبووە. ئەو ڕۆژە محەمەدی دڵشوشە ئەو هەواڵە سەیرە بۆ سەریاسی سوبحەدەم دەگێڕێتەوە. سەریاس بە پێکەنینەوە دەڵێت «نابێت، سوبحەدەمێکی تر لە دونیادا نییە... من تەنیا کەسێکم ناوی سەریاسی سوبحەدەم بێت».

بەڵام محەمەدی دڵشوشە دڵنیایە لە پشت ئەو ناوەوە نهێنییەکی گەورە خۆی حەشارداوە. لە یادتان نەچێت محەمەدی دڵشوشە عاشقی نهێنییە، کەسێکە لە هەموو شتێکدا بۆ نهێنی دەگەڕێت، ئەڤینی بۆ نهێنی خەیاڵی بەرەو جێگای ترسناک دەبات، لە هەموو

شتێکدا دیوێکی نادیار دەدۆزێتەوە، لەپشت هەموو پەردەیەکەوە بۆ شێوە تەلیسمێکی نەکراوە دەگەڕێت. گەنجێکە جگە لە شکاندنی تاریکی هیچ هیوایەکی تری نییە. ئەو ڕۆژە بە سەریاسی سوبحدەم دەڵێت «بەڵێ سەریاسێکی تر هەیە و نهێنی تۆش لەگەڵ نهێنی ئەودا هاوجووتە». دڵنیام کاتێک دڵشوشە ئەو قسانەیکردووە جگە لە ئارەزووی بۆ ورووژاندنی سەریاس هیچ ڕاستییەکی لەبەردەستدا نەبووە. بەڵام ئێوارەی هەمان ڕۆژ محەمەدی دڵشوشە و سەریاسی سوبحدەم دەچنە ئەو ڕادێویە و تکا لەو کچە دەکەن کە نامەکان دەخوێنێتەوە، ڕێنمایانبکات و ئەو نامەیەیان نیشانبدات کە سەریاسی سوبحدەم نوسیویەتی... دوای کەمێک مەکروناز کیژەکە لەناو نامەکاندا پارچە کاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگ دەدۆزێتەوە کە سەریاس ناوێک ناردویتی، بەڵام جگە لەو زانیارییانەی کە لە بەرنامەکەدا خوێندویتییەوە هیچی تری تیا نییە. ئێوارەی هەمان ڕۆژ محەمەدی دڵشوشە لە ڕێگای باوکییەوە بنکەی کەرتی بیستویەک دەدۆزێتەوە کە لە ئاوەدانییەکی بچوکی دەرەوەی شاردایە.

لە ئێوارەیەکی زۆر درەنگدا لە ژوورێکی چکۆلانەی بنکەیەکی سەربازی کۆندا، لە ناو گڤەی بایەکی سارددا، لە ژوورێکدا پڕ لە تاس و چەمچە و فەردە گەچی هەڵوەشاودا، کە کەرەستەی کاری ئەو کرێکارانەیە کە بنکەکە گەچکاریدەکەن، لە تەپوتۆزی ئەو گەچەدا کە پاشماوەی لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەو بنکەیەدا بڵاوبۆتەوە، شتێکی سەیر ڕوودەدات، شتێک بۆ ئێستێک شوێنی باوەڕ نییە. لەویادا سەریاسی سوبحدەم بە سەریاسی سوبحدەم دەگات. ڕووداوێک دواتر لە شەوێکی دووردا دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە ژیانی مندا دەبێت، منێک کە هاتووم و لە ناو گڤەبایەکی سارددا، لە تەمێکی سپیدا بۆ ئەوان دەگەڕێم.

•

ئیدی ئاگاداربن، ڕێگای هەموو چیرۆکەکەمان لێرەوە دەگۆڕێت، ئیدی ئەو دونیا یەکرەنگ و یەکگرتووەی پێشوو دەشکێت، ئیدی لە نێوان مرۆڤ و ئاوێنەکاندا وندەبین. ئیدی بۆئەوەی سەریاسەکان لە یەکتر جیابکەینەوە، بە یەکەمین سەریاسی سەربوورردەکەمان دەڵێین «سەریاسی یەکەم و بەوی دیکەیان دەڵێین «سەریاسی دووەم» یان «سەریاسی گەورە» و «سەریاسی بچوک».

ئەو شەوە شەوێکی سەیر و ترسناکە لە ژیانی هەردوو ئەو کوڕەدا، دوو گەنجن کە بە ڕوخسار هیچیان لەیەکترناچێت، بەڵام هەردووکیان ناویان سەریاسی سوبحدەمە، هەردووکیان بێکەسن، هەردووکیان زنجیرەیەک دەستاو دەستیان کردوە تا گەورەبوون، هەردووکیشیان لە منداڵییەوە سەرو هەنارێکی شوشەیان پێیە. محەمەدی دڵشوشە ئەندازیاری هەموو دۆزینەوەکانە، ئەو سەریاسی دووەم لەسەر شوێن خەوەکەی خۆی هەڵدەستێنێ و پێیدەڵێت «بۆ ئەو نامەیەت نارد بۆ ئەو بەرنامەیە؟ بۆ دەرگای ئەم تەلیسم و تاریکییەت کردەوە؟... تۆ کێیت، لە کوێوە هاتوویت، بۆ بەو جۆرە گەورەبوویت، چیت کردووە و چی دەکەیت؟... چیت هەیەو چیت لێزەوتکراوە؟». سەریاسی دووەم کە منداڵێکی سپیکەلانەی چاو هەنگوینییە، نیگایەکی درو نەسرەوت و ژێرەوانکێی هەیە، لە نیازی هەموو مەخلوقاتەکان بە گومانە، سەرەتا هیچ تێناگات، گێژی و نەفامی و بەدحاڵیبوونێکی کوتوپڕ کە کاریگەری ئەو ڕاچڵەکانە لەناکاو و ناوەختەیە لە سیمایایەتی، لە بەرمیلێکی کۆنی بنکەکە دووجار دەموچاوی دەشواو دەڵێت «لە ئێوارە ناچێت لە بەیانییەکی ناخۆشی تروهات دەچێت... نا ئێستا لە ئێوارە ناچێت، هیچی لە ئێوارە ناچێت، زۆر ڕۆژان هەن تێیاننناگەم، نیوەڕوانیان لە عەسر دەچێت، شەویان لە نیوەڕۆ دەچێت، ئێوارەیان

لـە بەیانـی دەچێـت، بەیانیـان لـە نیوەشـەو دەچێـت، تێیانناگـەم، ئـەم ڕۆژ لـەو ڕۆژانەیـە». سەریاسـی یەکـەم بـە زەدردەخەنەیەکـی پەشـۆکاوەوە دەڵێـت «ئێوارەیەکـی ناخۆشـە... وانییـە؟ ناخۆشـترین ئێـوارەی دونیایـە... ئێمـەش هاتوویـن سـەیرترین تەلیسـمی دونیامـان بـۆ هێناویـت». سەریاسـی دووەم کـە کەمێـک کەمتەرغـەم، بێبـاک بـەڵام دڵـڕەق و وریـا دیـارە، دەپرسـێت «مـن تێناگـەم باسـی چیدەکـەن...».

محەمـەدی دڵشوشـە دەڵێـت «باسـی ئـەوە دەکەیـن یەکێکـی دی هەیـە، مرۆڤێکـی تـر هەیـە کـە وەک تـۆ نـاوی سەریاسـی سـوبحدەمە... ناوێـک گـەر شتێکی لـە پشـت نەبێت بە ئاسانی دووبارە نابێتـەوە، وانییە؟... بـەڵام نازانـم ئەگـەر تـۆ خـۆت بناسـیت هەمـوو شـتێک لێـرەدا دواییدێـت و ئێمـە ماڵاواییـت لێدەکەیـن و دەڕۆیـن، بـەڵام گـەر خـۆت نەناسـی شـتێکی تـر دەسـتپێدەکات، سـەرەتایەکی تـر، بـەڵام چووزانـم... بەڵکـو هەمـووی خەیـاڵ بێـت، بەڵکـو شـتەکە درۆیـەک بێـت و بـە خـۆڕا لـە خەیاڵـی منـدا سـەوز بووبێـت...».

محەمەدی دڵشوشـە لەسـەرەخۆ هەموو چیرۆکەکەی بۆ باسـدەکات.

سەریاسـی دووەم بـە کەمێـک تێفکرینـەوە دەپرسـێت «گـەر تـۆش سەریاسـی سـوبحدەم بیـت کەواتـە مـن کێـم؟». هەمـوو شـتەکان نائاسـایی دەنوێنـن، شـتێک لـە لێکچوونـی سـەیر لـە دوورەوەڕا ئـەو دوو مرۆڤـە پێکـەوە گرێـدەدا، شـتێک کـە لەگـەڵ ئاشـکرابوونی ئـەو هەنـارە شوشـەیەدا دەگاتـە چڵەپۆپـەی خۆی. کـە سەریاسـی دووەم ئـەو هەنـارە شوشـەییە دەبینێـت کـە محەمـەدی دڵشوشـە دەیخاتـە سـەر مێزەکـەی و لێدەپرسـێت «تـۆ هەنارێکـی وات بینیـوە، ئـەم هەنـارە هیـچ مەعنایەکـی هەیـە لـەلات ؟». سەریاسـی دووەم بـۆ یەکەمجـار سەراسیمە و حەپەسـا و تەماشـایاندەکات و دەڵێـت «ئەمـڕۆ لـە هیـچ ڕۆژێـک ناچێـت... ئەمـڕۆ ڕۆژێکـی قەڵـب و تڕوهاتـە، لـە هیـچ کاتێکـی تـر ناچێـت». هەنـارە

شوشەکە هەڵدەگرێت و دەڵێت «ئەمە هەمان ئەو هەنارەیە کە من لە منداڵییەوە پێمە... هەمان ئەو هەنارەی کە تێناگەم هەناری خۆشییە یان نەگبەتی، هەناری بەختە یان بەدبەختی... ئێوە دەڵێن چی؟ ئێوە کێن؟... بەڵام گەر بشزانم ئێوە کێن، بەچی دەچێت... ئێستا دەبێت من بپرسم من کێم؟ من چیم؟... ڕۆژێکی تروهاتە، ڕۆژێکی گواوییە وەک قونی سەگ، شیاکەیە هەمووی شیاکەیە... گەر تۆ من بیت، ئەی من کێم؟... سەریاسی سوبحدەمێکی تر... یەکێکی تر کەوەک من بێکەس گەورەبووە و هەنارێکی شوشەی هەیە کەوەک کولەکەی ڕۆحی وایە... هەنارێکی شوشەی تر، بە یەکێکی تر کە نازانم وەک دۆست سەیریبکەم یان دوژمن... من نازانم بتگرمە باوەش یان بڵێم برۆ هەر کەس هەیت بە جەهەنەم بۆ کوێ دەچیت بچۆ؟».

دوو چاوی گەشی هەبوو گەر لەسەر تەختی دەموچاوێکی ساف بووایە گەلەک جوان دەکەوتنەوە، بەڵام تێکەڵاوبوونی تەعبیرەکانی منداڵی بە تەعبیرەکانی پیاوی گەورە هەموو ڕوخساری کوشتبوو، دەنگی گرتر و سیمای لە هەرزەکارەکانی تر گەورەتر بوو. ئەو شەوە هەردوو سەریاسەکە بەتەواوی نەیاندەزانی چی لە گۆڕێیە، هێشتا بوارێکیان نەبوو بیر لە قوڵایی ئەو دەردە بکەنەوە. سەریاسی دووەم نەیدەتوانی زۆر چاوەڕوانبکات، شەو دەبایە لەگەڵ ماشێنێکی پشکنیندا بۆ پاسکردنی هەندێ شوێنگەی گرنگی دیکە دەرچێت. بە میوانەکانی دەگووت «ئێوە لە چ کاتێکی سەیردا هاتوون، وەک ئەوەی خەنجەرێکم لێبدەن و بەجێمبهێڵن، وەک ئەوەی دڵم بۆ نەشتەرکارییەک بکەنەوە و بەجێمبهێڵن... سەیرکەن، من ئێستا دەتوانم چی بڵێم؟... بۆ هاتوون بۆ لای من؟... ئەگەر نهێنییەک هەبێت، کلیلی ئەو نهێنییە لای من نییە... ئەگەر ئێوە لە هیچ

تێدەگەن ئەوا پێمبڵێن، من لە هیچ تێناگەم... منیش حەزناکەم لە ترۆهات و تاریکییدا بژیم... خۆتان دەبینن ئێستا لە شوێنی ئیشم... وەزیفەیەک چاوەڕوانمدەکات... کێ لە دەردم تێدەگات گەر بڵێم ئەمشەو دەرگایەک لە من کراوەتەوە کە نازانم دەرگای بەهەشتە یان جەهەنەم... من دواجار هەرچییەک بێت دەبێت تفەنگەکەم هەڵبگرم و بڕۆم... من هەر کەسێکبم لەم تفەنگە جیاناکرێمەوە... ئەو لە جیاتی من بیردەکاتەوە... من ناوم سەرپاسی سوبحدەم بێت یان شیاکەی سوبحدەم، هیچ لە هیچ ناگۆڕێ... من تفەنگێکم هەیە و دەبێت لە واجبدابم... بمبورن، میوانەکانم، بمبورن... ئەمشەو ئەگەر چی دەشێت لە شەوەکانی تری ژیانم جیاوازتر بێت، بەڵام سەرکار و ئەفسەر و چاوەدێرەکانی شەو ئەو قسانە نازانن، من ناوم هەرچییەک بێت دواجار دەبێت ئەمشەو بڕۆم و لەو لووتکە ساردانە پاسەوانبم».

بەپەلە لە پێشچاویان خۆی دەبەست و دەیگووت «منتان ناناسوودەکرد، هەستم نەدەکرد گەر گۆرانییەک داوابکەم، کێچەڵی وەهام بۆ دروستبکات... من سەرپاسی سوبحدەمم، نابێت یەک مرۆڤ لە دوو ڕوخساردا دووبارەبێتەوە، گەر تۆش سەرپاسی سوبحدەم بیت، ئەی کەواتە من کێم، ئەی ئەگەر من ئەوم کەواتە تۆ کێیت...چ سەگبابێک یاری بەم شتانە کردووە، شتی وا دەبێت؟... دەبێت بڕۆم... بڕۆم و نەشزانم من کێم کە دەڕۆم... پاسەوانی دونیابم و نەشزانم من کێم پارێزگاری لەو ترۆهاتانە دەکەم... ترۆهات زۆربووە... فیشاڵ و هاشەوهوشەیەکی زۆرە لەم بازاڕەدا... گوێبگرن برایان دەمرێکی گواوییە، زەمانێکی بۆنی لە بۆنی قوونی کەر خۆشتر نییە». سەرپاسی دووەم تفەنگەکەی هەڵدەگرت و دەیگووت «تا بەردەرکی ئەم کاولەیە لەگەڵتاندا دێم... دەبێت یەکتر ببینینەوە... شتێک هەیە... کە نازانم چییە، دەبێت دوایی قسەی

لەسەر بکەین... با یەکتر ببینینەوە، ئەوسا دەزانین دەبێت لەسەر چی قسەبکەین».

محەمەدی دڵشوشە دەیگووت «کەسمان فێرنەکراوین بپرسین ئێمە کێین؟ کە ڕۆژێک ڕوبەڕوی ئەو پرسیارە دەبینەوە ئیتر هەموو ژیانمان دەشێوێت... بەڵام دواجار هەریەکێکمان دەبێت لە مانای ژیانی خۆی تێبگات».

لە ڕێگادا تا دەرگای بنکەکە بە ناو گۆڕەپانێکی گەورەدا تێدەپەڕین، گۆڕەپانێک بۆنی غەمێکی پاییزانەی لێدەهات... بۆنی بەردی وەڕز و گیای پەژموردە و تەنها... جێگایەک نە موڵکی تەواوەتی سروشتە و نە موڵکی تەواوەتی مرۆڤ... شوێنێک لە نێوان وڵاتی مرۆڤ و وڵاتی پانوبەرینی گیاندار و باڵندە کێوییەکاندا ساغنەبووبووەوە. ئەو شەوە کە سەریاسی دووەم لەبەرچاویان سوار ماشینێکی بوو، لە پەنجەرەکەوە دوا سڵاوی خێرای لێکردن گووتی «بەدۆعا هاوڕێیان بە دۆعا... ئەمە یەکەم شەوە ئاوەها لە خۆم دەترسم... بەدۆعا... وای وای، سەیرکەن ئاسمانیش پڕە لە ئەستێرەی تروهات... ئەزیزان تەنیا شتە تروهاتەکان لەیەکتر دەچن».

کە محەمەدی دڵشوشە و سەریاسی سوبحەدەم گەڕانەوە پێکەوە بە شەقامێکی درێژی شەودا درێژترین پیاسەی خۆیان کرد، ساڵانێک دواتر کە سەریاس دوای مردنی محەمەدی دڵشوشە چیرۆکی ئەو شەوەی دەگێڕایەوە نەیدەتوانی ئازارە قووڵەکانی بشارێتەوە. دوو گەنجن هەردووکیان لەسەرەتای ژیاندا، محەمەدی دڵشوشە بە تێفکرینێکەوە کە هەمیشە تێکەڵبووە بە سۆز و شەوق و شوڕێکی کوشندە بە سەریاس دەڵێت «سەریاس ئەوە درۆیە کە مرۆڤەکان لەیەکناچن... درۆیە... ئێمە هەموو ئەوانەی پێکەوە گەورەبووین، ژیانمان لەیەکدەچێت... وەک ئەوەی ژیانمان دووبارەبوونەوەی وێنەی

سەر یەک ئاوێنەبێت، وەک ئەوەی یەکێک لە جێگایەکی دووردا ژیانێکی نمونەیی هەموومانی پێبێت، ژیانێک هەرچی شتێک لە عومری ئێمەدا ڕوودەدات پێشتر لەلای ئەودا ڕوویدابێت، وەک ئەوەی دەردی ئێمە لەدەردی یەکێکی مەزنەوە کەوتبێتەوە، یەکێک کەسمان بەتەنیا ژیانی ئەو تەواوناکەین، هەر یەکێکمان بەشێکی بچوکی ئەو ئازارەی ئەومان پێیە... مەرجیش نییە ئەو شتانەی لەیەکتر دەچن تروهات بن».

سەریاس کە پەشۆکانێکی گەورەی پێوەدیارە، بەڵام بەردەوام بە تورەیی قژە خاو و بزرکاوەکەی لەسەر ڕوخسارێکی ماندوو و سووتاو لادەبات، هەندێجار دەوەستێت تا قەیتانەکانی کالەیەکی سپی کۆن گرێبداتەوەو دەڵێت «محەمەدی دڵشوشە بۆ گوڵەکان هەقیان هەیە لەیەک نەچن، بۆ باڵندەکان هەقیان هەیە هەر یەکێکیان بە جۆرێ بخوێنێت، بەڵام بۆ من دەبێت بپرسم سەریاسی سوبحەدم کێیە؟ کامەمان ژیانمان ئاوێنەی ژیانی ئەوی ترە؟». محەمەدی دڵشوشە بە ئەسپایی سەردادەنەوێنێت و دەڵێت «مرۆڤ هەقی خۆیەتی ناوازە بێت، تاقانە بێت، هیچ شتێک لەو نەچێت، بەڵام من قسەم لە ئازارێکە دواجار ژیانی هەموومان یەکساندەکاتەوە. قسەم لە شتێکە ئێمە بە هەموو جیاوازییەکانمانەوە کۆدەکاتەوە». سەریاسی سوبحەدم دەیگووت «من ترسم لەوەیە سێبەری یەکێکی تربم... دەترسم سەریاسی سوبحەدم بە خۆی و تۆپە هەنارەکەیەوە سێبەری یەکێکی تر بێت کە لە شوێنێکی تردا دەژی». محەمەدی دڵشوشە دەوەستاو دەیگووت «من قسە لە هەزاران ڕۆح دەکەم کە نازانین لە کوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین... قسە لە نهێنی دەکەم، لە قفڵێکی مەزن، لە دیوارێک ناهێڵێت ئەو مەعنایە ببینین... من لەو کاتەوەی ئەو ناوەم گوێ لێبووە، بیر لە هەموو ئەو نهێنییانە

دەکەمەوە کە چواردەوریان گرتووین، ئەو نهێنیانەی بچوکن بەڵام قفڵی گەورەیان لە ژیانمان داوە... باسی موسیبەتێکی گەورەتر لە هەموو موسیبەتەکانی تر دەکەم... موسیبەتی ئەوەی ئێمە هیچ دەربارەی خۆمان نازانین... نە من و نە تۆ هیچ دەربارەی خۆمان نازانین؟... کێ دەڵێت محەمەدی دڵشوشەش دووبارەنابێتەوە؟ کێ دەڵێت من بەیانییەک لە خەو هەڵناستم و یەکێکی تری وەک خۆم لە ژوور سەرم نادۆزمەوە؟ کێ دەڵێت ئێمە کۆمەڵێک مرۆڤ نین یەکتر دووبارەدەکەینەوە؟».

# ١٤

چاوپێکەوتنی ئەو ئێوارەیەی سەرپاسەکان بە جۆرێ کورت و خێرا بوو، کەسیان هیچ لەیەکدی تێنەگەیشتن، بەڵام ئێستا کە ئەم چیرۆکە بۆ ئێوە دەگێڕمەوە دڵنیام ئەو ئێوارە کورت و یەکدی بینینە ناوەخت و کوتوپڕە هەردووکیانی بە جۆرێکی سەیر ناناسوودە کردووە.

دواتر کە سەرپاسی دووەم لە زیندانێکی دووردەست و تاریکی ناو کۆمەڵێک چیاوە کاسێتەکانی بۆناردم، بە هێمنی باسی ئەو ئێوارەیەی بۆکردبووم، باسی ئەو پەشۆکان و ئازارانەی بۆکردم کە دوای ئەو ڕۆژە تووشیهاتوون. نا وامەزانن سەرپاسی دووەم بە پێچەوانەی سەرپاسی یەکەمەوە منداڵێکی خۆشبەخت بووە. تاکە خۆشبەختییەکی گەورەی سەرپاسی دووەم ئەوەیە کە زیندووە. ئەگەرچی زیندوێتی مایەی هەموو ئازارەکانە، بەڵام لە هەموو خۆشییەکانی تر گەورەترە. ژیان بەختیارییەکە کە دەیکەیتەوە پڕە لە ئازار، بەهەشتێکە لە ناوەوە لە کۆمەڵێک دۆزەخی بچوک بچوک دروستبووە، جوانییەکی بێمەودایە لە زنجیرێک ناشیرینی چنراوە. من ساڵگەلێکی درێژ لە زینداندا بیرم لەو گرفتە قووڵانە دەکردەوە، خەیاڵ و فیکری خۆم بۆ تێڕامان لەو کێشانە تەرخاندەکرد. هەرگیز باوەڕم بەوە نەبووە پارچە بچوکەکان کاتێک پێکەوەڕا دەلکێنرێن، کاتێک لە بەشە چوونیەکەکان شتێکی مەزن دروستدەکەیت، سیفەتی ئەو قەوارە تازانە هەمان سیفەتی گەردە

چکۆلەکانی بێت. سیفەتی ئاگر و سیفەتی گورزێک لە تیشک یەک شت نییە، ژیانیش ئاوەهایە شەپۆلانێکی مەزنە لە جوانی کە لە هەزاران وردە شەپۆلی ئازار دروستبووە. سەیرکەن، ئەی دۆستان، ئەی هاوڕێ و هاوسەفەرەکانی من، سەیری ئەم دەریایەی ژێرمانبکەن، ئایا نهێنی شەپۆلێک لەگەڵ نهێنی دەریادا تێکەڵاودەکرێت؟. دیارە دەکرێت شەپۆلێک بگرین، تەماشایبکەین، بەڵام کێ لە ئێمە دەتوانێت زەریا بگرێت و تەماشایبکات؟ دەتوانین بزانین شەپۆلێک لە کوێوە هاتووە و لە کوێدا دەمرێت، بەڵام کێ لە ئێمە دەتوانێت بزانێت زەریا لە کوێوە دەستپێدەکات و ئاو لە کوێدا کۆتاییدێت؟ دەتوانین هەموو هەست و نەستی شەپۆلێک لە هەڵچوون و داچوونەکانیدا ببینین، بەڵام کێ لە ئێمە دەتوانێت قسە لە هەست و نەستی هەموو ئەم ئۆقیانووسە بکات؟ دەزانین شەپۆلێک.کەی لە دایکدەبێت و کەی خامۆشدەبێت، بەڵام کێ لە ئێمە دەتوانێت ساتی لەدایکبوونی دەریا و ڕۆژی مردنی بزانێت؟ ژیانیش ئاوەهایە. هەمیشە زیندووەکان خۆشبەختترن لە مردووەکان... با یادگارەکانیان تاڵبێت، با بە ئازارەکانیانەوە وەک داهۆڵێک لە ئاگردا بسووتێن و لەبەر با سەمابکەن... دواجار زیندووەکان لە ناو ئەو دەریا مەزنەدان، ئەو دەریایەی کە نەدەگیرێت، نە ڕووناکدەکرێتەوە و نە تەفسیردەکرێت، مردووەکانیش ئەوانەن کە لەو دەریایە دەرکراون. تا ئەو ساتەی ئێمە زیندووین، خۆشبەختین. نا مەڵێن ئێمە لەم دەریایە وەڕزبووین و تاکەی لەم بەحرەدا بسوڕێینەوە. لە من بپرسن، من کە وەک پێغەمبەری ئازارەکانم لێهاتووە. بیستویەک ساڵ شەو و ڕۆژ لە پەنجەرەیەکەوە تەماشای سەحرام دەکرد و هاوارم لێدەکرد. من لەو پەنجەرەیەوە شتێکم بینی گەر بهاتبایە و نەمدیبایە نە دەژیام... من لەو پەنجەرەیەوە بەختەوەری بیابانم بینی، یاری تیشک و لمم بینی. گەر بیستویەک ساڵ باوەڕم بەوە نەهێنابایە کە من جوانییەکی بێسنوور و

مەزن لەو لمەدا دەبینم، لەویادا دەخنکام. مرۆڤ دەبێت تا دوا هەناسە، تا دوا مردنیش باوەڕی بە بەختیاری خۆی نەدۆڕێنێت، باوەڕی خۆی بە جوانی لە دەستنەدات... نا من پیاوێکی دوو زمان نیم، منیش وەک هەر یەکێک لە ئێوە پڕ بە دڵ لە دەست هەموو پوچییەکان هاوارمکردووە، منیش نائومێدی مەزن و بەزێن و بەزەبری خۆمم هەبووە، چەندەها جار شکستم خواردوە و چەمیومەتەوە و تێکشکاوم، بەڵام من قسە لەو نورە دەکەم کە دوای هەموو نائومێدییەک هەڵدێت. سەدان ڕۆژ وەک شێت بەیانی لە دوای بەیانی و شەو لەدوای شەو لەعنەتم لە خۆم و ژیان کردووە، بەڵام دواجار بەیانییەک هەڵدەستام و هەستم بەو جوانییە دەکرد کە کۆی شتەکان پێکەوە گرێدەدا. جیاکردنەوەی ئازارەکانی ئێمە، چارەنوسی ڕەشمان، ناڕێکییە کوشندەکانی خۆمان لەو ڕێکی و جوانی و مەزنییەی هەموو شتێکی ئەم گەردونەی ڕاگرتووە، تاکە هێزێکە دەتوانێت بە ژیانەوە گرێمانبداتەوە... با قەدەری بچوکی خۆمان بە مۆسیقای ئەفسوناوی ئەم گەردونەوە گرێنەدەینەوە. گەر ژیانی ئێمە نەغمەیەکی ناسازە، مانای ئەوە نییە لە قووڵایی ئەم گەردونەدا، لە کۆی یاساکانی وجوددا هێزێک و جوانییەکی مەزن بوونیان نییە. من لە زیندان گوێم لەو نەغمە ناسازەی زیندەگی خۆم نەگرت، بەڵکو گوێم لەو ئاوازە قووڵانە گرت کە لە هەموو لایەکی گەردونەوە هەڵدەقوڵان. من دەزانم ئێوە هەمووتان لە چ نائومێدیەکدا دەژین، دەزانم چ حەسرەتێکە سوار کەشتییەک ببیت بە نیازی ئەوەی بگەیتە خۆرئاوا، بگەیتە بەهەشت، بەڵام لە ناکاو شەوێک با بەرەو ناوەڕاستی ئۆقیانووسێک بتبات، قیپتانێک کە هیچ لە دەریا نازانێت لەناو دەریایەکی بێسنووردا ونتبکات. بەڵام ئێوە تەنیا بیر لەم ساتە غەمگینەی ژیانی خۆمان مەکەنەوە کە لێرەدا ونبووین، بەڵکو بیر لەو ئاوازە بکەنەوە کە لەم ڕێکییە بێسنوور و پێکەوە گونجانە مەزنە دروستبووە. من ئێستا کە بیر

لـە ڕابـوردووی هەمـوو ئـەم چیرۆکـە دەکەمـەوە هەسـتدەکەم بـە جۆرێکـی کەمیـش بێـت محەمـەدی دڵشوشـە زیاتـر لـە هـەر کەسـێکی تـر لـە دوای ئـەو دەزووە باریـک و نەبینـراوە گـەڕاوە کـە کـۆی شتـەکان ڕێکدەخـات. محەمـەدی دڵشوشـە چـاوی لـە هەمـوو دەریاکـە بـووە، مـن سـەروەختێک زۆر بیـرم لـە نهێنـی ئـەو گەنجـە دەکـردەوە. ئـەوەی کـە خـۆی ناویدەنـا عەشـقی نهێنـی، ئارەزوویەکـی گەورەبـوو بـۆ گەیشـتن بـەو هێـزەی هەمـوو پەیوەندییـەکان ڕێکدەخـات، گەڕانـی بـە دوای نهێنییـە بچوکەکانـدا بـۆ دۆزینـەوەی شـتێکی مەزنتـر بـووە، شـتێک نـاوی دەنێـم «مانـای ئـەم سـەردەمانە» مانـای ئـەم ڕۆژگار و سـەدەیەی ئێمـە تیـا ژیایـن.

محەمـەدی دڵشوشـە پێشـتر بـە گەلـەک نهێنـی ئاشـنابووبوو، لـە دوای ڕاپەڕینـەوە لـە هـەر کـەس زیاتـر شـتی دەزانـی، لەهـەر گەنجێکـی دی پتـر لـە نهێنـی ئـەو دیـو ویقـار و شـەرەف و حورمەتـی ئـەو ژیانـە تێدەگەیشـت کـە هەمـووان سـیمای خۆیـان پێدەڕازانـدەوە، لـە گەشـتەکانیدا بـە ڕووی ڕاسـتەقینەی ئـەو ژیانـە ئاشـنادەبێت کـە لەژێـرەوە دونیـا بەڕێوەدەبـات، قاچاغچییـە گرنگـەکان دەناسـێت، شـەرەفی درۆزنـی ژن و کچەکانیـان دەبینێـت، درۆی سیاسـەتمەدارەکان دەزانێـت، پیلانەکانـی یەکـدی کوشـتن دەدۆزێتـەوە، بـەڵام هەمـوو ئـەو شتانە ناتوانـن بیکەنـە کەسـێکی دڵـڕەق. خـۆی پێشـوەخت دەزانێـت ئـەو لـەوە ناسـکترە بچێتـە هیـچ جەنگێکـەوە، دەزانێـت ئـەو بوونەوەرێکـە لـە شوشـە، کـە خولیـای بـۆ حەقیقـەت ناتوانێـت ببێـت بـە خولیـا بـۆ جەنـگ. لـە شـەوەکانی هاوڕێتیـدا سـەریاس پێیدەگـووت «دۆزینـەوە و زانینـی ئـەم نهێنیانـە سـوودی چییـە، کـە مـرۆڤ نەتوانێـت ئاشـکرایانبکات و بەکاریانبهێنێـت... بـۆ هەمـوو ئـەو نهێنییانـە لـە کتێبێکـی گـەورەدا نانوسـیتەوە، ڕۆژێـک بیخەیتـە بـازاڕەوە و هەمـوو دونیـای پـێ سەرسـامبکەیت؟». محەمـەدی دڵشوشـە دەیگـووت «بـەڵام مـن لـە هیـچ دڵنیانیـم، ئیتـر چـی بکـەم بـە کتێـب و بـە چـی دونیـا سەرسـامبکەم.

لە نهێنی تۆ و خۆشم دڵنیانیم. هەندێ نهێنیش هەیە نانوسرێنەوە، هەندێ نهێنی مرۆڤ دەکوژن و تەواو. من لەو جۆرە نهێنیانە دەترسم». محەمەدی دڵشوشە خۆی لە هەر کەس زیاتر زانیوێتی ئەو سەرگەردانی ئەفسانەیەکە، ئەو لەدوای ئەستەمێکە باڵاتر لە توانای ئەو و هەر ئادەمیزادێکی زیندووی دیکەی دونیا.

ئەوەی دونیا ببێتە زەمینێکی بێنهێنی، چ تەلیسم و تاریکی و پرسیارێک نەمێنێتەوە، هەموو شتێک ببینرێت، ئەفسانەیەکی ڕەش و پوچ بوو، بەڵام ئەو گەنجە دڵشوشەیە نەیدەتوانی دواینەکەوێت. هەندێجار سەریاس بە غەمگینی و کەمێک توڕەییشەوە بە دڵشوشەی دەیگووت «خۆ ئادەمیزاد مافی ئەوەی هەیە، نهێنی خۆی هەبێت، شتێکی هەبێت کەس نەیزانێت، شتێکی هەبێت کەس دەستی لێنەدات؟». محەمەدی دڵشوشە کە هەمیشە بە جۆرێکی دی بیریدەکردەوە دەیگووت » دوو جۆر لە نهێنی هەیە، نهێنییەک کە دونیا تاریکدەکات و کوێرماندەکات. جۆرە نهێنییەکی تریش کە بەرەو دوورتر و قووڵتر دەمانبات، سەریاسی سوبحەدم نهێنییە بچوکەکان بەتەنیا نرخیان نییە، ئەوەی نرخی هەیە ئەو مانایەیە کە لە هەموو نهێنییەکان دەستماندەکەوێت». ئەو باوەڕی وابوو ژیان زنجیرێکی درێژە، ملوانکەیەکی مەزنە لە گرێ کە دەبێت یەکە یەکە بیانکاتەوە تا لەوسەر لە کۆتایی ئەو زنجیرە ناکۆتاییەدا بە ڕاستییەکی گەورە دەگات. ئەو باوەڕی وابوو کە دەبێت هەموو کەسێک خۆی و دونیای خۆی بناسێت. سەیرترین شت لەلای توانای سەریاس بوو لە زوڵوماتی بوونی خۆیدا بژی، کە دەتوانێت مرۆڤ بەسادەیی و ساکاری وەرگرێت، لە نهێنییەکانیان نەپرسێت، لەگەڵیاندا قسەبکات و بڕوات و لە هیچ ڕانەمێنێت، تاوێک دڵڕەقانە شەڕبکات و تاوێک قاقا پێبکەنێت. هەستدەکەم محەمەدی دڵشوشە تاکە کەسێک بووە ویستوێتی شتەکان تا کۆتاییان ببینێت، شتەکان تا ئەوسەری ئەوسەر بژی، خرۆش و

هەڵچوونێکی هەبووە هیچ سەبر و سەبوورییەک لەگەڵیدا سوودی نەبووە. زانینی نهێنی لەلای ئەو دەست بەسەردا گرتن و بینین و تێگەیشتن بووە لە کۆتاییەکان. موسیبەتی مەزنی ئەو ئەوەبووە ویستوێتی ئەوپەڕی سۆز تێکەڵی ئەوپەڕی زیرەکی بکات، نهێنییەکان بدۆزێتەوە و نەچێتە ناو ئازاردانی خەڵکەوە، تێبگات و عاشقیش بێت. بەڵام لەو دەقیقەیەدا کە تێدەگات عەشق دەشێت تا هەتاهەتایە دەرگایەکی نەکراوە و پڕ نهێنی و دووردەست بێت، هەموو ئەو خەونانەی دونیای خۆی لەسەر بونیادناوە هەرەسدەهێنێت. من وەک چۆن بیرم لە چارەنوسی هەموو کوڕەکانم کردۆتەوە هەمانشێوە بیریشم لە چارەنوسی ئەو کردۆتەوە، ئێستا لەم کەشتییەدا کە دەشێت کەشتی مان و نەمانمان بێت، دەتوانم بڵێم، من قەرزاربارى ئەوم، ئەویش شایستەی ئەوەبووە کوڕێک بێت لە کوڕەکانم... زۆربەی ئەو شتانەی من دوایی دەیزانم بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندی بە ژیان و مردنی ئەوەوە هەیە. ئەو شەوەی لە پاترا سوار کەشتی بووم، لە دوورەوەڕا سێبەری گەردەلوولێکم دەبینی، بۆنی باڕەشێکم دەکرد لە تۆزی شوشەیی زەریا، ئەو شەوە دڵنیابووم من چەندین وەختە لە مردنی ئەو کوڕەدا دەسوڕێمەوە. هەستدەکەم من ئەو چیرۆکە تەواودەکەم کە ئەو نەیتوانی تەواوییبکات، هەستدەکەم من ئەوم و لە کفنە سەحراییەکەی خۆم هەستاومەتەوە و لە بری دڵێک لە شوشە دڵێکم لە لمی بیابانەکان هێناوە کە ناشکێت، بەڵام دەنک لەسەرخۆ دەڕژێت. من ئێستاش لە ئاسکی ئەو گەنجانە سەرسامدەبم کە چەند سووک و ئاسان و بێئەزییەت و خێرا مردوون. من لە بیابان وێنەیەکم لەسەر مرۆڤ هەبوو، وەک بوونەوەرێکی بەهێز کە پێستێکی ئەستووری هەیەو دڵڕەقانە بەرگەی هەموو شتێک دەگرێت. بەڵام ئەو لاوازییە، ئەو ئامادەگییە قووڵ و خێرایە بۆ مردن، ئەو وێنەیەی تێکشکاند. ئێستا دڵنیام ئامادەگی بۆ مردن بەشێکە لە ڕۆحی ئەو سەردەمە. چ شتێکی

سەیره پیاوێکی وەک من لە گۆڕەکەی هەڵدەستێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە تەواوکەری ئەو نهێنیانەی کۆمەڵێک گەنج نایدۆزنەوە. من بەر لەوەی کوردستان بەجێبهێڵم چوومە سەر گۆڕەکەی محەمەدی دڵشوشە، ئا وا مەزانن ئەوە یەکەمین جارم بووە چوومەتە سەر ئەو گۆڕە، من ئەو ماوەیە وەک قەلەندەرێکی ریش درێژ و دەروێشێکی پڕ خولیا لە نێوان گۆڕ و ئاسەوار و شوێنەواری ژیانی ئەوانەدا هاتوچۆمکردووە. ئەو رۆژە کە چوومە سەر گۆڕەکەی بۆ ماڵاوایی بوو، بۆ سوپاس بوو. من کێلی گۆڕەکەیم ماچکرد، چونکە لە هەموو شتێکدا قەرزاربارى ئەو بووم، عەشقی ئەو بوو منی بە خوشکە سپییەکان ناساند، گەر ئەو نەبایە هیچ لە تەلیسمی سەرپاسەکان ئاشکرا نەدەبوو، ئەو نەبایە هیچ دەریاوانێکی دی گەوهەری ئەو مانایانەی نەدەبینی کە لە پشت ئەو هەنارە شوشانەوەیە، ئەو نەبایە دواهەمین هەناری دونیا ئەو مانایانەی وەرنەدەگرت. من قەرزارباری بووم، ئێستاش من وەک هەموو ئەوانی دی لە غوباری مردنی ئەودا دەسوورێمەوە.

بابگەرێینەوە بۆ چیرۆکەکەمان. من پێمگوتن لە شەوی دووەمدا، دوا بەدوای شەوی ئازادیم لە کۆشکەکەی یاقوبی سنەوبەر سەر لەبەری ژیانم گۆڕدرا، شەوی دووەم شەوی زیندوبوونەوەی من بوو، شەوی لەدایکبوونەوەی راستەقینەی من، بەڵام شەوی سەرلێشێوان و دەستخەڕۆبوون و ونبوونی منیش.

هەمووتان ئەو پەیمانەتان لە بیرە کە شەوێک لە نێوان خوشکە سپییەکان و سەرپاسی سوبحدەمدا نوسراو بە خوێن مۆرکراو خرایە ژێر هەنارێکی غەمگینەوە لە حەوشێکی غەمباری ماڵێکی غەمباردا، هەنارێک نیگاری ئاوێنەیی هەنارێکی دیکەیە کە لە شوێنێکی دیکەی دونیادا رواوە. دوو هەنار بێئەوەی ئاگایان لەیەک بێت، پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە پێکەوە گرێدەدەنەوە.

گەر لە یادتانبێت لەو پەیمانەدا هەبوو خوشکە سپییەکان جگە لە سەریاسی سوبحدەم هیچ کەسێکی دیکە بە برای خۆیان نازانن و جگە لەو هیچ برایەکی دیکەیان نابێت و ناوێت. ڕۆژانی سەرەتا سەریاسی سوبحدەم هیچی دەربارەی هاوڕێ و هاوناوەکەی خۆی ئاشکرانەکرد، ڕۆژانی یەکەمی خوشک و براییان بێ هیچ کێشە و گەرد و گرفتێک رابورد، بەر لە مردنی بە چەند هەفتەیەک شەوێک لە شەوان سەریاس دوای ماندووبوونی ڕۆژێکی درێژ لە ناو جەنگ و هەراهەرای بازاڕدا بە ماندوێتییەکی زۆرەوە گەڕایەوە و لەبەردەم خوشکە سپییەکاندا دانیشتنی گوناهبارێک دانیشت و ئاشکرایکرد دەیەوێت نهێنییەکیان لا بدرکێنێت کە تا ئەو کات نەیدرکاندووە. خوشکە سپییەکان هەمیشە ئەو سیما ماندوو و غەمگینەی سەریاسیان لە یادبوو کە بە دەنگێکی هێمن و جیاواز لە دەنگی ئاسایی خۆی، بە گەروویەکی بریندار، بەڵام پڕ لە پرسیار و نهێنی ئەو حیکایەتەی بۆ گێڕانەوە. چیتر نەیدەتوانی بێدەنگبێت، ئەو کات خوشکە سپییەکان چیرۆکێکی ڕاستەقینەیان دەویست، دەبایە سەربوردی ئەو هەنارە شوشەییەیان بۆ ڕوونبکاتەوە کە لەماڵی سلێمانی مەزنەوە هێنابوویان و سەریاسی سوبحدەم گووتبووی ئەوە «هەناری منە».
ئەو ئێوارەیە بۆ یەکەمجار گووتی «خوشکە ئازیزەکانم، شادەریا و لاولاوی ئەزیز، من دەزانم ئێوە منتان بە برایەکی تاقانە و تاکو تەنیا وەرگرتووە، من تا دەمرم سوپاستاندەکەم، کە دەمرم بە قەرزێکی گەورەوە دەچمە ناو گۆڕ کە قەرزی ڕەحم و خۆشەویستی ئێوەیە، بەڵام نهێنییەک هەیە دەبێت بیزانن، چونکە ئەو نهێنییە بۆتە شتێکی گرنگی ژیانی من، نامەوێت دواجار لە ناکاو ڕاستییەکی سەیر ئاشکرابێت و ئێوە لۆمەمبکەن کە هیچم بۆ ئێوە نەدرکاندووە. دەبێت بزانن جگە لە من کەسێکی تریش هەیە ناوی سەریاسی سوبحدەمە، کەسێکە لە ڕوخساریدا نەبێت لە هەموو شتێکی دیدا لە من دەچێت، ئەویش ژیانێکی نزیک لە ژیانی من

ژیاوە، هەنارێکی شوشـەی هەیـە و ماوەیەکـی زۆرە هاوڕێیەکـی نزیکـی منـە». سەریاسـی یەکـەم دەیگـووت «نهێنییـەک هەیـە ژیانـی مـن و ژیانی ئـەو پێکەوە گرێـدەدات، شـتێک هەیـە هەردووکمـان کۆدەکاتـەوە، بـەڵام کەسـمان نازانیـن ئـەو شـتە چییـە؟». ئـەو شـەوە سـەریاس هەمـوو چیرۆکـی خـۆی و محەمـەدی دڵشوشـە و نەدیمـی شـازادە و سەریاسـی دووەمـی گێڕایـەوە، بـە جۆرێـک وردەکاری ئـەو ژیانانـەی باسـکرد وەک ئـەوەی ئـەوان بکاتـە شاهیدی شـتێک کـە دەزانێـت خـۆی ناتوانێـت جارێکـی دی بـۆ هیـچ کەسـێکی دی بگێڕێتـەوە. بـەو جـۆرە خوشـکە سـپییەکان بوونـە تەنیـا شاهیدی گـەورەی چیرۆکێـک کـە دواتـر خۆیـان بـە شـێوەیەکی دی دەگەڕێنـەوە نـاو دیمەنەکانـی. ئـەو شـەوە کـە سـەریاس لەسـەرەتاوە تـا کۆتایـی بەسـەرهاتی خـۆی دەگێڕایـەوە، ئـەوان دەیانگـووت « ئێمـە، یـەک برامـان هەیـە، ئەویـش تۆیـت... هیـچ کەسـێکی تریـش جێـگای تـۆ ناگرێتـەوە، لای ئێمـە یـەک کـەس هەیـە نـاوی سەریاسـی سـوبحدەمە، نامانەوێـت کەسـی تـر ببینیـن نـاوی سەریاسـی سـوبحدەم بێـت، کەسـی تـر نییـە نـاو و یـادگار و ژیانـی تـۆ بدزێـت بـۆ خـۆی». سـەریاس پێدەکەنـی و دەیگـووت «مـن جگـە لـە بەدبەختێکـی نـاو عەرەبانـەکان زیاتـر هیچـی تـر نیـم، کـەس نایەوێـت ژیانـی مـن بدزێـت، ئەویـش بەدبەختێکـە دەترسـێت مـن ژیانـی ئـەو بـدزم. هـەر کەسـەمان بێمەعنـا لـەو ژیانـە پوچـەی خۆمـان دەترسـین». خوشـکەکانی پێیاندەگـووت «تـۆ مارشـاڵی عەرەبانەکانی، فەیلەسـوفی شـەوە تاریکەکانـی ئـەو منداڵانـەی کـە جگـە لـە تۆ کەسیان نییە ژیانیـان بـۆ ڕێکبخـات، شـتەکانیان بـۆ باسـبکات، هەواڵەکانـی دونیایـان بـۆ بگێڕێتـەوە، ڕۆژنامەیـان بـۆ بخوێنێتـەوە... هەمـوو ئـەو لەشـکری عەرەبانانـە تەنیـا تۆیـان هەیـت». خوشـکە سـپییەکان قبووڵیـان نەبـوو یەکێکـی دی بناسـن نـاوی سەریاسـی سـوبحدەم بێـت، هەرگیـز نەشیاندەویسـت کەسـێکی لـەو جـۆرە ببینـن. لای ئـەوان تەنیـا یـەک سـەریاس هەبـوو، لـەوە دەترسـان هاتنـە گـۆڕی سەریاسـێکی دیکـە زیـان لـەو پەیمـان و سـوێند و عەهـدە

ناوازەیەی نێوانیان بدات، لەوە دەترسان ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستیان بلەرزێت و لاوازبن و کەسێکی دی لە ژێر هەمان ناونیشان و چیرۆکدا خۆی بکات بە ژیانیاندا. دەترسان ئەو وێنە سەیرەی سەریاس لە خەیاڵیاندا بە کاریگەری دووبارەبوونەوە کاڵبێتەوە و ئەو هێز و سیحرەی لەسەریان نەمێنێت. دوای مردنی سەریاسیش بواریاننەدا یەکێکی دی بە ناوی سەریاسی سوبحدەمەوە بێت و پرسە و سەرەخۆشی خۆیان پێشکەشبکات. دواتریش ئەوەیان قبووڵنەکرد پێشوازی یەکێکی دی بکەن ناوی سەریاس بێت. لای ئەوان هەموو ئەم چیرۆکە لە مردنی سەریاسی یەکەمدا کۆتاییدەهات.

گەڕانەوەی من ئاسوودەیی ئەو خوشکانەی شێواند.

لەو شەوەدا کە ئیکرامی کێو چیرۆکی منیان بۆ باسدەکات، کە پێیاندەڵێت باوکی ڕاستەقینەی سەریاسی سوبحدەمە لە دوای بیستویەک ساڵ لە بیابان گەڕاوەتەوە و دەیەوێت بچێتە سەر گۆڕی کوڕەکەی، ئیدی ئاسوودەیی و دڵنیایی خوشکەکان دەشێوێت، هەموو ئیقاع و هارمۆنییەتی ژیانیان دەگۆڕێت. لەو دەقیقەیەدا ئیدی ناچارن ڕووبەڕووی ئەو چیرۆکە ببنەوە کە لە دوای مردنی سەریاسەوە لێیڕادەکەن. نازانن ئایا دەبێت نهێنی سەریاسی دووەم بۆ من بدرکێنن یاخود نا؟ دەبێت بمبەنە سەر گۆڕەکەی و ئیدی وازم لێبهێنن لەگەڵ نائومێدییەکانمدا بژیم، یان پێمبڵێن کە سەریاسێکی دیش هەیە لە جێگایەکی دی دەژی و نەمردووە؟ ئایا دەبێت بمخەنە بەر ئەو پرسیارە؟ شادەریا بڕوای وایە یەک سەریاسی سوبحدەم لە دونیادا هەبووە و نابێت قسە لە بوونی سەریاسێکی تر بکەن، چونکە بیرکردنەوە لە هەر سەریاسێکی دی خیانەتە لەو جوانەمەرگەی کە برای ئەوانەو کەس جێگای ناگرێتەوە. بەڵام لاولاوی سپی قسە لە بەدبەختی باوکێک دەکات دوای بیستویەک ساڵ هاتۆتەوە و شێتی ئەوەیە باوەش بە شتێک بکات و ماچیبکات و پێیبڵێت «کوڕی من». شادەریا

دەڵێ «ئەو وەک باوکێک دەبێت لە مردنی کوڕەکەی تێبگات و ببێت بە زێوانی گۆڕەکەی». بەڵام لاولاو دەڵێت «بەڵام دەشێت ئەو باوکی ئەو کوڕە بێت کە زیندوە، باوکی ئەو سەریاسە بێت کە نەمردووەو دەژی... کێ چوزانێت موزەفەری سوبحدەم باوکی ڕاستەقینەی کامیانە؟ ئێمە چۆن باوکێک لە کوڕەکەی مەحرومبکەین؟ بە چ هەقێک ڕاستییەکانی نیشاننەدەین؟». شادەریا بێسرەوت و وەک لەسەر ئاگر بێت دەڵێت «بەڵام ئەی ئەگەر موزەفەری سوبحدەم باوکی ڕاستەقینەی ئەوبرا تاقانەیەی ئێمە بوو، ئەوکات ئێمە چیمان کردووە، جگە لەوەی سەریاسمان بە مردوویش لە ڕابوردووی خۆی مەحرومکردووە؟».

شەوێک تا درەنگ پێکەوە لە قەراغی ئەو چۆمەدا دەگەڕێن و بیردەکەنەوە، لە پشووەکاندا گۆرانی غەمگینی خۆیان دەڵێن، پرچیان بۆ کزەی ساردی شەو بەرەڵادەکەن. دواجار دەگەنە ئەو بڕوایەی هەموو شتێک بخەنە بەردەستی من. ئەو شەوە کە منیان بردە سەر گۆڕەکەی سەریاس دەیانویست من مردنی ئەو ببینم و تێبگەم. دوو خوشک بوون دەیانویست هەموو دونیا غەم بۆ سەریاس بخوات. ئەوان لەو مردنە بێهودە و کوتوپڕە ترسابوون، بە چاوی خۆیان بینیبوویان سەریاس دەمرێت و هیچ شتێک لە شوێنی خۆی ناجوڵێت، دەمرێت و لەگەڵ هەموو غەمی هاوڕێکانیدا چ کەسێکی تر لەدەرەوە لە ماناو هۆی ئەو مردنە ناپرسێت. دەمرێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە یاددەچێتەوە، دوای نەمانی لەشکری عەرەبانەکان و پەرتەوازەبوونی ئەو منداڵانە لە کوچە و کۆڵانەکانی دونیادا، کەسێکیان نەدەبینی یادی سەریاسی سوبحدەمی لابێت. ئەو شەوە کە منیان بردە سەر ئەو گۆڕە دەیانویست کەسێک و هاودەمێک و هاوغەمێک بۆخۆیان بدۆزنەوە تێیانبگات، بەڵام کاتێک ئەوان حەسرەتی کوشندەی منیان بینی، کە زانیان من ناتوانم باوەڕ بەو مردنە بکەم، کە پێویستیم بەوەیە گەر لە خەیاڵیشدا بووە کوڕێکی

دیکەو سەریاسێکی سوبحدەمی تر دروستبکەم و بۆی بژیم. لە شەوی دووەمدا لاولاوی سپی بە تەنیا هاتە ژوورەکەم و گووتی «موزەفەری سوبحدەم، ئەی پیری بەدبەخت، هێشتا زۆر شت هەیە تۆ نایانزانیت». لەو شەوەوە ئیدی بە «پیری بەدبەخت» یان «باوکی ئازارەکان» یان «شێخی غەم» ناویاندەنام. لاولاوی سپی بە ڕەفتە ڕەشەکەی ملییەوە هاتبوو تا بەتەنیا هەموو ئەو چیرۆکەم بۆ بگێڕێتەوە. چیرۆکێک هەرگیز بە شەوێک دوایینایەت، چیرۆکێک بە درێژایی ئەو ماوەیەی ژیانم لەلای خوشکە سپییەکان بەردەوامدەبێت، شەوانێک لە ژوورەکەی مندا، شەوانێک لە پۆلەکانی ئەو قوتابخانەیە و لەبەردەم تەختە ڕەشەکاندا بۆیان دەگێڕامەوە. چیرۆکێک دێڕ بە دێڕ و پیت بە پیتی لە خەیاڵی خۆمدا هەڵمکەند، سەربوردێک یەکەیەکە وشەکانیم لە یادە. من ساڵانی دووردرێژی زیندان یادەوریمی سپیکردبووەوە. کاتێک کە تێکەڵ بە دونیابوومەوە یادەوەریسم یادەوەری منداڵێک بوو، لاپەڕەیەک بوو هیچی ئەوتۆی لەسەرنەبوو. خوشکە سپییەکان ئەو سەرەداوەیان بەخشییە من دوای نهێنییەکان بکەوم. ئەو شەوە لاولاوی سپی گووتی «سەریاس کەسێک بوو شایستەی هەموو غەمێکە، شایستەی ئەو فرمێسکانەیە کە بۆت ڕشت، بەڵام ڕاستییەک هەیە دەبێت بیزانیت. نە من، نە شادەریا، نەهیچ کەسێکی تری ئەم دونیایەش ناتوانێت دڵنیاتبکات ئەو گۆڕەی تۆ بەو جۆرە لەسەری دەگریت گۆڕی کوڕی تۆیە. موزەفەری سوبحدەم. جگە لەو کوڕەی تا قیامەت لەویادا خەوتووە، یەکێکی تریش هەیە، یەکێک زیندووە و ناوی سەریاسی سوبحدەمە، هەمان ناوی کوڕەکەی تۆی هەیە... بەڵام با لە ئێستاوە پێشتبکەوم و دوایی گلەیی لە کەس نەکەیت، هیچ کەس ناتوانێت ڕێنماییتبکات و دەستت بگرێت، چونکە کەس نازانێت کام یەک لەو دوو سەریاسە کوڕی تۆیە...».

ئەو قسانە قسەی ئاسایی نەبوون، وەک ئەوەبوو لە بنکی بێقەراری دۆزەخێکەوە دەرمبهێنێت و بمببات بۆ بەهەشت. وەک ئەوە بوو لە کۆتایی خنکاندا دەرمبهێنێت و فڕێمبداتە سەر وشکانی، وەک ئەوەی من ماسییەک بم، قولاپی مردن لە گەرووم دەربهێنێت و فڕێمبداتەوە ناو ئاو... ئاوەها زانیم کە جگە لەو مردووەی ناو پێدەشتەکان سەرباسێکی دی هەیە کە دەشێت کوڕی من بێت. دەشێت ئەو منداڵە خەیاڵییە بێت کە بیستویەک ساڵ چاوەڕوانمدەکرد. بەڵام نا وا مەزانن من خۆشبەختی کوێریکردووم، وامەزانن ئەو شادی و هەستانەوە و هیوایە ئەو ئازارەی لە دڵدا سڕکردووم کە مردنی سەرباس دروستیکرد. دواتر کە شەو تێپەڕی کە لەبەر پەنجەرەکەمدا بیرم لە هەموو شتێک کردەوە، تێگەیشتم من تا دەمرم هیواکانم چەند گەورەبن نائومێدی و غەمەکانیشم هێند گەورەن. لەو ساتەدا بڕیارمدا هەرگیز نەپرسم کوامەیان کوڕی من بوون، لەو ساتەدا وەستام و سەرمدانەواند و سوێندێکی ئەبەدیم خوراد نەپرسم کامیان فرزەندی من بووە. من دەبایە هەردووکیان هەڵگرمەوە. هیچ چارەیەکی ترم نەبوو... دواتریش هەرگیز لەو بڕیارەم پەشیمان نەبوومەوە. ئەو حەقیقەتەی کە دەشێت زیاد لە سەرباسێک هەبێت منی وا لێکرد، بە جۆرێکی بەرینتر سەیری ژیان بکەم، سەیری مردن و هەستانەوەی هەموو ئەو منداڵانە بکەم کە لەوساتەوە هەستێکی باوکانەی سەرتاسەریم بۆیان هەبوو. من لەو دەقیقەیەوە دەمزانی کە دەتوانم ئیتر باوکی هەموو ئەوانە بم لەسەرجادەکان ونبوون، بێهودە کوژراون، چارەنوسیان ونە، بێپاشەڕۆژن. من پیاوێک بووم لە ڕابوردووەوە هاتبووم تا قسەیەک لەسەر ئەوانە بکەم کە داهاتوویان نییە.

پێمبڵێن گەر ئێوە بوونایە چیتان دەکرد؟. گەر ئێوە بوونایە یەکێکیانتان هەڵدەبژارد و ئەوی دیکەتان فەرامۆشدەکرد؟ باوەشتان بە یەکێکیاندا دەکرد و حاشاتان لەوی دیکەیان دەکرد؟ نا ئەی دۆستان،

گەر ئێوەش بوونایە باوەشتان بە هەردوو ئەگەرەکەدا دەکرد. ئێستا دەزانم زۆر شتم ونکرد، بەڵام دەشزانم زۆر شتم بردەوە، کە ئینسان بە گەورەیی باوەشی بە دونیادا کرد ئازارەکان و شادییەکانیش بە گەورەیی باوەشی پیادەکەن. بەڵام من بە درێژایی ژیانم هەستێکی سەیرم هەبووە، کە چ شەرم ناکەم ئەمشەو بۆتان بەیانبکەم، من دەڵێم کاتێک هەستدەکەیت تۆ لە پێناوی دونیادا ئازار دەچێژێت، خۆشحاڵی و بەختەوەرییەک داگیرتدەکات زۆر لە هەموو خۆشییەکانی دی گەورەترە. من ئەو شەو کە لاولاوی سپی باوەشی پیاکردم و گووتی «ئەی پیری بەدبەخت دواجار لە ناو کورەکانتدا وندەبیت و هەقیقەت نادۆزیتەوە». پێمگووت «نا... خودا منی بۆ شتێکی دیکە ناردۆتەوە، منی بۆ جۆرە باوکایەتییەک ناردۆتەوە کە جیاوازە لە وانی دیکە». لەو دەقیقەیەدا نەمدەزانی من چ جۆرە باوکێکم، ئێستاش دروست نازانم چ جۆرە باوکێک بووم. بەڵام شێوە ئارەزوویەکی گەردونیم لەو هەستەمدا دەدۆزییەوە. ئەو شەوەی چوومە سەر گۆڕەکەی سەریاس ئەوەی منی ئازاردەدا خودی ئەو مردنە نەبوو، بەڵکو ئەو بێدەنگییە قووڵە بوو کە لە نێوان من و ئەو گۆڕەدا بەرقەرارە. بێدەنگییەک بوو لە بێدەنگی نێوان دوو ڕۆحلەبەر دەترازاو دەبووە بێدەنگی لە نێوان من و هەموو مەخلوقاتدا، لە خامۆشی نێوان من و مردوویەک دەترازاو دەبووە خامۆشی نێوان من و هەموو گەردون. لە دۆزینەوەی سەریاسێکی زیندوودا هەموو شتەکان پێچەوانە دەبوونەوە، من دووبارە زمانێکم دەدۆزییەوە لەگەڵ گەردون و مەخلوقاتدا قسەی پێبکەم.

ئەوشەوە وەک شێت باوەشم بە لاولاوی سپیدا دەکرد و هاوارمدەکرد «سەریاس نەمردووە، سەریاس نە خنکاوە، مردنێکی بێهودە نەمردووە، پۆلیسێکی گەمژە لە ناوەڕاستی شارێکی دڵڕەقدا نەیکوشتووە... کەواتە لێرەیە، دەتوانێت قسەبکات، دەتوانێت باس لە خۆی بکات، چیرۆکی

خـۆی بگێڕێتـەوە، لەگـەڵ ئـەم ژیانـەدا تێکەڵبێـت، بانـگ لـە ئەسـتێرە بـکات، هـاوار لـە باڵنـدەکان بـکات، بـەرد بگرێتـە گۆمـەکان، لـم بـکات بەسـەر خۆیدا، لـە گـەڵادا بنوێـت... کەواتـە یەکێـک هەیـە مـن دەتوانـم لـە سـەرەتاوە تـا کۆتایـی هەمـوو شـتەکانی لەگەڵـدا باسبکەم. مـن هاتوومـەوە تـا لـە سـەرەتاوە بـۆ کۆتایـی لەگـەڵ یەکێکـدا قسـەبکەم، یەکێـک دڵنیابـم دەمبیسـتێت.... کەواتـە سەریاسـێک لـەم سـەر عـەردەدا دەژی کـە گوێـم لێدەگرێـت. تێدەگەیـت مانـای چـی یەکێـک گوێـت لێبگرێـت؟».

لاولاوی سپی بەسەرسامییەوە دەیگـووت «نـا... نـا... سـەریاس مـردووە، سـەریاس پۆلیسـێکی گەمـژە لـە ناوەڕاسـتی بـازاڕدا کوشـتویەتی، ئەوانـە هیچیـان درۆ نیـن، درۆ نیـن، بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا کوڕێکـی تـر هەیـە نـاوی سەریاسـی سـوبحەدەمە، ئەویـش باوکـی نییـە، ئەویـش هەمـان ژیانـی سـەریاس ژیـاوە، بـەڵام ئـەو زینـدووە».

مـن هاوارمدەکـرد «ئـەو دەتوانێـت لـە بـری هەمـوو دونیا گوێـم لێبگرێت... ئـەوەی زینـدووە دەتوانێـت لـە بـری هەمـوو مـردووەکان گوێـم لێبگرێـت. لـە جیاتـی هەمـووان قسـەبکات... ئـەوەی زینـدووە دەتوانێـت لـە بـری هەمـوو ئەوانـی تـر هاواربـکات... دەبێـت زینـدووەکان ئـەو هێزەیـان تیـا بێـت لـە بـری مـردووەکان هاواربکـەن. وا نییـە دەبێـت جـۆرە هێزێکـی وا لـە مرۆڤـدا بێـت تـا دونیـا لەسـەر حیکمـەت و دادپـەروەری بوەسـتێت».

لاولاو بـە توڕەیییـەوە دەیگـووت «هیـچ کـەس ناتوانێـت لـە بـری سـەریاس هاواربـکات، ئـەو لـە هـەر کوێیـەک بێـت نابێـت دەنگـی بـە دەنگـی کـەس تێکەڵاوبکەیـت».

مـن بـە خرۆشـان و هەڵچوونێکـەوە دەمگـووت «کچـی مـن، لاولاوی مـن، وەک چـۆن بەشـێک لـە ژیانـی ئێمـە لـە نـاو هەمـوو ژیانەکانـی تردایـە، ئاوەهـاش بەشـێک لـە هەمـوو زیندەگییەکانـی تـر لـە زیندەگـی ئێمەدایـە، وەک چـۆن بەشـێک لـە مردنەکانـی تـر لـە مردنـی ئێمەدایـە، ئاوەهـاش گەردێکـی

مەرگی ئێمە بەجۆرێک لە جۆرەکان لە هەموو مردنەکانی تردایە».

من وەک یەکێک هەستبکات ئەو ڕۆژە غەمگینانەی ئازادی بە قەد هەموو ساڵانی دیلێتی ماندوویکردووە دەمگووت «لاولاوی من، لالای شیرینم، کچی من. من بیستویەک ساڵ لە زیندان بووم، لەوێ تێگەیشتم ئینسان لە هیچ شتێکی ئەم دونیایە دانابڕێت، ئینسان چەند دووریبخەیتەوە، دەریبکەیت، بیکوژیت، هەمیشە بەشێکە لەم سووڕە گەورەیەی دونیا... لێمگەڕێ، لێمگەڕێ من بیستویەک ساڵە وا بیرمکردۆتەوە ئێستا ناتوانم خەیاڵی خۆم بگۆڕم. ئێستا ئەو لە ڕێگای من و تۆوە دەژی، دەبێت تێبگەیت ئەو لە ڕێگای من و تۆوە دەژی. وەک من چۆن ئەو هەموو ساڵانەی زیندان لە ڕێگای هەمووتانەوە دەژیام، لە ڕێگای لم و سەحراو ئاسمان و شەوەوە دەژیام. ئا... حیسابی پیرەمێردێکی خەرەفاوم بۆ مەکە کە بەم هەموو ریشە سپییەوە، بەم پرچە ئاڵۆزکاوەی دەروێشانەوە هاتووم و ورێنەت لەسەر یاساکانی گەردون بۆ دەکەم... شتی ناماقووڵ لەسەر ژیان دەڵێم... من لە جێگایەکەوە قسەدەکەم کە تۆ نازانیت.... ئەو لە ڕێگای هەمووومانەوە دەژی. من لێرەم تا بەشێک لەو ژیانە بژیم کە ئەو نەژیا. لاولاوی سپی مەحرومەکە لەوەی هەستبکەم لە بری ئەوان دەژیم... ئەوان کە دواجار وەک یەک مرۆڤ، یەک کوڕ، یەک مەخلوقی قەشەنگ تەماشایاندەکەم کە قەدەر بێڕەحمانە دابەشیکردوون...».

ئەو شەوەی ئەو قسانەمدەکرد هێشتا هیچم لە ژیانی سەریاسی دووەم نەدەزانی، هێشتا نەمدەزانی باس لە چیدەکەم. تەنیا تەعبیرم لەو خولیایانە دەکرد کە وەک کۆمەڵێک بیرۆکەی ڕووت لە خەیاڵمدا دەسوڕانەوە. لاولاوی سپی پێیگووتم ئەوان هیچ شتێک لە سەر سەریاسی دووەم نازانن، هەرگیز نەیانبینیوە، ناشزانن ئێستا چیدەکات و لە کوێ دەژی.

من کە ساڵەهای ساڵ چاوەڕوانیم کێشابوو، ئێدی سەخت بوو زیاتر چاوەڕێبکەم.

# ١٥

کە من ئازادبووم لە مێژبوو کەس هیچ شتێکی دەربارەی سەریاسی دووەم نەدەزانی. دواهەمین کەس ئادەم مەرجان بوو کە جارێک لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگەی ماندوودا بینیبووی، بە دیکتاریۆفێکی کۆنەوە لە بەردەم ماڵی یەکێک لە بەرپرسە گەورەکاندا وەستاوە و پێدەکەنێت. دروست نازانم ئادەم مەرجان چەند دوای مەرگی سەریاسی یەکەم بینیوێتی، بەڵام بە دیمەنەکەدا پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ زەمانی هەڵگیرسانی قۆناغی سێهەمی شەڕی ناوخۆ. لەو زەمانەدا ئاسایی بوو بەردەرکی ماڵی بەرپرسە عەسکەرییەکانی حیزب وەک گۆڕەپانێکی جەنگ وا بێت... ئاسایی بوو هێزەکان لە بری ئەوەی لە بنکەیەک یان کامپێکی تایبەتی پێشمەرگەدا ڕیزببەستن لە سەر شەقام، لە بەر دەرگای ماڵی سیاسییەکان، لە دەوری ئۆتێل، یانەی خواردنەوە و زۆرجاریش لەدەوری ماڵی ژنە سۆزانی و خراپەکان کۆببنەوە. واتە لەدەوری نزیکترین شوێن کە فەرماندەکەیان تیا دەخەوێت. ئادەم مەرجان دروست نازانێت سەریاسی دووەم چیکردووە و بۆ کوێ چووە. ئەو وەک کۆمۆنیستێک دەیگووت «من دەستمگرت و پێمگووت مەچۆ بۆ ئەم شەڕە، ئەمە شەڕی تۆ نییە، ئەمە شەڕی بۆرژواکانە لەسەر زەوتکردنی تیکە نانەکەی ئێمە، لەم شەرایتەدا تەبەقەی کارگەر دەبێت هەڵوێستی تری هەبێت». سەریاسی دووەم پێیدەڵێت «من حەزدەکەم بچم بۆ هەموو شەڕەکان،

بەڵام لە ئێستادا لەم شەڕە زیاتر هیچی تر نییە، ئەگەر شەڕێکی تر هەبوو جوابم لێبگێڕەوە دێم بۆ ئەوێش». ئادەم مەرجان دڵشکاو لەو وەڵامە، خوداحافیزی لێدەکات و پێیدەڵێت «هاوڕێم هیوادارم نەکوژرێیت». ئەو بەدەنگی بەرز و بە پێکەنینەوە دەڵێت «هیوادارم بکوژرێم... من هیوادارم بکوژرێم».

ئەوە دواهەمین ڕستەی سەریاسە کە یەکێک لەو هاوڕێیانە بیستبێتی.

ڕۆژێک دوای ئاشکرابوونی نهێنی سەریاسەکان خوشکە سپییەکان منیان خستە ئوتومبیلێکی تایبەتییەوە و بردیانم بۆ شار.

کە ژینۆی مەخمەلی و ئادەم مەرجانمان دۆزییەوە، کەسیان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر شوێنی سەریاسی دووەم نەدەزانی.

شەوێک ئیکرامی کێو هاتەوە بۆ لام. ئەو دەرهەق بە هەموو شتەکان ناڕازی بوو... ناڕەحەت بوو لەوەی من بێباکانە و بە ڕیش و پرچێکی ئاوەها درێژەوە چوومەتەدەرێ. بەڵام وەک هەمیشە پڕبوو لە هێمنی و لێبوردن. ئیکرام هیچی لەسەر سەریاسی دووەم نەدەزانی. کۆی حیکایەتەکە شتێکی سەیربوو لەلای، بە جەستە گەورە و ئارامەکەیەوە لە ژوورەکەمدا دەهات و دەچوو و دەیگووت «هەموو شتێک دەکەم بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە... هەموو جێگاکان دەگەڕێم... سا سجلی هەموو بنکەکان دەپشکنم تا دەگەینە شتێک...». ئەو چێژێکی بێسنووری لەوەدا دەبینی بتوانێت شتێک بکات من زیاتر باوەڕم بە ژیان بێت.

ئێوارەیەکی دی گەڕایەوەو دەستی خستە سەرشانم و گووتی «سەریاسی دووەم لەم شارە نییە، هەشت مانگ زیاترە لەلای دوژمن دیلە».

یەکەمجاربوو بەوجۆرە وشەی «دوژمن» ببیستم. دوژمن ئەو ناوەبوو

کە مێزە شەرکەرەکان لەیەکدیان دەنا. من ئەو کات تێگەیشتم شەڕی ناوخۆ چەند گەورە و ترسناک بووە. ئیکرامی کێو دەیگووت «موزەفەری سوبحدەم بمبورە، بەڵام کۆمەڵێک گرێ و نهێنی هەن من ناتوانم هیچیان لەسەر بڵێم، بەڵام تا ئەو جێگایەی من دەزانم، ئەو کورە ناشتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەمبەر، لەبەر ئەوەی لێرەش کۆمەڵێک مەسەلەی گەورەی لەسەرە».

من ئەو شتانەم لا گرنگ نەبوو... بۆ من ئەوە گرنگ بوو کوڕێکم هەیە و لە شوێنێکی نادیاری ئەم زەمینەدا دیلە و دەبێت بیدۆزمەوە.

ئەگەر ئازاری مردنی یەکەمین سەریاس و سەرەتای چیرۆکی سەریاسی دووەم نەبایە، ئەوا ماڵی خوشکە سپییەکان هێمنترین و جوانترین ماڵێک بوو لە ژیانمدا بینیبێتم. لە ڕاستیدا من بەر لە گرتنم کەش و هەوای ماڵی هێمن و ئاسوودەم تاقی نەکردبووەوە، شارەزاییەکی تەواو کەمم لە ژیانی خێزانە ئاسوودەکان هەبوو. بێدەنگی و ئارامی و ئاشتی ناو ماڵی خوشکە سپییەکان ئەو بەهەشتە بوو من لە مێژە خەونم پێوەدەبینی. ژوورەکەی من دووربوو لە ژوورەکانی ئەوانەوە، بەڵام هەرگیز وەک نەناسیاو و غەریبەیەک مامەڵەیان نەکردم، هەرگیز ئەو هەستەیان پێنەدام کەسێکی زیادم و ئەوان خۆشحاڵنین بە نیشتەجێبوونم. دوای مانگێک من لەگەڵ ئیکرامی کێودا قسەم لەوەکرد کە کوختێکی بچوک بۆ خۆم دروستبکەم، پارچە زەوییەک لەیەکێک لە جووتیارەکان ئیجاربکەم و ببمە جووتیار. من لە زیندانەوە جۆرە پەیوەندییەکی ڕۆحی قووڵم لەگەڵ زەویدا هەبوو. ئەگەرچی لەم سەر کەشتییە مەلعونەدا ئێوە وەک یەکەمین عاشقی دەریا تەماشای من دەکەن، ئەگەرچی نیگای بێوچانی دەریا، خۆشەویستی من بۆ ئەم ئاوە مەزنە ئاشکرادەکات، بەڵام ئەوە ڕێگا لەوە ناگرێت عاشقێکی گەورەی زەویش بم. من عاشقی زەویم. ئەو شەو و ڕۆژە سەیرانەی لە گوندی

خوشکە سپییەکان ژیام، بە ناوێکی ترەوە تێکەڵ بە جووتیارەکان بووم، حیکایەتێکی ترم لەسەر ژیانی خۆم دروستکرد. خوشکە سپییەکان و جووتیارەکان و ئیکرامی کێو کۆمەکێکی گەورەیان کردم ئەو کوختە دروستبکەم. ئێوارەیەک ئیکرامی کێو لە زەرفێکی ڕەشدا کۆمەڵێک سەفتە پارەی بۆ هێنام و گووتی «من ئەوەم هەیە، دۆستی ئازیزم، من چەندین ساڵە پاشەکەوتدەکەم، بەڵام لەوە زیاترم بەیەکەوە نەناوە. جگە لەو جێبە چکۆلانەیە و ئەم زەرفە پارەیە خاوەنی هیچی تر نیم... چەندت دەوێت هەڵیگرە و چ زەوییەکت دەوێت ئیجاریبکە». وایدەگووت و زەردەخەنەیەکی گەورە دەکەوتە سەر ڕوخساری، وەک ئەوەی شەرم لە گەورەیی خۆی بکات، شەرم لەوە بکات خەندەکانی ناتوانن نازکتر و بچوکتربن. من بە پیری و کەساسی خۆمەوە دەنوشتامەوە و دەستەکانیم ماچدەکرد. پێمدەگووت «ئیکرامی من، ئەی گەورەترین چۆلەکەی دونیا... من لەسەرەتاوە دەستپێدەکەمەوە، من لە پارچە زەوییەکی بچوک و هەندێ حەیوانی گچکەوە دەستپێدەکەمەوە. خۆم تەرخانی جۆرە ژیانێکی تر دەکەم، من بڕێکی زۆر کەمم دەوێت، بەشی ئەوەی لەسەرەتاوە دەستپێبکەمەوە». کە ئەو قسانەم بۆدەکرد هەردووکمان لەسەر کێڵگەیەکی بەپیت وەستابووین، زەوی جووتیارێک لە پێناوی کۆچدا بۆدەرەوەی وڵات هەموو شتێکی جێهێشتبوو. زەوییەکی بەراوبوو خزمەکانی دەیاندا بە ئیجار تا نەفەوتێت. من و ئیکرام لەو سەر پارچە زەوییە، لە نێوان جۆگە و بناوان و خوڕەی ئاوەکاندا سەیری شەرمی یەکترمان دەکرد. بۆنی گوند، بۆنی تێکەڵاوی پاکی و پیسی بەیەکسانی دەچوو بەسەرماندا، بۆنی گیای پاکیز و ڕیخی مانگاکان وەک یەک لێمانەوە نزیکبوون. ئیکرام گومانی لە هەموو شتێک هەبوو، لەو بڕوایەدا نەبوو یاقوبی سنەوبەر من نەدۆزێتەوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ترسەکانماندا، ئەو ڕۆژانە تەنیا یەک خولیامان

هەبوو، ئەویش دۆزینـەوەی سەریاسـی دووەم بـوو.

لەدوای مردنـی محەمـەدی دڵشوشـەوە سلێمانی مـەزن، کـە دۆسـتێکی نزیکـی ئیکرام بـوو، ئـەوی ڕاسپاردبوو هەمـوو پێویسـتییەکانی خوشـکانی سپی بگرێتـە ئەستۆ. لـە ڕاستیدا خوشـکە سپییەکان لـەدوای جێهێشـتنی شارەوە، کارێکـی ئەوتۆیان نەبوو، ئەوان بـە ئـارەزووی خۆیـان هاتبوونـە ئـەو گونـدە، کەسـانێک هــەن وادەزانــن خوشـکەکان لەدەسـتی ئـەو چیرۆکانــە ڕایانکــردووە کـە لــە شـار وەک تاعـوون بەدوایانــەوە بـوو. بەڵام کیـژەکان بێبـاک لـە هــەر شـتێک ژیانـی خۆیـان دەژیـان، سـرووتە ڕۆژانـە و سـەیرەکانی خۆیـان دووبارەدەکـردەوە، پێکـەوە ئـەو قوتابخانـە چکۆلەیەیـان بەڕێوەدەبـرد. هەستدەکەم جگـە لـە مردنـی ئـەو دوو کـوڕە چ شـتێک نەبـوو بتوانێـت کار لـە یـادگار و ئاسـوودەییان بـکات. لـەو شـەوە سـەیرانەدا لەزەتێکـی بێسـنوورم لــە دەنگیــان بینــی. دوو گۆرانیبێــژی ڕاســتەقینە بــوون کـە لەبــەر هــەر هۆیــەک بێـت نەیاندەویسـت ببــن بــە گۆرانیبێـژ. شـەوەهای شـەو بـە دزییـەوە گوێـم لێدەگرتـن، بـە هێمنـی لـە کوختەکـەی خـۆم دەهاتمـەدەرێ و لـە پشـت کۆمەڵـێ درەخـت و لـە نێـوان دوو بـەردا پاڵدەکەوتـم و گوێـم لێدەگرتـن. هەرگیـز نەمدەهێشـت بزانــن گوێیــان لێدەگـرم. سـەیرترین شـت ئەوەبـوو کـە هەنـدێ شـەو بـە دەم گۆرانـی گووتنــەوە قژیاندەکـردەوە و بەرەڵایاندەکـرد، پێکـەوە دادەنیشـتن و پرچیـان بـۆ یەکتـر دروسـتدەکرد، گۆرانیـان دەگـووت و قژیـان دەخسـتە نـاو ئـەو جۆیبـارە درێـژەوە کـە لەگـەڵ خۆیـدا بـە ئارامـی دەیبـرد. هەنـدێ شـەو بـە قــژی تــەڕەوە دەهاتــن و لای مــن دادەنیشــتن، هەندێجـار لــە پۆلەکانـدا وەک وانـە بـە منداڵێـک بڵێنـەوە، چیرۆکەکانیـان بـۆ دەگێڕامـەوە، لـە ڕێـگای ئەوانــەوە زۆربــەی چیرۆکـی ئــەو بیسـتویەک سـاڵەم زانــی. زۆر ئـاگاداری سیاسـەت و جەنـگ و ئـەو جـۆرە شـتانە نەبـوون، بــەڵام کەسێکیشـم نەبینیـوە وەک ئــەوان وەسـفی شـەو، مانـگ، چیرۆکەکانـی

عەشق ، مردنی گەنجەکان و خامۆشی شەوە دوورودرێژەکانی شاریکات. من دواتر کە چوومە شار، هەمیشە هەموو شتەکانم لە چاوی ئەوانەوە دەبینی.

ئەو ماوەیە ژیانیان بۆ ئیشێکی سەیر تەرخانکردبوو، ئیشێک لەیەککاتدا زۆر نزیک و زۆر دووریش بوو لەوان، هەردووکیان بەردەوام لەسەر دوو مەکینەی درومانی سینگەری کۆن، جلی بوکێنیان دەدروو. ئەوەی لای من سەیربوو ئەوەبوو، ئەو دوو خوشکە، جلی سپی بووکێنی نەبێت هیچ جلێکی تریان ئامادەنەدەکرد. ژوورێکیان لە قوتابخانەکە جیاکردبووەوە بۆ دروومان، لەویادا تۆپە قوماشی گەورەیان دانابوو، هەر کراسێکیان تەواودەکرد بە شێوەیەکی بێوێنە لە زەرفێکی تایبەتیدا دەیانپێچایەوە و کۆتایی مانگ کاتێک دەچوون بۆ شار بۆ وەرگرتنی موچە و سەردانی گۆڕی محەمەدی دڵشوشە، کراسەکانیشیان دەگەیاندە دەست کۆمەڵێک دوکانداری تایبەت. لای من سەیربوو دوو کچ کە بڕیاریاندابوو هەتاهەتایە شوونەکەن، پیشەکەیان ئامادەکردنی کراسی بوکێنی بێت بۆ کچانی تر. بەڵام شادەریای سپی دەیگووت «هەر کەسەو بە ویستی خۆی و بەدەستی خۆی شادی و بەدبەختی خۆی دروستدەکات». ئەوەی ئەوانی شەیدای ئەو جۆرە کراسانە دەکرد ڕەنگە سپییەکەیان بوو. هەر کراسێکیان تەواوبکردایە پێش پێچانەوەی خۆیان جارێک لەبەریاندەکرد. من زۆر بەیانی، تاریک و ڕوون دەمبینین هەردووکیان بەو جلە بوکێنییە سپیانەوە لە پێدەشتەکان دەهاتنەوە.

ئیکرامی کێو هەفتەی جارێک دەهات بۆ لام. من هەرگیز بەتەواوەتی ئاشنای دونیای ئەو نەبووم، تا ئێستاش بەدروستی نازانم چۆن ژیاوە و لەکوێ ژیاوە. بەڵام وەک خۆی دەیگووت «من قەڵەندەر نیم»... ئەو قەڵەندەرنەبوو. حەزێکی سەیری لە ڕازندنەوەی ماڵ بوو، کاتێک ئەو کوختە بچوکەمان دروستکرد، بە دەستی خۆی هەموو شتێکی

تیا ڕێکخست. من ئەوکات نەمدەتوانی هیچ بکەم، شێوەی سەیرکردنم بۆ ژیان هێشتا ئەسیری ئەو زیندانە کۆنەی سەحرابوو، شەوان کە دەهاتمەدەرێ لەبری سێبەری بڵندی چیاکان، هێڵی ئاسۆکانی بیابان لە چاومدابوو.

خوشکە سپییەکان دەیانزانی من هەمیشە وەک مەخلوقێکی غەمگین دەمێنمەوە. دەیانزانی کە شەوان ئاوارەی ئەو کێوانە دەبم، جگە لە بیرکردنەوە لە سەریاسی سوبحەدەم خەیاڵم لای هیچی تر نییە، کە دەچمە ژوورەوە و خۆم گۆشەگیر دەغەم جگە لەو منداڵانە خەیاڵێکی دی لەسەرمدا نییە. سەردانەکانمان بۆ سەر گۆڕی سەریاسی یەکەم، بە هەیبەت و ڕێز و بێدەنگییەکی سەیرەوە تێدەپەڕی. خوشکە سپییەکان هەمیشە مۆم و بوغورد و داری عودێکی زۆریان لەسەر ئەو گۆڕە دەسووتان، بە جۆرێک تا درەنگ ئەو دەشتە بۆنی بوغردی بەرنەدەدا. هەموو ڕۆژانێکی هەینی هەر سێکمان خۆمان دەگۆڕی و دەچووینە سەر گۆڕەکەی، بەپێ بە ناو دەشتێکی بەریندا ڕادەبووردین... لە ڕێگای گۆڕەکەدا خوشکە سپییەکان بە گێڕانەوەی بەسەرهات و تراژیدیاکانی ئەو زەمانە دەیانەویست من بخەنە ناو وێنەی سەردەمێکەوە مەرگ حورمەتی خۆی دۆڕاندبوو. بەڵام دڵنیام هەستێکی قووڵیان بەهەموو شتەکان هەبوو. هەندێکجار هەستمدەکرد وەک یەکێک لە منداڵانی گوندەکە تەماشامدەکەن. مەحەبەتی ئەوان بۆ من لە مەحەبەتی کچێک نەدەچوو بۆ باوکی، بەڵکو لە مەحەبەتی دایکێک دەچوو بۆ منداڵەکەی. مامەڵەکردنی زۆر لەگەڵ منداڵاندا کردبوونی بە دایک، لەگەڵ منیشدا ڕەفتاری دایکێکیان هەبوو سەرتاپای میهر بێت. ئەوەی سەیربوو لای من ئەو عەشقە قووڵەی منداڵانی گوندەکە بوو بۆ ئەوان. بە خۆشییەکی زۆرەوە هەموو ژیانی خۆیان پێشکەش بەو منداڵانە کردبوو. ئەو کات کە من گەڕامەوە لەگەڵ دەیان مامۆستای دیکەی

چکۆلە و شیرین و منداڵدۆستدا خەریکی جەنگ بوون لە پێناوی منداڵی فەرامۆشکراوی ئەو گوندانەدا. من بەخیلیم پێدەبردن کە بەو جۆرە خۆیان بۆ ئاواتە بڵندەکان تەرخاندەکەن. ژیانی من بەراورد بە ژیانی ئەوان خاڵی بوو لە هەموو شتێک، لەوە دەترسام ببم بە پیرەمێردێک کە لەم ژیانە گەورەیەدا جەنگێک و کێشەیەک و ململانێیەکی نەبێت بیکات. ئەو شەوە خاڵی و ترسناکانەی چاوەڕوانی لەو گوندەدا، مانای ژیان و بوونی منی خستە مەترسییەکی گەورەوە. مرۆڤ تا دیلە ژیانی مانایەکی قووڵی هەیە، هیچ شتێک وەک دیلی و کۆیلەیەتی مانا نادات بە ژیان، چونکە ئەو کات مرۆڤ لە شەڕێکی مەزندایە بۆ ئازادی، بەڵام هیچ شتێک وەک ئازادی مانای ژیان ناخاتە مەترسییەوە. هیچ شتێک وەک سەربەستی لەسەر مانای ژیان پڕ مەترسی نییە. لە ئازادیدا مرۆڤ شەیدایی و خولیای خۆی بۆ مانا لەدەستدەدات. مرۆڤی ئازاد دەشێت مرۆڤێکی بێمانا بێت، بەڵام گەورەیی مرۆڤ ئەوە نییە لە کویلەیەتیدا بۆ مانا بگەڕێت، بەڵکو ئەوەیە لە ئازادیدا بۆی بگەڕێت. من ئەوکات لەگەڵ ئەو هەموو مانا و خولیا و پرسیارە سەیرانەی لە سەرمدا دەسوڕانەوە، هەستمدەکرد هێدی هێدی جۆرە ئازادییەکی خاڵی لە مانا دەژیم. من لەو ژوورەمدا هەستم بە فەرامۆشی و پیرییەکی بێئەندازە ترسناک دەکرد.

پێدەچوو ئیکرامی کێو بە زەحمەت بتوانێت هیچ زانیارییەک لەسەر سەریاسی دووەم کۆبکاتەوە، بەڵام ئەویش نەبایە من نەمدەزانی ڕووبکەمە کوێ.

هەندێک شەو وەک شێت هاوارمدەکرد و دەمنرکاند و دەمگووت «خودایە پێمبڵێ من ڕووبکەمە کوێ؟ ئەم دەستخەڕۆ و کوێرییەی من نیشانەی ناڕێکی ئەم گەردونەیە... کوێرێک ئەم دونیایەی دروستکردووە، کوێرێک ئەم زەمین و زەمانەی دروستکردووە... من لە دیلی بیابانەوە

بووم بە دیلی جۆرە زوڵوماتێکی تر....».

هەموو شەوێک هاوارم لە خۆم و گەردون و خودا دەکرد.... من لە نێوان ئەو سێیانەدا وێڵبووم. نەمدەزانی باوەڕی تەواوەتی بە کامیان بهێنم. خۆم لەوە لاوازتربووم بتوانم تەلیسمەکان شیبکەمەوە، گەردون لەوە دڵڕەقتربوو بە ئاسانی کۆمەکمبکات، خوداش لەوە بێدەنگتربوو چاوەڕوانی هیچی لێبکەم. ئیکرامی کێو دەیویست وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەو دونیایەم بداتێ کە تیادەژین. زۆربەی ئەو شەوانەی پێکەوە لە کێڵگەکاندا پیاسەماندەکرد ، ئەو سەرقاڵی شەرحکردنی وێنەی ئەو جیهانە بوو، کە من نەمدەویست تێیبیگەم. ئیکرام بەو شانە ئەستوورانەوە کە هەندێجار بە ئەستەم کوڕی دەکردن تا من ڕوونتر گوێم لەدەنگی بێت، دەیگووت «موزەفەری سوبحدەم، شارێک بهێنە پێشچاوی خۆت، پڕ لەهەزاران کوچەی تەسک، پڕ لە هەزاران دەرگای داخراو، پڕ لە هەزاران قەڵا کە مرۆڤ وەک شێت بەدەوریدا دەسوڕێتەوە و دەرگاکەی نادۆزێتەوە، شارێک سا جوگرافیایەکی هەیە جیاوازە لەوەی من و تۆ پێیڕاهاتووین، شارێک بەشێکی زەوییە و بەشێکی ئاسمانە، کوچەیەکی لە زەمیندایە و کوچەیەکی لە هەوردا، شارێک هەمووی مەتەڵە، سا کوچەکانی شوێنی خۆیان دەگۆڕن، دەرگاکانی شوێنی خۆیان دەگۆڕن، پەنجەرەکانی لە شوێنی خۆیاندا نین... بیهێنە پێشچاوی خۆت لە شارێکی وادا کە پڕە لە ملیۆنەها ژوور، سا لە هەر ژوورێکیشدا ملیۆنەها شت هەیە، لە ناو ئەو ملیۆنەها شتەدا ئێمە بۆ شتێکی بچوک دەگەڕێین... هاوارکردن سوودی نییە... نا، من ناڵێم ئەم شارە جێگایەکی بێدەنگە، بەڵام ئێرە شوێنێکی ترە، شوێنێک هێشتا ئادەمیزادەکان بە تەواوەتی تێینەگەیشتوون، ئێمە لە سەردەمێکی تردا دەژین کە هێشتا مرۆڤەکانی ئێمە ڕاستییەکەیان نەبینیوە، وەک ئەوەی بە نەخشەیەکی دێرینەوە لە شارێکی تازەدا

بسوڕێیتەوە... دەشێت چەندین کەس ناونیشانەکانت بۆ هەڵبدەن، بەڵام تۆ سا هیچ نادۆزیتەوە، چونکە لە دواجاردا ئەوانەی کە ناونیشانت دەدەنێ، نەخشەی شارێکی تر لەسەریاندایە... موزەفەری سوبحدەم ئەو شوێنەی سەرپاسی دووەمی لێ دیلە، شوێنێکی نهێنییە، ئەم وڵاتە پڕ لە زیندانی نهێنی... پڕە لە هێزی نهێنی، پڕە لە نەفرەتی نهێنی... کینە ئەم وڵاتە بەڕێوەدەبات، هیچ شتێکیش وەک کینە دەرگای خۆی قایمناکات. مرۆڤ لەم شارەدا ڕقی لە مرۆڤە، لێرە کەس کەسی خۆشناوێت».

من دەمگووت «بەڵام ئیکرامی کێو لەو شەوەوەی ئازادبووم، لەو کاتەوەی تۆ منت ڕزگارکرد، من جگە لە مرۆڤی پاک هیچی تر نابینم.».

بە ترسێکی قووڵەوە سەیریدەکردم، چاوەکانی هێندە گەش و کراوە و ترساو دەهاتنە بەر دیدەم، ئیدی من سڵم لە قسەکانم دەکردەوە. دەهەژی و عارەقەکەی دەسڕی، ئەو لە ساردترین وەرزیشدا کاتێک قسەیدەکرد دەبایە دواتر دەسڕەکەی دەربهێنێت و عارەقەکەی بسڕێت. بە دەنگێکەوە وەک لە ترسێکی گەورە ئاگادارمبکاتەوە دەیگووت «نا، موزەفەری سوبحدەم... نا.... سا لەهەر شوێنێک نهێنی زۆر بێت، ڕقیش زۆرە....».

من نەمدەویست باوەڕ بە ئیکرامی کێو بکەم، ئێستاش نامەوێت باوەڕی پێبکەم. من مەبەستم لە بڕواو هیوایەکی گەمژانە نییە بە مرۆڤ، دەزانم مرۆڤ، برای خۆی بە چ دەردێک دەبات. دەزانم مرۆڤ چ ئازارێک دەبەخشێتە هاوجنسی خۆی.... دەزانم ئێوە هەمووتان کە بەرامبەرم دانیشتوون و من شەو لە دوای شەو تنۆک تنۆک ئەم چیرۆکەتان بۆ دەگێڕمەوە لە مرۆڤ ڕاتانکردووە، هەموومان کە لەم کەشتییەدا سواربووین و ونبووین و پێدەچێت تا مردن لە

دەریـادا بێئەنجـام بسـوڕێینەوە لەدەسـت یەکێـک هەڵهاتویـن کـەوەک خۆمـان وابـووە، لەوانەیـە هەنـدێ سـات و هەنـدێ کات بەدبەختتـر و زامدارتریـش بووبێـت لـە مـن و تـۆ. بـەڵام لەگـەڵ هەمـوو ئـەو برینانـەدا کـە ئینسـان دەیکاتـە جەستەی براکـەی خۆیـەوە گـەر بڕوامـان بـە مـرۆڤ نەمـا دەبێـت بچیـن بـۆ کـوێ؟ چ مەخلوقێـک هەیـە بـاوەڕی پێبهێنیـن، هەتـا ئەگـەر ڕووبکەینـە سروشـت و داوای کۆمەکـی لێبکەیـن، ئـەو چـۆن یارمەتیمانـدەدات؟ بێگومـان هـەر لـە ڕێـگای مرۆڤـەوە... گـەر ڕووبکەینـە خـودا و داوای یارمەتـی لێبکەیـن، چـۆن کۆمەکماندەکات؟ هـەر لـە ڕێـگای مرۆڤـەوە... خـودا جگـە لـە مـرۆڤ چ دەستێکی تـری هەیـە ئـەم ژیانـەی پێشاوەدان بکاتـەوە؟ هیـچ.... هیـچ دەسـتێکی تـری نییـە... سروشت جگـە لـە ئێمـە کێـی هەیـە، بڵێـت شـارێکم بـۆ دروسـتبکەن، مۆسـیقایەکم بـۆ بژەنـن، نهێنییەکـی قـووڵ و خەوتـووی نـاو هەنـاوی خـۆم بـۆ بخوێننـەوە، کیمیـای ئـەم گـوڵ و ئـاو و ئەسـتێرانەم بـۆ لێکبدەنـەوە... کێـی هەیـە کـێ؟ لـە مـرۆڤ بـەو لاوە مەخلوقێکـی تـر نییـە.

ئیکرامـی کێـو کـە لـە نـاو شـۆڕش و دواتـر لـە دونیـای دوای ڕاپەڕینـدا ژیابـوو، دڵڕەقـی و دڕندەیـی ئەوتـۆی دیبـوو، بـاوەڕی بـە هیـچ نەمابـوو. کـە ئـەو شـەوە بـڕوای قووڵـی خـۆم بـە مـرۆڤ بـۆ ئاشـکرا کـرد، کـە پێمگـووت لـە مـرۆڤ بـەولاوە چ هێزێکـی تـر نییـە ڕووی تێبکەیـن. بـەو دەنگـە یـەک تـۆن و هێمـن و قووڵـەی خـۆی گووتـی «سـا مـن گومانـم لـە گەورەیـی مـرۆڤ نییـە، گومانـم لـەوە نییـە مەخلوقێکـی مـەزن هەیـە و دەبێـت چاوەڕوانـی ئیشـی گـەورەی لێبکەیـن... بـا موزەفـەری سـوبحدەم باشـتر تێتبگەیەنـم... باشـتر». هـاڵاوی کێڵگەکانـی هەڵدەمـژی، بۆنێکـی سـەیری خـاک بەسـەرماندا دەهـات، خـوڕەی ئاوەکانـی شـەو هەردووکمانـی ئاسـوودەدەکرد. ئیکـرام کەمێـک دەنگـی بەرزدەکـردەوە دەیگـووت «مـن لـەدوای نوشوسـتی ڕاپەڕیـن و دەسـتپێکردنی شـەڕەوە، سـا زۆر بیـرم لـەوە

دەکردەوە... گەلەک کتێبم لەسەر دەخوێندەوە، هەندێ کات ڕیش و سمێڵم و قژم بەرەڵادەکرد و وەک فیلێکی زەبەلاح دەکەوتمە دەشتەکان، بە هەموو توانای خۆم قاچمدەدا بە زەویدا و سەیری ئاسمانم دەکرد و دەمپرسی «مرۆڤ بۆ وادەکات، سا ئەم میللەتە چییەتی... چی؟» کە قۆناغی یەکەمی شەڕ دەستیپێکرد... ڕوخام... تێگەیشتم جانەوەرێکی برسی لە خوێنی ئەم میللەتەدایە... لە شەڕدا دوو میللەت، دوو دین، دوو شێوە سیاسەت بەرامبەری یەک نەبوون... سا دوو مرۆڤی ڕووت، بەرامبەری یەکبوون... دوو ئینسان وەک دوو جانەوەر، بێ هیچ هۆیەک پەیوەندی بە مانا و حیکمەتی ئینسانەوە هەبێت یەکتریان دەخوارد... موزەفەر مرۆڤایەتی وەک گڵۆپێک وایە، دەکوژێتەوە و دادەگیرسێت، گڵۆپێکە لە ناو ڕۆحماندا، دەشێت بۆ هەتاهەتایە خامۆش بێت و دانەگیرسێتەوە، دەشێت دابگیرسێت و بکوژێتەوە... بەڵام ئەوەی هەمیشە داگیرساو بێت، هەمیشە بە مرۆڤبوونی خۆمان ڕووناک بین ئەمەیان ئەستەمە و من نەمبینیوە.... ».

لە ناو تریفە و بێدەنگی شەودا سەیرمدەکرد و هەموو ئەو ئینسانیيەتە ونەم تیادەدۆزییەوە کە ئەو باسی لە مردنی دەکرد. سێبەری ئەو کەسەم تیادەبینی ئەو قسەی لە نەمانی دەکرد.

* * *

سەریاسی دووەم لە شوێنێکی دوور زیندان بوو، جێگایەک وەک قەڵایەکی کۆن، شوێنێک لە شوێنی زیندانە دێرینەکان دەچوو. قەڵایەکی گەورە پێش چەندین ساڵ دەوڵەت وەک بنکەیەکی قایم و سەقامگیر بۆ هێزەکانی دروستیکردبوو. قەڵایەک لە دوورەوەڕا ترسێکی قووڵی دەخستە دڵتەوە. بینایەک لە ناو چیاو پێدەشت و دارستانەکاندا

ونبووبوو. دیوارێکی بازنەیی مەزنی هەبوو، هێند بڵندبوو لەسەر قوولە بازنەییەکانییەوە نەبایە هیچ کەسێک نەیدەتوانی دەرەوە ببینێت. شتێکی نادیار هەبوو هەیبەتی جانەوەرێکی خورافی دەبەخشییە ئەو قەڵایە، جانەوەرێک لە بەرد یان میتاڵ، یا هەر کانزایەکی سەختی دیکە. ئێوارەیەک من و ئیکرام لەو جێگایە نزیکبووینەوە، لەدوورەوەڕا تەماشامانکرد. دەمویست بزانم سەریاس لە کوێ زیندانە. ئیکرام مێژووی ئەو قەڵایانەی دەزانی. جۆرە بینایەک بوون بە کەرەستەی نوێ و نەخشەو خەیاڵی ئیمپراتۆرە دێرینەکان. جۆرە بینایەک لە بەردی نوێ و لە خولیای کۆن. کە دواجار خەیاڵی ئەندازیارێک بوو دەیویست هەیبەتی نوێی دەوڵەت بە هەیبەتی خەلیفە دێرینەکانەوە گرێبدات. قەڵایەکی مەزن بوو لە ڕاپەڕینەکاندا بە چۆڵی دەست خەڵک کەوتبوو، ئەفسەر و سەربازەکانی زۆربەیان لە ترسی مردن و برسێتی و تینوێتییەکی درێژ یان خۆیان کوشتبوو یان وەک دیل خۆیان دابووە دەست خەڵک. دواتر بۆ ماوەیەکی درێژ خێزانە ئاوارەکان کردبوویانە نیشتەجێی بەدبەختییە ئەزەلییەکەی خۆیان، لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆشدا هێزە شەڕکەرەکان سیمیان بەدەوردا کێشابوو، هێزیان لەدەور بڵاوکردبووەوە و کردبوویان بە زیندان... لەدوای دەستپێکردنی شەڕەوە تەنیا باڵندەکان دەیانتوانی لەو قەڵایە نزیکببنەوە.

ئەو ڕۆژەی من ئەو قەڵایەم تیابینی، ترسێکی گەورەم لێنیشت. ئەو زیندانە تەواو لەگەڵ تێگەیشتن و سەیرکردن و ئەزموونی من لەگەڵ زینداندا جیاوازبوو. خەیاڵێکی بەد بەردەوام بەرەو ئەوە پاڵی پێوەدەنام زیندانی خۆم بە زیندانی ئەو بەراوردبکەم. بەدترین زیندان ئەوە نییە زیندانەوانەکانت دڕندەبن، ئەوەیە زەوی و ئاسمانت لێوە دیارنەبێت. زیندان ساتەوەختێکی ئازار نییە، بەڵکو مەودایەکی دووروودرێژە بۆ بیرکردنەوە و خەیاڵ. بۆ تێڕامان لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و دیوار،

مرۆڤ و سروشت، مرۆڤ و گەردون. گەر بەردەوام شتێک لەم گەردونە مەزنە نەبینیت، پارچەیەک لەم جیهانە بێمەودا و بەرینە نەبینیت، شتێک ناتوروژێنێت. دۆزەخ ئەوەیە شتێک خەیاڵت بریندارنەکات. واتە شتێک وات لێنەکات بیر لە شتە مەزن و گەورەکان بکەیتەوە، وات لێنەکات لە رێگای تەماشاکردنی مەزنی جیهانەوە لەو جوغزە چکۆلەیەی خۆت دەرچیت و بڕوانیت و بە شێوەیەکی دیکە بیر لە پەیوەندی خۆت و گەردون بکەیتەوە. زیندانی ڕاستەقینە تەنیا ئەوە نییە مرۆڤ لە مرۆڤەکانی تر جیادەکاتەوە، بەڵکو ئەوەیە مرۆڤ لە هەموو کانگاکانی ژیان، لە بوون بە مانا گەورەکەی جیادەکاتەوە. کەسی دیل کەسێکە لەو درزە بچوکانەوە کە هەیەتی دەتوانێت شەهوەت و ئارەزووی خۆی بۆ ژیان تیژبکاتەوە، بەڵام کاتێک دیوارەکانت کونبڕکرد، کاتێک خستە زوڵمەتەوە، ئیتر لەوە دەردەچێت لە زینداندا بێت، بەڵکو دەکەوێتە دۆزەخەوە.

سەریاس لەو قەڵا تاریکەدا دەژیا... ئێمە رێگایەکی درێژمان بڕی تا بیدۆزینەوە، شەوێک من و ئیکرامی کێو بە جێبەکەیەوە لەو گوندە هاتینە دەرەوەو ئەو گەشتە چکۆلانەیەی خۆمانمان دەستپێکرد، گەشتی دۆزینەوە سەریاسی دووەم.

یەکەمجار ئەو پیاوەمان بینی، ئەو مەیمونە چکۆلانەیەی ژیانی گێژەنێکی گەورە بوو. فەرمانبەرێکی ئاسایش بوو، دوو جار قەرزاربارى ئیکرامی کێوبوو. لە سەردەمی شەڕە خوێناوییەکانی شۆڕشدا جارێک ژیانی ڕزگارکردبوو، جارێکی دیش کاتێک ژنەکەی لەگەڵ کوڕێکدا هەڵدێت و دواتر پەشیماندەبێتەوە، ئیکرام یەکیاندەخاتەوە و ژنەکەی بۆ دەگەێنێتەوە بەرماڵ. ئەو لەگەڵماندا هات و لە دوورەوە ئەو قەڵایەی نیشاندان. بەدرێژایی رێگا قسەیدەکرد و دەیگووت «کاک

ئیکرام، چاوی من، من دوو جار قەرزارباری تۆم، جارێک لە کاتی شۆڕشدا کە لە مردن ڕزگارتکردم، جارێکیش کە کەوتیتە نێوان من و سکالاّی شەیتانەوە... من تا هەتا هەتایە قەرزاری تۆم... من ناتوانم بەتۆ بڵێم نا... بە باری تەعالا بڵێم نا بە تۆ ناڵێم، چونکە تۆ لە هەموو مەلایکەتەکانی خوا بۆ من بەکەڵکتر بوویت... دوو جار کۆمەکتکردووم، گاڵتە نییە، یەکێک دوو جار یەکێک ڕزگاربکات... بەڵام ئەوەی تۆ دەتەوێت ئەستەمە، لە دەسەڵاتی مندا نییە... لە دەسەڵات و هێزی کەسیشدا نییە... تۆ لە ئاسایش ئیشتنەکردووە، سەرۆک خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێک دەکات، حیزب خۆی دەستی لە شتەکەدا هەیە. من فەرمانبەرێکی بچوکم... سەبارەت بەو هاوڕێیەم هەر ئەوەندەی پێدەکرێت، ئەویش سنوورێک هەیە ناتوانێت ببڕێت... ئەو زیندانە پڕە لە نهێنی، هەندێ شتی تیایە کە جگە لە حیزب کەسی تر نابێت بیزانێت. ڕاستە من ئەو کوڕە دەناسم، برادەرمە، کوڕەکەی خۆیم بۆ سەردەبڕێت، بەڵام ئەویش لە شوێنێکدا دەوەستێت، چونکە ئەو زیندانە بەحرێکە لە نهێنی، هیچ کەسێکی وەک من و تۆ لە خۆمانەوە ناتوانین بچینە ژووریٚ. چونە ژوورەوە نییە، ئەوە لە خەیاڵی خۆتان دەرکەن بتوانن بچنە ژووریٚ... ئەو تەنیا دەتوانێت کاسێتەکانتان بەرێتە ژووریٚ و بیداتە دەست سەریاس و دواتر کاسێتەکانی ئەوتان بۆ بهێنێت. کوڕەکە لە ئینفرادیدایە، بەتەنیا لە ژوورێکدایە. چیت دەوێت بۆی تۆماربکە و ئەویش چیدەوێت بۆت تۆماردەکات، تەواو ئیتر تۆ چیت دەوێت؟... دڵنیابە من پەیمانی باشترین جۆری هەنگوینم پێداوە... ئەو هەنگوینی باشی لێببڕێت دەمرێت... ڕاستە برادەرمە، زۆر برادەرمە، پێیبڵێم بمرە دەمرێت، بەڵام هەنگوینەکەش نەبێت کە من لە کیسەی خۆم و بە پارەی زۆر کڕیومە ناهێڵێت ئەو تەسجیلە ببەینە ژووریٚ... لە ئێستادا ئەوە لە خەیاڵی

خۆت دەرکە، ئەو کورە ببینیت... شتی وا نابێت».
ناوی «تەیفور پاشا»بوو، کلێتەیەکی لە چەشنی کلێتەکانی ئەتاتورک لەسەردابوو، دەستی پڕبوو لە مستیلەی زێڕ، لە کاتی شۆڕشدا بەرپرسی زیندانی یەکێک لە حیزبەکان بووبوو. دواتر بووبوو بە ئاسایش، بەڵام بە هۆی ڕاکردن و هاتنەوەی بەردەوامی ژنەکەیەوە، بە هۆی ناو و ناوبانگی خراپی خێزانەکەیەوە لە ئاسایش دووریانخستبووەوە. کە قسەیدەکرد بەردەوام دەگەڕایەوە سەر چیرۆکی سکاڵای ژنی. من ئارەزوویەکم نەبوو گوێی لێبگرم. لەو کاتەوەی لە زیندان هاتبوومەدەرێ، هەستمدەکرد توانای پەیوەندی و گوێگرتنم تا دێت کەمتر و کەمتر دەبێتەوە. ئەو بەردەوام دەیگووت ئێمە ناتوانین سەریاس ببینین، ئەوە هێندەی تر نارەحەتیدەکردم. دواجار لە ژێر فشارێکی سەختی ئیکرامدا ڕازیبوو بەو پاسەوانەمان بناسێنێت کە دەیتوانی بمانبات بۆ لای سەریاس. ئەویش گەنجێک بوو سەربوردێکی سەیری هەبوو، ناوی «ئیدریسی هەنگوین» بوو. پێشتر هەموو ژیانی لە دۆزینەوەی هەنگدا بەسەر بردبوو، بە گەنجی خاوەنی توانایەکی ئەفسووناوی بووبوو لە دۆزینەوەی دار هەنگەکاندا، بە شادییەکی بێسنوورەوە کێواوکێو دوای مۆسیقای باڵیان کەوتبوو، فڕیبوو لەگەڵیاندا، تێکەڵاویان بووبوو، لالەزار بە لالەزار بەدوایاندا ڕۆیشتبوو، چیا بە دوای چیا سەرکەوتبوو. هەستێک و بۆنێکی بەهێز و سەلیقەیەکی نائاسایی لە دۆزینەوەی باشترین جۆری هەنگویندا هەبوو، بەڵام ڕۆژێک لە ناکاو هەموو تواناکانی خۆی لەدەستدەدات، ڕۆژێک چیتر ناتوانێت هەنگ بدۆزێتەوە، ناتوانێت لەگەڵیاندا بفڕێت و دەست لە شارەکانیان بدات، تاکە شتێک تیا نامرێت حەزێکی نائاسایی و ئەفسووناوییە لە هەنگوین. ئیدی ئەو سەلیقە کۆنەی لە دۆزینەوەی هەنگدا وەک پاشخانێکی بەکەڵک بۆ دۆزینەوەی گوناهبار و گومان لێکراوان بۆ حیسابدەکەن

و لـە ئاسـایش وەریدەگـرن، پاشـماوەیەک لـەوەش لـەو قـەڵا ترسـناکەدا دەبێتـە پاسـەوان.

شـەوێکی تاریـک لـە مەیدانێکـی پاسـدا بینیمـان. خـۆی ئـەو جێگایـەی هەڵبژاردبـوو، دەیگـووت «کـەس گومانـی لـەم شـوێنانە نییـە». گەنجێـک بـوو دەیویسـت واز لـەو زیندانـە بهێنێـت وبـڕوات بـۆ دەرەوەی وڵات. مـن لـە تاریکییـدا بـە ڕۆشـنی ڕوخسـاریم نەبینـی. دەنگـی شـتێک لـە دەنگـی باڵـی هەنگەکانـی تیابـوو. کـە قسـەیدەکرد وەک ئەوەبـوو پۆلێـک هەنـگ بـە ئاسـماندا بفـڕن. ئـەو گووتـی «مـن دەچـم بـۆ خاریـج، ناتوانـم زۆر شـت بکـەم، بگیرێـم و بیدۆزنـەوە هەمـوو شـتێکم دەفەوتێـت، بـەڵام وەک گووتومـە لەسـەر قسـەی خۆمـم تەسـجیلێکی بـۆ دەبەمـە ژووری شـتەکانی ئێـوە ببیسـتێت و چیشـی هەیـە لەسـەر هەمـان کاسێت تۆماریبکاتـەوە… مەڵێـن ئیدریسـی هەنگویـن پیاوێکـی خراپـە… پێشـتر ئـەوەم بـۆ کـەس نەکـردووە، بـەڵام بزانـن هەقدەسـتی خۆشـم وەردەگـرم».

مـن دەمویسـت سـەریاس ببینـم، دەمویسـت باوەشـی پیابکـەم، بـەڵام ئـەو دەیگـووت «بەرێـز، دەسـتت بێنـە ماچیبکـەم، لـە قسـە تێدەگەیـت یـان نـا… ئـەوە ناکرێـت… مـن سەریاسـی سـوبحدەم دەناسـم، خـۆم نانـی بۆدەبـەم… بـەڵام ئـەوەی تـۆ داوایدەکەیـت لەدەسـتی منـدا نییـە… تـا دەگەیتـە ژووریَ چـوار جـار پشـکنین هەیـە، یەکێـک شـتێکی وابـکات لەویـا تیربارانـی دەکـەن… منیـش دامنـاوە شـەش مانگـی تـر بچـم بـۆ خاریـج… حەزدەکەیـت ئیعدامبکـەن. مـن یـەک ڕێـگام بـۆ داناویـت و تـەواو، نرخەکەشـم پێگووتوویـت، ئیتـر کەیفـی خۆتـە… نەچوومایـە بـۆ خاریـج ئەسـحابە دەرزییەکـی پێنەدەبردمـە ژووریَ… خـۆت بڕیاربـدە… مـن دواقسـەی خۆمـم کـردووە… بـەڵام پێـش هەمـوو شـتێک مـن ئـەو میقدارەشـم لـە هەنگویـن دەوێـت… بێئـەوە هیـچ ناکـەم… حاڵـی بـوون

یـان نـا؟».

ئیدریسـی هەنگویـن تاکـە هیوامـان بـوو، ئیكرامـی كێـو كەمێـك دەسـتەپاچە و غەمگیـن دەهاتـە پێشـچاو، هەسـتیدەكرد ناتوانێـت وەك پێویسـت یارمەتیمبـدات، بـەردەوام لـە بـەرەوە پـارەی بـۆ زیاددەكـرد، ئەویش تادەهـات وەك پۆلێك هەنگی تـورە فنگەفنگی دەكرد. پێدەچوو سـەریاس دیلێـك بێـت لـە جۆرێكـی تایبەتـی، نرخێكـی گـەورەی لەسـەر بێـت، لەڕیـزی ئـەو زیندانیانـەدا بێـت كە بـۆ كاتـی پێویسـت هەڵدەگیرێـن. ئیدریسی هەنگویـن لـە نـاو پاشـماوەی گریسـی پاسـەكان و بـۆ دوكەڵـی بەجێمـاوی ئەگـرزۆزە كۆنەكانـدا قسـەیدەكرد. هـاوار و چاوەڕوانـی هەنـدێ شـۆفێر كـە بـۆ دواهەمیـن نەفەرەكانـی شـەو وەسـتابوون، غەمێكـی قووڵـی بـەو مەیدانـە بەخشـیبوو، چەنـد گڵۆپێكـی كـز و زەردیـش هەمـوو جوانـی شـەویان شـێواندبوو. ئیدریـس دەیگـووت «كوڕەكـەی ئێـوە لـەو دیلانەیـە كـە دەمێنێتـەوە... سـاڵێك، دە سـاڵ، پەنجـا سـاڵ نازانـم. لەوانەیـە ئەمشـەو شـتێك بقەومێـت و بەریانبـدەن. لەوانەیـە هـەر ئەمشـەو شـتێك بقەومێـت و لەگـەڵ دیلەكانـی تـردا هەموویـان تیربارانبكـەن... بەقوربـان... ئەمـە وڵاتەكـەی مـن و تۆیـە... شـتی وا زووزوو دەبێـت، لـە پڕێكـدا ئەمرێـك دێـت كۆمەڵێـك بـەرەدەن، لـە پڕێكیشـدا ئەمرێـك دێـت، لـەدەرەوەی قەڵاكـە پـاك و تەمیـز ریزێـك كوڕیـان پێهەڵدەكەنـن و دەیانكـوژن. ئەوەیـان بـە مـن زامنناكرێـت... سبەی كـە دەنگـی نەمـا گوناهـی مـن نییـە، مـن حەرەسـم... چاكـەم بۆیـان هەیـە خراپـەم بۆیـان نییـە... بـەڵام هەمـوو سامانی دونیـام بەیتـێ، لـە بـری دەهـەزار ملیۆنێكم بەیتـێ، ئـەوەی ئێـوە دەتانەوێت نابێـت... ئەگـەر ببوایـە بـە سـەرچاو بـە خۆڕایـی بۆمدەكـردن... مەسـەلەكە پـارە نییـە».

ئـەو شـەوە كـە گەڕاینـەوە ئیكرامـی كێـو بێدەنـگ بـوو، كـە هەسـتی بـە شكسـت بكردایـە، بـۆ ماوەیەكـی درێـژ قسـەی نەدەكـرد. دەمزانـی

بەردەوام بیردەکاتەوە، چونکە کە بیریدەکردەوە، نیگاو تەعبیرەکانی سیمای لە پنتێکدا دەوەستان و گۆڕانیان بەسەردا نەدەهات، دەکەوتە سەر عارەق و بێدەنگییەکی تایبەت دایدەگرت. دواجار لەگەڵ هەموو نائومێدییەکانمدا، بە درێژایی ڕێگا دڵخۆشیم دەدایەوە، ئەو بێدەنگ سەیریدەکردم و بە هێمنییەک لە ئارامی زۆرانبازێک دەچوو دوای شکست، جێبەکەی لێدەخوڕی و دەیگووت «بێدەنگ بە موزەفەری سوبحدەم، دەمەوێت بێدەنگ بیت».

من لە شەوی دواترەوە دەستمکرد بە تۆمارکردنی یەکەمین کاسێتی خۆم، دەبایە لە هەموو ڕستەو وشەیەکمدا وریابم، هیچم لەسەر سەریاسی دووەم نەدەزانی، من ئێستاش زۆربەی ئەو ڕستانەم لە یادە کە لە کاسێتی یەکەمدا تۆمارمکرد... شتێک بوو لەم جۆرە «من موزەفەری سوبحدەم، پیاوێک لە سەحراوە هاتووم دەشێت باوکت بم و دەشێت باوکت نەبم، تۆ چۆن سەیرمدەکەیت گرنگ نییە، بەڵام من تۆ وەک فرزەندی خۆم تەماشادەکەم، من تەمەنم بیست و دوو ساڵ بوو کە گیرام و بەجێمهێشتیت، ئێستا دوای بیستویەک ساڵ لە دەریای لم دێمەدەرێ و بۆت دەگەڕێم... هەموو دونیام بەدواتدا تەیکردووە... هەموو دونیا... بەڵام تۆ وەک خەیاڵێک وایت کە کەس نازانێت هەیت یان نیت... ماویت یان نا... ئارەزووت لە ژیانە یان پیربوویت... دەتەوێت من ببینیت یاخود ناتەوێت؟ بەڵێ سەریاسی من... سەریاسی سوبحدەم، من دوای ئەو هەموو ساڵە لە مردنەوە دەگەڕێمەوە و تۆ لەو قەڵا تاریکەدا دەدۆزمەوە کە کەس ناتوانێت بۆی بێتە ژوورێ...».

بەو جۆرەبوو لەسەر کاسێتێکی نوێ من چیرۆکی خۆم بۆ سەریاسی دووەم گێڕایەوە. لە تۆمارێکی تازەوە کە ئیکرامی کێو بۆ ئەو مەبەستە بەتایبەت کڕیبووی. لەو ڕۆژەوە ئیدی جیهانی من گۆڕا، لەو ڕۆژەوە

ئیتر من و سەریاس لە ڕێگای ئەو کاسێتانەوە باسی ژیان و دونیامان بۆ یەک دەکرد. باوک و کوڕێک هەرگیز یەکتری نابینن و تا هەتا هەتایە بە کاسێت لەگەڵ یەکدا قسەدەکەن...لە سبەی شەوەوە من بێدەنگ دەبم و هەندێ بەش لە کاسێتەکانی سەریاس گوێ لێدەگرین، ئەوەتا من هەموو ئەو کاسێتانە شار بەشار و دەریا بە دەریا دەگێڕم. ئەوە شاهیدی ئەوەیە کە دەنگی من جگە لە تەواوکەرێکی دەنگی ئەوان هیچی تر نییە، کە ئەوان قسەیانکرد دەبێت من بێدەنگ بم... بێدەنگ... ئێستا درەنگە و با دووبارە سەیری دەریا بکەین... هەستن هەموو پێکەوە سەیری دەریا بکەین و گۆرانی ئەوانە بڵێین کە لە ئاودا وندەبن... هەستن ئەمشەو با گۆرانی ئەوانە بڵێین کە زەوی و دەریا ڕەحمیان پێناکات.

## ١٦

### كاسێتی یەکەم

...من ناوم سەریاسی سوبحدەمە، نازانم ئەم کاسێتە دەگاتە دەست کێ و کێ گوێی لێدەگرێت؟ من ئەوم، بەڵێ من سەریاسی سوبحدەمم، تۆ پێمدەڵێیت سەریاسی دووەم، دەترسیت پێمناخۆش بێت... نا مەترسە، من لەوە ناترسم سەریاسی دووەم بم. تۆ هەر کەسێک هەیت، مارشاڵت وەک من نەناسیوە، پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکان، ئەو سەریاسی یەکەمە، من خۆم بە شایستەی ئەوە نازانم کەس بە سەریاسی یەکەم ناوم بهێنێت... ئێستاش کە بیری لێدەکەمەوە دەمەوێت بگریم... من هەندێجار بەوم دەگووت، سەریاسی مەزن، ئەم ماوەیەی کە لەم قەڵایەدا زیندانم کاتی خۆم لەگەڵ یادگارەکانی ئەواندا دەبەمە سەر، من و سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشە و نەدیمی شازادە. نەدیمی شازادە هەموو شتێک دەزانێت. گوێم لێبگرە... گەر تۆ کەسی منیت، دەبێت بڕۆیت و نەدیمی شازادە بدۆزیتەوە، ئەو هەموو شتێکت پێدەڵێت... هەموو شتێک.

دەتەوێت لە کوێوە دەست پێبکەم. وەک هەموو منداڵەکانی دونیا، منداڵی خۆمم لە یاد نییە. گەر لەیەکەم ساتەوە هەموو شتێکم لە یادبایە، ئێستا وەڵامی هەموو شتێکم دەزانی، بەڵام وەک هەموو

منداڵەکانی دونیا هیچ لە منداڵی خۆم نازانم... هەستدەکەم لەم تاریکییەدا شتەکانم زیاتر لە بیردەچێتەوە، هەندێ لەوانەی پێش من لێرەن، دەڵێن دواتر ناتوانین بچینەوە بەر ڕووناکی، دەڵێن گەر ڕووناکیمان لێبداتِ کوێردەبین... نازانم وایە یان نا... بەڵام دەزانم تاریکی مرۆڤ لاوازدەکات، من چەندین مانگە هەست بەلاوازییەکی زۆر دەکەم.

لەوانەیە ئەگەر تا چەند مانگێکی تر ئاشتی بەرقەرار نەبێت، بمانکوژن. من لە مردن ناترسم، لەوە دەترسم لەو ساتەدا کە دەمرم هەموو شتێکم بیرچووبێتەوە. بەڵام نا... موزەفەری سوبحدەم... تکایە لێم زویرمەبە، من چۆن بە دەمم گونجا بەوجۆرە بانگتدەکەم، شتێک لە دەنگی تۆدایە سەریاسی سوبحدەم و محەمەدی دڵشوشەم بیردەخاتەوە، تۆ ئەوانت بە یادامێنامەوە. خۆشحاڵم کە چوویتە سەر گۆڕەکەی سەریاسی مەزن، من مردنی ئەوان سەرگەردانیکردم... مردنی ئەوان خیانەتبوو لە من. من پێتدەڵێم ئەدیمی شازادە هەموو شتێک دەزانێت، هەموو شتێک.

ئەفسوس کە من و تۆ هەرگیز یەکتر نابینین.

حەزدەکەم باسی ئەوانت بۆ بکەم، من شەرم لە خۆم دەکەم. لەو ڕۆژەوەی ئەوان بەجێیانهێشتم هەموو شتێک گۆڕا. ڕۆژانێکە لە بیرمناچنەوە، ئەو ڕۆژەی محەمەدی دڵشوشە مرد من دەگریام... دەمگووت هەمووی تروهاتە... ژیان هەمووی تروهاتە. مارشاڵ دەستی دەخستە سەر شانم و دڵنەوایی دەدامەوە، ئەو غەمێکی زۆری هەبوو، بەڵام نەدەگریا. بەیانی بوو کە هەواڵەکەیان بۆ هێناین، لە ژوورەکەی مندا پێکەوە بەرچاییمان دەکرد، کە شەریفی پەپولە خۆی کرد بە ژووردا و گووتی تەواو محەمەدی دڵشوشە مردو و ماڵە شوشەکەی بوو بە تۆز. من کترییەکم بەدەستەوە بوو، کە وایگووت کترییەکەم لە

دەست کەوتەخـوارێ، بـەڵام سـەریاس بەزەردەخەنـەوە سـەیری شـەریفی پەپولـەی کرد و گووتـی «تـۆ درۆزنیت... بـاوەڕت پێناکـەم، تۆ درۆزنترین پیـاوی دونیایـت». شـەریف قـاپ قورئانێکـی زێـڕی لـە ملدا بـوو، دایکـەن و دەسـتی پیـاداو گووتـی «درۆناکـەم... محەمـەدی دڵشوشـە لـە شـەوێوە مـردووە». پرۆفیسـۆری شـەوە تاریکەکانمـان تـا بـە چـاوی خـۆی مەیتەکـەی دڵشوشـەی نەبینـی باوەڕینەکـرد. مـن وەک شـێت دەگریـام، پێشـتر هیـچ مەرگێک بەوجـۆرە غەمـی نەدابوومـێ. من کە لـە منداڵییـەوە هەمـوو ئیشـە پیسـەکانی دونیـام کردبـوو، سـاڵانێک چەتـە و سـاڵانێکیش لـە شـەڕدا هەمـوو شـتێکی خراپـم کردبـوو، لـە هەمـووان زیاتـر بـۆی دەگریـام. ئـەوان بـە گاڵتـەوە بـە منیـان دەگـووت «سەریاسـی چەپـەڵ» «پرۆفیسـۆری دڵـە تاریکـەکان». بـەڵام ئـەو ڕۆژە دڵنیابـووم شـتێک لـە ڕووناکـی و بەزەیـی لـە منیشدا هەیـە. تاکـە پیاوکوژێکـی ناویـان بـووم... تاکـە کەسـێک بـووم لـە نێوانیانـدا دەسـتم چووبـووە خوێنـی کەسـانی تـر، ئەوانـی تـر هەمـوو پاکبـوون، مـن تاکـە خوێنڕێـژی ناویـان بـووم. ئـا موزەفـەری سـوبحدەم گـەر تـۆ کەسـی منـی مەمبینـە و حیسـابی ئـەوان بـە حیسـابی مـن مەپێـوە. سـەیرت لێنەیـە کـە بەمجـۆرە هەمـوو شـتەکانت بـۆ دەگێڕمـەوە، شـتێک لـە دەنگـی تۆدایـە وادەکات ئەوانـم بەیادابێتـەوە، ئێمـە هـەر چوارمـان پەیمانێکمـان مۆرکـرد کـە درۆ لەگـەڵ یەکـدا نەکەیـن. مـن بـە هەمـوو خراپەکانـی خۆمـەوە تـا دوای مردنـی دڵشوشـە و زویربوونیشـم لـە مارشـاڵ ئـەو پەیمانـەم نەشـکاند. بـەڵام دواتـر، دوای مردنـی ئـەوان مـن هیـچ ڕێکەوتـن و مەرجێکـم لەگـەڵ دونیـادا نەمـا. پەیمانێـک لـە ژێـر درەختێکـی دووردایـە، درەختێـک جوانتریـن یـادگاری ژیانمانـە، درەختـی هاوڕێتـی و تەنیـای و دڵپاکیمانـە بـۆ یەکتـر. درەختێـک پێماندەگـووت «دواهەمیـن هەنـاری دونیـا». نەدیمـی شـازادە بـەو درەختـەی دەگـووت «هەنـاری بینیـن»، مارشـاڵیش پێیدەگـووت «درەختـی نەگبەتەکانـی سـەر

زەوی» محەمـەدی دڵشوشـە پێیدەگـووت «درەختـی ئیلهـام ، درەختـی نزیکیمان لـە ئاسـمانەوە». قەناعەتـی وابوو هەنـدێ شـوێن لـە دونیـادا هـەن مـرۆڤ باشـتر و ئاسـانتر دەتوانێـت شـتەکانی لێـوە ببینێـت، ژێـر دواهەمیـن هەنـاری دونیـاش یەکێـک بـوو لـەو شـوێنانە. ئـەوە درەختـی ئومێدەکانـی ئێمـە بـوو، خەومـان بـەوەوە دەبینـی ڕۆژێـک بێـت پێویسـتیمان بـە کار نەبێـت و لـە تەنیشـت ئـەو دارەوە، لەسـەر سـنووری ئاسـمان و زەویـدا ماڵێـک دروسـتبکەین. لەویـادا بـە ئاسـوودەیی تامـی ژیـان و هاوڕێتیمـان بکەیـن. بمبـورە... ئەوەیـان قسـەی مـن نییـە، ئـەوە محەمـەدی دڵشوشـە بـوو کـە پێیدەگـووت «سـنووری ئاسـمان و زەوی... سـنووری مـرۆڤ و خـودا... سـنووری ژیـان و خەیـاڵ».

موزەفـەری سـوبحدەم... نازانـم بـۆ ناتوانـم بەبـێ باسـکردنی دواهەمیـن هەنـاری دونیـا باسـی خۆمانـت بـۆ بکـەم. شـوێنێکی ڕاسـتەقینە نەبـوو، کـە دەچووینـە ئـەوێ، لەژیانـی ئاسـایی خۆمـان دادەبڕایـن، یـان خەیاڵماندەکـرد، یـان قسـەمان لـە پاشـەڕۆژ دەکـرد، یـان دەمانەویسـت لـە نهێنییەکانـی خۆمـان تێبگەیـن. لـە ژێـر دواهەمیـن هەنـاری دونیـادا بڕیارمانـدا درۆ لەگـەڵ یەکدا نەکەیـن، مـن لەویـادا حـەرف هەمـوو شـتە ناشـیرینەکانی خـۆم بـۆ گێڕانـەوە و داوام لـەو هەنـارە کـرد بمبورێـت. موزەفـەری سـوبحدەم مـن لەتەمەنێکـی زووەوە پیاوکوژبـووم. ئـەو کات دەمویسـت پاکببمـەوە و ببـم بـە یەکێـک لـەوان.

مـن دیـوە چەپەڵەکـەی سەریاسـم... ئـەو دیـوەی سەریاسـم کـە نەیتوانی لـە جەنگەکانـدا خـۆی پـاک ڕاگرێـت. ئـەو بەیانییـە کـە شـەریفی پەپولـە هاتـە ژووری و گـووتی محەمـەدی دڵشوشـە لـە عەشـقدا مـردووە. مـن بـێ هیـچ دوودڵییـەک بـاوەڕم پێکـرد، دڵنیابـووم کەسـانی وەک دڵشوشـە تەنیـا لـە عەشـقدا دەمـرن. کـە کترییەکـەم لەدەسـت کەوتەخـوارێ و وەک شـێت

کەوتمە گەڕان بەدوای کلیلی ژوورەکەمدا بە سەر مارشاڵدا هاوارمدەکرد و دەمگووت «هەمووی ترۆهاتە... تۆ ئینسان بە چی دەزانیت... ئێمە بە چی دەزانیت... محەمەدی دڵشوشە بە چی دەزانیت... هەموو وا بە سەخیفی دەمرین... تۆش وا بەسەخیفی دەمریت... تێدەگەیت، تۆش وا بەسەخیفی دەمریت». بەدوای کلیلەکاندا دەگەڕام ، جلەکانم ئەودیوە و دیودەکرد و دەمگووت «دەتویست لە چیدا بمرێت، لە شەڕدا، لە غەزادا، لە پێناوی نیشتیماندا... لە پێناوی دایکی وەتەندا کە وەتەنپەروەران وەک قەحبە سواریدەبن؟ ها دەتویست لە چیدا بمرێت... هەر دەبێت لە عەشقدا بمرێت، کەسێکی وەک دڵشوشە دەبێت لە شکۆفەی گەنجیدا و بە عەشق بمرێت... ئەگینا ژیانی مەعنای نییە».

کە تورەدەبووم پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان بێدەنگ دەبوو. من سەریاسی چەپەڵ لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا بەوانم گووت «لە کاتی تورەییدا خۆیانم لێبپارێزن». کە چووینە سەر مەیتەکەی هێشتا لە غوباری شوشەکانی مردنی خۆیدا نوقمبوو، هەمان ئەو جلەی لەبەردابوو کە من لە لەنگە بۆم کڕیبوو. ئەو لەبەر خاتری ئێمە جلی کۆنەی لەبەردەکرد، نەیدەویست نیشانیبدات ئەو شتێکی ترە، ئێمە بە خۆمان دەگووت «منداڵانی لەنگە»، «ئەوەی چڵپاوی مەزاتخانەکان». حەزیدەکرد یەکێک بێت لە ئێمە، ئەگەرچی ئێمە توانا و بەهرەی ئەومان نەبوو، بەڵام ئەو دونیای ئێمەی بە دونیای خۆی دەزانی. کە مرد من نەچووم بۆ پرسەکەی، کە بەوجۆرە لە خوێناو و وردە شوشەکانی مردنی خۆیدا بینیم وەک شێتم لێهات، وەک پاسارییەکی سووتاو هەڵدەپەڕیم، وەک منداڵێک یەکەمجار بێت خوێن ببینێت، خۆم لە قوڕی ئەو کوچەیەدا تلاندەوە، سەریاسی یەکەم منی وەک شێت ڕاوەشاند و دەیگووت «بۆ وادەکەیت، بۆ؟». لە ساتە سەختەکاندا

مـن هۆشـم لای خـۆم نەدەمـا... سـەریاس وانەبـوو. لـە بەردەرگاکـە کـە منـی بەوحاڵـە بینـی خـۆم لـە چڵپـاوی کوچەکـە هەڵکێشـاوە، بـۆ یەکەمجـار زللەیەکـی لێـدام. ئـەو یەکەمیـن جـار بـوو ئـاوا بـە بێدەنگـی زللـەی یەکێـک قبووڵبکـەم، هـەزار کـەس لـە دەوری مەیتەکـە کۆبووبوونـەوە و تەماشـایاندەکردین، هەمـوو چاوەڕوانـی ئـەوە بـوون شـەڕبکەین. بـەڵام مـن بێمەعنـا دەگریـام. سـەریاس لـەو کاتانـەدا بەهێزتربـوو، وەک یەکێـک هەڵسوکەوتی دەکـرد کـە کارەساتەکان نایچەمێننـەوە. مـن دەمزانـی کاتێـک دەیخەنـە گۆڕەکـەوە ناتوانـم ببینـم، لەگـەڵ ئەوەشـدا وەک ماخۆلانـم بێـت، دوور بـە دوور دوای جەنازەکـەی کەوتـم. لێتـی ناشـارمەوە کـە جەنازەکـەی محەمـەدی دڵشوشـە شـتێکی گـەورە بـوو، بـەڵام لایەقـی ئـەو نەبـوو. هەمـوو ئەوانـەی لـە ڕیـزی پێشـەوە دەڕۆیشـتن ئـەو پیاوانـە بـوون کـە دڵشوشـە خۆشـی نەدەویسـتن، هاوڕێکانـی باوکـی بـوون، سیاسـەتمەدارە چەپەڵەکانـی ئـەو سـاڵانە بـوون کـە ئـەو دەیگـووت «لەسـەر شـانی ئێمـە دانیشـتوون». ئێمـە هـاوڕێ ڕاسـتەقینەکانی ئـەو دەبایە شـەو لـە تەلەفزیونی چایخانەیەکـەوە تەماشای پرسـەکە بکەیـن. کـە سـەریاس زللەکـەی لێدام، مـن وەک هەڵهاتنـی برایەکـی بچـوک لـە بەردەسـتی هەڵهاتـم. لـە حەشاماتی زۆری پرسـەکەدا لەیـەک ونبویـن. مـن لـە سـەر سیلەی کۆڵانێکدا وەسـتام و چاوەڕێمکـرد تـا تەعزێکـەران ڕابـوردن، ئـەوەی منـی تورەدەکـرد ئـەو کامێرایانـەی تەلەفزیـون بـوو کـە چواردەوری مەیتەکەیـان دابـوو. دەمزانـی شـەوێ قسـەبێژێکی درۆزن دەنگـی خـۆی گـرو غەمگیـن دەکات و دەڵێـت «ئەمـڕۆ بـە کارەسـاتێکی دڵتەزێـن، محەمـەد سـلێمان حسـێن، ناسـراو بـە محەمـەدی دڵشوشـە، کۆچـی دواییکـرد، شـایەنی باسـە ناوبـراو کـوڕی خەباتگێـڕی ناسـراوی نەتەوەکەمـان سـلێمان حسـێنی کەرخییـە کـە لـە هەمـوو شۆڕشـەکانی نەتەوەکەمانـدا خـۆی و خێزانەکـەی ڕۆڵێکـی بەرچاویان بینیـوە، لێـرەوە پرسـەو سەرەخۆشـی خۆمـان بـۆ بنەماڵـەی جوانەمـەرگ

پادەگەێنین و هیواداریـن یەزدانـی گـەورە بـە بەهەشـتی بەرینـی بسـپێرێت».
ترۆهاتێکـی گـەورە بـوو... درۆیـەک بـوو لـە تەپاڵـەی خالیـس... شـەوێ
کـە مـن لـە تەلەفزیونـدا شـتەکانم بینـی نەمتوانـی نەڕشـێمەوە.

سەریاسـی یەکـەم کـە زللەکـەی لێدام و بەجێیهێشـتم زانیـم پەشـیمان
دەبێتـەوە. ئەو وابوو، شـەڕەکانی نـاو بازاڕیشـی بەوجۆرە بوو، هـەر کاتێک
تـوڕە دەبوو دواتـر پەشـیمان دەبووەوە، هەمیشـە بـە پێکەنینـە بەرزەکـەی
ئاشـتیدەکردیتەوە، کـە پێدەکەنـی نەدەبـوو لەگەڵیـدا ئاشـتنەبیتەوە...
ئێـوارێ لـە «بـوراق» دانیشـتبووم و چاوەڕوانـی هەواڵەکانـم دەکـرد. کـە
بـە خـۆی و پێکەنینەکەیـەوە هـات و هـەوای چایخانەکـە هەمـووی گـۆڕا.
سـەیربوو بەلامـەوە لـە ڕۆژێکـی وا غەمگینـدا پێدەکەنێـت. بـە هێمنـی لـە
تەنیشـتمەوە دانیشـت، بێئـەوەی سـەیرمبکات گووتـی «باشـتکردووە خـۆت
لـە قـوڕ و لیتەکـەی بەیانـی پاککردۆتـەوە». بـە دەنگێکـی ئارامتریـش
گووتـی «باشـتکرد نەهاتیت بـۆ پرسـەکە... لـە بـری تەعزێ لـە ئاهەنگـی
شـووکردنی قەحبەیـەک دەچـوو». دەسـتیکردە ملـم و گووتـی «مـن و تـۆ
خۆمـان پرسـە بـۆ محەمـەدی دڵشوشـە دادەنێیـن». بۆئـەوەی بێبڕوایـی و
دوودڵـی خـۆم نیشـانبدەم گووتـم «گوێبگـرە سەریاسـی سـوبحدەم، ئـەی
ئـەوەی خـۆت لـە مـن بـە باشـتر دەزانیـت، هەمـوو پێتدەڵێـن پرۆفیسـۆری
شـەوە گواوییـەکان، وەزیـری عەرەبانـەکان، پاشـای سـڵق... دەزانـم تـۆ
مـن بـە شـتێکی خـراپ دەزانـی... دەشـزانم مـن خراپـم... بـەڵام گوێبگـرە
فەیلەسـوفی شـەوە تاریکەکانمـان... محەمـەدی دڵشوشـە مـردووە و تـۆ
پێدەکەنیت... تۆ وا خـۆت نیشـاندەدەیت وەک ئـەوەی هیـچ نەبووبێـت...».

سەریاسـی یەکـەم بـە پێکەنینی برایەکـەوە زگـی بـە براکـەی بسـووتێت
گووتـی «تـۆ دەزانـی پێکەنینـی مـن پەیوەنـدی بـە ئازارەکانمـەوە
نییـە، مـن دەزانـم مـردووەکان دوایـی بیردەکەنـەوە و ئاوڕدەدەنـەوە و
سـەیردەکەن کـێ خەفەتیـان بـۆ دەخـوات... ڕۆژێـک لـە ڕۆژان مـن دەچـم

بۆ لای، بەڵام تۆ نایەیت... ئەو ڕۆژە دەردەکەویت کاممان محەمەدی دڵشوشەمان زیاتر خۆشدەویت». ئەو کات بەباشی تێنەگەیشتم دەڵێ چی، کۆمەڵێک ڕۆژنامەی لەسەر تەپڵەکی چاخانەکە دانابوو، بە هێمنی چاکەی تێکدەدا، من ڕۆژنامەکانم هەڵگرت و گووتم «قسەکانی تۆ تڕوهاتە... تۆ پیاوێکی دڵڕەقیت.... من خۆم ناکەم بە مەلایکەت... بەڵام مردنی محەمەدی دڵشوشە لای من کۆتایی دونیایە... یەعنی ئیتر هیچ... ئیتر من و تۆ ناتوانین لە خۆمان تێبگەین، دەزانم ئەوەی من دەیڵێم سەخیفە دەزانم تۆ گاڵتەت لێدێت، تۆ کە خۆت بە فەیلەسوفی دەستگێڕەکان و پەتاتەفرۆشەکان دەزانیت... دەزانم لەبەر ئەوەی ئەم جەریدە هیچ و پوچانە دەخوێنیتەوە و ئەو کولەکەفرۆشە گەمژانە پێتدەڵێن مارشاڵ، خۆت لە من بە باشتر دەزانیت، بەڵام ئیتر من و تۆ هیچ... هیچ... یەعنی تادەمرین نازانین کێین... ئیتر کێ یارمەتیماندەدات... باینجانفرۆشەکان یان شقارتەفرۆشەکان؟... ها مارشاڵی ڕۆژە گواوییەکانمان... پێمبڵێ... ئیتر کێ یارمەتیماندەدا؟».
لەسەرەتادا هەمیشە بە هێمنی گوێی دەگرت دواتر بڕیاری دەدا چیبکات، بێئەوەی چاکەی بخواتەوە بەردەوام تێکی دەدا، لەزەتێکی زۆری لەوە دەبینی کاتێکی درێژ پیاڵەکە لە بەردەستی خۆیدا بهێڵێتەوە و تەماشاییکات. ئێستاش کە بیر لە هێمنی، زەردەخەنە و توڕەبوونەکانی دەکەمەوە حەزدەکەم بە دەنگی بەرز بگریم و بکێشم بەسەری خۆمدا، هەموو جارێک بە منی دەگووت «سەریاسی سوبحەدەم هەندێ سنوور هەیە نابێت بیبڕیت». من زۆربەی کات دەمگووت «من میزدەکەم بەو سنوورانەدا... هیچ سنوورێک نییە نابێت من بیبڕم».
ئەو ڕۆژە کە وام پێگووت بە سەرسامییەوە سەیریکردم و پێکەنی و گووتی «دەزانم... دەمێکە دەزانم من و تۆ لە یەکتر تێناگەین».
من بەردەوام پێم دادەگرت. مردنی دڵشوشە هەموو شتێکی لە مندا

گۆڕیبوو، لەو ڕۆژەدا تووشی لەرزۆکییەک بووبووم بەردەوام لەگەڵمدا بوو، نەمدەتوانی پیاڵەی چاو پەرداخی ئاو و تیکەی نانەکەشم بە دروستی بگرم. کە سەریاسی یەکەم وایگووت من هەستم بە نائومێدییەکی گەورەتر کرد، هەستمکرد هەموو ئەم یارییە شتێکی سەخیفە... ئەوەی هەردووکمان یەک ژیان و یەک ناو و یەک ڕابوردوومان هەیە و ناشزانین بۆ وایە. شتێکی سەخیفە. من هەموو ئەو سنوورانەم دەبڕی کە ئەو دەیگووت نابێت ببڕدرێت و دەمگووت «کە من و تۆ نەزانین کێین؟... بۆ لەیەک دەچین؟... ئیتر بۆ ببین بە هاوڕێ... بۆ پێکەوە پەیمانێکمان مۆرکرد و خستمانە ژێر دواهەمین هەناری دونیاوە... کەواتە هەمووی قسەی بێمانایە... دەتوانین میزبکەین بە هەموو شتەکانماندا، میزبکەین بە ناوەکەماندا، میزبکەین بە هەنارە شوشەکاندا، میزبکەین بە دواهەمین هەناری دونیادا». کە وامدەگووت بێدەنگ کەوچکەکەی دادەنا و ڕۆژنامەکانی هەڵدەگرت و دەڕۆی. من لەو چایخانە شێتەدا کە پێیاندەگووت «بوراق» سەرمدەخستە سەر مێزەکە و دەستمدەکرد بە گریان... لەناو ئەو گەچکار و بێئیش و قوتابییە غەمگینانەدا کە لەدەورم پێدەکەنین دەستمدەکرد بە گریان و بە فرمێسکەکانمەوە دەهاتمەدەرێ و ئیتر تا دوای مردنی سەریاسی یەکەم نەدەچوومەوە بۆ بوراق. ئەو شەوە لە ماڵی ژینۆی مەخمەڵی بە غەمگینی بینیمەوە، گووتی «ئەمڕۆ تەنیا محەمەدی دڵشوشەمان لەدەستنەدا، منیش هەنارە شوشەکەم ونکرد. سەریاس عەفوومکە، ئەو کاتەی محەمەدم بە مردوویی بینی، ویستم هەنارە شوشەکەم بدۆزمەوە... لێتی ناشارمەوە لە ڕۆژێک پێش لافاوەکەوە هەنارەکەم لای ئەو بوو، ویستم بیدۆزمەوە کەس نەیبات، بەڵام لەو کاتەدا تۆ خۆت لە قوڕ و لیتەی ئەو کوچەیە هەڵکێشا و سەرت لێشێواندم، کە زڵلەکەم لێدایت چەندە پەرێشانی مردنی جوانەمەرگ بووم،

ئەوەنـدەش غەمـی تـۆم بـوو، چەنـدە دڵـم لای تـۆش بـوو ئەوەنـدەش دڵـم لای هەنارەکـەم بـوو، بـەڵام تـازە ڕۆی... تـازە فەوتـا». مـن ئـەوکات نەمدەزانـی بـۆ سـەریاس هەنارەکـەی خـۆی داوە بـە محەمـەدی دڵشوشـە؟ دەمزانـی لـە پێنـاوی نهێنییەکـی گـەورەدا نەبێـت سـەریاس دەسـتبەرداری هەنارەکـەی خـۆی نابێـت. بـە هەرحـاڵ ئـەو ئێوارەیـەی کـە محەمـەدی دڵشوشـە لـە مـاڵ هاتـەدەرەوە و تووشـی لافـاوەکان بـوو، دەچـوو بـۆ لای «سـەی مـژدەی شـەمس» کـوڕی «سـەی جەلالـی شـەمس»، ئـەو توحفەفرۆشـەی شـتێک لـە نهێنـی هەنـارەکان دەزانێـت. نەدیمـی شـازادە زۆر شـت دەزانێـت. مـن لـە ڕۆژی مردنـی سەریاسـی گـەورەوە وازم لـەوە هێنـا بـۆ ئـەو چیرۆکـە بژیـم... بەلامـەوە گرنـگ نییـە ئـەو نهێنییـە بزانـم یـان نـا. بـەڵام نەدیمـی شـازادە زۆر شـت دەزانێـت، زۆر شـت. تـۆ دەبێـت نەدیمـی شـازادە بدۆزیتـەوە. ئـەو شـەوە وەک هەمیشـە مـن و سەریاسـی یەکـەم، کـە لـەو سـاتانەدا پێماندەگـووت سەریاسـی گـەورە دەسـتمانکردە ملـی یـەک و ئاشـتبووینەوە... بـەڵام مـن تـا دوای مردنـی ئـەو نەچوومـەوە بـۆ بـوراق... ئـەو چایخانەیـەی یەکەمجـار یەکـەم چـای هاوڕێتیمـان لـەوێ خـواردەوە.

ئیتـر نەچوومـەوە بـۆ بـوراق... نەچوومـەوە بـۆ بـوراق... نەچوومـەوە بـۆ بـوراق.

مـن بـە گشـتی لـە هەمـووان کەمتـر دەچـووم بـۆ ئـەو چایخانەیـە... نەچـوون بـۆ ئـەو چایخانەیـەش مانـای ئـەوەی خەڵکێکـی زۆر نەناسـیت و خەڵکێکـی زۆر نەتناسـن. گوێـت لـەو چیرۆکانـەی نـاو بـازاڕ نەبێـت کـە سەریاسـی یەکـەم بـە دەنگێکـی بـەرز دەیگێڕایـەوە، ئـاگات لـە ڕووداوە سـەیرەکان نەبێـت... ئـەو چایخانەیـە بەشـێکی گرنگـی ژیانـی سەریاسـی سـوبحدەم بـوو. سەریاسـی گـەورە، پرۆفیسـۆری شـەوە تاریکەکانمـان. لەویـادا دەسـتگێڕەکان دەردە دڵـی خۆیـان بـۆ سـەریاس دەکـرد، ئەوانـەی کـە عەرەبانەکانیـان دەفرۆشـت سـەواو مامەڵەیـان دەکـرد، ئەوانـەی دڵداریان

دەکرد نامەیان لەسەر نامەی یەکتر دەنوسییەوە، دەستگیرە تازەکان دەهاتن بۆ لای مارشاڵ و ئەنجومەنی عەرەبانەکان تا شوێنێکیان لە ناو لەشکری عەرەبانەکاندا بۆ بکەنەوە. سەریاسی گەورە لەویادا لەگەڵ پۆلیس و پیاوانی شارەوانیدا ڕێدەکەوت، پارەی زیادی دەدا بە کەناسەکان تا باشتر شوێنە پیسەکان پاکبکەنەوە، لەو منداڵانە توڕەدەبوو کە نەیاندەزانی ژیان لەگەڵ لەشکری عەرەبانەکاندا یەعنی چی... بەڵام ئەوەی کە منی سەرسامدەکرد، حورمەتی زۆری بوو بۆ ئافرەت... بوەستە... بوەستە... بوەستە موزەفەری سوبحەدەم با لێرەدا بوەستم و بیربکەمەوە. هەر سێکمان سێ بەدبەخت بووین ئافرەتێک چییە لە ژیانماندا نەبوو، عەفومکە حورمەتی باوک و کوڕ دەخەمە ژێر پێمەوە و دەڵێم کەسمان مەمکێکمان نەگوشیبوو، لێوێکمان نەمژی بوو، ڕانێکمان نەگلۆفیبوو... سەریاسی گەورە ئەوەی ناودەنا شەرەف، من ناوم دەنا بەدبەختی، دڵشوشە ناوی دەنا بێسەبری... وای لە من وای، کێ لەو باوەڕەدا بوو ئافرەتێک محەمەدی دڵشوشە بکوژێت؟. من ئێستا لەم زیندانەدا یەک ئومێدم هەیە... یەک ئومێد و هیچی تر... گوێبگرە موزەفەری سوبحەدەم، ئەی ئەوەی کە نەمبینیویت و ناشمەوێت بتبینم... بۆ ئەم وڵاتەی ئێمە یەک ئومێد زۆرە. من هیوام ئەوەیە بێمەدەرێ و بڕۆم لە شوێنێکی ئەم دونیایەدا خۆم ونبکەم، کۆمەڵێک بەڵگەنامە و شوناسی ساختە دەربهێنم و ناوی خۆم بگۆڕم و یەک منداڵم هەبێت... یەک منداڵ ناوی سەریاسی سوبحەدەمی نەبیستبێت.

بەڵام درۆیە ئێمە سێ پیاوی خەسیو بووین...

موزەفەری سوبحەدەم... گوێت لێمە... هەندێجار دەبێت تەسجیلەکە بکوژێنمەوە و بیربکەمەوە... من لە زوڵمەتێکی تەواودا قسەت بۆ دەکەم، نازانم دەبێت سەعات چەند بێت؟ تۆش وەک من زیندان بوویت... دەزانیت مرۆڤ لە زینداندا ئەگەرچی پێویستی بە سەعات

نییە، بەڵام بەردەوام حەزدەکات بزانێت سەعات چەندە، خەڵکی چیدەکەن، چ جێگایەکی دونیا ئارامە و کوێ جەنجاڵە. من هەرچۆنێک قسەبکەم دێمەوە سەر یادگاری ئەوان. مەبەستدەکەم لە بەیانی مردنی دڵشوشەوە، لەو کاتەوەی شەریفی پەپولە بە خۆی و قاپێک ماست و سێ کولێرەی ئیعاشەوە خۆی کرد بە ژووردا و گووتی «ئەمشەو محەمەدی دڵشوشە مردووە» ژیانی من تێکچوو. ئەو مرۆڤە چەپەڵەی لە ناو مندایە هاتەوەدەرێ... وەک ئەوەی لەو ساتەوە ئەو سەریاسە چەپەڵەی دەمویست بیکوژم زیندوو بێتەوە. مردنی دڵشوشە مردنی هەموو حەقیقەتێک بوو لە ژیانی ئێمەدا. ئەم سەریاسەی ئێستا زیندانە پیاوێکە لە تەپوتۆزی مردنی ئەودا ونبووە، تۆش کە لە بیابانەوە هاتوویت هەر لە ناو تەپوتۆزی مردنی ئەودایت... ئەو خۆی وایدەگووت، ئەو کە هەردەم باسی مردنی خۆی دەکرد، قسەی لە غوبارێک دەکرد دوای مردنی خۆی جێیدەهێڵێت و ئێمەی تیا وندەبین. بزانە گەر محەمەدی دڵشوشە، بەو جۆرە نەمردایە، ئێستا ئێمە ژیانێکی تر دەژیاین... ئێستا تۆ دەهاتیتەوە، بۆ ئەوەی من ببینیت، سەریاسەکانی تر ببینیت... باوەش بە هەمووماندا بکەیت. بەڵام ئەو لەگەڵ خۆیدا هەمووماني کوشت. لە بیرمە شەوێک باسی مردنی خۆی بۆکردم. دڵنیابوو دەمرێت... دەیزانی شتێک دەیکوژێت... بەڵام دروست نەیدەزانی چییە. لای هەموان دەیگووت عەشق دەیکوژێت، بەڵام لای من دەیگووت لەوانەیە نهێنییەکان خۆیان یان دۆزینەوەی ڕاستییەک کە هیچ کەس نابێت بیزانێت، بیکوژێت... خودایە... خودایە، لەم تاریکییەدا کە نەسەرەتای هەیە نە کۆتایی بەردەوام باسی مردنی ئەو دەکەم، چونکە مردنی ئەو سەرەتای هەموو شتەکان بوو... سەرەتای مردنی منیش بوو.

## کاسێتی دووەم

شەوباش موزەفەری سوبحەدەم... شەوباش، لای من هەمیشە شەوە. گوێم لە کاسێتی دووەمت گرت... ئەوەی باسی گەردون و ئەو شتانەی تیادەکەیت... ئەوەی دەڵێیت گوایە ژیانی ئێمە پارچەپارچە بوونی ژیانی تۆیە، دەنگی ئێمە پارچەپارچە بوونی دەنگی تۆیە، تۆ لەبری ئێمە درێژە بەو چیرۆکە دەدەیت و لەو جۆرە قسانە. عەفوومکە من گاڵتەم بەهەموو ئەو تروهاتە دێت... مرۆڤ هەندێ جار دەتوانێت قسەی زۆر بێمەعنا بکات. ئەوەی تۆ لە دیلێتی خۆتەوە هاتوویت بۆ ئەوەی سەیری دیلێتی من بکەیت... ڕاستە. بەڵام ئەوەی بتوانیت شتێک بۆ ئێمە بکەیت... درۆیە... تۆ کێیت؟ تۆ مردوویت... دوای بیستویەک ساڵ لە ناو لمەوە هاتوویت، دەتەوێت چیبکەیت؟... تۆ چیت؟ تۆ لمیت...لم... من بەدەنگتدا دەزانم تۆ لمیت. موزەفەری سوبحەدەم من لەم تاریکییەدا قسە بۆ خۆم دەکەم... بۆ خۆم... نەوەک بۆ تۆ.

دوێنێ شەو نیگەران بڕیارمدا هیچ شتێک نەگێڕمەوە، دواتر پەشیمانبوومەوە. تۆ بە من دەڵێیت هەموو شتێکت بۆ باسبکەم... هەموو... هەموو...هەموو شتێک. هەموو شتێک باسناکرێت. لەبەرئەوەی تۆ چۆن دەڵێیت «من لە زیندان تنۆک تنۆک خۆم لە ڕابوردووی خۆم ئازادکرد» منیش دەمەوێت تنۆک تنۆک خۆم لە ڕابوردووی خۆم ئازادبکەم. من لە دوای کاسێتی یەکەمەوە مەراقێکی گەورەم هەیە، ئازاری گێڕانەوە لە ئازاری زیندان خراپترە. بەڵام غەمێک کە غەمی مانەوە و خەیاڵی مردووەکانە وادەکات قسەبکەم. غەمی ئەو دوو مردووە ئێشی زۆرە، هەموو ڕۆژێک وەک ئەوە وایە یەکەم ڕۆژی مردنیان بێت.

یەکەم ساتی بیستنی هەواڵی مردنیان بێت... ئەو ئازارەیە وادەکات قسەبکەم. موزەفەری سوبحدەم تۆ کێیت، تۆ باوکم نیت، ئەوانە باوکی ڕاستەقینەی من بوون. شەوێکیان وام بە سەریاسی یەکەم گووت. گووتم «تۆ باوکی منیت». ئێستاش پێکەنینە بەرز و پرسەداکەیم لە بیرە. شەریفی پەپولە هاوڕێی ژوورەکەمان حاجەتی دەشت، سەریاس لەسەر سینییەکی گەورە بۆ ئێوارە برنجی دەبژارد، من لەسەر دۆشەکێکی گوڵ گوڵ پاڵکەوتبووم و گوێم لە کامکارەکان دەگرت، من هەمیشە گوێم لە کامکارەکان دەگرت... من ئیشمنەدەکرد، دەمگووت «من سەریاسە دزێو و ناشیرینەکەم». نانمدەخوارد و سفرەکەم بەجێدەهێشت، چام دەخواردەوە و پیاڵەکەم سەرەوخوار دەخستە سەر مێزی تەلەفزیۆنەکە، گۆرەوییەکانم دەخستە ناو سوراحی ئاوخواردنەوە کە تا بخوسێت، ژوورەکە ماڵی من و شەریفی پەپولە بوو، تەلەفزیۆنەکەش هی من بوو، ستریۆکەش هی من بوو. سەریاسی گەورە هەندێ ڕۆژ گەر باران بایە، گەر نەچووایەتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لە موجەمەع، نە چووایە بۆ لای ئادەم مەرجان کە دوای مردنی سەریاس بوو بە کۆمۆنیست، دەهاتەوە بۆ لای ئێمە. ئەو ڕۆژەی پێمگووت «تۆ باوکمیت» پێکەنینی بە دیمەنەکە دەهات. من لەو گەورەتر بووم، بەڵام ویقارو ڕەوشتی ئەوم نەبوو، قیافەتم لەو باشتربوو، بە ڕوخساریش لەو زیاتر لە پیاو دەچووم، بەڵام کەس پێی نەدەگووتم پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکان. من کەس پەروەردەی نەکردبووم. بوەستە دەبێت ڕاستی بڵێم، ئەویش کەس پەروەردەی نەکردبوو، بەڵام ئەو توانای هەبوو خۆی خۆی پەروەردەبکات، هەندێ کەس دەتوانن خۆیان خۆیان پەروەردەبکەن و من ناتوانم. سەریاس پێیخۆش بوو وەک پیاوێکی ڕاستەقینە قسەی لەگەڵدا بکەیت، داوای ئامۆژگاری لێبکەیت، بیکەیت بە دەمڕاست و غەمخۆری خۆت. من گاڵتەم بەو شتانە دەهات، گاڵتەم بەو ژیانەی

دەهات لە ناو عەرەبانەکاندا... پێمدەگووت تۆ لە بەحری ترۆهاتدا نوقمبوویت. ئەویش بە منی دەگووت تۆ نازانیت بۆچی دەژیت. من دوای ناسینی ئەوان ژیانم گۆڕا، دوای مردنی ئەوانیش جارێکی تر کۆی شتەکان خراپ تێکچوونەوە. هەندێجار زۆر گوێم لە ئامۆژگارییەکانی دەگرت، بەڵام هەندێجاریش پاڵدەکەوتم و دەمگووت هەموو ئەم قسانەی تۆ بە پولێکی قەڵب ناکرم. من لە هەمووان کەمتر دەچوومە بوراق، شێوەی ئیشکردن و ژیانی من وابوو، دوای ناسینی ئەوان بڕیارمدا لە هێزی پێشمەرگە بێمەدەرێ. کە شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد، ماوەیەک بوو ئەوانم دەناسی و پەیمانی برایەتییەکی هەتاهەتایم لەگەڵیاندا مۆرکردبوو. ئێوارەیەک بە هەموو تفەنگ و کەلوپەلی جەنگەوە خۆم کرد بە بوراقدا، هەمووان بە گەرمی هەواڵی شەڕیان لێدەپرسیم، من بەدرۆ ناوی سەد شاخ و گرد و کەپکم بۆ دەژماردن کە حیزبمان گرتوێتی، هەستمدەکرد خەڵکی زۆر بەدرۆ بەختەوەردەبن، منیش کە لە شەڕ دەهاتمەوە بەردەوام درۆمدەکرد. محەمەدی دڵشوشە و سەریاسی گەورە تاکە دوو کەسێک بوون بە غەمگینی سەیریاندەکردم. من لە ناوەڕاستی مێزەکاندا هەڵدەستام و دەمگووت «حیزب لە خەتەردایە» دەبێت ئەو کۆنە جاش و سیخورانە پاکبکەینەوە و پەرلەمانێکی تر دروستبکەین... تێدەگەن حیزب لە خەتەردایە». مارشاڵ یاری بە کڵۆ شەکرەکانی بەردەمیدەکرد و بە غەمگینییەوە دەیگووت «گەمژە دانیشە، هیچ کەسێک لە خەتەردا نییە تۆ نەبێت... تاکە کەسێک لە خەتەردا بێت تۆیت». ئێوارە منیان برد بۆ شوێنێکی خۆش، بۆ بارێکی بچوک کە خەریک بوو نەمانکەنە ژوورێ، لەوێ محەمەدی دڵشوشە پێیگووتم «مەچۆ بۆ ئەو شەڕە... سەریاسی سوبحدەم، مەچۆ بۆ ئەو شەڕە... دەکوژرێیت و تەواو... دەکوژرێیت و جگە لە لاشەکەی خۆت هیچ بەجێناهێڵیت». بەدرێژایی شەو قسەیان لەگەڵ

کردم. ئەو شەوە تێگەیشتم بۆ بە سەریاسی گەورە دەڵێن پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکان، ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان لە تاریکیدا جوانتر قسەیدەکرد، سوێندت بۆ دەخۆم ئەو لە تاریکییدا وەک فەیلەسوفەکان قسەیدەکرد، بۆ لە ڕۆژدا ئاوەها جوان قسەی بۆ نەدەهات، نازانم؟ لەوانەیە هۆکەی ئەوەبێت بە ڕۆژ بەردەوام ماندووبوو، کێشەو دەردی ناو ئەو بازاڕە ئەشکەنجەیان دەدا، ئەو بەردەوام خەونی بەوەوە دەبینی جۆرە ڕێکخستنێکی تر بخاتە ئەو شارەوە، بەجۆرێک خۆی و عەرەبانەکان باشتر جێگایان ببێتەوە. موزەفەری سوبحدەم شتێک لە قسەکانی ئەودا هەبوو دەربارەی ژیان و مردن و ئەو شتانە لە قسەکانی تۆ دەچوون. وەک ئەوەی دەیگووت «ژیانی تۆ لە شەرەفی هەزار حیزب گەورەترە، کە لەسەر بەشکردنی تاڵانییەکانیان شەڕدەکەن». هەردووکیان زۆر ڕقیان لە شەڕبوو، هەر کاتێک باسی جەنگ بکرابایە باسی ڕوخساری ئەو کوژراوانەیان بۆدەکردم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێکەوە لە شاخێکی دوور دیبوویان. من وانەبووم، من لە منداڵییەکی زووەوە جەنگاوەربووم، شەڕ لە خوێنمدا بوو، ئاشنای باروت و فیشەک و ئاگربووم. ئەوان توانایەکی گەورەیان هەبوو لەسەر قەناعەت پێهێنان، توانایەک گاڵتەی پێنەدەکرا. من بە غەمگینی گوێمدەگرت و سەرم بۆ قسەکانیان دەلەقاند. لەدوای ئەو شەوەوە کەمەکەمە خۆم لە شەڕەکان کێشایەوە، تاوای لێهات ڕۆژێک خۆم بەتەواوی لەدەرەوەی هەموو ژیانی جارانم دۆزییەوە. موزەفەری سوبحدەم ناتوانم باسی ئەو ڕۆژانەت بۆ بکەم، من ئەگەرچی زوزوو لەگەڵیاندا بەشەڕ دەهاتم، بەڵام لەوان بترازێت هاوڕێی دیکەم نەبوو. دەمزانی ئەوان دەیانەوێت لە شتێک بمپارێزن، ئەوان باوکی من بوون، غەمێکی گەورەیان لە ژیانی من دەخوارد، ئەو ماوەیەی لە پێشمەرگایەتی هاتمەدەرێ، نەمدەزانی بچم بۆ کوێ؟ بە درێژایی ئەو ماوەیە منیان بە خێوکرد، تاکە مەرجیشیان

ئەوە بوو نەچم بۆ شەڕ.

من لە ماڵێکدا ژوورێکم هەبوو، خانوویەکی چکۆلانە بوو کۆمەڵێک قوتابی لەدەرەوەی شارەوە بۆ خوێندن هاتبوون، گرتبوویان. شەریفی پەپولە هاوڕێی ژوورەکەم بوو. ئەو ماوەیە محەمەدی دڵشوشە پارەی ژوورەکەی بۆدەدام. ئەو کەمجار ئێمەی دەبردەوە بۆ کۆشکە شوشەییەکەی خۆی، حەزی نەدەکرد بەخیلی بە ژیانی ببەین، یان ژیانی خۆمان بەو بەراوردبکەین و غەمبخۆین. هەردووکمان لە سەریاسی یەکەم خۆشتر دەژیاین، من لە ڕۆژە خراپەکانیشمدا پۆشتە و پەرداخ خۆم دەگۆڕی و بە بازاڕدا دەگەڕام. بەڵام ژیانی ناو بازاڕ سەریاسی ئازاردەدا... بەیانیان دەبایە زۆر زوو لە خەو هەستێت، شەوانیش لە شوێنی زۆر خراپدا دەخەوت، هەندێجار پێکەوە دەچووینەوە بۆ ئەو ژوورە چکۆلانەیەی خۆی لە موجەمەع کە پڕبوو لە وێنەی ماشێنی خێرا و یاریکەری کاراتییە و نوسینی سەیرسەیری عەرەبی کە نەمدەتوانی بیانخوێنمەوە. شەوان لەوێ لە سەر قەرەوێڵەیەکی کۆن درێژدەبوو و بیریدەکردەوە، بەردەوام بیریدەکردەوە، کە قسەشیدەکرد بەر لەوەی دەستپێبکات بە دەنگی بەرز پێدەکەنی. شەوێکیان لێمپرسی «سەریاس لەو باوەڕەدایت من و تۆ برابین؟» بە غەمگینییەوە سەیریکردم و گووتی «من و تۆ برایان... خەڵکانی لێقەوماوی ئەم دونیایە هەموویان بران». گووتم «مەبەستم ئەو برایەتی و تروهات و شتانە نییە، من دەزانم خەڵکانی لێقەوماوی ئەم دونیایە بە دەستیانبێت میزدەکەن بە دەموچاوی یەکدا، مەبەستم برای ڕاستەقینەیە... واتە لە یەک دایک و باوک بووبین». ئەو گووتی «یەکجۆر برایەتی هەیە... ئەوەی کە ژیان و خۆشەویستی دروستیدەکات... ئەوانی تر هەمووی درۆیە». لێمپرسی «لەو باوەڕەدایت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم نهێنییە بزانین، یەعنی بزانین بۆچی ناومان سەریاسی سوبحدەمە، بۆ دایک و باوکی خۆمان نییە،

بۆ بێکەسین، بۆ یەکی هەنارێکی شوشەمان هەیە؟ یەعنی بزانین ئەم هەموو شتە سەخیفە چۆن ئاوا پێکەوە کۆدەبێتەوە؟». گووتی «نا... سەریاس لەو باوەڕەدانیم، من تەنیا بۆ خۆم قسە دەکەم، دڵنیام دەمرم و لەو پرسیارە تێناگەم... ئەوەتا ژیانی من وەک تیرێک وایە کە لە کەوانی خۆی دەرچووە، تیرێک بێ هیچ ئامانجێک بە خێرایی دەڕوات و دواجار بەر شتێک دەکەوێت و دەشکێت». موزەفەری سوبحەدەم پێت سەیر نەبێت، ئەویش و دڵشوشەش بەو جۆرە سەیری شتەکانیان دەکرد، هەردووکیان دەیانگووت «بەر شتێک دەکەوین و دەشکێین». سەریاسی گەورە خۆی بە تیرێکی خێرا دەشوبهاند کە دەستێک لە کەوانی خۆی بەریدەدا و کەس ناتوانێت ڕێگا و ئاڕاستەی ڕاستبکاتەوە، محەمەدی دڵشوشەش خۆی بە هەنارێکی ناسکی شوشە دەشوبهاند کە بە بەردەڵانێکدا دێتەخوارێ و پەراش دەبێت. من درەنگ تێگەیشتم بۆ دڵشوشە بەو جۆرە سەرسامی هەنارە شوشەکان بوو، بۆ هەمیشە ئاوەها شەیدا تەماشایدەکردن. ئەو خۆی بە هەنارێکی شوشە دەزانی... ئەو هەنارێکی شوشەی زیندوو بوو، دڵنیابوو لەوەی ڕۆژێک بەر شتێک دەکەوێت و دەشکێت. هەر دووکیان لەو کەسانە بوون کە دڵنیابوون هیچیان لەگەڵ چارەنوسی خۆیاندا بۆ ناکرێت، لەبەر ئەوە خەریکی چاککردن و باشکردنی چارەنوسی ئەوانی تر بوون. وەک ئەوەی ئەوان بەر پرسیاری ئازار و میحنەتەکانمان بن... ئاوەها بوون... ئەوان باوکی من بوون... ئەوان کە ڕۆژێک بەر شتێک کەوتن و شکان.

موزەفەر باسی ئەو کچە سپییانەم بۆ مەکە، هەر جارێکی دیکە کاسێتت بۆ ناردم باسی ئەو خوشکانەم بۆ مەکە. من تا دەمخەنە گۆڕەکەوە وەک جنسی شەیتان سەیریاندەکردم، ئەوان دڵشوشەیان کوشت، ئەوان بوونە مایەی تێکچونی پەیوەندی من و مارشاڵی شەوە

تاریکەکانمان. من ڕقم لێیانە... موزەفەری سوبحدەم... ڕقم لەو خوشکە سپییانەیە، ئەوان محەمەدی دڵشوشەیان کوشت.

ڕۆژێک سلێمانی مەزن، هەموومانی کۆکردەوە و چیرۆکەکەی بۆ باسکردین. ئێمە هاوڕێ ڕاست و دروستەکانی محەمەدی دڵشوشە. ئەو و سەریاسی یەکەم هەردووکیان سووربوون لەسەر ئەوەی ئەو خوشکانە بێتاوانن. من دەمکێشا بەسەری خۆمدا و دەمگووت "چۆن بێتاوانن؟ گەر ئەوان بێتاوانن ئەی محەمەدی دڵشوشە چی دەکات لەو گۆڕەدا... گەر ئەوان گوناهیان نییە ئەو کوڕە بۆ هەڵناسێننەوە و بیبێتەوە بە هاوڕێکەی جارانمان و لەگەڵماندا بێت بۆ ژێر دواهەمین هەناری دونیا؟ چ تاوانێک لەوە گەورەترە مرۆڤ یەکێکی لە قووڵایی دڵەوە خۆشبوێت و ئەو خۆشی نەوێت؟ ها چ تاوانێک لەوە گەورەتر هەیە بە خوێنی خۆت عاشق بیت و ئەوەی خۆشتدەوێت، سارد و سڕ سەیرتبکات و خۆی بابدات و بڵێ من تۆم خۆشناوێت... من دەڵێم ئەوە لە کوشتنی مرۆڤ بە گوللە خراپترە، لە کوشتنی ئینسان و سەربڕینی بە چەقۆ خراپترە».

من لە پشت هەموو ئەو هەراو بەزمەوە بووم کە دوای پرسەکە ڕوویدا. من و سێ کەسی دیکە لەوانەی دەمانویست لە هۆی مردنی تێبگەین. نا وامەزانە چیرۆکی مردنی دڵشوشە، چیرۆکێکی سادەیە. ئەو ڕۆژانە لە بازاڕ، هەموو دونیا قسەی لەسەر کوشتنی دڵشوشە دەکرد، خەڵکی قسەیان لە گوللەیەکی نهێنی دەکرد لە شەوی دوای لافاوەکەدا نرابوو بە دڵشوشەوە. هەموو خەڵک دەیانگووت دڵشوشە لەبەردەم دەرگای دۆزینەوەی نهێنییەکی مەزندابووە بۆیە کوژراوە، بەڵام کێ لە ئێمە دەیتوانی بگاتە ڕاستی و دروستی ئەو چیرۆکانە. ئەوکات کە من چوومە بەردەم ماڵی سلێمانی مەزن وەک هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە نازکی ئەو کوڕە هەبوو بەخۆمم دەگووت «دڵشوشە عەشق کوشتوێتی،

عەشق و هیچی تر». بەڵام ئێستا دەڵێم مردنی دڵشوشە وەک نهێنییەک دەمێنێتەوە، نهێنییەک کەس ناتوانێت تەلیسمەکانی بکاتەوە. دڵنیام تا دوا ساتیش محەمەد باوەڕی وابووە کە عەشق دەیکوژێت، بەڵام هەر ئەو خۆشباوەڕییەش نیشانەی سەرکەوتنی تاریکی و نهێنییەکانە بەسەر ئەو مەملەکەتە نازک و شوشەییەی ئەودا کە بێسوود دەیویست تەمتومانەکان لابات و غوباری سەر ژیان بڕەوێنێتەوە. ئەو ئێوارەیە چووینە بەردەرکی ماڵی سلێمانی گەورە و گووتمان دەمانەوێت باوکی دڵشوشە ببینین، پاسەوانەکانی نەیانهێشت. ئێمە کەوتینە بەردبارانکردنی پەنجەرەکان، پاسەوانەکان ویستیان تەقەمان لێبکەن، بە کۆڵانەکاندا ڕاویاننایین، بەڵام بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ جارێکی تر کۆبووینەوە، ئەمجارە ژمارەمان زۆرتر بوو، کۆمەڵێک کەس بووین کەسمان یەکترمان نەدەناسی، هەموو ئەو گەنجە بێدەرەتان و مەحرومانە بووین لە شوێنی جیاواز و بەشێوەی جیاواز دڵشوشەمان ناسی بوو. بە دەنگی بەرز بانگم لە سلێمانی مەزن کرد و گووتم «هۆ بەڕێز هۆ... لەو ژوورە وەرەدەرێ و تێمانبگەێنە محەمەدی دڵشوشە بۆ مرد؟ ئێمە ڕەفیقی گیانی بە گیانی جوانە مەرگ بووین. تا ئێستا لە هیچ حاڵی نین، بایەکێ بێتەدەرێ و لە جیاتی قسەی تروهات حاڵیمانبکات». من دەمزانی نایەوێت باس لە مردنی کوڕەکەی بکات، لەسەرێکی دیشەوە دەترسا شتێک لەو خوشکە سپییانە بکەین، کە ئەوکات پێمانوابوو وەکو ڕۆژی ڕوون ئاشکرایە ئەوان دڵشوشەیان کوشتووە. ئەو ڕۆژەش نەهاتەدەرێ و پاسەوانەکان بڵاوەیان پێکردین... بۆ ڕۆژی دوایی ژمارەی ئەوانەی کۆبووینەوە لەوە گەورەتر بوو حیسابیکرێت. دەستگێڕ و عەلاگەفرۆش و ئاوفرۆش و گوڵەبەڕۆژە فرۆشەکانی شاریش هاتبوون، دواجار مارشاڵ خۆشی هات. کە مارشاڵ هات من خۆم کێشایەوە، ئەو لە هەمووان عاقڵانەتر دەیزانی ئیشبکات. یەکەمجار لە بری هەموومان چووە ژووری

و قسەی لەگەڵ باوکی محەمەدی دڵشوشەدا کرد، کە لەبەر ناوبانگ و پلەوپایەی حورمەتێکی زۆریان دەگرت. من لە منداڵییەوە دەزانم حورمەتی ئەوانە درۆزنانە و بەتاڵە. من حورمەتم بۆی نەبوو، بەڵام لە بەر سەرياسی مەزن خۆم وانیشاندا کە ڕێزێکی زۆری دەگرم. کە هاتەدەرێ قسەمان بۆ بکات، ئێمە هێندە زۆربووین نەیدەتوانی بە ئاسانی ئاراممانبکاتەوە، مێزێکیان بۆ هێنایە دەرێ و چووە سەری. سەرياسی یەکەم بۆ ئەوەی لە بەلەسەبوون و تورەیی ئێمە بیپارێزێت، چووە سەر مێزەکە و لە تەنیشتییەوە وەستا، گەر ئەوی لەگەڵ نەبایە لەوانە بوو شتەکان خراپ بشکێنەوە، بەڵام لای ئێمە و ئەو منداڵانەی لەناو کوچە و قەیسەری بازاڕەکاندا گەورەبووبوون سەرياسی گەورە، پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان لە هەموو سیاسی و خەباتگێڕ و نوسەر و هونەرمەندانی ئەم وڵاتە حورمەتی زۆرتربوو. لەبەر ئەوە کە سەرياسمان لە تەنیشتییەوە بینی وەستاوە و پێماندەڵێت «بێدەنگبن... ئێوە چیتانە خۆ وەحشی نین، با پیاوەکە قسەبکات» هەموو بێدەنگ بووین.

ئەو ڕۆژە سلێمانی مەزن، باسی ئەوەی کرد بۆ ئەوەی ڕێگا لە مردنی دڵشوشە بگرێت هەموو شتێکی کردووە... باسی خۆی و یەکێکی تری کرد لە بەربەیانێکی زووزوودا پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، پێش ئەوەی دونیا ڕووناک بێتەوە چوون بۆ خوازبێنی کچێک کە عەشقی لە ناکاوی ئەو محەمەدی دڵشوشەی کوشتووە. باسی ئەوەی کرد کە شتەکان بە جۆرێک خێراو سەیربوون کەس تەفسیری بۆیان نییە. لە نێوان قسەکانیدا زووزوو دەوەستاو دەیگووت «دڵێک بوو بابردی و شکا». من یەکەم کەس بووم لە دواوە هاوارمکرد «با ئەو دوو سۆزانییە بکوژین... با ئەو دوو دەڵە سەگە بکوژین». سلێمانی مەزن بە هێمنییەکەوە گووتی «ئەوان گوناهیان نییە... تاکە گوناهبارێک

خـودای مەزنــە لــە ژوور ســەرمانەوە، کــە دڵــی دڵشوشــەی وا بــە نازکـی دروسـتکرد». مـن سـووربووم لەسـەر ئـەوەی ئازارێـک بە خوشـکە سـپییەکان بگەیێنیـن، لەنـاو حەشـاماتی منداڵ و گەنجەکانـدا دەنگگەلێکـی زۆری تـر هاواریاندەکـرد «بـا بچینـە سـەر خوشـکە سـپییەکان، بابچینـە سـەریان». سەریاسـی مــەزن ئارامیکردینــەوە و گووتــی «مــن دۆســتی دڵشوشــەم، هاوڕێــی منداڵــی و ژیانــی ئەوبــووم، ئێــوە دەمناســن کــە چەنــدە حــەزم لـە باشـی و دادپەروەرییـە. وەک ئێـوە گەنجێکـم و لـە بـازاڕدا گەورەبـووم، پێشـئەوەی کـەس گوناهبارېکەیـن دەبێـت دڵنیابیـن، دڵنیابـن گـەر ئـەوان تاوانبـار دەرچـوون، مـن بەرلـە ئێـوە لێیـان نابـوورم، گـەر بێگوناهیـش بـن ناهێڵـم هیـچ کەسـێک دەسـتیان بۆبەرێـت... دەبێـت بـاوەڕ بـە مـن بکـەن». خـودای گـەورە ئـەو ڕۆژە کـە ئەوانـی بینـی و گەڕایـەوە پێدەچـوو جادوویـان لێکردبێـت، جادوویـەک تــا شــەوی مردنیشــی لــە خوێنیــدا گەرایکردبــوو. کاتێـک هاتــەوە و بــە منــی گــووت «گۆرانییەکانیــان دەلیلــی بێگوناهیانــە» مـن لـەو ئێوارەیـەوە شـێتبووم، لـەو ئێوارەیـەوە برینێـک کەوتـە نێـوان مـن و سەریاسـی مەزنــەوە کــە هەرگیــز سـارێژ نەبـوو.

ئــەو ڕۆژە ســلێمانی مــەزن و سەریاســی گــەورە، کــە یەکێکیــان پڵنگـی شـاخ و ئــەوی دیکەیــان پڵنگێکـی نـاو کوچــەو بـازاڕەکان بــوو، ئارامییانکردینــەوە و بڵاوەیــان پێکردیــن.

موزەفــەری ســوبحدەم کــێ دەیگــووت تــۆ لــە بیابــان دێیتــەدەرێ و دەچیتــە ماڵــی ئــەو خوشـکە سـپییانە... مـن هەمیشـە ڕقـم لێیـان بـووە و تامـردن ڕقــم لێیاندەبێـت. ئــەو ئێوارەیـە کــە سەریاسـی مــەزن چـووە ســەر گۆڕەکــەی دڵشوشــە و بەسەرســامی گەڕایــەوە، تێگەیشــتم ئــەو دوو خوشـکە دوو سـیحربازی گــەورەن، دوو ڕۆحــی خراپــن دەتوانــن هەمــوو پیاوێـک بخەنـە تەلیسـمی خۆیانـەوە. سـەریاس کـە هەمیشـە بـە ئەدەبێکـی بێتامـەوە باسـی ئافرەتـی دەکـرد، وەک یەکێـک جـادوی لێکرابێـت قسـەی

لە دەنگ و ویقار و نهێنیی ناو نیگای خوشکە سپییەکان دەکرد. کە لە گۆڕستان هاتەوە خۆیکرد بە ژوورەکەی من و شەریفی پەپولەدا. بەدەنگی بەرز قسەیدەکرد و پێدەکەنی، شتەکانی بۆ شەریفی پەپولە دەگێڕایەوە و مەبەستی بوو منیش گوێم لێبێت. من وەک شێتم لێدەهات و دەمگووت «تۆ سەرياسی مەزن نیت، سەرياسی گەورە نیت... پرۆفیسۆری شەوە تەڕەماشەکانمان نیت... تەپاڵەی مانگای کۆڵانەکانیش نیت... تۆ هیچ نیت هیچ، لەبیرتچووەوە کە ئەو کچانە نزیکترین هاوڕێی تۆیان کوشتووە؟ لەبیرت چووەوە ئەوانە دڵشوشەیان کوشت؟ من حەزناکەم گوێم لەم قسانە بێت... حەزناکەم لە ماڵی مندا ئەم قسانە بکەیت».

شەوێکی تاریک و تاڵ بوو... تاریک و تاڵ، تاریکتر و تاڵتریش لەم شەوە بێڕەحم بێکۆتاییانەی زیندان. سەرياسی یەکەم بە پێکەنینەکەی خۆی ئارامیکردمەوە و گووتی «ئەو دوو خوشکە، دوو فریشتەن... دوو فریشتەی گەورەی خودان».

کە دواتر زانیم پەیمانێکی خوشک و برایەتیان لەگەڵ سەرياسی مەزندا مۆرکردووە، پەیمانێک لە جۆری پەیمانەکانی دڵداری، ئەوە بووە مایەی تێکچوونی تەواوەتی پەیوەندی من و سەرياسی یەکەم.

شەوێک لە کوچەیەکی خاڵیدا وەخت بوو تەقەی لێبکەم... من بڕیارمدابوو تەقەی لێبکەم، پێمگووت «تۆ خیانەتت لەو پەیمانەی ئێمە کرد، تۆ میزتکرد بەو پەیمانەدا... من دەتکوژم، تۆ لە جیاتی ئەوەی تۆڵەیان لێبکەیتەوە کردوتن بە خوشکی خۆت». چواردەخۆرێکی تازەم پێبوو، دەمانچەکەم دەرهێناو گووتم «دەتکوژم، تۆ زیادیت... تۆ هیچ نیت... من شەرم لە خۆم دەکەم کە منیش ناوم سەرياسە، ئەو دوو کچە سووک و سەلیمیان کردوویت، بوویت بە فلیمی ئەم شارە... بوویت بە فلیم... تەواو... یان تۆ بژی یان من... یان

تۆ تەقە لە من بکە یان من لە تۆی دەکەم». لەبەر پلەکەی قاپی ماڵێکدا دانیشت و بە ئارامی پاڵیدایەوەو گووتی «بمکوژە... سەریاسی سوبحەم بمکوژە. ئا لێرەدا و ئا بەمجۆرە بمکوژە... من پاڵدەدەمەوەو دەستم بڵاودەکەمەوە و تۆ یەک فیشەک بنێ بە ناوچاوانمەوە، یان بوەستە، با بچین لەوێ لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا بمکوژە... لەوێ هیچ کەسیش ئاگای لێتنابێت».

پڕ بە شەو پێدەکەنی و بە گاڵتەوە دەیگووت «بمکوژە، من و تۆ یەکێکمان زیادین... زیاد، ئا... دەی بۆ نامکوژیت... ها بۆ نامکوژیت». ئاه...تا ئەو کات منیش وامدەزانی جگە لە خۆمان سەریاسێکی دیکە لە جیهاندا نییە... بوەستە... بوەستە... نامەوێت من هیچت بۆ بدرکێنم... نەدیمی شازادە هەموو شتێک دەزانێت... ئەو تەنیا کەسێکە دەتوانێت یارمەتیتبدات، دەبێت نەدیمی شازدە بدۆزیتەوە، ئەو کوێرە بدۆزیتەوە کە نهێنییەکان دەزانێت.

ئەو شەوە پێمگووت بمکوژە یان دەتکوژم... بمکوژە یان دەتکوژم... بمکوژە یان دەتکوژم...

من و ئەو یەکێکمان زیادبووین، ئێمە نەدەبایە هەرگیز یەکتری بدۆزینەوە. من لەو دەترسام و ئەویش لە من.

من لە ناو جاش و درو چەتە و پیاوانی حیزبدا گەورەبووبووم، ئەویش لە منداڵییەکی زووەوە لە سەر مەرز و لە ناو قاچاغچی و ناو بازاڕدا گەورەبووبوو. خۆشترین کاتی ژیانی ئەو ماوەیە بوو کە لە مەیتەم ژیابوو، خۆشترین ساڵانی ژیانی منیش ئەو کاتە بوو کە هاوڕێی محەمەی دڵشوشە بووم. ڕقمان لەیەک نەبوو، نا وامەزانە ڕقمان لەیەک بووە، ئێمە یەکترمان زۆر خۆشدەویست... هەندێجار بەسەعات بەسەر شانی یەکتردا دەگریاین و شەریفی پەپولە ژێریدەکردینەوە. بەڵام شەریفی پەپولە ڕۆژێک ڕۆیشت و ئیدی نەگەڕایەوە، دواجار

لە دیمەشقەوە نامەیەکی بۆ ناردم، باسی ژوورەکەی خۆی دەکات لە «سەیدە زێنەب» لەگەڵ کۆمەڵێک شیعەدا. ئیدی دوای ئەو نامەیە هیچی لێنازانم... هەندێک دەڵێن لە ئۆکرانیاوە کچی ڕوسی ئاودیوی ئەڵمانیا دەکات، هەندێکیش دەڵێن لە ئەفغانستان لە ئۆردوگایەکی «ئەفغانە عەرەبەکاندایە»... شەریفی پەپولە تەنیا شاهیدی خۆشەویستی من و سەریاسی مەزن بوو... بەلام شەریفی پەپولە ئێستا لە کوێیە؟.

من و ئەو یەکترمان خۆشدەویست، بەلام هاوڕێتییەکەمان هاوڕێتییەکی ناخۆشبوو، ئێشی هەبوو ئێش، هەر کاتێک یەکتریمان دەبینی ئەو پرسیارەمان لە خۆمان دەکرد «ئێمە کێین؟». ئەو پرسیارەش هەردووکمانی توڕەدەکرد.

تادەمرم ئەو ئێوارەیەم لە بیرناچێتەوە کە لەسەر جێگاکەی خۆم خەوتبووم و دوو غەریبە خەبەریانکردمەوە. من وێنەیەکی گەورەی کامکارەکانم بە سەر قەرەوێڵەکەمدا هەڵواسیبوو، ئیتر باقی دیوارەکان ڕەسمی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری بوو. من ئەوکاتە حەزمدەکرد ناو و ڕەسمی شەهید کۆبکەمەوە و وەک ئێستگەکانی حیزب، ژیاننامەی خەیاڵیم بۆ دروستدەکردن و لەگەڵ پێشمەرگەکانی تردا دادەنیشتین لاسایی موزیع و ئەو شتانەمان دەکردەوە. نا ئەو ئێوارەیەم لە بیرناچێتەوە کە سەریاسی مەزن و محەمەدی دڵشوشە لە ناو وێنەی ئەو هەموو مردووەدا دەرکەوتن، کە یەکەمجار چاومکردەوە ڕوخساری ئەوان لە ناو ڕوخساری شەهیدەکاندا ونبووبوو... چەندجارێک دەموچاوم شت تا توانیم ببینم... توانیم ئەوان لە نیگارەکان جیابکەمەوە. کە هەستام بیست دەقیقەم مابوو بۆ ئەوەی لەگەڵ مەفرەزەکانی شەودا بچم بۆ واجب. هەستدەکەم ئەو بیست دەقیقەیە سەیرترین کاتی ژیانی منن. نا من لەسەرەتاوە شتەکانم بە جیدی وەرگرت، بەلام هەستمدەکرد جۆرێک لە تروهات لە هەموو شتەکانیشدا هەیە. ئەو

شەوە لە کاتی واجیبدا وەختبوو خۆم بکوژم... ئەو شەوە بیرمکردەوە کە ژیانی من جگە لە گۆرانی کامکارەکان، جگە لە حەزی بێمانای من لە کامکارەکان هیچی تری تیا نییە... شەرمم لەوە دەکرد کە دەبێت ژیانی خۆم بۆ ئەو دوو کورە بگێڕمەوە. ئەو شەوە ویستم خۆم بکوژم... زۆر جار لە کاتی واجبدا، لە شەوە ساردەکاندا کە دەهاتمەدەرێ و دەبوومە پاسەوانی شەو و ڕەشەبا و بەفر، بیرم لەوە دەکردەوە خۆم بکوژم. بەڵام مارشاڵی شەوە تاریکەکانمان پێیدەگوتم تۆ «ترسنۆکترین پیاوی دونیایت»... من جورئەتم نەبوو خۆم بکوژم، لوولەی تفەنگەکەم دەخستە ناو دەمم و دەمهێنایەوە دەرێ، دەمخستە سەر ناوچاوانم و دامدەگرتەوە، دەمخستە ژێر چەناگەم و لامدەبرد. ئەو شەوەش کە لە تاریکیدا چواردەخۆرەکەم دەرهێناو بە مارشاڵم گووت «یان تۆ من بکوژە، یان من تۆ دەکوژم» درۆمدەکرد... من هەمیشە لە مردن دەترسم، بەڵام ئەو شەوە هێندە شەرمم لە ژیانی خۆم دەکرد، بە ڕاستی بیرم لە خۆکوشتن دەکردەوە. من بەدرێژایی ئەو شەوە بیرم لە دروستکردنی چیرۆکێکی درۆ دەکردەوە بۆ ژیانی خۆم... هێندەم شەرم لە ژیانی خۆم دەکرد، لە دروستکردنی حکایەتی درۆدا بووبووم بە وەستایەکی عەجایەب. هەتا ئەو ناوانەش کە دەمناردن بۆ گۆرانی داواکراو درۆبوون، کەسانی خەیاڵی بوون تەنیا لە سەری مندا بوونیان هەبوو. هەندێجار لە ئۆردوگا مۆڵەتم دەخواست و دەمگووت «دەچم بۆ ماڵی پورە حەلیمم»، بەڵام من کەسێکم نەبوو ناوی پورە حەلیم بێت... من بە درۆ دەژیام... ئێستا دەڵێم چ خۆشبوو... چ خۆشبوو ئەو ڕۆژانەی کە دەمتوانی بەدرۆ بژیم... چ خۆش بوو... چ بەهەشتێک بوو. گەر تا هەتاهەتایە بمتوانیبایە، بەو درۆ سادە و خۆشانەی گەنجیمەوە بژیم، بەڵام دەرکەوتنی مارشاڵ و محەمەدی دڵشوشە منی پیرکرد.

من بە ویقار و دڵنیاییەکی زۆرەوە چوومە بەردەمیان، دەستمکرد بە حکایەتێکی درۆ دەربارەی ژیانی جارانی خۆم، باسم لەماڵێکی خانەدان کرد کە منیان گەورەکردووە، باسم لە کچێکی زۆر جوانکرد حەزی لێکردووم و دەیەوێت بیهێنم، باسم لە کۆمەڵێک پارەی دانراو کرد کە کردوومە بە دۆلار و لای هاورێیەکم هەڵمگرتوون، باسم لەوە کرد نیازموایە دوکانێکی کەمالیات بکەمەوە، هەتا لە شوێنیکیشدا گووتم «لەوانەیە سەفەرێکی خاریج بکەم و بێمەوە... حیزب دەمنێرێت». لەگەرمەی درۆکردندا بووم محەمەدی دڵشوشە، سەیریکردم و بە ناسکی هاورێیەکەوە گووتی «سەریاسی سوبحەدەم تۆ درۆ دەکەیت». کە وایگووت وەستام و سەیرێکی هەردووکیانم کرد و دەستمکرد بە گریان و گووتم «ئا درۆدەکەم... درۆدەکەم... خۆ عەیب نییە ئینسان درۆبکات». ئەوە ئەو ساتە بوو کە دەبایە هەموو ژیانی خۆمیان بۆ ئاشکرابکەم... هەموو شتێک. بەڵام ئەو رۆژە بۆنەوەی ئارامبکەنەوە، پێیانگووتم «نا، سەریاسی بچکۆلە حیکایەتی ژیانی خۆت هەڵگرە بۆ ژێر دواهەمین هەناری دنیا... چیرۆکەکان لە ژێر ئەو درەختەدا تامێکی تریان هەیە». ئاوها بوو لە یەکێک لە سەیرانەکانماندا بۆ بن ئەو درەختە هەموو شتێکی خۆم بۆ گێڕانەوە. موزەفەری سوبحەدەم، تا ئەمرۆ دڵنیانیم ئایا ئەوە سیحری محەمەدی دڵشوشە بوو کە دەبایە هەموو کەس نهێنییەکانی خۆی پێبڵێت، یان ئەفسونی دواهەمین هەنار بوو، زمانی پژانم و کارێکیکرد ژیانی خۆمم بە هەموو پیسییەکانییەوە خستەبەردەستیان و بەهەموو ساتەکانییەوە بۆمگێڕانەوە؟.

## کاسێتی سێیەم

من لەو شوێنەوە لە بیرمە کە لە گوندێکدا بووم... گوندێکی بچوک... بچوک... بچوک... من ڕقم لە لادێیە، هەتا خۆشترین لادێی دونیا لای من جەهەنەمە. سەرياسی مەزنیش وابوو، ئەویش زۆر کەیفی بە لادێ نەدەهات، کە لە ڕۆژنامەکاندا باسیان لە گێڕانەوەی خەڵک بۆ لادێ ڕوخاوەکان دەکرد، ئەو توڕە دەبوو. ڕاستە من و ئەو لە لادێوە هاتبووین، بەڵام لە شاردا چاومان کردبووەوە، لە شاردا باڵقبووین، هەردووکمان لەبەر دەرکی سینەما و دوکانی فیدیۆ و و مەزاتخانە و لەنزیک عەرەبانەی شووتیفرۆش و هەنارفرۆشەکانەوە گەورەبووین.

من لەو شوێنەوە لە بیرمە کە لە گوندێکدا بووم. لەو شوێنەوەی منداڵ بووم، لەوانەیە تەمەنم شەش یان حەوت ساڵ بووبێت کە ڕۆژێک هەموو گوندەکەیان چۆڵکرد، من بۆردومانی تەیارە و پێوەبوونی بەرغەل و کوژرانی دوو کچم لە کانی ژناندا لەبیرە... دیارە هەزار ترۆهاتی تریش هەیە من لە بیرمنین و نامەوێت بۆت باسبکەم... من ڕقم لە گێڕانەوەی ژیانی خۆمە... من لەو جێگایەوە بۆتباسدەکەم لە گوندێکی بچوکدا بووم، ڕۆژێک هەموو ئەو گوندە چۆڵیکرد... لەبەرئەوەی جەیش و جاش و هەموو ترۆهاتەکانی تر هێرشیان هێنا... لەبیرمە کە هەموو گوند چۆڵیکرد. مەلا هەباسێک و خەرامان خانێک، کە دەبێت دایک و بابم بووبێتن لەو ڕۆژەدا دەکوژرێن، یەعنی وا بڕیارە ئەوان منیان بە خێوکردبێت و من پێمگووتبن بابە و دایە و هەموو شتەکانی تر کە باش لە بیرم نەماون. وا بڕیارە خەرامان خان پێش ئەوەی بکوژرێت بە هەموو کەسی گووتبێت «بەقوربانت بم، ئەوە منداڵی خۆمان نییە، ئەوە کوڕە شەهیدە ئێمە بەخێویدەکەین... بۆ کوردە بەساقەت بم... بۆ کوردە ئاگرتێبەربووەکەیە». وا بڕیارە مەلا

هەباس لەگەڵمدا زۆر خراپ بووبێت، بە شوڵک و هەموو ئەو شتانەی تر لێیدابم... دیارە دەڵێن من زۆر هاربووم... بەڵام من هیچ شتێکم بەتەواوی لە بیرنییە. نە هارییەکانی خۆم و نە شتەکانی تریش.

لەو شوێنەوە لە بیرمە لە گوندێکی بچوکدا بووم، هێند بچوک بەقەد ڕیقنەی کۆترێک. لەو کاتەوە لە بیرمە کە هەموو ئەو گوندە چۆڵیدەکات و من بەتەنیا لە ناو دێدا دەمێنمەوە، وەک دەڵێن گەر بهاتبایە و من لەگەڵ ئەوانی تردا گوندم چۆڵبکردایە دەکوژرام، چونکە خەرامانخان و مەلا هەباس کە من بەجێدەهێڵن تۆپێک دەیانکات بە قاورمە، یەعنی بەسەر شاخێکدا سەردەکەون، لەوێ ڕەسەدی دوژمن دەیانبینێ... ئیدی لەوێوە تۆپەکان دوایاندەکەون، ئەوان دەڕۆن و بووم تۆپێک دەدات بە شوێنی پێشوویاندا.

دەڕۆن و بووم، دەڕۆن و بووم، دەڕۆن و بووم، دەڕۆن و بووم... تا بووم، بووم، بووم و ئیتر نارۆن.

وابزیارە یەکەمین دایک و باوکی ڕاستەقینەی من بەوجۆرە مردبێتن.

من لەو جێگایەوە لە بیرمە کە جاشەکان دێنە ناو گوندەکەوە و جگە لە منداڵێکی چڵمن بە هەنارێکی شوشەوە کە ناوی سەریاسی سوبحەدەمە کەسی تر نادۆزنەوە، لەو جێگایەوە لەبیرمە کە جاشەکان نەوتیان دەکرد بە گوندەکەدا، من بە خۆشییەوە سەیری ئاگرەکەم دەکرد و یارمەتیمدەدان. ئێستا باش لە بیرم نییە، بەڵام وا دێتە خەیاڵم ئەو ساتانە خۆشترین ساتەکانی منداڵیم بووبێتن. وامەزانە من لە منداڵییەوە ڕقم لە نیشتیمان بووە... یان وەک مارشاڵ دەیگووت «وەحشیترین منداڵی دونیا» بووم... نا... من خۆشحاڵبووم بە سووتانی ئەو گوندە لەبەرئەوەی هەموو شتێکم وەک یاری سەیردەکرد.

من جاشێک ڕزگاریکردم ناوی «کەیخوسرەو ئاغای سوفیان ئاغای سەدری ئەرحەمی» بوو، نازانم کە بانگیاندەکرد بەردەوام بە هەر سێ ناوەکەیەوە بانگیاندەکرد، لای ئەو فێری چوار شتی گرنگ بووم، جاشایەتی، چەتەێتی، پێشمەرگایەتی، خوێندەواری. کۆمەڵێک ژن و کۆمەڵێک کچی جوانی هەبوو، بەڵام کوڕی نەبوو. هەرگیز منی وەک کوڕی خۆی تەماشا نەدەکرد، دیارە دەیتوانی من بکات بە کوڕی خۆی، هەویەم بۆدەرکات، شتێکم لەسەر تاپۆبکات و هەموو شتە بێماناکانی تریش، بەڵام نەیکرد... تاکە شتێک لە مندا بەدڵی بوو ناوەکەم بوو. هەندێجار کە بەتەنیا بووینایە بیریدەکردەوەو دەیگووت «سەریاسی سوبحدەم.... سەریاسی سوبحدەم... سەریاسی سوبحدەم... دەبێت ئەم ناوە مانای چی بێت؟» پێموایە دڵی نەدەهات ئەو ناوەم لێبکاتەوە، دەیزانی گەر بمکات بە کوڕی خۆی دەبێت ناوەکەم بکات بە «سەریاسی کەیخوسرەو ئاغای سەدری ئەرحەمی»، ئەوەشی بە زوڵمێکی گەورە دەزانی. کە پێکەوە بووینایە دەیگووت «سەریاسی سوبحدەم... پەح کە ناوێکی جوانە».

ڕەنگە من بچوکترین جاشی وڵاتی خۆمان بووبێتم. یەکەمین وێنەی ژیانم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتە لەگەڵ کۆمەڵێک جاشی تردا ڕۆژێکی ڕەشەبا لەسەر لووتکەیەکی بەرز گرتوومە. ئەوکات تەمەنم نۆ ساڵە، بە خۆم و بڕنەوێکی سێ جار لە خۆم درێژترەوە، لە نزیک سەنگەرێکەوە وێنەیەکی دیکتاتۆرمان پێیە و پەنجەمان وەک نیشانەی سەرکەوتن بەرزکردۆتەوە. سەیرترین یادگاری ژیانم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ هەموو ماڵە جاشەکاندا بردیانین بۆ لای دیکتاتۆر، کەیخوسرەو ئاغا بەدرێژایی ڕێگا قسەی لەسەر گەورەیی ئەو ڕۆژە بۆ کچ و ژنەکانی و کۆمەڵێک خەڵکی تروهاتی تر دەکرد، دوای ئەوەی دەجار قوونیان پشکنین، بردیانینە هۆڵێکەوە کە پێیاندەگووت هۆڵی دیدارەکانی سەرۆک... کە خۆی هات، هەمووان هەستان و دەبایە نیوسەعات چەپڵە و تڕوهات و شتی تری وا

لێبدەین. من چەپڵەم لێنەدا. کەیخوسرەو ئاغا کە ڕەفتارە سەیرەکەی من شڵەژاندبووی، بەردەوام لەناو هەلهەلە و چەپڵە و هوتافەکاندا دەیگووت «سەریاسی سوبحدەم... چەپڵە لێبدە... کوڕی حیز چەپڵە لێبدە». من قەت چەپڵەم لێنەدا. دەبوایە هەمووان بە ڕیز دەستی ماچبکەین، کە هاتە سەرەی منەوە، وەک بچوکترین جاشی وڵات منیان بەسەرۆک ناساند. ئەو پێدەچوو زۆر خۆشحاڵ بێت کە شەرەفی ئەوەی پێبڕاوە بچوکترین جاشی مەملەکەتەکەی خۆی ببینێت. من دەبوایە دەستی ماچبکەم و ئەو شتانە، بەڵام وەستام و هیچم نەکرد. بەزۆر منیان بردە بەردەمی، ئەو منی خستە نابەینی هەردوو ڕانی خۆیەوە، ئەو کات سەرم لە ئاستی هەردوو گوونی سەرۆکدا بوو، ناوگەڵی سەرۆک بۆنێکی پیسی لێدەهات. من سەرم بەرزکردەوە و بە کوردییەک کەس لە حمایەکان تێینەگەیشتن، گووتم «سەرۆک تۆ قوونت ناشۆیت»، کەس لە تەواوی قسەکەم تێنەگەیشت، کەیخوسرەو ئاغا نەبێت کە دەمودەست لەویادا بورایەوە... من کە کەیخوسرەو ئاغام بینی کەوت دەستمکرد بە گریان، نازانم بۆ دەستمکرد بە گریان، بەڵام شتێک وایلێکردم حەزبکەم بگریم. مەحشەرێک بوو مەپرسە، ڕۆژنامەکانی دەوڵەت دواتر بورانەوەی کەیخوسرەو ئاغایان وا تەفسیرکردبوو کە لە خۆشی ئەوەی منداڵەکەی خۆی لە ناوگەڵی سەرۆکدا بینیوەتەوە، لەهۆش خۆی چووە. ئەو وێنەیەی من دواتر بوو بە وێنەیەکی بەناوبانگ، بەڵام ساڵ بە ساڵ دەموچاوی من گۆڕدرا، ساڵ بە ساڵ من لەداخی ئەو وێنەیە بڕیارمدا دەموچاوێکی تر بۆ خۆم دروستبکەم، تا ڕۆژێک هەموو دونیا ئەو وێنەیەی منی لە ناو گەڵی سەرۆکدا بیرچووەوە، وێنەیەکی سەیرە لە سەر تەختێک، لە نزیک دوو بازنە گوڵی گەورەوە، سەرۆک دەمیکردۆتەوە و پێدەکەنی و منیش دەممکردۆتەوە و دەگریم. کەیخوسرەو ئاغا هەرگیز لێم خۆشنەبوو. لەدوای ئەو ڕۆژەوە لە دانیشتن و پشووی ناو ژنان و کچانی خۆی مەحرومیکردم و ناردمی بۆ حەراسەت

لە ڕەبییە دوورەکاندا. لەو سێ ساڵەدا وەک بچوکترین جاشی وڵات توانا و بەهرە و سەلیقەی خۆم تاقیکردەوە، دیاربوو کەیخوسرەو ئاغا تف لەو ڕۆژەدەکات منی تیا هەڵگرتۆتەوە، بەردەوام لەشەڕە قورسەکاندا منیان دەخستە پێشی پێشەوە بۆ ئەوەی بکوژرێم، بەڵام وەک ئەوەی هەموو شەیتانەکان دەستیان بەباڵمەوە گرتبێت، نەدەکوژرام... بێئەوەی بترسم دەچوومە هەموو شوێنە خەتەرەکان، لە شەڕە قورسەکاندا لە پێشی هەمووانەوە پەلامارمدەدا، جاشەکانی تر ناویاننابووم «سەلکە زوڕنا». لە دوو شەڕدا سەرتاپای هێزەکانمان تەفروتونابوون من نەبێت بە خۆم و بڕنەوە درێژەکەمەوە گەڕامەوە و خەبەری کوژرانی برایەکی کەیخوسرەو ئاغا و مامێکی و دوو ئامۆزایم بۆ هێنایەوە. هێزێک لە ئاسمانەوە نەیدەهێشت من بکوژرێم. جارێک مینێک لە ژێر قاچمدا تەقییەوە و هیچم لێنەهات، جارێکیش هاوەنێکی پێشمەرگە کەوتە ناو ڕەبییەکەمانەوە هەموو جاشەکانی تر کوژران، من نەبێت لە ناو دوکەڵ و باروتی تەقینەوەکەدا وەک شێر بازمدا و هاتمەدەرێ... من یەکێک بووم لە ئازاترین جاشەکانی نیشتیمان. کە پێشمەرگە تێکشکان و فەوجەکەمان بچوککرایەوە کەیخوسرەو ئاغا خێزانێکی ئەوەندە گەورەی بۆ خۆی دروستکردبوو بە خێونەدەکرا. کەس بەتەواوی ژمارەی ژن و کچەکانی نەدەزانی، پارەیەکی بێشوماری دەویست کە بە جاشایەتی تەواو نەدەبوو. لەو ڕۆژانەدا من و کۆمەڵێک لە پیاوەکانی تری بووینە چەتە. ئەو سەردەمە هەر چییەکیان پێبگوتبامایە بە خۆشییەوە دەمکرد. لەو سەردەمانەدا یەکەمین کەسم کوشت، دیارە نازانم گەر لە شەڕەکانی پێشوودا کەس بە گوللەی بڕنەوەکەی من کوژرابێت یاخود نا، بەڵام یەکەم کەس کە لە نزیکەوە و ڕووبەڕوو کوشتبێتم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژانە. من و دەیان چەکداری دیکەی کەیخوسرەو ئاغا لە هەموو کون وکەلەبرێکی نیشتیماندا بۆسەمان دادەنا، قافڵەی قاچاغچییەکانمان تاڵاندەکرد، ڕێبوارەکانمان ڕووتدەکردەوە، ترومبێلمان

دەوەستان و موسافیرەکانمان ڕووت و قووتدەکردەوەو بەرەڵاماندەکردن. یەکەم کەس کوشتم بازرگانێکی ئاڵتون بوو، شەوێکی تاریک بە تەنیا بە خۆی و سێ کێلۆ خۆڵەوە لە مارسیدسێکی سپییدا بەرەو سنوور دەڕۆی. ئاڵتونەکەی لە شوێنێکی تایبەتی ژێر کوشنەکەدا شاردبووەوە. ئەوکات مامۆستا «خەلیل هورمز» لەگەڵماندا چەتە بوو، خۆشەویسترین کەسێک بوو تا ئەو کات بینیبێتم، زۆر حەزی لە پارە بوو، بەڵام زۆر پیاوێکی بەڕێز و بەویقاربوو، ئەو دڵنیابوو کە ئەو پیاوە خۆڵی ئاڵتونی پێیە. کەسمان خەیاڵمان بۆ ئەوە نەدەچوو کە لە ژێر کوشنەکەدا بێت، کە مامۆستا خەلیل هورمز دەستی برد بۆ ژێر کوشنەکان، بازرگانەکە لەدواوە پەلاماریدا، خەریک بوو دەمانچەکە لە مامۆستا خەلیل هورمز بستێنێت. من لە ترساندا تەقەم لێکرد، بە جۆرێک تەقەم لێکرد وەخت بوو مامۆستا خەلیل هورمزیش بکوژم، کە بە ئاگاهاتمەوە و چاومکردەوە بازرگانەکە بە جووتێک چاوی سەرسامەوە سەری خستبووە سەر شانی مامۆستا خەلیل و خوێنی دەهێنایەوە. مامۆستا خەلیل هورمز بۆئەوەی هەست بە ترس و پەشیمانی نەکەم گووتی «زۆر باشتکرد کوشتت، کوڕی حیزە بەشی خۆی ژیاوە». من زۆرم پێخۆشبوو کە مامۆستا هورمز ئافەرینیکردم... شەوانی دواتر لە خۆشی و لە ترسدا خەوم لێنەدەکەوت، ئەو ڕۆژە کە مامۆستا هورمزم ڕزگارکرد، ئەو گووتی «هەقت بۆدەکەمەوە... شتێکت فێردەکەم، هەموو ژیانت سوودی لێببینیت» ئەو فێری خوێندەواری کردم. لەو شەوە بەدواوە بە درێژایی ڕۆژ فێری نوسین و خوێندنەوەی دەکردم، کە ڕاپەڕین ڕوویدا من تەواو فێری خوێندەواری بووبووم، بەڵام فێری ژیانێکی سەیریش بووبووم کە دواتر بەزەحمەت وازملێهێنا، ژیانی چەتەیەک لەسەر شەقامەکان دەوەستێت و چاوەڕوانی نێچیر دەکات. لە دوای ڕاپەڕینەوە هەموو شتەکان بە خێرایی گۆڕان، کەیخوسرەو ئاغا بە خێراییەکی سەیر بوو بە پێشمەرگە، بەپەلە هەموو ئەو ڕەسمانەی سووتان کە لەگەڵ

سەرۆکدا گرتبوومان و ڕەسمی تری لەگەڵ سەرۆکە تازەکاندا هەڵواسی... سەرۆکە تازەکان لە داوەت و خواردن و گەڕان و سەیران و خواردنەوە بێزارنەدەبوون، تاقمێکی مەشرەب خۆشبوون، کە زۆر حەزیان لە گۆرانی و سەفا و ئافرەت و پێکەنین بوو. هەرگیز لەوە نەدەچوون لە شەڕێکی دوور و درێژ هاتبێتنەوە، بەڵکو لەوە دەچوو لە شاییەکەوە گەڕابێتنەوە و خۆیان بۆ شاییەکی تر ئامادەبکەن. کە دواتر بووم بە پێشمەرگەیەکی چالاک و لە شەڕی ناوخۆدا بەشداریمکرد، بەو ڕووخۆشییەی سەرکردە و مەسئولەکان سەرسامبووم. شتێک لە ژیانی ئەواندا هەبوو لە ژیانی ئێمەدا نەبوو، ئەویش سەفای بەردەوام بوو، کە دەچووین بۆ شەڕ ئەوان نوکتەیان دەگێڕایەوە، کە دەگەڕاینەوە نوکتەیان دەگێڕایەوە، کە دەچوون بۆ تەعزێ لە نابەینی سورەتەکاندا بەچرپە چرپ نوکتەیان بۆ یەکتر دەکرد. لە سەنگەرەکاندا بە بێتەل نوکتەیان بۆ یەکتر دەگواستەوە، کە لە کاتی شەڕدا لیژنەی ئاشتییان دروستدەکرد لە پێشدا بە تازەترین نوکتە دانیشتنەکانیان دەکردەوە... شتێک وای لە من کرد تێبگەم هەموو شتەکان تروهات و بێمانان. بەڵام من دواجار تێگەیشتم مرۆڤ بۆئەوەی بتوانێت شەڕبکات دەبێت زۆر پێبکەنێت.

ئێوارەیەکیان چووم بۆ لای کەیخوسرەو ئاغای سەدری ئەرحەمی دەستیم ماچکردو گووتم «بەڕێز هاتووم سوپاستانبکەم، تۆ چەند ساڵە من بە خێودەکەیت، من بارێکی قورس بووم لە سەر شانی ئێوە... ئێستا گەورەبووم و دەڕۆم خۆم خۆم بەخێودەکەم...». نازانم بۆ وامکرد، بەڵام هەستدەکەم ئەو هەموو نوکتانەی لەو دیوەخانەدا گوێم لێبوو کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو، ئەو کات دەمێک بوو دەمزانی من پیاوێکی غەمگینم لێدەردەچێت کە حەزی بە لایەنە تاریکەکەی ژیانە... شتێک لە خوێنمدا بوو وایدەکرد حەزم لە گریان بێت. چیتر تەحەمولی ئەو هەموو نوکتەیەم نەدەکرد کە لە دیوەخانەکەی کەیخوسرەو ئاغای کوڕی سوفیان ئاغادا

گوێم لێدەبوو. کاتێک لەو ماڵە هاتمەدەرێ زۆر خۆشحاڵ و ئاسوودە بووم، هەستم بە ئازادییەکی گەورەدەکرد، کە لە ماڵی ئەو ئاغایە هاتمەدەرێ هەرگیز نەچوومەوە، لەماوەی چەتەیەتیدا پارەیەکی کەمم کۆکردبووەوە کە بە خێرایی لە ناو بازاڕ و لە سینەما و دوکانی فیدیۆ و چێشتخانەکاندا خەرجمکرد. کە ئێوارەیەکیان خۆم لە هێزی پێشمەرگەدا ناونوسکردەوە، بەشی لەفەیەکی چکۆلانە پارەم پێمابوو، لە جێگایەک دوا لەفەم خوارد و گەڕامەوە بۆ پێشمەرگایەتی و حەراسەتی دوور و درێژ لە ناو باران و بەفرو ڕەشەبا و تاریکیدا. تاکە هاوڕێیەکی ڕاستەقینەم لەو کاتەدا خەلیل هورمز بوو کە یەکەم کەس بوو لە گۆڕینەوەی پارەدا دەستی خۆی وەشاند و دوکانێکی تایبەتی لە ناوەڕاستی بازاڕدا کردەوە و بوو بە دەوڵەمەندێکی گەورە. وەک خۆی بە پێکەنینەوە دەیگووت «ئێواران کە بۆرسە داخرا... وەرە و دەرسی خۆمان دەخوێنین». ئەوکات من هەر ڕۆژێک پشووم هەبایە درێژەم بەوانەکانی خوێندن و خوێندنەوە دەدا. کە سەرپاسی یەکەم و محەمەدی دڵشوشە دەرکەوتن، من لە کۆمەڵێک ئازاری ڕۆحی و دەرونی قووڵدا دەژیام. لە ڕاستیدا شتێکم نەبوو بۆی بژیم. بیرم لە خۆکوشتن و تڕوهاتسی تر زۆر دەکردەوە. کە ئەوان دەرکەوتن شتێکی تەواو نوێ هاتە ژیانمەوە، یەکەم دانیشتنی ڕاستەقینەم لەگەڵیاندا دەرگای دونیایەکی تری لێکردمەوە، لە چایخانەیەکی بچوکدا نزیک سینەماکان یەکترمان بینی، پێشتر دووجار لەگەڵ محەمەدی دڵشوشەدا بەتەلەفون قسەمکردبوو. ئەو ئێوارەیە کە چووم بۆ ئەو چایخانە چکۆلانەیە تەنیا بیرم لەوە نەدەکردەوە خۆم بناسم، بەڵکو بیرم لەوە دەکردەوە ئەو دوو مرۆڤە سەیرە بناسم کە چیرۆکێکی تریان دەربارەی ژیان و تڕوهاتەکانی ڕابوردووی من پێبوو. بەرلەوەی هیچ بڵێین محەمەدی دڵشوشە گووتی «گرنگ ئەوەیە هەنارە شوشەکان نەفەوتێت... هیچ شتێک وەک هەنارە شوشەکان گرنگ نییە». هیچیان دەربارەی من نەدەزانی، من هەرگیز

ئارەزووی ئەوەم نەبووە بەدوای نهێنی و تروهات و شتی وادا بگەڕێم، خۆشییەکم لە ناسینی خەڵکدا نەدەبینی، مرۆڤ لای من شتێک نەبوو باوەڕی پێبکەیت. من گومانی خراپم لە هەموو کەسێک هەبوو... تائەمڕۆش وام، تادەمرم گومانی خراپم لە هەموو کەسێک هەیە. باوەڕم بەو قسانە نییە تۆ لەو کاسێتانەدا دەیکەیت، گوایە مرۆڤ جوانە و ئینسان باشە و قسەی سەیروسەمەرەی تر. من تەنیا باوەڕم بەوانە هەبوو کە مردن.

لەیەکەم ئێوارەوە ناوەکانمان بەشکرد، ئەومان ناونا «سەریاسی گەورە» و منیان ناونا سەریاسی بچکۆلە. من بە قەڵافەت و باڵا لەو گەورەتر بووم، دەموچاوێکی هێند مۆنم هەبوو پێدەچوو بەردەوام حەزم لەشەڕ و ئەو فەرتەنانەی تر بێت. کە ئەو ڕۆژە دەستمکرد بە گریان کەسیان باوەڕیانپێنەدەکرد، ئەم دەعبا مۆن و ڕوخسار گرژە ئاوا لە دڵەوە بگری. من ئەو ئێوارەیە دووجار گریام، جارێک کە هەستمکرد ژیانم ئەوەندە ناشیرینە ناتوانم ڕاستگۆیانە بیگێڕمەوە، جارێکی دیش کە سەریاسی گەورە باسی منداڵی خۆی کرد لەسەر مەرزەکان و لە ناو تەرسی هێستری قاچاغچییەکاندا، باسی ئەو ڕۆژە تروهاتانەی کرد کە لە مەیتەم ناچاربووە پیسایی منداڵە بچوکەکانی تر پاکبکاتەوە، قسەی لە شەوانی برسێتی کرد کاتێک نانی لە ماڵان داواکردوە. ئەو شەوە من دوو جار گریام. هەر دوو جارەکەش سەریاس ژێریدەکردمەوە.

گەر ئەو ئێوارەیە دووجار نەگریابامەیە لەوانەبوو منیان ناونەنابایە سەریاسی چکۆلانە یان سەرگزگل. هەردووکیان دەیانزانی من بەتەواوەتی گەورەنەبووم. پێدەچوو هەموومان یەک تەمەنمان هەبێت، بەڵام من گەورەنەبووبووم... ئەوان ویستیان گەورەمبکەن و ببم بە مرۆڤێکی مەزن، بەڵام نەیانتوانی.

تادەمرم ئەو ڕۆژەم بیرناچێتەوە کە دواهەمین هەناری دونیام تیا بینی. ئەو کات کە من بینیم ئەوان مێژوویەکی درێژیان لەگەڵ ئەو درەختەدا

هەبوو، چەندەها شەو لە ژێریدا خەوتبوون... شتێک هەمیشە بەرەو ئەو درەختەی ڕادەکێشان. ناتوانم وەسفی دواهەمین هەناری دونیات بۆبکەم، درەختێکی سەیربوو، تەنیا درەختی هاوڕێتی و ئاسوودەیی ئێمە نەبوو، بەڵکو درەختی بینین و خەونەکانیش بوو. نەدیمی شازادە لەویادا ئیلهامی سەفەرە دووروودرێژەکانی خۆی بۆ دەهات، محەمەدی دڵشوشە لەویادا لەهەندێ نهێنی تێدەگەیشت، سەریاسی گەورە لەویادا بیری لە شتەکان دەکردەوە، ئەو لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا پاڵدەکەوت و دەیگووت «بیر لە خۆم و شتەکان دەکەمەوە». کەسمان نەماندەزانی «شتەکان» چین؟. کە لە ترۆپکی هەنار دەگەڕاینەوە، سەریاس بەردەوام پێدەکەنی و قسەیدەکرد، زۆر لە قسەکانی وەک نەخشی بەرد وابوون... موزەفەری سوبحەدەم ئێستا بیردەکەمەوە و تێدەگەم تۆ بەرلەوەی بگەڕێیتەوە ئەو لە ژێر دواهەمین هەناری دونیاوە دەیبینێت. ئێوارەیەکیان من و ئەو پێکەوە سەرسامانە سەیری ئاسمانمان دەکرد، گووتی «ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێک لە سەحراوە دێت... لە سەحرایەکی زۆر زۆر دوورەوە... پیاوێکی بێکەسە، نازانێت چی بکات و بچێت بۆ کوێ... باوەش بە ئێمەدا دەکات و دەڵێت من باوکی ئێوەم... باوکی هەمووتانم». نەدیمی شازادە ئەو کوێرەی ترۆهاتی دونیای نەبینیبوو، دەیگووت «لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا... قسە قسەی من و تۆ نییە... قسەی مرۆڤ نییە... قسەی خودایە». ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە خودا لە ڕوخساری باوکیدا دەردەکەوێت و ئیلهامی بۆ دێنێت و پێیدەڵێت «وابکە و وامەکە». هەر سێکیان چاوەڕوانی ئەوەبوون لە بن ئەو دارەدا پەیامێک و ئیلهامێکی گرنگیان بۆ بێتەخوارەوە ژیانیان بگۆڕێت، بەڵام ئیلهامەکان هەر بەقەد ڕووبەری ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بوو. لە ژێر ئەو درەختەدا سەریاس بڕیاریدابوو «سینەی کەژاڵ» بکڕێت. ئاه... بوەستە موزەفەر دەزانیت «سینەی کەژاڵ» چییە؟ عەرەبانە چکۆلە دەستییەکەی خۆیەتی کە بەبازاڕدا دەیگێڕا. لەویادا بڕیاری دروستکردنی

«ئەنجومەنـی عەرەبانەکانـی» دابـوو، لەویـادا بڕیـاری جەنگـی دابـوو لـە پێنـاوی هەمـوو دەسـتگێڕە بچـوک و منداڵـە بێبەشـەکانی بـازاڕدا، بڕیـاری دابـوو سیاسـەت نـەکات و لـە شـەڕی ناوخـۆدا دوژمنـی هەمـوو لایـەک بێـت، ئـەو تکانامەیـەی داڕشـتبوو بـۆ دەسـتگێڕەکان کـە لـە ڕۆژە سـەختەکاندا نـرخ زۆر زیادنەکـەن، ئـەو ئامۆژگارییانـەی بـۆ دەسـتگێڕەکان نوسـیبوو کـە ئەگـەر بازرگانـە گـەورەکان نرخیـان بەرزکـردەوە مانیـان لێبگـرن و شـت نەکـڕن، وەحـی دابـووە شیرفرۆشـەکان لەهـەر پەنجا قوتوویـەک شـیر، قوتوویـەک بـۆ منداڵـە ئـاوارەکان جیابکەنـەوە. ئـەو دەغیلەیـەی دامەزراندبـوو بـۆ کۆمەکـی ئـەو دەسـتگێڕانەی تووشـی زەرەری کوتوپـڕ و گـەورە دەبـوون، خەیاڵـی ئـەوە کەوتبـووە سـەرییەوە سـەندیکایەکی منداڵانـی دەسـتگێڕ دروسـتبکات، بیـری لـە دروسـتکردنی قوتابخانەیەکـی شـەو کردبـووەوە بـۆ ئەوانـەی لـە بـەر نـەداری لـە قوتابخانـەی ڕۆژ نەیاندەخوێنـد، ئـاه... چوزانـم... چوزانم، لەویادا ئیلهامی ئـەو شـتانە و هـەزار شـتی تریشـی بـۆ هاتبـوو کـە بـە منـی دەگـووت «سـەرگزگل تـۆ بـە ئاسـانی تێیانناگەیـت».

هەمیشـە پێکـەوە دەچووین بـۆ بـن دواهەمیـن هەنـاری دونیـا، بـۆ مـردن نەبێـت نەدەبایـە کـەس بـە تەنیـا بچێتـە بـن ئـەو درەختـە. نەدیمـی شـازادە لەبـەر کوێـری و سـەختی چیاکـە نەیدەتوانـی بەتەنیـا بێـت، ئەوانـی تریـش وا ڕێکەوتبـوون هەرگیـز بەتەنیـا نەیـەن، ئـەوە بەشـێک بـوو لـە حیکمەتـی پەیوەنـدی لەگـەڵ دواهەمیـن هەنـاری دونیـادا کـە شـازادە دەیگـووت «درەختێکـی خوداییـە»، بەڵام مـن هێزمەدایـە خـۆم و دەمگـووت «درەختـی ئاواتەکانـی سـەر زەمینـە». کـە وامدەگـووت هەمـوو چەپڵەیـان بـۆ لێـدەدام، چونکـە مـن بەڕێکـەوت قسـەی جوانـم دەکـرد، یەعنـی قسـەیەک تڕوهـات نەبێـت.

نەدیمـی شـازادە لـەو بنـدارەدا خەونـی بـە باوکییـەوە دەبینـی، لەویـادا دەخـەوت و کـە هەڵدەسـتا چیرۆکـی درێـژی لەسـەر گەشـتەکانی باوکـی لـەو

دیو مردنەوە دەگێڕایەوە... لەوێوە هەڵدەستا و بە کوێری بەرەو خاک و مەملەکەتی سەیر سەیر دەڕۆی و پاشماوەیەک بەکۆمەڵێک قسە و حیکایەتی سەیرەوە دەگەڕایەوە، باسی ئەو شارانەی دەکرد کە کەسمان نەماندەزانی ڕاستن یان درۆ، باسی گەشتی ئەفسانەیی دەکرد لە شاری عاجباتیدا، ناوی ئەو شارانەی پیاڕۆیشتووە هەموومانی سەرسامدەکرد «لاهور، زەنجبار، یەزد، کرمان، هیرات» دەیان شاری سەیرسەیری تر کە لە بیرم نەماون، لە هەموو شوێنێکی دونیادا بەدوای بینابیدا دەگەڕا... لەیەکێک لەو گەشتە دووردورێژانەیدا لە چیاکانی کوردستاندا، لە ناوچە شاخاوییە زۆرزۆر دوورەکان، لەو هەرێمانەدا کە زۆر لە ناوەوەن، لە گوندێکی چکۆلەی ناو چیاکاندا و لەسەر کانی و ئاوێکی چکۆلە «سەید جەلالی شەمس» دەناسێت کە بەشێکی گرنگی نهێنی «سەریاسەکانی» پێیە. ئاه، من دەزانم تۆ تا ئێستا بەتەواوی چیرۆکی سەریاسەکان نازانیت، من نامەوێت ئازارتبدەم، نامەوێت وێڵبیت و بکەویتە ئەو چیایانە، بەڵام سەریاسەکان لە من و سەریاسی گەورەدا کۆتاییان نایەت، ئەدیمی شازادە هەموو شتێک دەزانێت... هەمو شتێک... ئەو دەتوانێت بتبات بۆ لای سەی جەلالی شەمس، ئەو دەتوانێت یارمەتیتبدات.

ئا من ئەگەرچی زۆر لە ترووهاتی ژیانم بیرچۆتەوە، بەڵام هەرگیز دواهەمین هەناری دونیام بیرناچێتەوە.

ئەو ئێوارەیەی منیان برد بۆ ژێر ئەو درەختە ئێوارەیەکی بەهاریبوو، محەمەدی دڵشوشە و سەریاس داوەتیانکردین، ئەوان دەیانتوانی جوانترین میوە و باشترین گۆشتی بازاڕیان دەستکەوێت، زۆر شانازیان بەوەوە دەکرد کە باشترین قەسابی بازاڕ و چاکترین سەوزەفرۆشەکان دەناسن. هەردووکیان زۆر شانازییان بەو جۆرە ترووهاتانەوە دەکرد. من کە گەیشتمە سەر ئەو لووتکە سیحراوییە هەموو شتێکم لە بیرچووەوە، لەوێوە ئاسمان

و زەوی دیمەنێکی تریان هەبوو، جێگایەک بوو لە خەوەوە نزیک بوو نەک لە ڕاستی، دەزانی ئەوە یەعنی چی؟ یەعنی لەوێوە ئاسەواری جەنگ، ئاسەواری ناخۆشی، ئاسەواری پیری دیارنەبوو، لەوێوە تەنیا یەک شت دیاربوو، هێمنی، جوانی، ڕووناکی. ئێمە چاومان دەیبینی و بە هەستەکانمان ئەو هەموو جیاوازییەمان لە نێوان دونیای ئەو هەنارە و جێگاکانی تردا هەستپێدەکرد. بەڵام نەدیمی شازادە کە کوێرێکی مزمەعیل بوو، بە شێوەیەکی تر هەستی بەشتەکان دەکرد، لەبەرئەوە دەیگووت «درەختێکی خودایییە... خودایی». ئەو ئێوارەیە کە من دواهەمین هەناری دونیام بینی، ماوەیەکی درێژ قسەم بۆ نەکرا. من ڕۆژانی جاشایەتی و چەتەیەتی زۆر لە ناو شاخ و سروشت و پێدەشتی ئازاددا ژیابووم، بەڵام جوانی ئەو جێگایە شتێکی تربوو، شتێک قسەی لەگەڵ دەکردیت... لەقووڵایی ڕۆحتدا سەدایەک دروستدەبوو بەرەو جێگای تر بانگیدەکردیت. یەکەم ئێوارە دڵشوشە دەستیکردە ملم و گووتی «سوبحەمی چکۆلانە... دەزانی بۆ ئەم شوێنە بەوجۆرە مرۆڤ سەرسامدەکات؟». گووتم «نا... نازانم... باوەڕت بێت... نازانم... ئەوەندە دەزانم سەرسامم... من عەقڵم وەک تۆ ئیشناکات». دڵشوشە کەمێک تێدەفکری و سەری بەرزدەکردەوە و دەیگووت «لەبەرئەوەی مرۆڤ لێرەدا هەستدەکات، ژیان دەکرێت جۆرێکی تر بێت. دواهەمین هەنار ئەو درەختەیە کە پێمدەڵێت ژیان دەکرێت جۆرێکی تر بێت، دەکرێت لە دونیایەکی ڕووناک و ساف و بێگەردا بژین... ئەم درەختە شتێکە ئیلهاممان دەداتێ، ئیلهام و هیچی تر». هەڵدەستایە سەرپێ و وەک بانگ لەیەکێکی دووربکات دەیگووت «ئیلهام... ئیلهام... ئیلهام». بە ئەسپایی لە شوێنی خۆی دادەنیشتەوەوە دەیگووت «من، من ئەم درەختەم دروستکرد... من یەکەمجار بەم هاوڕێیانەم گووت ئێمە پێویستیمان بە درەختێک هەیە، درەختی خۆمان بێت... درەختی برایەتییمان بێت». ئەو ئێوارەیە سەریاسی مەزن لە بن درەختەکەدا

خەریکی تەماتە قاشکردن و جاجک دروستکردن و پل پلکردنی گۆشتەکەبوو. زووزوو قسەکانی پێدەبڕین و گۆشتەکەی بەرزدەکردەوە و دەیگووت «سەیری نەرمەیەکی چەند جوانە». نەدیم کە هەر بە «کوێرەی مەلعون» بانگماندەکرد، ئاگای لە هەموو قسەکانمان بوو. ئەو بەدەنگی بەرز گووتی «ئەوە درەختی منە، درەختی باوکمە، درەختی نەسیمی شازادەیە کە باپیری لە کۆشکی پەهلەوییەکاندا پاڵەوانی زۆرخانە بووە... شاهەنشای ئێران نازناوی شازادەی داوەتێ، ئەم نازناوە بە منەوەیە دیاری شاهەنشای ئێرانە، ئەو ئەم ناوەی داوە بە خێزانەکەمان... دەڵێن لەو ڕۆژەوە کە ئەو نازناوەمان وەرگرتووە، زەرعاتمان نەهاتۆتە وشکی، حەیوانمان سێ قاتی حەیوانی تر شیریداوە...». من قسەکانیم پێدەبڕی، دەبایە بەردەوام قسەی پێببڕیت، چونکە ئەگەر پێتنەبڕیبایە تا دەخەوت قسەیدەکرد. من دەمگووت «کوێرەی مەلعون... تاقەتم نییە گوێ لە تڕوهاتی تۆ بگرم. من تەنیا بە قسەی ئەم کوڕە دڵمدەکرێتەوە...».
نەدیمی شازادە کوێرێکی بێشەرم بوو، لەبیرمنایە لە کەسێک زویربووبێت، وەک محەمەدی دڵشوشە نەبوو کە نازکی دڵی منی وێراندەکرد، منی دەکوشت. ئەو ئێوارەیە محەمەدی دڵشوشە دەستیکردە ملی نەدیمی شازادە و گووتی «نەدیم ڕاستدەکات، ئەمە درەختی شازادەکانە... بەڵام ئەمە بەتەنیا درەختی تۆ نییە، ئەمە دەبێت درەختی هەموومان بێت، چونکە کاتێک باوکێک لە باوکەکان درەختێک دەڕوێنێت بە تەنیا بۆ کوڕەکەی خۆی ناڕوێنێت، باوکی ڕاستەقینە بۆ هەموو کوڕەکانی دونیا شت دەچێنێت... بۆ هەموو ئەوانەی لە دوای خۆی دێن... نەسیمی شازادەش زانیویێتی تۆ بەتەنیا ناگەیتە ئەم لووتکەیە، دەبێت یەکێکی تر دەستت بگرێت، زانیویێتی ئەوەی لەگەڵ تۆشدا دێت، ئاواتێکی لە دڵدایە، حەزی لە شتێکە و مرادێکی هەیە... کە ئەو هاتۆتە ئەم جێگایە تێگەیشتووە لێرەوە ئینسان باشتر دەتوانێت بیربکاتەوە و خەو بە

شتێکی باشترەوە ببینێت، تا وامەزانە من زۆر بیرم لەو ساتە نەکردۆتەوە کە نەسیمی شازادە بەم شاخەدا سەرکەوتووە و ئەم درەختەی لێرەدا چاندووە، من شەوەهای شەو بیرم لێکردۆتەوە. دەزانم نەسیمی شازادە ئەو دەستگرتنەی بەلاوە گرنگ بووە، ئەوەی بە لاوە گرنگ بووە کە «نەدیم» بەتەنیا ناگاتە سەر ئەم شاخە، واتە دەبێت یەکێکی تر دەستیبگرێت، هەر یەکێکیش کە لە خۆی بوورد و تا سەر ئەم لووتکەیە دەستی نەدیمی بەرنەدا، ئیدی دەبێتە برای، دەبێت هەموو جارێک دەستیبگرێت، دەبێت ئەویش و نەدیمیش لە برایەتییەکی گەورەدا بن تا بتوانێت هەموو جارێک دەستی هاوڕێ کوێرەکەی بەرنەدا... تێدەگەیت... ئەوەی لای نەسیمی شازادە گرنگ بووە ئەو یەکتر بەرنەدانە بووە... بۆیە ئەم درەختەی لێرەدا چاندووە تا دەستی یەک بگرین و ڕێگاکان بۆیەکتر ئاسانبکەین... نەسیم ئەم درەختەی بۆ هەموومان چاندووە... منت مردبێ و تۆم نەمردبێت... بۆیە پێیدەڵێم ئەم درەختە درەختی ئیلهامە، چونکە ئێمە هەر چوارمان لە سەردەمی کۆتایی برایەتیدا دەژین... لەسەردەمێکی وادا، ئەم درەختە ئیلهامی برایەتییەکی پاکی بە ئێمەدا». هەمیشە کە قسەی لەگەڵدا دەکردم، بەوجۆرە کۆتایی پێدەهێنا، بە چاوە قووڵ و غەمبارەکانییەوە دەیگووت «منت مردبێ و تۆم نەمردبێت».

ئەو ڕۆژەی کە ئێمە لە بن دواهەمین هەناری دونیادا بووین هێشتا شەڕی ناوخۆ دەستی پێنەکردبوو، بەڵام ئەو وەکو غەیب بخوێنێتەوە، دەیگووت «ئێستا سەردەمی کۆتایی برایەتییە... منت هەلاهەلابم و تۆم سەلامەت بیت... هەموو ئەم ئاشتی و شتانە درۆیە، ئێمە دەبێت بە ڕاستی ببین بەبرای یەک... ئەم درەختە بکەین بە شاهید، سوێندێک بخۆین کە تا دەمرین کۆمەکی یەکتر دەکەین، شەڕەکان لەیەکترمان جیاناکەنەوە... سوێندێک زەمین و زەمان یادی نەکات، ئەگینا سەردەمێک بەڕێوەیە براکان وەک سەگ دەکەونە گیانی یەکتر». ئەو خەیاڵی پەیمانێکی گەورە

کەوتبووە سەری، کە ناویدەنا «پەیمانی ئێمە». من سەرەتا نەمدەزانی پەیمانی ئێمە بەتەواوەتی چییە. ئەو شەوە هەر چوارمان پەیمانێکمان نوسی و بە خوێنی خۆمان مۆرمانکرد، کە هەتاهەتایە هاورێ و دۆست و برای هەمیشەیی یەکبین و هەتا دەمرین یارمەتی یەکتر بدەین، لە رۆژە ناخۆشەکاندا، لە جەنگ و لێقەومانەکاندا دەستی یەکبگرین. خودایە چەندە جوان باسی مردنی دەکرد، ئەو هەموو ساڵە من لەناو جەنگ و پیاوانی شەرکەردا ژیام و کەسم نەبینی لەو جوانتر باسی مردن بکات. ئەو هەموو ساڵە من سەروکارم لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە بەردەوام لەگەڵ مردندا خەریکن، بەڵام کەس وەک دڵشوشە نەیدەزانی قسە لە مردن و سەرسامییەکانی بکات. ئەو کات چوار گەنج بووین نەماندەزانی چیمان لێدێت. ئەو شەوە سوێندمانخوارد کە بەرامبەر دونیا ئاڵای برایەتیی خۆمان بەرزدەکەینەوە، ئەو شەوە نەماندەزانی چۆن ئەو پەیمانە بێویست و دەسەڵاتی خۆمان تێکدەشکێت. موزەفەری سوبحدەم من ئەمڕۆ لەم زیندانە تاریکەوە ئەو درەختە ناودەنێم «هەناری دواهەمین برایەتی دونیا»... نا، نا تڕوهات نەبوو، تاکە شتێک بوو لە ژیانی مندا تڕوهات نەبوو، ژیانی من هەمووی تڕوهات بووە، ئەو درەختە نەبێت کە وەک جوانترین و موبارەکترین شتی من دەمێنێتەوە، من کە نەمتوانی مانا قووڵەکانی ئەو پەیمانە تێبگەم کە شەوێک مۆرمکرد و لەگەڵ ئەو سێ برا ئەبەدییەدا خستمانە ناو قوتوویەکی زیو و لە بن ئەو دارەدا بۆ هەتاهەتایە هەڵمانگرت.

ئەو رۆژەی شەری ناوخۆ دەستپێکرد من بە خۆم و تفاقی جەنگەوە خۆمکرد بە بوراقدا، خۆم وەک دوا شێری هیندوستان دەهاتەبەرچاو، بۆنی باروتی ئەو «ئار. بی. جی»انەم لێدەهات کە تەقاندبووم. لە بوراق چیرۆکی شەرەکانم بەو هەموو درۆیەوە گێرایەوە، دڵشوشە بە نائومێدییەکەوە تەماشایکردم کە لەیادمناچێتەوە. شەوێ کە لەو بارە چکۆلەیەدا پێکەوە

بیرەمان دەخواردەوە، دڵشوشە گووتی «تۆ ئەو پەیمانەمانت شکاند... تۆ حورمەتت بۆ ئەو پەیمانە دانەنا... من گاڵتەت لەگەڵ ناکەم. ئەوەی برای ئێمە بێت، دەبێت برای هەموو کەسێکی تریش بێت، کەس ئازار نەدات» یەکەمجاربوو وا تورە و بێتاقەت بیبینم، پێشتر هەستمدەکرد منی زۆر خۆشدەوێت و لێم تورەنابێت. هەموو جارێک پێیدەگووتم «سەرکزگل تۆ ئەو هەموو ساڵە لەکوێ بوویت، بۆ زووتر داوای ئەو گۆرانییەی کامکارەکانت نەکرد». من ئەو رۆژە نەمدەزانی چیم کردووە. محەمەدی دڵشوشە دەیگووت «ئەوەی پەیمانی برایەتییەک مۆربکات، چۆن دەچێت بۆ شەڕ، چۆن، خەڵکێک ئازاردەدا کە نایانناسێت... بەقسەی کێ وادەکات؟ بەقسەی سەرکردەکان؟... ئاخر سەرکردەکان نازانن برایەتی چییە».

ئەو دواهەمین هەناری دونیای وەک درەختی خۆشەویستی ژیان تەماشادەکرد... ژیانێکی ساف و بێنهێنی و بێگەرد.

بەقسەی ئەو لە حیزب هاتمەدەرێ و چەکەکەم دانا. لە رۆژانی یەکەمی ئەو شەڕەدا کە هەموو دونیا دەپاڕایەوە کۆتاییبێت، ئێمە زووزوو دەچووین بۆ ژێر دواهەمین هەناری دونیاو لەوێدا بیرمان لە ژیانی خۆمان دەکردەوە. لەو رۆژانەدا من و سەریاس هەنارەکانمان دادەنا و تێیڕادەماین. دوو هەناری شوشە کە هەناری برایەتییەکی گەورە بوو، بەرزماندەکردەوە و دەمانگووت «خودایە، ئەی خاوەنی ئەرزو ئاسمان، بۆ خاتری ئەم هەنارە جوانانە، شەڕ کۆتایی پێبێت»... دۆعایەک ئێستا تێدەگەم چ ئاواتێکی پوچ، بەڵام گەورەبوو.

## کاسێتی چوارەم

سەعات یازدەی پێشنیوەڕۆ بوو دۆفرۆشەکان پێیانگووتم سەریاسی سوبحدەم مردووە.

کە ئەو کوژرا پێکەوە قسەمان نەبوو، هەردووکمان چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد نەدیمی شازادە بێتەوە و ئاشتمانبکاتەوە. دوای مردنی دڵشوشە هەردووکمان بیری دواهەمین درەختی دونیامان دەکرد، بیری ئەو لوتکەیەمان دەکرد، بیری ئەو ساتانەی بە ڕاستی تامی ژیان و هاوڕێتی و برایەتیمان تیاکردبوو.

دوای ناسینی بۆ خوشکە سپییەکان من حاشام لێکرد، دوای ئەوەی ئێوارەیەک هات و دەستیکردە ملم و گووتی «من لەگەڵ ئەو کچانەدا پەیمانی برایەتیم مۆرکردووە». ئیتر من دەهری بووم. من ڕقم لە خوشکە سپییەکانە، ئەو ڕاستییانەی دواتر دەربارەی مردنی دڵشوشە بۆم دەرکەوت هیچی لەو ڕقەی من لەوان نەگۆڕی. شەوێکی هاوین لەو گۆڕەپانەدا بینیمن کە هەندێ لە دەستگێڕەکان تیادەخەوتن... شەوێک بوو هاتبووم هەندێک شت بۆ سەریاس بگێڕمەوە، لە دوورەوە گوێم لە گۆرانییەکی خۆش بوو، کوڕانی عەرەبانەم بینی چوارمەشقی لەسەر زەوییەکە دانیشتوون و حەپەساون، هەردوو خوشکە سپییەکە لەسەر دوو تەپلەکی چاخانە دانیشتبوون و گۆرانییان دەگووت. کە گۆرانییەکەیان تەواوکرد لەسەرخۆ هەستان و بەو نیگا ساردوسڕانەی خۆیانەوە، بە پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمانیان گووت «بمانگەێنەوەماڵەوە». مارشاڵ بە حورمەتی برایەکەوە کە شەرمێکی تەواو لە خوشکەکانی بکات، گووتی «سەرچاو، هەر ئێستا دەتانگەێنم». من ئەو شەوە هاتبووم قسەی زۆرم پێبوو. بە سەریاسم گووت «مەڕۆ، من هەزار حیکایەت زیاترم پێیە...

هەزاری چی، سەد هەزار حیکایەتی تازەشم پێیە... یەک دونیا شتی عەجایەب هەیە بۆت باسبکەم». زۆربەی شەو کە پێکەوە دادەنیشتین باسی دڵشوشە و چیرۆک و قسەکانیمان دەکرد، یەکی وێنەیەکی ئەو لە جزدانەکەماندا بوو. ئەو ڕۆژە دەمویست وابکەم سەریاس لەگەڵ ئەو دوو خوشکەدا نەڕوات و بەجێمبهێڵێت. بەڵام ئەو گووتی «سەریاس، خۆ ئەمشەو دواهەمین شەوی دونیا نییە، کاتێکی تر ئەو شتانەم بۆ باسبکە، کاتێکی تر».

ئەو شەوە دواهەمین شەوی هاوڕێتیمان بوو. ڕۆژی دوا ئەوە قسەم لەگەڵدا نەکرد، چەندین جار هات و دەستیکردە ملم و ماچیکردم، من قسەم لەگەڵدا نەکرد. لێتی ناشارمەوە کە حەزمدەکرد بیکوژم، حەزمدەکرد کۆتاییەک بۆ هەموو ئەو چیرۆکە دانێم و من وەک تاکە سەریاسێک لەسەر زەوی بژیم، ئەوکات هێشتا نەدیمی شازادە نەهاتبووەوە، هیچم لەوە نەدەزانی کە ئەو ئاسەواری تری لە چیاکان دۆزیوەتەوە، نەدیمی شازادە زۆر درەنگ دوای مردنی سەریاس و دڵشوشە گەڕایەوە... زۆر درەنگ... کاتێک گەڕایەوە هیچ شتێک سوودی نەبوو. لەو نێوەندەدا دوای بینینی سەید جەلالی شەمس ئێوارەیەک گەڕابووەوە و شاری بەدوای من و مارشاڵدا تەیکردبوو، کەسمانی نەدۆزیبووەوە، دواجار هەموو چیرۆکەکەی بۆ محەمەدی دڵشوشە گێڕابووەوە. نەدیمی شازادە لەسەر ڕێگای خۆیدا بۆ گەشتە دوورەکانی تری خۆرهەڵات هاتبوو، تا شتێکمان پێبڵێت و بڕوات... دەبایە بەیانی لەگەڵ هەندێ ئاسیاوی خۆیدا لە پیکابێکی تویۆتادا بچێت بۆ ئەودیو سنوور، بە شانازییەوە هەموو نهێنییەکانی خۆی خستبووە بەردەستی محەمەدی دڵشوشە. ڕۆژێک بەر لە ئێوارەی لافاوەکان دڵشوشە بێئاگا لە مردنی ناکاوی خۆی وەک شادمانترین کەسی دونیا، بەدەم گۆرانی گووتن و یاریکردن بە کلیلەکانەوە دەچێت بۆ لای پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان، بێئەوەی هیچی لابدرکێنێت،

داوای لێدەکات بۆ یەک ڕۆژ هەنارە شوشەکەی خۆی بداتێ و پێیدەڵێت «خەریکە نهێنییەکی گەورە دەدۆزمەوە، جارێ هیچت پێناڵێم، تا دڵنیانەبم». کە دەڕوات هێندە کامەرانە، هێندە دڵخۆشە، هێندە بە سەفا و قاقایە مارشاڵ سەریدەسوڕمێت، ئەوە دواهەمین یەکتر بینینی مارشاڵ و محەمەدی دڵشوشەیە. ئەو ئێوارەیە کە دڵشوشە دەڕوات بەتەمای بینینی توحفەفرۆشێکە... توحفەفرۆشێک کە هەرگیز نایبینێت.

ئاه مەزەفەری سوبحدەم چیت پێبڵێم... چی؟ من لێرەوە ناتوانم یارمەتیبدەم... لە شەوی تاریک و پڕ تروهاتی ئەم زیندانەوە... ناتوانم کۆمەکتبکەم. من کە هەموو شتێکم زانی، ئارەزوویەکم نەبوو بۆ بیرکردنەوە... ئەوکات من تفم لە ناوەکەی خۆم دەکرد... دوای ئەو هەموو ماوە درێژە نەدیمی شازادە گەڕایەوە و منی لە کاتی واجبدا لە یەکێک لە سەنگەرەکانی شەڕدا دۆزییەوە. پێمگووت «من تەواو... ئەو ڕۆژانەم لە بیر خۆم بردۆتەوە... میزدەکەم بە تۆ و بە دواهەمین هەناری دونیا و ئەم حیکایەتانەشدا... من ناوم سەرباسی سوبحدەم نییە... من ناوم هیچ نییە... سەیرکە... من بۆ ئەم تفەنگەی سەرشانم دەژیم... هەستەو ئەم تروهاتانەم لێدووربخەرەوە... هەستەو بەر لەوەی میزبکەم بەو چاوە کوێرانەتدا، بڕۆو با نەتبینمەوە...».

... ئەو هەموو شتێک دەزانێت... ئەو دەتوانێت یارمەتیت بدات... ئەو.

موزەفەری سوبحدەم، دەبێت هەندێجار کاسێتەکە بکوژێنمەوە و بگریم.

سەعات یازدەی پاشنیوەڕۆ بوو پێیانگووتم سەرباسی سوبحدەم مردووە. کەسێک نییە سەرباسی ناسیبێت و یەکسەر باوەڕی بە خەبەرەکە کردبێت. کەسێک ناناسم لەوانەی ڕۆژی دواتر هەواڵەکەیان بیست، باوەڕیان پێکردبێت، حیکایەتێکی سەیر و بێمانابوو، من تا ئێستاش باوەڕی پێناکەم. ئێستاش ئێوارەی ڕووداوەکەم لەبیرە، من گێژانە بە بازاڕدا

دەسوڕامەوە، چایخانەیەکی چکۆلانە هەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەوە، شوێنێکە ئەوانەی پاییزان حەزیان لە هەتاوە لێیدادەنیشن... منیش کەسێکم پاییزان حەزم لە هەتاوە. ئاگام لە دەستپێکردنی هەراوزەنای ناو بازاڕ بوو، لەو بالکۆنە چکۆلەیەوە لەسەر کورسییەک دانیشتبووم و دۆندرمە لەسەر دۆندرمە دەمخوارد و پێدەکەنیم... ئەو کات دوو مانگ بوو لەگەڵ سوبحەدەمی گەورەدا قسەم نەبوو. لەبەر هەتاوەکە خۆم کردبووەوە و لە باڵکۆنەکەوە تەماشای هەراوزەنای دەستگێڕەکانم دەکرد، کە بوو بە تەقە من قاقا پێدەکەنیم، کە سەدان دەستگێڕ عەرەبانەکانیان جێهێشت و چوون بۆ سەرەوە بەرەو ڕووی تەقەکان، من بێزار و کەنەفتە لەو باڵکۆنە هاتمەخوارێ و لە هەموو ئەو هەراو هاوار هاوارە دوورکەوتمەوە و داگەڕام بۆ دوکانێکی فیدیۆ، لەو دوکانانەی فلیمی خراپ و شتی وا لێدەدەن، تا شەو درەنگ لەوێ تەماشای ترۆهاتم دەکرد و خەفەتم دەخوارد. کە شەو گەڕامەوە و سەیری ئەستێرەکانم کرد، تێگەیشتم شتێکی گەورە ڕوویداوە، دەستم لە هەنارە شوشەکەی گیرفانم دا، هەستمکرد خوێنی پێوەیە، دڵنیام خوێنی پێوەبوو، لەبەر ئەستێرەکان سەیری دەستی خۆمم کرد هەمووی خوێن بوو، سەیری هەنارەکەم کرد هەمووی خوێن بوو، کە دەگەیشتمە بەر ڕووناکییەکان و تەماشامدەکردەوە هیچم نەدەبینی، کە دەچوومەوە تاریکییەکە دیسانەوە هەموو گیانم دەبووەوە بە خوێن. کە گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، هەستێکی سەیرم هەبوو کە خەڵتانی خوێنم. ژوورەکەم کەسی لێنەبوو، ئەوکات شەریفی پەپولە ماوەیەک بوو چووبوو بۆ دیمەشق و خۆم بەتەنیا لەو ژوورەدا دەژیام. بەو هەستەوە کە نوقمی خوێناوم خەوم لێکەوت، بە درێژایی شەو دەکوژرام و زیندوودەبوومەوە، بە درێژایی شەو خوێنم لەبەر دەڕۆی و ڕادەچڵەکیم، گڵۆپەکەم دادەگیرساند و تەماشای خۆم دەکرد و دەچوومەوە ناو جێگا. بەیانییەکی زوو لە ماڵ چوومەدەرێ، وەک ئەوەبوو لەو خولیای خوێنە ڕابکەم کە بەدرێژایی شەو

بەدوامەوە بوو، هەنارە شوشەکەم لە ماڵەوە بەجێهێشت و هەستمدەکرد خوێنی لەبەردەڕوات.

سەعات یازدەی بەیانی زانیم کە سەریاس کوژراوە.

پەرداخێک دۆم لە دۆفرۆشێک کڕی و لێمپرسی «دۆکەت بۆ سارد نییە؟». گووتی «ئێستا دەستمانکردووە بە ئیش، لە بەیانی زووەوە لەسەر قەبری مارشاڵ بووین، هەموو بازاڕ لەوێ بووین... دوێنێ پۆلیسەکان کوشتیان». من پەرداخی دۆکەم لەدەست کەوتەخوارەوە، وەک هەمان ئەو بەیانییەی هەواڵی مردنی محەمەدی دڵشوشەیان هێنا و من کتری ئاوەکەم لەدەست کەوتەخوارێ. یەکەمجار باوەڕم بەو منداڵە نەکرد، هەموو دۆفرۆشەکانی تر هەواڵەکەیان لەنوکەوە پێگووتمەوە و من وەک شێت دەمگووت «شتی وانییە... شتی وانییە». لە هەموو بازاڕم پرسی، لە جگەرەفرۆشەکان، لە شیرفرۆشەکان، لە ئاوێنەفرۆشەکان، لە ماسیفرۆشەکان هەموویان کۆی چیرۆکەکەیان بە ورد و درشتییەوە بۆ گێڕامەوە، بردیانمە سەر شوێنی مردنەکەی، خوێنەکەیان نیشاندام کە تا ئەو کات پاکنەکرابووەوە. هەموویان مارشاڵیان دەناسی و دەگریان بۆی. بە هێمنی، چیرۆکەکەیان دەگێڕایەوە و فرمێسک بە چاویانەوە بوو، منیان نەدەناسی، بەڵام لە خەفەتدا، لە حەسرەتدا، لە ویستی ئەوەدا شتێک بکەن ئەو ئازارەیان هێوربکاتەوە باوەشیان پیادەکردم و ماچیاندەکردم. من جار بەدوای جار دەمقیڕاندو دەمگووت «درۆیە، درۆ، ئێوە هەمووتان درۆزنن...». هەموویانم بەجێهێشت، یەکێک دەستیگرتم و گووتی «وەرە بتبەم بۆ مزگەوتی پرسەکە». من باوەڕم بە پرسە و شتی وانەبوو، باوەڕم بەوانە نەبوو دوو ڕۆژ لەسەر کورسی ڕەق و تەق دادەنیشن و ئاو و شتی وا دەخۆنەوە و دوایی دەچن بۆ سێوخواردن لە ماڵێک و ئەوەش ناودەنێن پرسە... هەموو ئەو شتانە لای من تروهات بوون، من باوەڕم بە گریانی زۆر، بە قوڕپێوان، بە خۆبریندارکردن و خۆلێدان و ئەو شتانەی

تـر هەبـوو. ئـەو ڕۆژە چوومـە کوچەیەکـی خاڵییـەوە و دەسـتمکرد بـە گریـان، نـا دەستمنەکرد بـە گریـان، بەڵکـو سـەرمدەدا بـە دیوارەکـەدا، تـا دەمتوانـی سـەرمدەدا بـە دیـواری بەردینـی ماڵێکـدا، تـا هەمـوو گیانـم دەبـوو بـە خوێـن. دەمگـووت «بـۆ بەدبەختـی وەک مـن نامـرم و تـۆ دەمریـت... بـۆ جانـەوەری وەک مـن دەژی و تـۆ دەمریـت.... بـۆ ماڵوێرانـی وەک مـن ناکـوژرێ و تـۆ دەکوژرێیـت؟». بـەو ئازارانـەوە خـۆم دەگەیانـدە ماڵـەوە، بەدرێـژای ڕێـگا وەک شـێت هاوارمدەکـرد، هـەر درەختێکـم دەبینـی سـەرم پیـادەدا، هـەر دیوارێکـم دەبینـی سـەرم پیـادەدا، چنگـم دەکـرد بـە خۆڵـی هەمـوو کوچەکانـدا و دەمـدا بـە دەموچاومـدا. هـاوارم لـە خـۆم دەکـرد «سـەریاس بـە تەنیـا مایتـەوە، کـوڕی قەحبـە بەتەنیـا مایتـەوە... وەک ئـەوەی هیـچ نەبووبێـت... هیـچ». ئەو هەنـارە شوشـەیەم هەڵدەگـرت و دەمـدا بـە دیوارەکانـدا و نەدەشـکا، دەمخسـتە ژێـر قاچمـەوە و نەدەشـکا. ئیـدی ئـەوە کۆتایـی هەمـوو شـتەکان بـوو... ئـەوە دواهەمیـن ڕۆژی ژیانـی مـن بـوو.

لەدوای مردنی سەریاسی سوبحدەمەوە، منیش مردم...

دوای ئـەوە سـێ جـار نەدیمـی شـازادەم دەرکـرد و ئـەو دەگەڕایـەوە، هەرجـارەی بەشـێکی لـە باقـی ئـەم چیرۆکـە بـۆ دەگێڕامـەوە. هەمـوو کات لـە کاتـی واجبـدا دەردەکـەوت، مـن لـە شـوێنی خۆمـدا پاسـەوانی شـەو و بـاران و ڕەشـەبام دەکـرد و ئـەو کوێـرە بـە خـۆی و گۆچانـە شـەیتانییەکەیەوە دەهـات و دەیگـووت «سـەریاس دەرممەکـە، مـن نهێنـی گـەورەم پێیـە... وادەکـەم لـە هەمـوو شـتێک تێبگەیـت... دەبێـت مـن و تـۆ ئـەم تەلیسـمە شـیبکەینەوە... مـن و تـۆ ئـەو نهێنییـە ئاشـکرابکەین کـە ئـەوان نەیانتوانـی». مـن ڕقـم لێیبوو، چیتـر نەمدەویسـت کـەس ئـەو ژیانـەی جارانـم بیریخاتـەوە... شـەوێکی تاریـک و شەسـتەباران هـات و مـن پێمگـووت «کوێـرەی سـەگ بـۆ وازم لێناهێنیـت، نابینیـت لـەم بارانـەدا بـووم بـە پاسـەوانی هیـچ، نابینـی حەراسـەتی بـەرد و

دار و کەلاوە دەگرم... نابینیت، ئیتر چیت دەوێت و بۆ وازم لێناهێنیت».
ئەو بە خۆی و چەترێکەوە هاتبوو و لە بارانەکەدا دەیقیڕاند «سەریاس، سەرگزگل، تۆ هیچ نازانیت... تۆ بەتەنیا نیت... جگە لە مارشاڵ، خەڵکی تر هەیە... سەریاسی تر هەیە... ژیانی تر هەیە... نهێنی تر هەیە... تۆ چیت... تۆ دەزانیت بەس خۆت هەیت... وادەزانی کە مارشاڵی شەوە تاریکەکانمان مرد ئیتر ئەم بەسەرهاتە تەواودەبێت... وادەزانی دونیا کۆتایی پێدێت... تۆ کەیفی خۆتە دەتوانیت نهێنی خۆت لەگەڵ خۆتدا ببەیتە قەبرەکەتەوە... دەتوانیت بڵێیت من نامەوێت بزانم من کێم... تۆ کەیفی خۆتە بە جەهەنەم... دەتوانیت بڵێیت من وەک سەگ دەژیم، باوەڕم بە مەلایکەت و شتی وا نییە، دەتوانیت تا دەتۆپیت لووتی خۆت لەقوونی سەگ بخشێنیت... بەڵام دەزانم دەبێت نهێنییەک هەیە ئاشکرابێت... لەبەرخاتری تۆ نا، بەڵکو لەبەر خاتری ئەو فریشتانەی هەموو شتێک بۆ ڕۆحیانەتی ئەو دوو کوڕە دەگێڕنەوە کە ویستیان تۆ بکەن بە ئینسان و نەبوویت... لەبەر دڵی ئەو مەلایکەتانە کە بەو دوو جوانەمەرگە دەڵێن، نەدیمی شازادە وازی لە ئێوە نەهێناوە... بەڵام ئەو کەسەی ڕاستییەکانی لەلایە، هیچم پێناڵێت گەر حوجەتێکی نیشاننەدەم، ئەو پیاوەی نهێنییەکان دەزانێت دەلیلێکی لە من دەوێت... دەلیلێک کە من نیمە و تۆ هەتە... تێدەگەیت... ئێستا تێدەگەیت بۆ من بەم بارانە ئاوا دەقیڕێنم».

باران بە جۆرێک دەباری بە زەحمەت گوێمان لەیەک بوو، من دەمگووت «کوێرەی سەگ... لێم نزیک مەکەوە، تەقەت لێدەکەم... تێدەگەیت... من باکم بە هیچ نەماوە، نە بەژیانی خۆم نە بەژیانی کەس... کوێرەی شەیتان، من میز بە مەلایکەتەکانتدا دەکەم... تۆ مەلایکەتت نییە، تۆ سەگت هەیە... من میز بە بەسەرهاتەکانتدا دەکەم... من ناوم سەریاس نییە... باکم بەوە نییە کێ لەم دونیادا هەیە و کێ نییە، کێ ماوە و

کێ نەماوە... من هیچم نییە، هیچ دەلیلێکم نییە... برۆ ئەو دەلیلە لە شەیتانەکان داوابکە... لە مەلایکەتە چاوسەوزەکانی باوکت و واز لە من بهێنە». ئەو شەوە چەندین جار نەدیمی شازادەم دەرکرد و دوای کەمێک دەهاتەوە، تا دەهاتیش باران زیادیدەکرد. هەر جارەی پارچەیەکی ئەو چیرۆکەی دەگێڕایەوە... خوای گەورە دواجار تەقەم لێکرد، وەک شێت کەوتمە فیشەک تەقاندن بەسەریدا... وەک شێت، ئەو ڕایدەکرد و من دوای دەکەوتم، ئەو دەکەوت و من فیشەکم بەسەردا دەتەقاند، چەترەکەی با دەیفڕاند، لە قوڕەکەدا دەگەوزا و هەڵدەستایەوە و جنێوی بە من دەدا، منیش بەردەوام فیشەکم بەشەو و هەوا و ڕابوردووی خۆمەوە دەنا... وەک شێت میلم دەهێنایەوە و فیشەکم دەتەقاند و دەمگووت «وازم لێبهێنە... کوڕی سەگ. وازم لێبهێنە... پێمگووتی وازم لێبهێنە». ئەو ڕایدەکرد و من لە ناو ئەو قوڕو شەوو بارانەدا دادەنیشتم و وەک هەتیوێکی غەمگین ، وەک منداڵێک لەوپەڕی بێدەسەلاتی و بێکەسیدا دەگریام.

دوای مردنی سەریاس من هەموو ژیانم گۆڕا. ئێوارەیەک بۆ دواهەمین جار چوومەوە بۆ ژێر دواهەمین هەناری دونیا، لەو سەر ترۆپکەوە وەستام و وەک ئەوەی ماڵاوایی لە هەموو ئەو ڕۆژانە بکەم کە ئەو کوڕە دڵسۆزانەم تیاناسی، ئەو هەنارە شوشەیەم هەڵگرت و تا هێزم هەبوو لەو بەرزاییەوە تورمدایە خوارێ، ئەو هەنارە ئێستاکێ لەوێیە، لەو شیوو دۆڵ و بەردەلانە ترسناکانەدایە کە مرۆڤ دەستی پیاناگات، لەو نشێوە ڕەشانەدایە کە هیچ کەس نایگاتێ. من لە مانای ئەو هەنارە نەگەیشتم، ئەو ئێوارەیە کە هەنارەکەم فڕێدا حاشام لە خۆم دەکرد، لە لەدایکبوونم، لە منداڵیم لە گەنجیم لەو عەهد و پەیمانەی لەگەڵ ئەو مردووە بەدبەختانەدا مۆرمکردبوو... دوای مردنی ئەوان من هەستم بە ئازادبوونی ئەو شەیتانەی ناو خۆم دەکرد. ئیتر من کەسێک نەبووم،

دەموچاوم نەبوو، من شتێک بووم کە دەمویست خۆم و شتەکانی تریش وێرانبکەم. مردنی ئەوان منی گێڕایەوە بۆ جەنگ. هەموو ژیانی من لە ناو ئەو هەنارە شوشەیدا بوو، منیش تا هێزم هەبوو فڕێمدا... فڕێمدا و هاتم بەرەو جەهەنەم.

دەشێت لێمبپرسیت مردنی ئەوان چ کارێکی بە گەڕانەوەی تۆوە هەبوو بۆ شەڕ؟ منیش زۆر بیرم لەوە کردۆتەوە. تۆ زیندانت بینیوە، دەزانی مرۆڤ لە ئینفیرادیدا کاتێکی دوور و درێژی هەیە بیربکاتەوە، هەستەکەم من و تۆ بۆیە غەمگین و کەساس قسەدەکەین، چونکە هەردووکمان لە زینداندا فێری بیرکردنەوە بووین. موزەفەری سوبحدەم من لە زینداندا فێری بیرکردنەوە بووم. هەرچییەک پێشتر بیرم لێکردبووەوە تروهات بوو... ئەو شەوەی کە بۆ دواجار لە بن دواهەمین هەناری دونیاوە هاتمەوە، هەستمکرد شوێنێکم لەم سەر زەوییەدا نییە، ئەو شەوە هەموو ئاوێنەکانم شکاند، هەرچی وێنەیەکم هەبوو کۆمکردەوە و سووتانم، تاکە وێنەیەک نەمدەتوانی کۆیبکەمەوە و بیسووتێنم، وێنەی ئەو منداڵە گریاوە بوو کە لە باوەشی دیکتاتۆرێکدایە پێدەکەنێت. ئەو وێنەیەی بە سەدان هەزار دانەی لێ چاپکرابوو. من لەو ڕۆژەوە دەموچاوی خۆمم نەبینیوە... موزەفەری سوبحدەم، گوێبگرە، هەموو ئەو کەسانەی کە دەموچاوی خۆیان نابینن خەتەرن... من لەو ئێوارەیەوە کە لە بن دواهەمین هەناری دونیادا ڕۆحی خۆمم فڕێدا ئیتر ئامادەنەبووم بیر لە کەسێک بکەمەوە ناوی سەریاسی سوبحدەمە... سەریاسی سوبحدەم درۆیەکی گەورەبوو، ئینسانێک نەبوو، بەڵکو شتێک بوو دروستکرابوو تا لەو ڕۆژگارە تاریکانەدا ونبێت... من هیچ دەبازێکی ترم نەبوو، بەپێی خۆم چوومەوە سەر ئەو ڕێگایەی کە دەمزانی ناتوانم خۆمی لێلادەم.

شەوێکیان بە ڕیشێکی درێژ و نیگایەکی نەخۆشەوە چوومەوە بۆ بنکەی ئەو هێزە کۆنەی لە کاتی خۆیدا جێمهێشتبوو، وەک پەڕپووتترین و لاوازترین پیاوی دونیا دەمنواند، وەک هەمیشە بە گیرفانێکی خاڵی و زگێکی برسییەوە دەگەڕامەوە بۆ باوەشی حیزب. ئەوکات قۆناغ لە دوای قۆناغ شەڕ هەڵدەگیرسا و هێور دەبووەوە... هەڵدەگیرسا و خامۆش دەبووەوە. کە گەڕامەوە بۆ جەنگ شەڕانگێزییەکی شەیتانی لە ڕۆحمدابوو، وەک هەموو دۆڕاو و بێئومێدەکانی دونیا حەزمدەکرد، گەردون بە خوداکانییەوە بڕوخێت... یەکەم ڕۆژ کە چوومەوە بۆ بنکەکە، ماوەیەکی درێژ بوو نانم نەخواردبوو، ماوەیەکی درێژبوو خۆم نەشتبوو. لاواز و درێژ و کەنەفتە... بەڵێ... موزەفەری سوبحدەم، من دوای مردنی سەرپاسی مەزن، هەستمکرد کە من ناتوانم ژیانێکی ئاسوودە بژیم... لە تفەنگ زیاتر هیچ شتێک لەو وڵاتەدا نەبوو هەڵیگرم... لەدوای ئەوەی ئەو هەنارەم فڕێدا لە تفەنگ زیاتر هیچی دیکە نەبوو دەستیبدەمێ. ئەوەم بەلاوە گرنگ بوو لە شوێنێکەوە تەقە لە دونیا بکەم. نەمدەزانی بۆ شەڕدەکەم، کێ شەڕدەکات، کێ دەکوژم، کێ دەمکوژێت... بەڵام ئەوانە هیچیان گرنگ نەبوون، گرنگ ئەوەبوو من لە جێگایەکەوە تەقە لە دنیا بکەم.

ڕۆژگارێک بوو من نەدەمویست بزانم چیم و کێم. ئەو کات لە چەندین شەڕی خوێناویدا بەشداریم کرد، بەتەواوی بووم بە بەشێک لەو دونیایە... بەدەگمەن دەچووم بۆ شار، وەک پیاوێکی کێوی هەمیشە لە چیا و ڕەبییە و سەنگەرەکانی پێشەوە بووم، کرنووشم بۆ مەسئولەکانم دەبرد، لەزەتم لەوە دەبینی ببم بە کوێلەیەکی دڵڕەق، شانازیم بەوەوە دەکرد کە هەمیشە لە بەفر و ڕەشەبا و تاریکیدا پاسەوانی ئەو هیچییە دەکەم کە سەرۆکەکان حەزیاندەکرد پاسیبکەم. وەک دەروێشم لێدەهات، ڕیشم تا دەهات درێژدەبوو... شەڕیووایە و شەڕنەبایە من لە حاڵی ئامادەباشدا دەژیام، دەیەها شەو تێدەپەڕی و من خۆم نەدەکردەوە، دەیەها شەو

هاورێکانم دەخەوتن و من یەک بە دوای یەک لە بری هەموو هێزەکە خەفارەتم دەگرت، وەک شێت لە تاریکیدا دادەنیشتم و گوێم لە سەدای باو چرپەی جانەوەرە بێدارەکانی شەو دەگرت. کە ئاشتیش بەرقەرار دەبوو لە شاخەکان نەدەهاتمە خوارێ، لەو مەفرەزانەدا بووم کە جەنگ تا جەنگ لە شاخ و ئەشکەوت و کێوەکاندا دەژیام.

من وەک ئەو شەڕانەی دەمکردن پیسبووم. ئاخ موزەفەری سوبحدەم... ئاخ ئەی ئەو پیاوەی کە پێناچێت هەرگیز یەکتری ببینین... هەندێ شەو پەشیمانم و هەندێ شەو پەشیمان نیم... من نەمدەتوانی نەبم بە خزمەتکاری ئەو جەنگە... نەبم بە خزمەتکاری ئەو سەرۆک و سەروەرانەی نانیان دەدامێ و پێیاندەگووتم «سەریاسی سوبحدەم تەقەبکە... کوڕی قەحبە تەقەبکە... کوڕی حیز تەقەبکە». سەرۆکەکانم منیان خۆشدەویست، ئەوان هەموو ئەوانەیان خۆشدەویست کە وەک سەگ پاسیاندەکردن، منیش لەوانە بووم. لەهەموو شەڕەکاندا لە پێشەوەبووم، هەرکاتێک بیانویستبایە پەلاماری لووتکەیەکی عاسی بدەن و کەسیان دەستنەکەوتایە، من یەکەمین کەس بووم کە دەچوومە پێشێ و دەمگووت «من دەڕۆم» پێیاندەگووتم «زرێپۆش». ڕۆژانی ئاشتی ناخۆشترین ڕۆژانی ژیانی من بوون، کە شەڕ دەوەستا تووشی نائومێدییەکی گەورەدەبووم. لە ئاشتیدا هیچم نەبوو بیکەم، جگە لەوەی تفەنگەکەم پاکبکەمەوە و بخەوم، ڕۆژی دوو جار تفەنگەکەم پاکدەکردەوە و دەخەوتم. تفەنگەکەم پاکدەکردەوە و دەخەوتم. لەو کاتەوەی کە گەڕامەوە بۆ شەڕ ئیتر نە تەماشای تەلەفزیۆنی بنکەکەم دەکرد و نە گوێم لە کامکارەکان دەگرت. کە پێشمەرگەکان کامکارەکانیان لێدەدا من هەڵدەستام و دەچووم بۆ جێگایەکی تر. هەر شتێک پەیوەندی بەو ڕۆژە جوانانەوە هەبایە منی ئازاردەدا. کە ئەوان کامکارەکانیان لێدەدا من خەشابێکی حەفتاوپێنجیم دەخستە سەر تفەنگەکەم و دەمنا بە

ئاسمانەوە، ئاربی جیپەکەم هەڵدەگرت و لە خۆوە دەمتەقاندە ئەو دۆڵ و شاخ و کێوە ماندووانە، دەمویست شتێکبکەم ئەو یادگارانەی نێو خۆم بکوژم و نەمدەتوانی. ئێوارەیەکیان لەسەر بەردێکی بەرز دانیشتبووم، پێشمەرگەیەک بانگیکردم و گووتی «سەرپاسی سوبحدەم، کامکارەکان هاتوون... کامکارەکان هاتوون». بەجۆرێک بانگیکردم هەموو ئەو شاخ و دۆڵ و چیایانە دەنگیاندەدایەوە. ئەو لە ڕادیۆوە هەواڵی هاتنی کامکارەکانی بیستبوو، ئەو دەیزانی تاکە ئاواتێکی ژیانم ئەوەبووە ئەوان لەسەر سەحنە ببینم. ئەو شەوەی کە ئەوان ئاهەنگیان دەگێڕا، من چوومە ناو دۆڵێکەوە و دەمانچەکەم دەرهێناو نام بەسەری خۆمەوە. مەترسە مەترسە... من نەمردم ، هەمووی تروهاتێکی گەورەبوو، ئەو گوللەیە بە جۆرێکی بێمانا تیغیکرد و خەتێکی درێژی لە ناوچاوانمدا دروستکردو نەیکوشتم.

ڕۆژێکیان بەو ناوچاوانە برینداره‌وە مەسئولەکەمان کاغەزێکی پیاناردم بۆ سۆزانییەک لە شار، پێشتر ئەو نیشانەیان بە من نەدەکرد، ڕۆژگارێکی خراپ بوو، واتە دەنگ هەبوو شەڕ دەستپێدەکاتەوە و ئەو شتانە، مەسئولەکەمان نەیدەتوانی دابەزێت بۆ شار، کەسێکی لە من بێدەنگتری دەستنەدەکەوت. سەرەتا گووتی «ئەوە بۆ خوشکمە...» دوایی کەمێک وەستاو گووتی «نا... بۆ خوشکم نییە، بۆ قەحبەیەکە... قەحبەیەکە ئیمانی دەرهێناوم... بەقەد سەد مەلایکەت حەزم لێکردووە». من نامەکەم بۆ قەحبەکە برد، کچێکی زۆر جوان و نازک بوو، لە دائیرەیەکی پاکوتەمیز کاریدەکرد... ئەوەندە جوان بوو خەریک بوو حەز لە ژیان بکەمەوە، خەریک بوو کڕنوشی بۆ بەرم و بڵێم «شووم پێبکە». بەڵام کە کاغەزەکەم دایە، بە لالووتێکەوە گووتی «دیسان ئەو قۆنەرەیەیە... دڵمخۆش بوو وامدەزانی کاغەزی ئیحسانە، کەچی هی ئەو پۆتینەی ترە، ئێسکی تۆش مرێت، هەتیوە سەرزلە، بۆخۆت و دەست ودیارییەک بۆت هێناوم، ڕەزاگران، دە بڕۆ سەعاتێکی تر وەرەوە بۆ جوابەکەی...».

ئەو سەعاتە کە هاتمە بازاڕەوە بەسەر کۆتایی لەشکری عەرەبانەکاندا هاتم. ئەو ڕۆژەبوو سەدان پۆلیس عەرەبانەکانیان کۆدەکردەوە و دەیانشکاند، هەزاران عەرەبانەی شکاو لەسەر شەقام و لە ناو کوچەکان و لە بەردەم دەرکی بازاڕ و قەیسەرییەکاندا کەوتبوو، کە من گەیشتم جەنگ تەواوبووبوو. من لە ناو چڵوچێوی هەزاران هەزار عەرەبانەدا وەستام، هەزاران کارتۆن و سندوقی شکاو لەسەر شەقامەکان کەوتبوون، هاڵاوێک لە هاڵاوی دوای جەنگ دەچوو لەوێکانەدا بوو، لە هەندێ شوێن خوێنی ئەو دەستگێڕانەم بینی، بەسەر میوە و ماسی و جگەرە و شامپۆ ئێرانییەکاندا ڕژابوو، لە جێگایەکی دیکە ئەو دەستگێڕانەم بینی پۆلیسەکان لە پیکابێکی سەوزدا سەریاندەخستن و بە سۆندەو دار لێیاندەدان. من وەک یەکێک لە ناو گۆڕەپانێکی بەرینی شەڕدا بۆ مەیتی هاوڕێیەکی بگەڕێت، بە سەر ئێسک پروسکی تێکشکاوی عەرەبانەکاندا گەڕام تا گەیشتمەوە ئەو جێگا کۆنەی پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان عەرەبانەکەی تیا دەوەستان. لەویادا لە هەمان شوێندا پارچەو چڵوچێوی شکاوی «سینەی کەژاڵ»م دۆزییەوە، ئەو عەرەبانە جوانەی سەردەمێک ناسکترین عەرەبانەی دونیا بوو. دوای مردنی سەریاس کوڕێکی منداڵ هەڵیگرتەوە و لە هەمان ئەو شوێنەی سەریاسدا کاسێتی تورکی و فارسی لەسەر دەفرۆشت، ملوانکەیەکی شین بە پێشەکەیەوە بوو، ویستم دەستبەرم و لێیبکەمەوە، بەڵام جورئەتمنەکرد، ئەوکات غیرەتی ئەوەم نەبوو دەرگای هەموو ئەو یادگارانە لە خۆم بخەمەوە سەر پشت. لە بری ئەوە وەستام و دەستمکرد بە گریان. تێکشکانی ئەو عەرەبانەیە نیشانەی کۆتایی ڕۆژگارێک بوو... ڕۆژگارێک ئەمڕۆ هیچ کەس نییە باسیبکات... ڕۆژگارێک بۆ من سەرەتای کۆتایی هەموو جوانییەکانی دونیابوو.

## کاسێتی پێنجەم

کەس لێم تێنەدەگەیشت... هیچ کەس.

من لە هەموو شەڕەکاندا دواهەمین کەس سەنگەرم چۆڵدەکرد، لەناو شریخەی خومپارەو تەپوتۆزی هاوەن و دوکەڵی ڕاجیمە بچوکەکاندا، دەمقیڕاند «کەس سەنگەرەکان چۆڵ نەکاااااات». بە جۆرێک دەمقیڕاند خوێن لە گەرومەوە دەهاتەدەرێ، هێندە بەدەنگی بەرز هاوارمدەکرد دوژمنەکان لەوبەر گوێیان لێم بوو. وەک چۆن سەردەمانێک بەوە ناوبانگمدەرکرد، بچوکترین جاشی وڵاتی خۆمانم، لە داوی ڕاپەڕین بەوە ناسرام کە لە هەموو بەرەکانی شەڕی ناوخۆدا شەڕمکردوە. ڕۆژێک بڕیارمدا تا شەڕ بەتەواوی کۆتایدێت پۆستاڵەکەم، کۆڵەپشتەکەم، پشتێنەکەم نەکەمەوە. تادەهات لاوازتر و درێژتر دەبووم، تادەهات ڕیشم درێژتر دەبوو، لە عیفریت و تروهات و ئەو شتانە دەچووم. بەوەدا جەنگ کۆتایی نەدەهات، من بەردەوام لە هەموو جێگایەکدا بووم، ئێستا هەستدەکەم زۆرجار لەیەککاتدا لە زیاد لە جێگایەکدا شەڕمکردووە، بەیانیان لە هەرێمێک بووم، ئێواران لە شوێنێکی دی و شەوان لە جێگایەکی تر. کەسانێک منیان وەک ئازاترین کوڕی وڵات تەماشادەکرد، من هەمیشە دواهەمین کەس بووم کە سەنگەرەکانم چۆڵدەکرد، هەتا هەندێجار کە فەرمانی گەڕانەوە و پاشەکشەش دەدرا، من هەر نەدەگەڕامەوە، ئەو هاوارە گەورە و بێبڕانەوەیەی خۆمم وازلێنەدەهێنا «کەس سەنگەرەکان چۆڵ نەکاااااات»، بەڵام کەس تێنەدەگەیشت بۆ؟.

موزەفەری سوبحدەم، لە دونیادا هیچ شتێک وەک ئازایی و نائومێدی لەیەکترەوە نزیک نین... تێدەگەیت، مرۆڤی ئازا کەسێکی نائومێدە.

هەموو ئەو کەسانەی ئاواتێکیان هەیە ترسنۆکن، من بۆیە دواکەس سەنگەرەکانم چۆڵدەکرد چونکە نائومێدترین کەسی دونیا بووم، هاورێکانم هەموو خەونیان هەبوو، هەندێکیان دەستگیرانیان هەبوو، هەندێکیان دەیانویست برۆن بۆدەرەوەی وڵات، دەیانویست ببن بە بەرپرسی گەورە. من نەبێت، هیچم نەبوو. من لە هەموو چیاکانی کوردستاندا، لە هەر شوێنێک گوللەیەکی شەڕ تەقیبێت، بە خۆم و ریش و کۆڵەپشت و نیگا شەیتانییەکانمەوە لەوێ بووم، کلاشینکۆفێک و ئاربیجییەک یان دیکتاریۆفێکم هەڵدەگرت، وەک شەیتانێک لە جەهەنەم ڕایکردبێت دەچوومە سەر بەرزترین شوێن و سنگم بۆ ڕەشەبا و تورەیی ڕووتدەکرد، بە دەنگێکی گڕو برینـدار کە هەموو گیانم لەگەڵیدا دەلەرزی، دەمقیراند «کەس سەنگەرەکان چۆڵنەکاااااات»، بە نارنجۆکێکەوە دەردەپەڕیم و هەڵمدەکوتایە سەر دوژمن، بە ناو کێڵگەی مین و بەربەستی دڕکاوی و هەموو ترۆهاتەکانی تردا دەڕۆیشتم و هاوارمدەکرد، لە ناو شریخەی دۆشکەو و دەنگی سەدان مەترەلۆزدا بە ناو ئاگردا ڕامدەکرد و پڕ بەدونیا هاوارەکانی ناو ژیانی خۆمم دووبارەدەکردەوە، لەو کاتانەدا کە هەزار تفەنگ تەقەیدەکرد، من پڕ بە گۆرەپانی خوێناوی ئەو جەنگانە دەمگووت «محەمەدی دڵشوشە تۆ لە کوێیت؟». هاوارمدەکرد «مارشاڵ، تۆ لە کوێیت.... پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان بۆ ناتگەمێ؟».

هێزەکەی ئێمە لەوانەبوو کەدیلی نەدەگرت، بیست کەس بووین لەوانەی بەقەد و قەڵافەت کەتەن، ریشیان درێژە و هەموو ترۆهاتەکانی تر، تا بناگوێمان لە شەڕدا نوقم بووبوو. مەسئولەکەمان هەمان ئەو کورە بوو کە بێ ئافرەت و خواردنەوەو ئەو شتانە نەدەژیا، ناوی «کەریمی شیرین» بوو، شەیتانیش بەتەواوەتی نەیدەزانی بۆ

ناوی کەریمی شیرینە، هەزار حکایەتی لەسەر بوو. یەکێک دەیگووت کاتی خۆی لە ساردەمەنی و شیرینی گولاڵە ئیشیکردووە، یەکێکی تر دەیگووت لە گەنجیدا حەزی لە قەحبەیەک بووە ناوی شیرین بووە، یەکێکی تر دەیگووت ژنێکی هەبووە کاتێک لێیان پرسیوە تامی چی دەدات؟ گووتوێتی «شیرینە، زۆر شیرینە»... خودایە هیچ کەسێکم نەبینیوە شەوان ئاوەها بۆ ئافرەت بگری. کە سەنگەرەکان خامۆشدەبوون ئەو دەگریا. ئەوکات کە مەسئولی ئێمە بوو ژنی نەبوو، بەڵام لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەو مەملەکەتەدا یەکێکی دەناسی. گەر جەنگ نەبایە من بە خۆم و کۆڵەپشتەکەمەوە پاڵمدەدا بە بەردێک یان درەختێکەوە و چامدەخواردەوە و ئەو باسی قەحبە گرنگەکانی ناو ژیانی خۆی بۆدەکردم، دەیگووت «سەناریا...ئای، سەریاسی سوبحەدەم، تۆ نایناسیت، ئەوە ڕۆحی دەرهێنام... تا دەهاتە ناو جێگاوە حەوت ڕۆحم دەردەکرد، خوشکێکی لە خۆی جوانتری هەبوو ناوی کەناریا بوو، لەو نەدەچوو هەر سەیرتبکردبایە لە باوەشتدابوو، بەڵام تامی ئەوی نەدەدا». «نەغەدە ژنی زەڕەنگەرێک بوو، لە هیچی کەم نەبوو، بەشەو کە مێردەکەی دەخەوت لە حەوشەکەی پشتەوەدا دەمانکرد، حەشەری وام لە فلیمیشدا نەدیوە، عەترێکی لە خۆی دەدا خوشکێکی لە نەمساوە بۆی دەنارد، پیاوی شێتدەکرد». «بەفرین کە لەوە ئەسمەرترم نەناسیوە، بەناوەکەی دەستخەڕۆ مەبە، سپی و شتی وا نەبوو، جوانترین قوونی هەبوو من دیبێتم، قوونێکی ڕەشی قەترانی بۆنی پاتۆنیای لێدەهات». چیرۆکەکانی بە جۆرێک دەگێڕایەوە کەس گومانی نەدەما. لە کاتی شەڕدا چاوی نەیدەبینی، دۆشکاکەی دەتەقاندو هاواری لەو قەحبانەدەکرد کە حەسرەتێکیان لە ژیانیدا بەجێهێشتووە. ئەو بە ئێمەی گووت دیل نەگرین، دەیگووت «هێزی ئێمە دیل ناگرێت، ئەوانەی دوای ئێمە، مشکە کوێرەکانی پشتەوەمان دیلدەگرن». سەرەتا تاکەتاکە

دیلمان دەگرت، دوایی ڕۆژێک بردیان و شەو درەنگ هێنایانەوە، گووتیان سەرۆک دەیەوێت لەسەر قەحبەکانی تەمێبکات، بەڵام هەمووی تڕوهات بوو، بردبوویان خەلاتیبکەن و کلومەلێک تڕوهاتی زۆری بدەنێ... کە هاتەوە تا نیوەشەو چایدەخواردەوە و باسی نانخواردن و تەوقەکردن و پێکەنینەکانی سەرۆکی دەکرد. لە دوای ئەوەوە فەرمانی پێدایین بە هیچ جۆرێک دیل نەگرین. پێشمەرگەکانی تر دەترسان دیلەکان بکوژن. نا موزەفەری سوبحەدەم، دروست نازانم کەی عادەتی دیل کوشتن لەو شەڕانەدا بڵاوبووەوە، بەڵام هەمووان دیلەکانی خۆیان دەکوشت... هەمووان ژمارەیەکی بچوک دیلیان دەهێشتەوە بەشی ئەوەبکات لە ڕێکەوتندا ڕوویان بێت بیانگۆڕنەوە.

موزەفەری سوبحەدەم لەو شەڕانەدا دیل کوشتن قانونی خۆی هەیە کە ئێمە نەماندەزانی، بە جۆرێک لە جۆرەکان دەبێت هەر دیلێک کە دەیکوژیت بیناسیت، دەبێت لە بەگزادە و ئاغازادەکان نەبێت، کوڕی سیاسەتمەدارە گەورەکان نەبێت، پشت و پەنایەکی نەبێت دوایی تۆڵەی ئەو لە گۆڕی بابوباپیرانت بکەنەوە. کەریمی شیرین ئەو قانونانەی نەدەزانی، یان بیری لێنەدەکردەوە، هەناسەی بۆ سۆزانییەکانی ژیانی هەڵدەکێشاو بە ئێمەی دەگووت «بیانکوژن». ڕۆژێکیان دیلێکمان گرت، کە نەدەبایە بیکوژین، منداڵێکی دوازدە ساڵ بوو باوکی هێنابووی سەنگەرەکانی پیشمانبدات، کوڕی خزمێکی نزیکی خانەوادەی سەرۆکی ئەوبەر بوو، یەکێک بوو لە زیرەکترین و نازکترین و خۆشەویستترین منداڵانی خانەوادە، لەوانەی لە پاشەڕۆژدا دەبن بە بەرپرسی مەکتەبەکانی حیزب لە ئیتالیا، لە فەرەنگستان، لە بەرازستان و حوشترستان ومەملەکەتەکانی تری دونیا کە من ناوەکانیان نازانم. کوڕێکی تابڵێی ناسک و بەئەدەب بوو، ئسوڵی لێدەباری. کە گرتمان لەو باوەڕەدا نەبوو بیکوژین، هەموو شتەکانی وەک یاری سەیردەکرد. من بە کەریمی

شیرینم گووت «بینێرەوە بۆ لای دایکی... ئەمە بە کەڵکی کوشتن نایەت... وازیلبهێنە بڕوا شیرو نەستەلەکەی خۆی بخوات». کەریمی شیرین ئەو ڕۆژە خەفەتی زۆربوو، گووتی «کوڕی باری تەعالابێت دەیکوژم... ئامۆزای حەزرەتی مەسیح بێت لە دەستم دەرناچێت». من دیسانەوە لە کەریمی شیرین پاڕامەوە «بابڕوات لەگەڵ خوشکەکانیدا چاوشارکێبکات... ئێستا دایکی چاوەڕوانێتی لە حەمامەکەدا بیشوات... وازیلێبهێنە بڕوات وەزیفەکەی بنوسێتەوە». ئەو دەیگووت «من وازم لە چلورە نەهێنا، کە پێیاندەگووت مریەمی کوردستان، کە کردبوویان بە خوای شەرەف و ئەخلاق، پێیاندەگووت ڕابیعەی عەدەوی.... وازم لێنەهێنا تا بە کامیلی حیجابەکەیەوە لەگەڵمدا خەوت، ئێستا چۆن واز لەمە بهێنم». ئەو نەیدەتوانی کوشتنی مرۆڤ و خەوتن لەگەڵ ئافرەتێکدا لەیەک جیابکاتەوە، خوێن هەمان ئەو لەزەتەی دەدایە کە ماچی ئافرەتێک پێیدەبەخشی، من ئەو ڕۆژە هەستێکی تاریکم هەبوو کە کوشتنی ئەو منداڵە کارەساتی گەورەی بەدوادا دێت، بە خۆم و ڕیش و کۆڵە پشتەکەوە چوومە بەر ئەو منداڵەو گووتم «یان منیش بکوژە، یان ناهێڵم بیکوژیت». درۆمدەکرد، من لە ناخی ناخدا هەمیشە ترسێکی سەخیفم لە مردن هەبووە، ئەگەر ترسێکی سەخیفم لە مردن نەبووایە دەبایە دوای مردنی سەریاسی مەزن خۆم بکوشتبایە. ئەو دەیگووت «تۆ ناکوژم، هاوڕێی خۆم ناکوژم، یەکێک ناکوژم، هەموو یادگارە خۆشەکانم لەگەڵدا باسکردبێت، بەڵام ئەوە دەکوژم».

«کەریمی شیرین» تەنیا ئەو شتانەی دەکرد کە خۆی دەیوسیت، کەمجار وەک بەرپرسێک ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردین، بەڵام هەندێجار دەبوو بە گورگێکی سەخیف. ئەو ڕۆژە لەو ڕۆژانەبوو کە مەزاجی باش نەبوو، کەسمان نەماندەتوانی قسەی لەگەڵ بکەین. «ساماڵی کونجی» کە لەدێرزەمانەوە پێشمەرگە بوو، لە هەموومان زیاتر قسەی

لەگەڵ کرد، ئەو لە هەمووان زیاتر دەیزانی کوشتنی ئەو منداڵە چەند خراپە، کە زانی کەریم بەقسەیناکات بە بێدەنگی چووە سەر بەردێک و سەیریدەکردین. ئێوارە درەنگ کەریم غافلبوونی هەموومانی بەفرسەت زانی و ئەو منداڵەی لە کاتی نانخواردنی ئێوارەدا کوشت، دیمەنێکی سەیر بوو، پێشتر لە ژیانمدا سفرەیەکی ئاوا خوێناویم نەبینیبوو، برنجەکە پڕبووبوو لە خوێن، نانەکە لە خوێندا شەلاڵ بوو. سەری چکۆلانەی ئەو منداڵە کەوتە سەر کۆشی من، بە هەموو خوێن و ئێسکە وردەکانییەوە کەوتە باوەشم، وەک ئەوەبوو باوەشم پیابکات یا شتێک، من لە شوێنی خۆم هەستام و برنجەکەم ڕشت، بە کەریمم گووت «تۆ ناهێڵیت نانەکەمان بخۆین». دەزانم قسەیەکی بێمانا بوو، بەڵام نەمدەزانی چی بڵێم. لەو ساتەدا سەیری ساماڵی کونجیم کرد و زانیم بیر لە چی دەکاتەوە. دوای دوو سەعاتی تر کە ئێمە خەریکی پێچانەوەی منداڵەکەبووین لە بەتانییەکەوە تا بینێژین، ساماڵ ونبوو. من چوومە سەر بەردێک و بە هەموویانم گووت «ساماڵ ڕایکردووە بۆ ئەوبەر چووە بۆ لای دوژمن، دەبێت ئەم جێگایە چۆڵبکەین... دەبێت هەر ئێستا ئەم جێگایە چۆڵبکەین». کەریمی شیرین کە پێیاندەگووت «ڕۆملی چیا» خەیاڵێکی تری لەسەردا بوو، خەیاڵێکی شەیتانی، ئەویش دڵنیابوو ساماڵی کونجی ڕایکردووە تا خۆی لای دوژمنانی ئەوبەر خۆشەویستبکات، دەیزانی شەو بە هێزێکی گەورەوە دێنە سەرمان، بۆسەیەکی گەورەی لەبەردەم کەپکەکانی خۆیاندا بۆدانان، یەعنی ئێمە هەموو هاتینە پێشەوە، هاتینە بەر لووتی دوژمن تا هەر لە کونەکانی خۆیان هاتنەدەرەوە لێیانبدەین. من هیچم لە پلان و ئەو جۆرە تروهاتانەی تر نەدەزانی، ئەوەندەم دەزانی دوژمن ببینم و تەقەی لێبکەم. ئەو شەوە تاریکترین و سامناکترین شەوی ژیانم بوو، نیوەشەو هێزێکی دوژمن بە گۆرانی گووتن لە کەپکەکانی خۆیان

هاتنەخـوارەوە، هــەر هەموویـان پێکـەوە «دیسـان بارانە»یـان دەگــووت، کـە گەیشـتنە بەردەممـان، مـن بـەو دەنگـە گـڕەی خۆمـەوە پـڕ بـە دونیـا قیڕانـدم «لێیانـدەن... لێێێێێێێـێ». مـن هاوارەکـەم تەواونەکردبـوو هەندێک لـەو بەسـتەزمانانە گەیشـتبوونەوە ئاسـمان بـۆ لای خـودای تەبـارەک وەتەعـالا. کارەسـاتی گـەورە ئەوکاتـە دەسـتی پێکـرد کـە یازدەیانمـان بـە زیندوویـی گـرت. ئـەو شـەوە حەزمدەکـرد کـەس بەزیندوویـی نەگریـن، چونکـە دەمزانـی کەریمـی شـیرین تـا دەیانکوژێـت یاریـان پێـدەکات.

یارییەکانـی لـە یـاری شـەیتان دەچـوون، هیـچ شـتێک وەک گرتنـی دیلێـک دڵیخـۆش نەدەکـرد.

ئـەو شـەوە ئێمـە هەموومـان وەکـو سـەگ ماندوبوویـن، هەمـوو گیانمـان خوێـن و باروت و تۆزبـوو، مـن هەمـوو ڕیشـم خوێـن بـوو. کـە گەیشـتینە یەکەمیـن چـەم خـۆم فڕێدایـە ئاوەکانـەوە، ئاگاداربـووم کـە ئاگرێکیـان کـردەوە، کاتێـک لـە ئاوەکـەدا بـە خـۆم و کۆڵـە پشـتەکەوە مەلەمدەکـرد، دەنگـە دەنگـی بارگـە خسـتنی ئـەوان و حەپـەی دووری هەنـدێ سـەگی بـەرەڵا هەسـتێکی تیادروسـتدەکردم لـە مێژبـوو هەسـتم پێنەکردبوو، هەسـت بـە جوانـی سروشـت، جوانـی شـەو، جوانـی ژیـان... کـە هاتمـەدەرەوە لـەدوورەوە لەسـەر بەردێـک دانیشـتم و گوێـم لێبـوو کەریمـی شـیرین لـە دیلـەکان دەدا، دونیـا بەجۆرێـک فێنـک بـوو، بـە جۆریـک دڵنەوازبـوو، وەک ئـەوەی پاکـی هـەوا، ڕۆشـنی شـەو و ئارامـی ئـەو زەمینانـە، پوچـی ئـەو شـەڕانەمان نیشـانبدەن... هەسـتدەکەم فێنکـی ئـەو شـەوە زۆر شـتی لـە منـدا گـۆڕی، مـن لـەدوای کوشـتنی ئـەو منداڵـەوە لـە ئێوارێـدا شـتێک لـە دڵمـدا شـکابوو، بـەڵام تـازە زۆر درەنـگ بـوو. پێشـمەرگەکانی ئێمـە هەلهەلـەی سـەرکەوتنیان لێـدەدا، لـە بـەر ئـەو ئاگـرە هەڵدەپەڕیـن. مـن ڕیشـی خۆمـم بـە پشـتێنەکەم وشـکدەکردەوە و هیچـم نەدەکـرد. ئاگاداربووم کەریمـی شـیرین دەسـتدەکات بـە یاریکـردن بـە دیلـەکان، دڵنیابـووم تـا

ڕۆژدەبێتەوە دەیانکوژێت، بەڵام نەمدەزانی چۆن.

من پێمگووتن یارییەکانی لە یاری شەیتان دەچوون.

ئاگاداربووم دیلێکی دەرهێنا و پێیگووت «ئەمشەو یارییەکی خۆشدەکەین، یارییەکی زۆر خۆش، ڕەفیقەکانت دەبەستمەوە بەو دارەوە، ئەو دارە دەبینی، زۆر دوور نییە، تۆش نیشانە لە تەختی ناوچاوانیان دەگریتەوە، بەس تەختی ناوچاوان، شوێنی تر حیساب نییە، تا فیشەکەکان بەر ناوچاوان بکەوێت، تفەنگەکە بەدەست خۆتەوە دەبێت، کە لێتنەدا، ئیتر سەرەی خۆتە بچیتە بەر دارەکە... تێگەیشتی، لەدواجاردا یەک کەس ڕزگاری دەبێت، من حەزدەکەم تۆ بیت». گەنجێکی باریکەلە بوو، لەبەر ڕووناکی ئاگرەکەدا نەمدەتوانی بە جوانی بیبینم. پشتێنەکەم بەدەستمەوەبوو، دەمهێنا بەسەر و ڕیشمدا، هەستم بەساردی جلە تەڕەکانم دەکرد لەسەر لەشم، بەڵام نەمدەویست لە ئاگرەکە نزیکببمەوە. لە دوورەوە هاوارمکرد «تفەنگی مەدەرە دەست، تفەنگی مەدەرە دەست، شتی وامەکە» دەمزانی لەو سەرکەوتن و خۆشیدا هیچی لەیادنامێنێت. بە دەنگی بەرز پێدەکەنی و گووتی «سەریاسی سوبحدەم، مەترسە... ئەمشەو، شەوی خۆمانە». ئەوە دواهەمین جاری بوو پێیبکەنێت... ئیتر دوانەوە هەتاهەتایە پێنەکەنی. من شتەکانم بە ڕوونی نەبینی، ساتێکی کورت بوو، دانەویمەوە قەیتانی پۆستاڵەکانم گرێبدەمەوە، گوێم لەتەقەکان بوو. دواتر باسی ئەو وەرچەرخانە کوشندەی دیلەکەیان بۆکردم کە لەبری ئەوەی تەقە لە براکانی خۆی بکات، تەقەی لە کەریمی شیرین و دووانی دیکە کرد. هەمووی ساتێک بوو، ساتێکی کورت. هێندە کورت من حیسابم بۆ ناکرێت. گوێم لێبوو یەکێک لە نزیک ئاگرەکەوە قیڕانی «کەریمیان کوشت». لە چاوتروکانێکدا گوێم لە دەنگی میل هێنانەوەیەکی زۆر بوو، ئێستاش شتەکان وەک کۆمەڵێک وێنەی بروسکەیی و خێرا لە

پێشچاومە، ئێستاش تەقە و ناڵە و قیرەکان بە تێکەڵاوی لە خەیاڵمدان، بەو ریش و پرچە تەڕەوە، بەو کۆڵە پشتەوە کە ئاو قورسی کردبوو، وەرچەرخام و پەلاماری تفەنگەکەمم دا، کە ئاوڕمدەدایەوە دەمبینی دیلەکان لە تاریکیدا ڕادەکەن، دەمبینی ئەو کوڕە گەنجە تەقەدەکات و پێشمەرگەکانی ئێمە شێتانە پەرتەوازەدەبن و لە سەر ئەرزەکە دەکەون و میلدەهێننەوە، من زامنەکەم دەترازاند و تەقەمدەکرد، گوێم لێبوو، یەکێک لە تاریکیدا هاواردەکات «وای کوژرام». شێتانە دەکەوتینە سەر دیلەکان... لە ژیانمدا وەحشییەتی وەک ئەو شەوە نەژیاوم، دەکەوتینە دوایان و بەقەمە و گوللە داماندەپاچین، دەکەوتینە سەر ئەو برا بچوک و بێگوناهانەی قسەیەکمان لەگەڵدا نەگۆڕیبوونەوە، ئەوانەی بە زمانی خۆمان هاواریاندەکرد «مەمانکوژن»... وایاندەگووت و ئێمە قەمەکانمان دەکرد بەسەر دڵیاندا، خەنجەرە تیژەکانی خۆمانمان دەکرد بە ژێر چەناگەیاندا، ئەوانەی کە بەردەوامبوون لە ڕاکردندا بە گوللە دەمانبێژان. دوو برایان تێدابوو، من یەکێکیانم گرت و خەنجەرەکەم خستە سەر ملی، پێشئەوەی سەرییبڕم هاواری لە براکەی کرد «شەهاب تۆ ڕاکە... بچۆرەوە بۆ لای دایکم... مەوەستە یەکسەر بچۆرەوە بۆ لای داییییی» بەر لەوەی ڕستەکەی تەواوبکات، تیغی من گەیشتبووە سەر هەناسەی. ئەو شەوەی خۆمم بیرناچێتەوە ئاو لە ڕیشم دەتکاو و بە دوو چاوەوە ئاگری لێدەهاتەدەرێ، پڕ بە شەو قیراندم «مەهێڵن دەرباز بن... مەهێڵڵڵڵڵن». هەموو ئەوانەی شەوێک لە بەرەیەک لە بەرەکانی شەڕی ناوخۆدا بەشداریانکردووە ئەو هاوارانەی منیان دەناسییەوە. کەس نەبوو قریشکەکانی سەریاسی لەو شاخ و دۆڵانەدا نەبیستبێت. ئەو قریشکانەی دەیانگووت لە قریشکەی پڵنگێکی برسی دەچێت. ئەو هاوارەم بە جۆرێ سەیرو بەهێزبوو لە هەموو دەشت و چیاو دەربەندەکاندا دەنگیدایەوە، ئێستاش هەستدەکەم بەردەوام لەو دۆڵ و

دوند و پێدەشتە و گەلییانەدا دەڕوات و دەنگدەداتەوە. ئەوە دواهەمین و گەورەترین هاواری ژیانی من بوو. ئێستا زۆر شتی ئەو شەوەم لەیادنەماوە. بەڵام هێشتا ئەو هاوارە لەگوێچکەمدا دەزرینگێتەوە. شەوێکی تاریک بوو، هەموو ئەو کوشتارە لە زوڵمەتێکی تەواوەتیدا ڕوویدا، کەس نەیدەزانی کێ دەکوژێت، دەموچاوی ئەو دیلانەمان نەدەبینی، کە دەنیشتینە سەریان و لە ناو گیاو بەردەلان و وردە زیخی کەنار ئەو چەمەدا سەرماندەبڕین. ئێستا ئەوەندەم لەیادە بە درێژایی ئەو شەوە تەکانمدەدا، دووان نەبێت لە تاریکییدا دەربازبوون، هەموو دیلەکانمان کوشت، بەڵام خۆشمان بە جۆرێک پەرتەوازەبووبووین تا بەربەیان نەگەیشتینەوە سەر شوێنی بارگەو بناوانی یەکەمجارمان. لەگەڵ تاریک و ڕووندا من گەیشتمەوە سەر مەیتەکەی کەریمی شیرین، ئەو بەدرێژایی شەو پاشماوەی دواهەمین پێکەنینی لە ڕوخساری خۆیدا هەڵگرتبوو، هێشتا سێبەری ئەو حەرفانە لەسەر لێوی بوون کە گووتی «ئەمشەو شەوی خۆمانە...». سەعاتەکەیم داکەند و دەستمکرد بەگیرفانیدا تا شتەکانی بۆ هەڵگرم، گیرفانی یەک مەمکدانی شینی تیابوو، دیاربوو خاوەنەکەی جووتێک مەمکی زۆر چکۆلەی هەبووە، پارچە کاغەزێک لەناو مەمکدانەکەدا بوو، دەستێکی کچانە کە پێدەچوو خوێندەوارییەکی تەواوی نەبێت نوسیبووی «کەریم گیان بۆ تۆ، بەیادی شەوی ناو حەمامەکە». من مەمکدان و نامەکەم فڕێداو بە پێشمەرگەکانم گووت «لە ئێستاوە تادەگەینەوە لای هێزەکان من مەسئولتانم».

نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە فەرمانیان پێداین بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان، من لە جیهازەکەوە هەوڵمدا تێیانبگەێنم کە مەترسییەکی گەورەمان لەسەرە، بەڵام گووتیان «ئەمری مەکتەبی عەسکەرییە». من لەو ترۆهاتانە

تێنەدەگەیشتم، لە جیهازەکەدا قیڕاندم «بە مەکتەبی عەسکەری بڵێن، بابێن بە قونی خۆیان دیفاع لەم کەپکە خوێڕییە بکەن کە دەیانەوێت ئێمەی تیا بکوژرێین». من دڵنیابووم هەموومان لەو کەپکەدا تەواو دەبین. دڵم بەخۆم نەدەسووتا، بەڵام دڵم بەو گەنجانە دەسووتا کە هەندێکیان تازە فێربووبوون خەون ببینن. سەعاتێک دواتر جیهازێکیان بۆکردین و گووتیان «گەر نەگەڕێنەوە شوێنی خۆتان... حیزب هەمووتان ئیعدامدەکات». من بەدەنگێکی نووساو و گریاو کە هەموو عەدەد جیهازەکانی دونیا گوێیان لێبوو هاوارمکرد «من میزدەکەم بە حیزبدا... میز». وامگووت و بەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە بەهەموو پێشمەرگەکانم گووت «گوێم لێبگرن، حیزب دەیەوێت هەموومان لێرەدا وەک سەگ بتۆپێین... ئێمە چۆن ئەمشەو ئەوانمان سەربڕی، ئەمشەو ئەوانیش سەرماندەبڕنەوە، لەمشەڕەدا کەس لەوی تر شەریفتر نییە، تێدەگەن. ئێوە هەمووتان شەڕتان دیوە... شەوێک تۆ هێرشدەبەیت و شەوێک ئەوان، ئەمشەو هەمووتسان دەکوژن، بەقسەی من بکەن، من بەتەنیا دەگەڕێمەوە بۆئەو کەپکە، من دەمێکە باکم بەزۆر شت نەماوە، ئازا نیم، وامەزانن ئازاو تڕوهات و ئەو شتە قۆڕانەم، بەقەد مشکێک و زیاتریش لە مردن دەترسم، بەڵام کەستان وەک من نائومێد نیین، حیزب بڕیاریداوە لەم کەپکە خوێڕییەدا شەهیدی هەبێت تا دوایی چلەیان بۆبکات و هەموو ئەو تڕوهاتانەی تر. من وەک هەمووتان لە مردن دەترسم، لە ئێوەش زیاتر لە مردن دەترسم، بەڵام نامەوێت کەستان لەویادا بکوژرێن، بڕۆنەوە بۆ لای دایکتان، ئەوەی دەتوانێت نەگەڕێتەوە بۆ ئەم شەڕە با قەت نەیەتەوە، ئەوەی دەتوانێت بڕوات و نەیەتەوە بەم مەملەکەتەدا بابڕوات و نەیەتەوە، ئەوەی پارەی هەیە و دەتوانێت ئیشێکی تر بکات با ئیشێکی تربکات». من پێشتر بەوجۆرە بیرم نەکردبووەوە، بەڵام هەموو ڕووداوەکانی ڕۆژی پێشتر

لەوە پیستریبوون بتوانم وەک جاران ئەهریمەنانە بژیم. لەو ساتەدا ئەو قسانەی سەریاسی گەورەم لە پێشچاو بوو کە باسی مرۆڤی مەزنی دەکرد. بۆ یەکجار دەمویست ببم بە مرۆڤێکی مەزن. دواجار دەمویست بە کەمترین خوێن ئەو کەپکە خوێڕییە بدەم بە دەستەوە کە دڵنیابووم حیزب دواتر ناشیکات بە ئاودەستخانە. دڵنیابووم ئەمشەو هەموو ئەو کوڕە گەنجانە سەردەبڕن، وێنەی لاشەکانیان لەناو ئەو بەردەڵان و گیاو خۆڵە گەرمەی هاویندا دەهاتە بەرچاوم. هەموویانم یەکە یەکە بە مردوویی دەبینی. دەمزانی ئەو دوو دیلەی کە لە تاریکییدا هەڵهاتن هەموو شتێک لەسەر هەمووومان دەزانن، دەمزانی سەنگەرەکانی دوژمن لەوبەرەوە هاوار و قیڕە دووروودرێژەکانی منیان ناسیوەتەوە. ئەو شەوە هەموو پێشمەرگەکان ڕۆیشتن، دوانیان نەبێت کە سووربوون لەگەڵ مندا بمرن. شەو لە سەر ئەو کەپکە غەمگینە سێ بە سێ دانیشتین و چاوەڕوانی هاتنی دوژمنمان دەکرد. شەوێکی گەرم بوو، دونیا یەک پارچە مێشوولەبوو. نزیکی نیوەشەو هەستمان پێکردن، خۆیان بوون، دوژمن بوو بە هەموو هێزو تفاقێکی خۆیەوە هاتبوو، تۆڵەی شەهیدەکانی بکاتەوە. سەرەتا بە هاوەن دایانگرتینەوە، بەڵام ئێمە باکمان نەبوو، خۆمان لەسەر دۆشکەکانمان متکردبوو، دەوری سەعات یەکی بەیانی پەلاماریاندایین، بڕیارمدابوو دواهەمین شەڕی ژیانم بە شەرەفەوە بکەم، هەر سێکمان تادوا فیشەک لە شوێنەکانی خۆمان هەڵنەستاین، نزیکی سەعات سێ ئێمە گوللەمان پێنەما. نزیکی سەعات چوار سامالی کونجی کە بووبوو بە چاوساغی دوژمن لە بن بەردێکی نزیکەوە هاواری لێکردم «سەریاسی سوبحدەم، دەزانم فیشەکتان پێنەماوە... تەسلیم بن، وەرنەخوارێ، من وەعدی شەرەفتان دەدەمێ ناتانکوژن». ئەوکاتەی ئەو وایدەگووت من و دووانەکەی تر سەعاتێک بوو، پاڵکەوتبووین و دەستمانکردبووە ملی یەک و سەیری

ئەستێرەکانمان دەکرد. خودایە ئەوە چی نەریتێکی پیس بوو لە شەڕی ئەم مەملەکەتەدا بەردەوام بە دیلەکانیان دەگووت «وەعدی شەرەف وەرنەخواریێ، هیچتان لێناکەین». من بە دوو پێشمەرگەکەی ترم گووت با گۆرانییەکی کامکارەکان بڵێین. من لە مێژبوو گۆرانی کامکارەکانم نەگووتبوو، لەدوای مردنی سەرباسی سوبحەمەوە هەموو ئەو شتانەم وازلێهێنابوو، ئەوشەوە هەرسێکمان گۆرانییەکی کامکارەکانمان گووت. کە دوژمن گەیشتە سەرمان ئێمە گۆرانیمان دەگووت. کە ئێمەیان داگرتەخواریێ، دەستیانکردە ملی من و گووتیان «تۆ شتێکی تریت... شتێکی تر». ساردییەکی قوتویان دامێ و من خۆشحاڵانە دەمخواردەوەو پێدەکەنیم، لەوکاتەدا کە من وەک گەمژە سەیری ئەو پاسەوانانەی دوژمنم دەکرد و ساردیم دەخواردەوە، هەردوو هاوڕێکەمیان بردە نزیک بەردێکی دیکە لەولاوەو بە دوو دەستڕێژی کورت حسابیان بۆکردن. شتەکان بە خێراییەکی بێمەعنا تێپەڕین، من هەستمدەکرد کە ڕەوتی دونیا بە جۆرێکی سەیر خێرا دەڕوات. ئەوە دەنگی دواهەمین دەسڕێژ بوو لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا گوێم لێبووبێت، وەک دەسڕێژەکانی تر ساردو ڕەق و ترسناک نەبوو، بەڵکو لە دەنگی باڵندەیەکی برینداردەچوو بخوێنێت، لەقاسپەی کەوێکی زامدار دەچوو، بە منیان گووت «سەرباسی سوبحەم... تۆ حسابێکی ترت هەیە... تۆ شتێکی تریت».

لەو ساتەدا زانیم من ناکوژن، بەڵکو بۆ شتێکی سەختتر لە مردن ئامادەمدەکەن......

ئەوکات کە کۆڵە پشتەکەیان لێسەندم و نیتاقەکەیان کردمەوە و پشتێنەکەیان کردمەوە و پێڵاوەکانیان لە پێ داکەنم ، تێگەیشتم ئیدی جەنگ لە ژیانی مندا بۆهەتاهەتایە کۆتایی پێهاتووە. دیارە موزەفەری سوبحەم جەنگ بە شێوەی جۆراوجۆر درێژەی هەیە، ئەو ڕۆژەی کە منیان بردە تەلەفزیۆن تا هەموو نهێنییەکانی خۆم لە شەڕدا باسبکەم،

ئەوەش بەشێک بوو لە جەنگ، بەڵام ئەوانەی کە تەنیا شەڕی ناو سەنگەر و هاوار و ڕاکردنی ژێر بارانی گوللەیان تاقیکردۆتەوە زۆریان دەوێت تا لە جۆرەکانی تری شەڕ تێدەگەن کە لە شەڕی ڕووبەڕووی ناو جەنگەڵ پیستر و چڵکنترن. من پێتدەڵێم شەڕی پیاوانی عاقڵ سەد هەزار جار لە شەڕی پیاوانی کێوی و ڕامنەکراوی وەک ئێمە چەپەڵترە، من پێتدەڵێم بۆ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێت.

کە منیان برد بۆ تەلەفزیۆن، لەوەو پێش لەبەردەم کامێرادا نەوەستابووم، هەستیشم نەدەکرد ببمە پیاوێکی ئەوتۆ گرنگ بە کۆمەڵێک کامێرای گەورە وێنەمبگرن، بەڵام ئەو ڕۆژە تیمێکی تەواویان هێناو بە هەمووان وێنەیان دەگرتم. هەرچییەکم دەزانی لە پێشدەم کامێراکاندا گێڕامەوە، بەدرێژیی باسی هەموو شەڕەکانم کرد، لە باسی ئەو دیلانەوە کە کوشتوومانن تا باسی سۆزانییە غەمگینەکانی کەریمی شیرین، چۆن چیرۆکەکان بۆ تۆ دەگێڕمەوە، بێباک لەبەردەم کامێراکاندا دانیشتم و هەموو شتێکم گێڕایەوە، هەموو نوکتەو ترۆماتەکان، هەموو ئەو گفتوگۆیانەی کە لە ژیانمدا بیستبووم، ئەو قسانەی لە دیواخانەکەی «کەیخوسرەو ئاغای سوفیان ئاغای سەدری ئەرحەمی» بیستبووم، ئەو نوکتانەی گەچکارەکان لە بوراق دەیانگێڕایەوە، چیرۆکی پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمان، مردنی محەمەدی دڵشوشە. قسەبێژێک چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکردم لەوانەی مرۆڤ وادەزانێت شەویش بە قات و بۆینباخەوە دەخەون، کوڕێکی شیرین بوو، پێیدەگووتم قسەبکە بە ئارەزووی خۆت قسەبکە، دوایی خۆمان مۆنتاژیدەکەین، چەند جار ئەو وشەیەی بەکاربهێنایە من ڕیشم دەخوراندو لێمدەپرسی«مۆنتاژ یەعنی چی؟». ئەو دەیگووت یەعنی ئەوەی قسە زیادەکان دەبڕین و فلیمەکە دەنێینەوە دەم یەک بە جۆرێک کەرتبوون و دابڕانی تیانەبێت. من بەرامبەر کامێراکە دادەنیشتم و بەئارەزووی خۆم هەموو ژیانی خۆمم

دەگێڕایەوە، هەندێ جار ئەو بە شێت و شتم تێدەگەیشت، بەردەوام یەک دوو پرسیاری دووبارەدەکردەوە، من باسی دواهەمین هەناری دونیامدەکرد ئەو دەیپرسی «ئەی ئەو کات پەیوەندیت بە جاش و خۆفرۆشەکانەوە چی بوو؟». من دەمگووت «هیچ پەیوەندیم نەبوو، پەیوەندی چی... من ئەوکات هاوڕێی مارشاڵ بووم، هاوڕێی پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکان بووم، دواهەمین هەناری دونیا هەقی جاش و خۆفرۆش و ئەو تروهاتانەی چییە؟». قسەبێژەکە کە نە ناوی مارشاڵ، نە پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکانمانی بیستبوو، بێئەوەی خۆی تێکبدات. دەیگووت «ئەی وەک بزانی ئەوکات چەکیان لە حکومەتەوە بۆ دەهات؟». من دەمگووت «نا ئەوکات پەتاتەو تەماتەو ئەو شتانەیان لە حکومەتەوە بۆدەهات سەرپاسی مەزن بەیانیان لە عەلوەکە وەریدەگرت و دەیفرۆشت». من هەرچییەکم دەگووت، ئەو بەدەست ئامازەیدەدامێ تا بەردەوامبم. ئەو دەیگووت «مەترسە، دوایی خۆمان مۆنتاژیدەکەین». هەر شریتێکمان پڕدەکردەوە، پشوویەکمان دەداو چایەکمان دەخواردەوە. لە پشووەکاندا هەموو ماچیاندەکردم و دەیانگووت «قسەکانی تۆ دۆکۆمێنتێکی زۆر گرنگە بۆ حیزب، پشتی ئەو خۆفرۆشانە دەشکێنێت». من پێشم دەخوراند و دەمگووت «دۆکۆمێنت یەعنی چی؟». پێیاندەگووتم «یەعنی بەڵگەنامە... یەعنی ئەوەی گەر ئەو جاشانەی ئەوبەر گووتیان ئێمە شتی وامان نەکردووە، ئەم قسانە دەخەینە بەردەستیان و دەڵێین، تەماشاکەن ئەمە قسەی چەکدارەکەی خۆتانە... ئێمە ئەو فلیمە دەدەین بە هەموو دونیا، بەدەرەوە، بە وڵاتە دراوسێکان، بە نەتەوەیەکگرتووەکان، بە فەخامەتی سەرۆک دەوڵەتەکان، بە دادگای نێودەوڵەتی، بە کۆنگرەی ئیسلامی، بە فاتیکان....».

من لە منداڵیدا جارێک وێنەکەم لە ناوگەلی سەرۆکدا بە هەموو وڵاتدا بڵاوبووبووەوە، ئێستاش ئەم وێنانەم بە سەرتاسەری دونیادا

دەڕۆیشت، لە ڕاستیدا خۆشحاڵنەبووم بەوەی وێنەکانم بەوجۆرە دەڕوات، خۆشحاڵنەبووم کاتێک ئەو هەموو تروهاتە دەگێڕمەوە، مەلاکانی دونیاو حەزرەتی پاپا بمبینن. کە دڵنیابووم ئەو کاسێتانە دەبرێت بۆ شوێنی ترو خەڵکانی لە من و تۆ گرنگتر گوێیان لێیدەبێت، پتر لەسەر شەڕەکان قسەمدەکرد، چی شتێکم لەسەر دڕندەیی و وەحشییەتی جەنگەکان دەزانی گێڕامەوە، زووزوو ڕووەدەکردە قسە بێژەکەو دەمگووت "هەر ئێمە وانەبووین، ئێوەش لە ئێمە شەریفتر نەبوون... لەم شەڕەدا کەس لە کەس شەریفتر نییە". حەزمدەکرد شتێک بکەم خەڵکی لەو شەڕانە بترسن، شتێک بگێڕمەوە خەڵکی شەرمبکەن. من لە دواییدا بەو کوڕەم گووت "کە شریتەکانتان پیشاندا پێمبڵێن باسەیریبکەم". دیارە قسەکەم تروهاتێکی گەورەبوو، لەدوای تۆمارکردنی کاسێتەکانەوە ئیتر نە چاو نە ساردیم نەخواردەوە، هەر ئەو شەوە بە دەست وچاوی بەستراوەوە بردیانم بۆ زیندانێکی بچوک و پێیانگووتم "تا سبەی لێرەدا دانیشە، بەیانی خۆمان دەزانین دەتبەین بۆ چ جەنەت و لالەزارێک". شەوی دواتر منیان هێنایە ئەم قەڵایەوە. ئەم قەڵا تاریک و بێدەنگ و دووردەستە، لەو ڕۆژەوە ئیتر جگە لە پاسەوانەکان کەسی ترم نەبینیوە، نازانم ئایا شریتەکانم لێدراوە یاخود نا. نازانم کەس گوێی لە من بووە کاتێک چیرۆکی مردنی سەریاس و محەمەدی دڵشوشە دەگێڕمەوە یاخود نا؟ گەر کاسێتەکانم پەخشکرابێت یان نا، من ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ باوەشی ئەو دونیای جاران، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان بەریاندام، دەڕۆم بۆ وڵاتێکی تر، لە مەملەکەتێکی تر ژندەهێنم و ناوی خۆم دەگۆڕم... موزەفەری سوبحدەم گەر بەربووم کارێکدەکەم نەمدۆزیتەوە، دەزانم شتێکی بێمانایە من و تۆ دەستبکەینە ملی یەک و تۆ پێمبڵێیت "وای سەریاس گیان... وای کوڕی شیرینم"، من دەستبکەمە ملی تۆ و بڵێم "وای بابەگیان... وای". گەر شتێکی وابێت

مـن لـه شـەرم و قێـز و تەریقیدا دەمـرم. هەسـتدەکەم ژیانـی هەردووکمـان لـەوە ناشـیرینتره بەرگـەی گوناهـی وابگرێـت. وانییـه موزەفـەری سـوبحدەم، وانییـه؟ ژیانـی هەردووکمـان لـەوە ناشـیرینتره بەرگـەی خۆشەویسـتییەکی لەوجـۆره بگرێـت.

# ١٧

تاماوەیەکـی درێـژ مـن و سەریاسـی سـوبحەدەم کاسـێتمان دەگۆڕییـەوە، دواهەمیـن کاسـێتم لـە پاتـراوە بۆ نـارد. شـتێکی زۆر لـە غـەم و گاڵتەجـاری، لـە زیرەکـی و سـاویلکەیی لـە دەنگـی ئـەو کـوڕەدا هەبـوو، هەمـوو جارێـک ئـەوەی دووبارەدەکـردەوە کـە نایەوێـت مـن ببینێـت. بـۆ جارێکیـش چییـە لێـی نەپرسـیم لـەدەرەوە چـی ڕوودەدات، لـەو زینـدان تاریـک و تەنیایـەی خۆیـەوە ئارەزوویەکـی بـۆ دونیـا نەمابـوو، تەنیـا لـە نـاو یادگارەکانیـدا دەژیـا. دڵنیـام گـەر هـات و ڕۆژێـک لـەو زیندانـە هاتـە دەرەوە، شـوێنێکی دوور هەڵدەبژێرێـت، شـوێنێک جگـە لـە یـادگارەکان کەسـی دی دەسـتی پیاڕانـەگات.

مـن لـەو کاسـێتانەی ئـەوەوە بۆنـی ئـەوەم کـرد، جگـە لـە خـۆی سەریاسـێکی دیکـەش هەیـە، جگـە لـەو کەسـانێکی تـر هـەن کـە مـن هیچیـان لەبـارەوە نازانـم. ئـەوە گینگڵێکـی کوشـندەی لـە ڕۆحـدا بـۆ سـازکردم، نائاسـوودەییەکی بـۆ هێنـام گەورەتـر بـوو لـە نائاسـوودەیی ئـەو ڕۆژانـەی بـەدوای سـێبەری سەریاسـی دووهەمـدا دەگـەڕام. مـن لـەو شـەوانەدا دەمپرسـی «خوایە من کەوتوومـە نـاو چ دونیایەکـی خەیاڵییـەوە، کەوتوومـە کوێـی ئـەم وجـودەوە کـە مەخلوقاتـەکان بـەو شـێوە تیادەشـکێن و پارچەپارچەدەبـن و هەریەکەیـان دەکەونـە گۆشـەیەکەوە لـە هیـچ گۆشـەیەکی تـرەوە دیارنییـە؟».

ئەو لە هەموو کاسێتەکاندا بە منی دەگووت «بڕۆ و نەدیمی شازادە بدۆزەرەوە... نەدیمی شازادە نهێنییەکان دەزانێت». ئەو کاتەی من گەڕامەوە نەدیم لە گەشتێکی درێژ بوو، چەندەها مانگ بوو کەس نەیبینیبوو. دەبایە لە جێگایەکی دیکەوە دەست پێبکەم. من هەرگیز نەدیمی شازادەم نەبینی، دەزانم بەجێهێشتنی کوردستان بەبێ بینینی نەدیمی شازادە، گەلەک نهێنی و سیمای ئەو ڕۆژگارانەی وەک نادیار و نهێنی هێشتەوە، دەزانم دەکرا نەدیمی شازادە هەندێ لاپەڕەی نهێنی ئەو سەردەمەم پێبڵێت کە جگە لەو کوێرە هیچ کەسێکی دی نەیدەزانی. بەڵام پێدەچوو دەستێکی تاریک من لەهەموو ئەو سەرچاوانە داببڕێت کە بە قووڵی دەچوونەوە سەر ڕۆژە تاریک و تایبەتییەکانی ئەو منداڵانە، نەدیمیش یەکێک بوو لەو سێ منداڵەی لەسەرەتای سەرەتاوە لەگەڵ نهێنییەکاندا هاتبوو، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر لەناو تەپوتۆزی ڕۆژەکاندا خنکاو شوێن و ئاسەواریم نەدۆزییەوە... هەموو ئەو شوێنانەی بۆ گەڕام کە دەشێت تیا بگەڕێیت، ئیکرام دونیای بەدوادا تەیکرد و نەیدۆزییەوە. وەک ئەوەی نەدیم هیچ نەبێت جگە لە خەیاڵێک، جگە لە تەمێک کە لە چیرۆکێکەوە دێت و لە دنیادا پەخشدەبێتەوە و دەمرێت. ئا دۆستان، من هەرگیز نەدیمم نەدۆزییەوە، بۆیە دەبایە ڕێگایەکی تر بگرمەبەر.

من دەبایە بچم بۆ لای سەی جەلالی شەمس.

کە یەکەمجار ناوی ئەو پیاوەم لە کاسێتەکانی سەریاسدا گوێ لێبوو، ناوێکی ئاشنا هاتەبەرگوێم، ناوێک وەک ئەوەی لەوەوبەر بیستبێتم و دواتر لە جەهەنەمی یادەوەرییەکانمدا سووتابێت. من وەک هەموو ئەوانەی لە ساتێکدا پێویستیان بە گەڕان دەبێت لە خاشاکی یادگارەکانیاندا، لە خۆڵەمێشی ئەو سەردەمانەدا کە دەبایە جارێک وێنەکانیان لە یادبەرنەوە، ئاوەها ناو تاریکترین و دوورترین شوێنی

یادەوەریـم دەگـەڕام. ئـەو نـاوە شـتێکی پێدەگوتـم دروسـت نەمدەزانـی چییـە. شـەوێکیان ئیکرامـی کێـو، بـە خـۆی و ڕوخسـارە ئاسمانییەکەیەوە هـات... لـە فریشـتەیەکی گـەورە دەچـوو لـە ڕیواقەکانـی ئاسماندا خەریکی جێبەجێکردنـی کاروبـاری فریشـتەکانی تـر بێـت، ئـەو شـەوە بۆنێکـی هێنـدە سـەیری هەبـوو واتێدەگەیشـتم ئـەو چرکەیـە لـە ئاسـمانەوە دابەزیـوە، هەستتدەکرد لەگـەڵ دەرکەوتنیـدا کۆمەڵێـک ڕۆحـی ئاسماننشـینی دیکـە ئەو جێگایـە پڕدەکـەن. لەسـەرۆکی مەلایکەتـە ئـارام و بێدەنگـەکان دەچـوو، ئـەو لەشـە گـەورە و نائاسـاییەی نەبووبـوو بـە ڕێگـر لـەوەی دیمەنـی پەپولەیەکـی سـووکەڵەی تیاببینیـت. بەیەکێـک دەچـوو دۆسـییەی ژمارەیەکـی زۆر لـە مەخلوقاتـی بەدەسـت بێـت، بـەڵام هێمنـی و شـەرم و ئارامـی وای لێبـکات لەنـاو جەنجاڵـی دونیـادا بەئاسـانی نەناسـرێتەوە. ئـەو هەنـدێ شـەو دەهـات و لەگەڵمـدا دەمایـەوە، پێکـەوە بـەرەو نـاو کێڵگـە و دەشـتە تاریکـەکان دەڕۆیشـتین، دوو پیـاوی لەسـەرەخۆبووین تاریکـی کردبوویینـی بـە هـاوڕێ، هەندێجـار لەگـەڵ منـدا گوێـی لـە کاسـێتەکان دەگـرت، هەندێجاریـش چەنددەهـا ڕۆژ ونـدەبـوو و نەمدەبینییـەوە. هەمیشـە حەسـرەتی ئـەوەم هەیـە کـە بـە ئەنـدازەی پێویسـت ئیکرامـی کێـوم نەبینـی، ئـەو لـەو کەسـانەیە بـۆ ئـەوەی کەماڵـی جوانیـان ببینیـت، دەبایـە هەمیشـە لەگەڵیانـدا بیـت. لـەو کەسـانەبوو هـەر دوورییـەک لێـی لەدەسـتچوونی سـاتێکی جوانـی و گەورەیـی بـوو، نائومێـدی گـەورەی لـە ئینسـان ڕێـگای لـەوە نەگرتبـوو خـۆی تـا دوا ئەنـدازە مـرۆڤ بێـت. هەمـوو جارێـک پێمدەگـووت «ئیکرامـی کێـو تـۆ لـە کوێیـت؟ بـۆ نایەیـت... بـۆ؟». قسـەیدەکرد و سـێبەری شـەرمێکی تەنـک لەسـەر سـیمای بـوو، دەیگـووت «موزەفـەری سـوبحەدەم، ئـەم وڵاتـە پـڕە لـە کەسـانی کەسـاس، لەوانـەی بەتەنیـا ناتوانـن ئـازار و دەرد و برینەکانـی خۆیـان تیماربکـەن، تـا مـن هیچـی ئەوتـۆم بـۆ ناکرێـت، مـن هیچـم بـۆ ناکرێـت، بـەڵام هەسـتدەکەم دەبێـت بـڕۆم و بـە قسـەیەکیش بـووە، بـە

یارمەتییەکی بچوک و سادەش بووە، دەستی خۆم بۆ ئینسانەکانی تر درێژبکەم... من دەچم و دەنوشتێمەوە و بەو دایکە برینداراتە دەڵێم، لە بری کورە کوژراوەکەتان بە کوڕی خۆتان حیسابمبکەن، بە خوشکەکان دەڵێم لەبری برا کوژراوەکانتان بەبرای خۆتان حیسابمبکەن، من دەبێت لەوێبم، لەو دارستانەدابم و چاوەڕوانبم چ تەیرێکی بریندار لە نزیکمەوە دەنیشێتەوە تیماریبکەم. عەفوومبکە، بمتوانیایە هەموو میحنەتەکانم بکردایەتە یەک میحنەت، هەمیشە لەگەڵتدا دەبووم... هەمیشە، بەڵام میحنەتەکان ناکرێنە یەک میحنەت... ناکرێن». دەمزانی بە هەموو ئەو کەسانەی تریش وادەڵێت، باوەڕی وابوو تێگەیشتنی مرۆڤ لە ئازاری یەکتر زۆر لە ڕەنگی ئەم دونیایە دەگۆڕێت. دواجار کە وڵاتم بە جێهێشت و لە ماڵاواییدا دەستمانکردە ملی یەک، من بەدەنگی بەرزو ئەو بەویقاری فریشتەکانەوە گریاین، ئەوکاتیش هەمان ڕستەی پێگووتمەوە «من دەبێت لەوێ بم، لەو دارستانەدا بم و سا چاوەڕوانبم چ تەیرێکی بریندار لە نزیکمەوە دەنیشێتەوە تیماریبکەم».

لەگەڵمدا بە ئارامییەوە گوێی لە کاسێتەکان دەگرت، ئەو شەوە کە ناوی سەی جەلالی شەمسم لێپرسی، بە هێمنییەوە سەیریکردم و گووتی «بێگومان... کەس نییە سەی جەلالی شەمس نەناسێت، هەموومان دەیناسین». ئەو ئەو پیاوەی بە یادامهێنامەوە، ئەو سەرەک خێڵەی تێکەڵەیەک بوو لە کۆمەڵێک دونیای جیاواز، ڕۆژێک لە ڕۆژان لەسەرەتای شۆڕشدا بینیبووم و لەیادمچووبووەوە. یەکێک بوو لەو ئاغایانەی دۆستی هەموو دونیابوون، هاوڕێیەکی نزیکی یاقوبی سنەوبەر بوو، سەردەمانێک لەسەرەتادا کە یاقوب نەخۆش بوو لە ماڵی ئەو پیاوە تیماردەکرا. ناسینی ئیکرامی کێو بۆ سەید جەلالی شەمس دەگەڕایەوە بۆ ڕۆژانی شۆڕش، ئەو کەسێک نەبوو ونببێت، پیاوێک بوو لە مسەرەو سەری ئەو وڵاتەدا ناوبانگێکی هەبوو، باوەڕپێکراوی گەورەی سەرۆک و

ئەمیر و پاشا و سەرەک خێڵەکانی تری ئەو هەرێمە بوو.

ئێوارەیەکیان چووم بۆ لای سەید جەلالی شەمس، ئەو لە ناو چیاکاندا دەژیا. بە زەوییەکی شاخاوی و پڕ لە دارستاندا بەرەو بەهەشتێکی پەنهان لە ناو چیاکاندا تێپەڕیم، ئەو دوور لە هەر ژاوەژاو و دڵتەنگییەکی دونیا لە باغێکی مەزندا دەژیا، لەسەر کورسییەکی سەیر کە لەتەختی پاشاکان دەچوو بینیمەوە. لە چیمەنێکی ئارام و سەوزدا سەرقاڵی خوێندنەوە بوو. پیرێک بوو ڕیش سپی، کیژێکی هەژدە ساڵ، جللی ساقی کۆشکی شاهەنشا دێرینەکانی لەبەردابوو خزمەتیدەکرد، مێزێکی لە بەردەستدا بوو پڕپوو لە کتێب و کاغەز و شوشەی گەورەی مەرەکەب، ڕەزێک لە چواردەوەری بوو، هەر لقێک لە لقەکانی بە دەیان هێشووی گەورە سەنگین بوو. دیمەنی ئەو شاعیرە دێرینانەی هەبوو کە وێنەی خۆی و مەعشوقەکانیان لەسەر بەرگی هەندێ کتێبی کۆن دەبینران، شتێکی تیابوو کەسانی وەک خەیام و فیردەوسی بەیادادەهێنایتەوە. چرایەک بە وێنەی پەپولەیەکەوە و شوشەیەکی گەورەی شەراب لەسەر مێزەکەی بوو. دواتر زانیم ئەو کیژە منداڵەی خزمەتیدەکات دواهەمین ژنێتی. لە ژیانیدا دەیان ژنی هێنابوو. من لە ناوەڕاستی باغەکەیدا وەستام و گووتم «سەی جەلالی شەمس. من موزەفەری سوبحەمم... ئەو پیاوە سەرلێشێواوەی لە تۆ زیاتر کەسی تری نییە، کۆمەکیبکات».

بە هێمنی سەری لەسەر کتێبەکانی بەرزکردەوە و سەیریکردم و هەستایە سەرپێ و گووتی «تۆ موزەفەری سوبحەمی... تۆ ئەویت؟». من وەک لەبەر زاتێکی گەورەدا کڕنووشببەم گووتم «گەورەم ڕێنماییم بکە... من سەرلێشێواوترین پیاوی دونیا، لە تۆ زیاتر کەسم نییە یارمەتیمبدات». ئەو پێیدەگووتم «وەرە و دانیشە... ئەگەر تۆ موزەفەری

سوبحدەم بیت، من لە قسەو ڕەفتاردا دەتخوێنمەوە، گەر ئەویش نەبیت ناهێڵم لە شەرابی من بخۆیتەوە». بەرامبەری دانیشتم و پێمگووت «سەیرمکە... سەی جەلالی شەمس، سەیرمکە و لە نیگامدا عومرێک دەدۆزیتەوە کە هیچ کەسی تر ژیانی وەها نەژیاوە. بۆنمکە، لەسەر جەستەم ئاسەواری بیابانێکی گەورە دەبینیت، تەماشای چاوم بکە سێبەری سەحرا گەورەکان دەبینی، هیچ کەسێکی تر وەک موزەفەری سوبحدەم بۆنی لمی لێنایەت، بۆنی شەوگارێکی ناکۆتای لێنایەت، بۆنی تێکەڵبوونێکی بەڕەحم و بێسەبری زەوی و ئاسمانی لێنایەت... سەیرمکە و لەسەر دەستم بیابان بخوێنەوە».

چاوەڕوانی نەدەکرد ئەو پیاوە لاوازەی لە جلی شڕی جوتیارێکدا هاتبووە باغچەی بەو جۆرە قسەبکات. بەهێمنی سەیریدەکردم و پەرداخێک شەرابی بۆ خۆی تێدەکرد و پەرداخەکەی منی خاڵی جێدەهێشت و بە ئارامییەکەوە کە نیشانەی ژیانێکی ئاسوودە بوو، قوومی لە شەرابەکەی دەداو دەیگووت «سوپاس بۆ خوا... سوپاس بۆ خوا». کەمێک بێدەنگ دەبوو، تەماشایدەکردم و دەیگووت «من هەرگیز ئەو ناوەم لە بیرناچێتەوە، هەرگیز ناوی موزەفەری سوبحدەمم بیرناچێتەوە، ناوی هەندێ پادشا و ئەمیر و وەزیر و وەلیم یادچۆتەوە، بەڵام ناوی موزەفەری سوبحدەمم بیرناچێتەوە». من دەمگووت «من ئەوم، من موزەفەری سوبحدەمم، هەموو ئەم زەمینە لەمسەر تا ئەو سەری بگەڕێیت، موزەفەرێکی سوبحدەمی تر نادۆزیتەوە... من ئەوم کە شەو و بیابان و ونبوون دروستیکردوم، من باوکی ئەوانم، باوکی ئەو کوڕانەم کە تۆ نهێنییەکەیان دەزانیت... تەنیا تۆ». پاڵیدەدایەوە و دەیگووت «موزەفەری سوبحدەم قسەبکە، چیرۆکی خۆت بگێڕەوە». من هەموو چیرۆکی خۆم دەگێڕایەوە، ئەو چیرۆکەی پێمدەگووت «جگە لە چاوەڕوانییەکی دووردرێژی مردن هیچی تر نییە». ئەو چیرۆکەی لەسەرەتاوە تا کۆتایی لە هیوایەکی

ڕەش دروستبووبوو، کە وشەی «هیوای ڕەش»م بەکاردەبرد، دەوەستاو دەیگووت «تۆ ئەویت... ئەویت... یەکێ ساڵانێکی زۆر لە زوڵمەتدا بۆ هیواکانی نەژیابێت نازانێت هیوای ڕەش چییە... ئومێدی سیا... ئومێدی قەترانی». سەیری چاویدەکردم و زیاتر گوێی لە من دەگرت کە قسەم لە یەکێتی نیوان ئومێدو نائومێدی دەکرد، لەسەر یەکانگیری ڕۆشنایی و دەیجور دەدوام، قسەم لە لێکچوونی لم و ئاو دەکرد. تێدەگەیشت من ئەوم. بە هێمنی پاڵیدەدایەوە و دەیگووت «تۆ بیستویەک ساڵ لە مەویەر، گیرایت... خۆت کرد بە قوربانی یاقوبی سنەویەر، وەک هەزاران هەزاری تر. خۆت لەو بیابانانەدا نوقمکرد و بوویت بە قوربانی هیچ». دەنگی تارمایی حیکمەتێکی تیابوو، پرچی لە ژێر مێزەرێکی سپی گەورەوە هاتبووەخوار. بە هێمنی سەیریکردم و قومێکی گەورەی لە شەرابەکەی داو جامێکی پڕیشی بۆ من تێکرد و گووتی «ئێستا دەتوانیت لە شەرابەکەی من بخۆیتەوە، کە پڕە لە نوری خالیق... ئێستا من دەتوانم ئاسوودە تەماشاتبکەم و بخۆمەوە و سەیری شەو باڵای مێوەکانم بکەم و لەسەر مەستی بادە هەموو شتێکت پێبڵێم. لە مێژە چاوەڕوانتدەکەم، ئەو ساڵانەی سەرپاسەکان ونبوون و من نەمدۆزینەوە، چاوەڕوانی تۆم دەکرد، من وامدەمزانی مردوویت، دواجار وابڵاوبوو کە تۆ مردوویت... یەکێک ناوی تۆی سڕییەوە، تا کاتێک هات ئیتر کەس تۆ و هاوڕێکانتی لەیادنەما. بەڵام من دەمزانی مرۆڤ دەبێت سەبری ئەوەی هەبێت و بتوانێت چاوەڕوانی مردووەکانیش بکات. من ژیان فێریکردم چاوەڕوانی مردووەکانیش بکەم. ڕۆژێکیان کوێرێک هاتە ژێر ئەم کەپرانە و لە شەرابی منی خواردەوە. کوێرێک گووتی دوو سەرپاسی سوبحەدم دەناسێت، دوو کوڕ دەناسێت، هەریەکەیان هەنارێکی شوشەیان هەیە، من نازانم چی ڕێگای ئەو کوێرەی هێنابووە ناو ئەم هەرێمەوە، بەڵام کە شەرابەکانم مەستیکرد و دەستیکرد بە

گێڕانـەوەی ژیانـی خـۆی، بێنـەوەی بزانێـت چـی دەڵێـت و لەگـەڵ کێـدا قسـەدەکات کەوتـە گێڕانـەوەی چیرۆکـی درێـژی سەریاسـەکان، مەقدەمـم لێگـرت و پێمگـووت دەلیلـم بـۆ بهێنـە، کوێـرەی پیـس دەلیلـم بـۆ بهێنـە. دەیگـووت دەلیلـی مـن هەنارەکانـە، سەریاسـەکانە کـە لـە ژیانـی خۆیـان و لـە لێکچوونـی خۆیـان تێناگـەن. مـن دەمگـووت «کوێـرەی پیـس، گـەر تـۆ دوو سەریاسـم بدەیتـێ مـن سەریاسـی سێهەمت دەدەمـێ». ئـەو نەیدەزانـی سەریاسـێکی دیکـەش هەیـە، کـێ چوزانـێ لەوانەیـە دەیـان سەریاسـی تریـش هەبـن کـە مـن و تـۆ نایانناسـین، مـن شـەرابم دەرخـواردی ئـەو کوێـرە دەداو دەمگـووت « قسـەبکە، قسـە، پێمبڵـێ سەریاسـەکان لـە کوێـن، کوڕە بێنازەکانـی شـۆڕش لـە کوێـن؟». ئـەو لـە منـی بیسـت کـە سەریاسـی تـر هەیـە... مـن تـا درەنـگ شـەرابم بـۆ تێدەکـرد و ئـەو دەیخـواردەوە و بێنەفـەس قسـەیدەکرد، هەوڵیـدەدا مـن نهێنییەکانـی بـۆ بدرکێنـم، بـەڵام دیاربـوو چ کوێرێکـی دەمشـڕ و خەیاڵواڵایـە، نەفسـێک بـوو پشـووی نەبـوو. مـن هیچـم پێنەگـووت، پێمگـووت «هەنارەکانـم بـۆ بێنـە، هەنارەکانـم بـۆ نەهێنـی مـن هیچـت پێناڵێـم، مـن هیچـم نییـە بتدەمـێ، مـن کـەس ناناسـم» ئـەو دەیگـووت «مـن لەسـەر سـەفەرێکی درێـژم بـەرەو ئەوسـەری دونیـا، لەوانەیـە بگەڕێمـەوەو لەوانەیـە نەگەڕێمـەوە». پێمدەگـووت «یەکـێ بنێـرە هەنـارەکان پیشـانی سـەی مـژدەی شـەمس بـدات» ئـەو کـوڕەی مـن کـە لـە شـار توجـارەت بـە شـتی عەنتیکـەوە دەکات. لـەو ڕۆژەوە چاوەڕوانـم و کـەس نایـەت، ئێـواران لـەم باغـەدا بـە ئیرسـی مـەی خـۆرە گەورەکانـی ئـەم مەملەکەتـەدا دەچمـەوە و دونیـام فەرامۆشـکردووە، مـن دواجـار کـە شـەڕ دەسـتیپێکرد و گوێیـان لێنەگرتـم، ئیتـر تەرکـی ئـەو دونیایـەم کـرد، وەتەنـی مـن شـەراب و کتێـب و مەحبوبەیـە. مـن لـەم باغـەی خـۆم نایەمـەدەرێ، هەمـوو دەزانـن مـن ناتوانـم لـەم باغـە بێمـەدەرێ، وەک جـاران دەرگا بـۆ سـەرۆکەکان ناکەمـەوە، لێـرەدا خـۆم و شـەراب و مەعشـوقەم لـە جوانـی

جاویدانـە و ئیلاهـی مـەی و خەڵـوەت و عەشـقدا دەژیـن».

قسـەیدەکرد و شـەرابی هەڵـدەدا، هێنـدە وەسـتایانە پیاڵەکانـی فڕدەکـرد، ئاسـەواری پیریـت بەدەسـت و پەنجەیـەوە نەدەبینـی، پیرێـک بـوو سـەرتاپای ڕووناکـی و نـور، حەبیبەکـەی وەک حەبیبـەی باغەکانـی بەهەشـت بێدەنـگ خزمەتیدەکردیـن، تـا ئێـوارە درەنگتربایـە ئـەو مەسـتتر دەبـوو و ئەویـش زێباتـر و جوانتـر... قسـەیدەکرد و سـەیری ترێـی نـاو باغەکـەی خـۆی دەکـرد، دواجـار مـن ڕامکێشـا قسـەم بۆ بـکات، ئەگەرچـی شـەرابێکی ئاگرینـی نۆشـدەکرد هێشـتا شـتێک لـە سـەبرو هێمنـی نـاو لـە دەنگیـدا بـوو. دواجـار گووتـی «مـن سەریاسـەکانم وەرگـرت، بیسـتویەک ساڵ لـە مەوبـەر مـن سەریاسـەکانم وەرگـرت، سـێ سـەریاس لەگـەڵ سـێ هەنـاری شوشـەدا، سـێ مەلۆتکـەی چکۆلانـە و نیـوە مـردوو... ئیلاهـی ئـەی ئـەوەی مـەی و مەیخانـەت دروستکردووە، لەبیرمـە یاقوبـی سنەوبـەر خـۆی ئـەو سـێ کۆرپەیـەی بۆ هێنـام. ئەوکاتیـش نەیویسـت مـن هیـچ بزانـم، سـێ منداڵـی چکۆلانـە و لاواز و گرینۆکـی خسـتە بەردەسـتم، وەک ئـەوەی خـودا لـە نوتفـەی سـێ مەلەکـی غەمگیـن دروسـتیکردبن، هـەر سـێکیان دەگریـان ، بەجۆرێـک خەسـتە و بیماربـوون مـن دەمگـووت «ئیکسـیری حەیاتیـان دەوێت ئیکسـیری حەیـات». ئـەو شـەوە یاقـوب وەک جـاران نەهاتـە دیوەخانەکـەم، نەهاتـە بـەر ڕۆشـنایی مۆمەکانـم کـە هـەردەم پەروانـە لەدەوریـان دەگـەڕا، پێیگووتـم «مـن ئیکسـیری حەیاتـم نییـە، شـەرابی زیندەگـی گـەر لای تـۆ دەسـتنەکەوێت لای کەسـی تـر نییـە، ئەگـەر دڵۆپێکیـش بـووە لـە ئـاوی حەیـات بیـدە بـەم منداڵانـە و بابژیـن». بـەڵام پێمگـووت «ئەمانـە چیـن لـە نوتفـەی مەلەکـن یـان شـەیتان، لـە خوێنـی خۆتـن یـان هـی خەڵکـی تـر». سـەرەتا هیچـی نەگـووت، ترسـی هەبـوو شـتێک بڵێـت درەخـت و هـەوا و باڵنـدەکان ئاشـکرایبکەن. بـە درزییـەوە و بەتەنیـا دوور لـە چـاوی بەشـەرێک سـێ کۆرپـەی هێنابـوو، دەیگـووت دەبێـت هـەر سـێکیان یـەک

ناویـان هەبێـت، یـادگاری ڕەفیقێکـی بەوەفـان، دەبێـت هەرسـێکیان ئـەو نـاوەی ئـەو هەڵگـرن، نـاوی موزەفـەری سـوبحدەم، نـاوی شۆڕشـگێڕێکی دڵسۆزی ئـەم شۆڕشانەی ئێمـە، ئـەو گووتـی بـەر لـەوەی بمرن ئـەم سـێ مەلۆتکەیـە، بەسـەر سێ خێزانـی جیاوازدا لەسـێ هەرێمـی جیاواز دابەشـکە، بیانـدە بـە سـێ خێزانـی دوور، سـێ خێـزان یەکتـری نەناسن، هـەر یەکەیـان لـە جێگایـەک، یەکێکیـان لـە کوێسـتان و یەکێکیـان لـە ئـاران. شـەوێکی تاریـک بـوو، لەسـوار کەحێلێـک دابـەزی و هـەر سـێ مەلۆتکەکـەی پێبـوو، بەردەماغێکـی ئەوتـۆی کردبـوو کـەس نەیناسـێتەوە، بـە منـی گـووت «ئـەوە نهێنـی گـەورەی ژیانمـە... سـەی جـەلال لـە تـۆ زیاتـر کەسـێک نییـە، ئـەم منداڵانـە ڕزگاربـکات... مـن ناتوانـم هیچیـان بۆبکـەم...». لـە تاریکییەکـەدا منداڵەکانـم لێوەرگـرت و هەمـوو گیانـم دەلـەرزی. جارێـک و دووان و سـیان دەمپرسـی «ئـەم منداڵانـە منداڵـی کێـن، یاقوبـی سنەوبەر منداڵـی کێـن؟». هەمـوو جارێـک بـە شـەرمەوە دەیگـووت «منداڵـی شۆڕشـن، کـوڕی شۆڕشـن، بیـرت نەچێـت هـەر سێکیان یـەک ناویـان هەیـە و کـوڕی شۆڕشـن». کـەوای دەگـووت درەختـەکان دەجوڵانـەوە، جوڵەیەکـی سـەیر دەکەوتـە هـەوا، ئـەرز لـە ژێـر قاچـی هەردووکمانـدا ئارامـی بـە خـۆی نەدەگـرت. بـەڵام ئـەو دەیگـووت «لـەوە زیاتـرم لێمەپرسـە، مـن دەبێـت بـڕۆم، مـن دەبێـت بـڕۆم، سـەید جەلالـی شـەمس، ژیانـی ئـەم منداڵانـە لـە ئەسـتۆی تۆدایـە».

مـن تەماشـامدەکرد و دەستمدەخسـتە سـەر دەسـتی سـەی جەلالـی شـەمس.

کەمێـک لـە ڕۆشـنایی فێنکـی ئێـوارە لە نێـوان درزی کەپرەکانەوە دەهات، هـاڵاوی ترێیەکـی بەهەشـتی بەسـەر سـەرماندا شـنەیدەکرد. دەمگـووت «ئەوانـە هەمـوو کـوڕی منـن، حاشـا لـە هیچیـان ناکـەم، ئەوانـە کـوڕی منـن... مـن ئێسـتا تێدەگـەم کـێ منداڵەکانـی منـی لەیەکتـر جیاکردۆتـەوە، مـن کـە گیـرام تەنیـا یـەک کوڕم هەبـوو، بـەڵام کـەی ئـەوە گرنگـە، دواجـار

ئەوانە هەموو ناوی منیان هەڵگرتووە... ئەو شەوە کە لە چەندەها لاوە تەقەیان لێدەکردین بە یاقوبی سنەوبەرم گووت لە پشتەوە دەرچۆ، تا تۆ دەربازدەبیت من دوژمن دەخلافێنم، گووتم بەڵام ئاگات لە سەریاسی سوبحدەم بێت، ئاگات لێبێت. شەوێک بوو لە شەوەکانی مردن، من تەنیا یەک تکام هەبوو، پێمگووت ئاگات لەسەریاسی سوبحدەم بێت، ئەو کات سەریاس تەمەنی چەند ڕۆژێک بوو، دایکی بەسەر ئەوەوە کۆچیدوایی کردبوو، مەلۆتکەیەکی بچکۆلەبوو لە کن ئاسیاوێکی یاقوبی سنەوبەر بەجێمابوو، من یەک ڕۆژ بینیبووم، ئەوکات نەدەمتوانی پرسە دانێم نەدەمتوانی کوڕەکەم ببینم، شەوێکی تاریک بە دزی سیخوڕ و ئاسایشەکانەوە چووم بۆ گوندێکی چکۆلانەو لەویادا بۆ چارەکێک سەریاسی سوبحدەمم نا بە سنگمەوە، ئەو چەند چرکەساتە درێژترین دەمی باوکایەتی من بوون. لە زیندان دڵئاسوودەبووم دەمگووت یاقوبی سنەوبەر و هەموو ئەوانەی لەبری من لە نیشتیمان ماونەتەوە سەریاس فەرامۆشناکەن، دڵنیابووم دەیگرنە ئامێز، بەڵام کە گەڕامەوە جگە لە کۆمەڵێک چیرۆک هیچی ترم لەبەردەستدا نییە... سەریاس لە دوای سەریاس لە ڕێگامدا زیندوودەبێتەوە و لە ژیانی هەموویاندا لە غوربەت و مردن و تەنیایی زیاتر هیچی تر نابینم... خودای گەورە، تۆ پێمبڵێ، سەی جەلالی شەمس، تۆ پێمبڵێ، چی کوڕەکانی منی بەو دەردە برد... چی؟».

سەی جەلالی شەمس شەرابەکەی پڕدەکردەوەو بە ئارامییەکەوە سەیریدەکردم و وەک ئەوەی گوێی لە قسەکانی من نەبووبێت، وەک ئەوەی قسە بۆ خۆی بکات دەیگووت «سێ منداڵ بوون، هەر سێکیانم برد بۆ سێ ناوچەی لەیەکدی دوور، بۆ سێ گوند یەکێکیان لە مەشریقە و ئەوی دیان لە مەغریب و ئەوی دیان لە باشوور، سێ تیفلی بێگوناه بوون، سێ پارچە گۆشتی بچکۆلە و مەعسوم بوون، یەکی هەنارێکی

شوشـەیان لەگەڵـدا بـوو، مـن هـەر شـەوە و یەکێکیانـم دەخسـتە نـاو ماشێنەکەم و بە ڕێگایەکدا سەدان فرسـەخ دوورتـر لـەوی تـر دەڕۆیشـتم، لـەوێ خانەوادەیەکـم دەدۆزییـەوە بیانگرێتـە خـۆی... ئەوسـەردەمە وەک کوێـر باوەڕم بە یاقوبـی سنەوبەر بوو، ئیمانم بە شـەراب نەبوو، ئیمانـم بەو بـوو. ئیمانـم بـە نەشـئەی مـەی نەبـوو، ئیمانـم بـەو پیاوانـە بـوو. عیبادەتـی ڕەز و مەحبوبـەم نەدەکـرد، عیبادەتـی نیشـتیمانم دەکـرد... وەک ئێسـتا نەبـووم... وەک ئێسـتا نەبووبـووم بـە پیرەمێـردی خەڵوەتـزەدەی نـاو وەرد و هەردێکـی دوور...».

لـە پڕێکـدا سـەری بەرزکـردەوە و وەک ئـەوەی بیـری کەوتبێتـەوە مـن لەوێـم. بـە دەنگێکـی غەمگیـن، دەنگێـک هێـدی هێـدی دەبـوو بـە گریـان، گووتـی «سـیان بـوون، سـێ پارچـە گۆشـت بـوون، دەبـوو بەیەکـەوە گەورەبـن، مـن وەک ئـەوەی لەشـێک پارچـە پارچەبکـەم هـەر یەکەیانـم برد بۆ زەوییـەک، هـەر یەکەیانم برد بۆ ناوچەیـەک سـەد فەرسـەخ دوور لـەوی تـر، دوایـی تەنیـا یەکێکیانـم دۆزییـەوە، تەنیـا یەکێکیـان... وای خالـق، دووانیـان لـە بۆنـی تەقـە و باروتـی ئـەو زەمانـەدا ونبـوون... دوکـەڵ بردنـی... دوکـەڵ فڕاندنـی».

مـن دەسـتم دەخسـتە سـەر دەسـتی سـەی جـەلال کـە وردەوردە یەکـەم فرمێسـک بەسـەر ڕیشـیدا دەهاتـە خوارەوە و دەڕژایە بن پیاڵەی مەیەکەیەوە و دەمگـووت «مـن چیرۆکـی ئـەو دووانـەی تـر دەزانـم، شـتێک بـە ژیانیـان ئاشـنابووم، سـەی جەلالـی شـەمس، پێمبڵـێ ئەویتریـان لـە کوێیـە... ئـەوی تریـان؟». سـەی جـەلال کـە بـەردەوام شـەرابی دەخـواردەوە و بـەو ویقـار و سـیما نورانییـەی خۆیـەوە دەگریـا، سـەری دەخسـتە سـەر وەرەقەکانـی و لـە بـەر خۆیـەوە دەیگـووت «سـیان بوون، سـیان بـوون، سـیان... دواتـر کـە وڵات لـە پڕێکـدا خاپووربـوو، کـە لافـاوی مـردن لـە هەمـوو لایەکـەوە هـات، کـە ئـەو بارەشـە هەڵیکـرد کـە شـارۆچکەکانی دەبـرد، دوانیانـم

لەدەستدا. من بەر لەوەی ڕۆژگاری قاتوقڕی و تالانی و مردنی بێحیساب دەستپێبکات، هەموو وەرزێک جارێک دەچووم و تەماشامدەکردن، پەنهان دەچووم و پەنهان دەگەڕامەوە، خۆم لێ ئاشکرانەکردن. یەکجار یەکێکیانم بانگکرد و پێمگووت «سەریاسی سوبحدەم وەرە بۆ لای مامی خۆت» بە گومانێکەوە سەیریکردم و لێمهەڵهات... کە ئەم زەوییە خاپووربوو، من تەنیا یەکێکیانم دۆزییەوە، تەنیا یەکێکیان بەسووتاوی لە ئاتەشگای ئەو ڕۆژانە هاتەدەرەوە، یەکێک دەموچاوی نەبوو، نەیدەتوانی قسەبکات... شەڕبوو، شەڕێکی خوێنین ئەویش لەو شەڕەدا هەمووشتێکی خۆی لەدەستدا».

من دەنوشتامەوەو دەستیم ماچدەکرد، باوەشم پیادەکرد، فرمێسکەکانی سەر ڕیشیم ماچدەکرد، ئەو وەکو ئەوەی ئەو حکایەتە بۆ درەختەکان بگێڕێتەوە دەیگووت «سیان بوون، دووانیانم هەرگیزا و هەرگیز نەدۆزییەوە... کە ئەو منداڵانەم ونکرد، حاڵیبووم زەوی چ قەدر گەورەیە، دەرکم بە گەورەیی ئەم ئاو و سەر زەمینە کرد کە خالیق دروستیکردون... زەمانێک بوو ئینسان تەنیا هەڵدەهات، لە چەند مانگێکدا هەزاران گوند توانەوە، سەدان عەشرەت وەک ئەوەی لە مۆم بن جێدەستێکیان لەسەر زەوی نەما، هەموو ڕەزەکانی من سووتان، ساقییەکانم دەوڵەت بردنی و نەمبینینەوە، شەرابەکانم ڕژا... چ شتێک لەوە خراپترە، تۆ مەیپەرست بیت و شەرابەکەت بڕژێت».

بە هێمنی پیاوێکەوە کە وجودی بە هەموو ساردی و گەرمییەکانەوە تاقیکردۆتەوە، دەهاتەوە سەر مێزەکەی، قۆپچەکانی سەرەوەی کراسە سپییەکەی دەترازاند و هێلەکەکەی دادەکەند و دەستی دەخستە سەر دڵی خۆی و دەیگووت «خودایە... دڵی عەبد چیتر عیبادەت ناکات، تەنیا مەستدەبێت و تەواو». ئەو کیژەی کە بە فریشتەکان دەچوو زوو زوو لە دەفرێکی زیودا، لە کۆمەڵێک کاسی نەخشدار و دێریندا مەی

تازەتری بۆ دەهێنایین. ئەو تەماشایەکی منی دەکرد و دەیگووت «فەلەک پیرێژنە... پیرێژن». من ئەو کات لەسەر پشکۆکان دانیشتبووم، بەدرۆ سەبر و تەحەمولم نیشاندەدا، دەمویست دواجار بگەمە سەر حەقیقەتی «دواهەمین سەریاس». ئەو ڕەزو باغ و شەراب و ئێوارەیە بێئۆقرەیی مالّی نەکردم، ئەو ڕیشە سپی و چاوە سیحراوی و گەشانە، بەژنی ئەو ئافرەتەی هەموو جوانییەکانی خودای تیابوو، هەموو سیفەتەکانی حۆری تیابوو ئارامی نەکردمەوە. دەستی سەی جەلالی شەمسم گرت و گووتم «بەلّام سەریاسی سوبحدەم لە کوێیە، لە کوێ». ئەو لە ناو ژانە بەهەشتییەکانی خۆیدا، وەک پیرێکی شەیدا بۆ لەزەتە بێسنوورەکان، بۆ سفرە ڕازاوەکانی دونیا دەیگووت «بخۆرەوە، شەراب بخۆرەوە، مەی نۆشکە، بە قامەتی ڕەزدا سرودکە... سرود». فرمێسکەکانی خۆی دەسڕی و کاسێکی زیوینی پڕدەکرد لە مەی و بێئەوەی چاو بنوقێنێت دەینۆشی، بە جۆرێک سەری بەرزدەکردەوە، لە کاتی قوم لێدانـدا ئەستێرەکانی کۆتایی ئێوارە ببینێت. کاسەکەی دادەنایەوە و دەیگووت «بۆ چ سەریاسێک دەگەڕێیت... بۆ چ سەریاسێک؟... من و تۆ چوزانین چەند سەریاسی تر لەم ولّاتانەدا هەیە... چوزانین چەند شەوی تر، چەند سەی جەلالی شەمسی دیکە، شەوانێک مەلۆتکەیان هەلّگرتووە و بەسەر ئەم هەرێمانەدا بەشیانکردوون... کێ چوزانێت کێ کوڕی تۆیە...». من بەبێ سەبری کاسێک مەیم پڕدەکرد و دەمگووت «من بەدوای کوڕی خۆمدا ناگەڕێم... تێدەگەیت، سەی جەلالی شەمس، من بەدوای سەریاسی سوبحدەمدا دەگەڕێم». تەماشایدەکردم و دەیگووت «هێشتا منداڵ بوو دەموچاوی سووتا، بۆمبێک لە بۆمبە تێزابییەکان کەوت بەسەر ئەو خانووەدا کە تیا دەژیا، من بردبووم بۆ ئەوێ، بۆ لای ژن و مێردێکی بێمنداڵ بەخێوبیکەن. تەسلیمی سێ خێزانی جوتیارم کردن، ئەو سەروساڵە کە گوندەکان ڕووخان، دونیا خاپووربوو دووانیانم

ونکرد، وەک شوشـەیەک شـەراب هیـچ کـەس نەیخواتـەوە، شـەرابێک نەیەتـە سـەر هیـچ سـفرەیەک، سـاقییەک پەنجـەی بۆنەبـات، ڕەندێـک لێـوی پـێ تەڕنـەکات. نەفسـێک، بەشـەڕێک نەبـووە دایـک و باوکـی ئـەو منداڵانـە. هیـچ کـەس».

کەمێـک فەقیانـە سـپییەکانی گرێدەدایـەوە و دەسـتیدەبردوە بـۆ کاسـەکەی و دەیگـووت «وامەزانـە مـەی خافڵیکـردووم، مـن بەدوایانـەوە بـووم، بـێ تەکلیفـی عەبـد و خـودا بەدوایانەوەبـووم، لـەوە منداڵتربـوون لـە زۆر شـت تێبگـەن، تاکـە کەسـێکم هـەر سـێکیانم گرتۆتـە بـاوەش... سـێ تیفلی غەمگیـن بـوون... دووانیـان لـە هەراوزەنـا گەورەکانـدا ونبـوون، یەکێکیـان دایـک و بابـی مردن، دووەمیـان لـە کاتـی ڕاکردنـدا بـۆ ئەودیـو سنوور لەو دارسـتان و دۆڵ و دەربەندانـەدا ونبـوو... سـەیرکە عەزیـزم، ئـەو سـنوورە دەبینیـت، ئـەو چیـاو دۆڵـە سـەختانە دەناسـیت کـە مەملەکەتـی ئێمـە لـە مەملەکەتـی شاهەنشـا و مـەلاکان جیادەکاتـەوە، خاکـی ئێمـە لـە خاکـی سـوڵتان و ئاخونـدەکان جیادەکاتـەوە، لەویـادا هـەزاران هـەزار کـەس کـوژراون و سـەریان بـە گۆمـی نەهاتـدا چـووە. چۆن دوای ڕیشـەی هەورێـک دەکەویـت، ئـاوا دوایانکەوتـم... مەبەسـتم نەبـوو بیانهێنمـەوە بـۆ باوەشـی دایـک و بـاب، حەزمدەکـرد دوور بـە دوور تەماشـایانبکەم، وەک تینوویـەک دوور بـە دوور تەماشـای پەرداخێـک مـەی بـکات... ئـاوا تەماشـایانبکەم... شـەش سـاڵی منداڵـی بەوجـۆرە سەرپەرشـتیمکردن، بـە سـوار ئەسـپێکەوە دەهاتـم و بـەر دەماغێکـم دەبەسـت و تەماشـای گەورەبوونیانـم دەکـرد. سـەردەمێ کـە تەپوتـۆزی فاجیعـەکان هێوربـووەوە، کـەوای لێهـات دەسـتی پیـری مەیخانـە جارێکـی تـر شـەراب بگرێتـەوە، کـە ڕەز کەوتـەوە سـەر شـکۆفەی هێشـوو، من لەو مەرز و وەرد و مەملەکەتانەدا کەوتمە سۆراغیان، جارێکیـان بیسـتم یەکێکیـان لـە مـەرزەکان یارمەتـی وڵاغـدارەکان دەدات، هێسـترەکانیان ئـاودەدات، ئاڵفیـان بۆدەخـات، جێشـەویان بـۆ دەگرێـت،

ڕایەخیـان بـۆ جێبەجێـدەکات. مـن چـووم بـۆ مـەرزەکان و بەگەیشـتنی مـن گووتیـان منداڵێـک بـەو نـاوەو بـەو وەسـفە هەفتەیـەک پێشـتر ئیشـێکی لای سـایەقێکی ڕێـگای جنـوب دۆزیوەتـەوە، هەسـتێکم هەبـوو کـە مـاون، هەستێکِ لـە هەسـتی مەیخۆرێـک دەچـوو بـە سـەلیقە دەزانێـت سـوراحییەکەی چەنـد مەیـی تیامـاوە... حەیـف... حەیـف کـە ئینسـان ناتوانێـت دوای ڕیشـەی هـەور کـەوێ، موخابـن کـە ئینسـان ناکرێـت ڕەگـی ئـاو لـە زەویـدا بدۆزێتـەوە».

من دەمگووت «بەڵام دواهەمین سەریاس لای تۆیە... لای تۆ».

«مـن یـەک مەخلوقـم لەلایـە کـە پێیاندەگـووت سەریاسـی سـوبحەم، یـەک مەخلوقـی زامـدار کـە نامەوێـت بیبینیـت... نامەوێـت»

بـە ئارامـی دەسـتیم هەڵدەگـرت و ماچمدەکـرد و دەمگـووت «ئـەی پیاوچاکـی گـەورە... دەمەوێـت بیبینـم... بیبینـم».

سـەی جەلالی شـەمس تەماشـای سینییەک مۆمی دەکرد کە ئەو فریشـتە خوداکـردەی ژنـی بـە بێدەنـگ دەیهێنـا، سـینیەکی گـەورە دروسـت نازانـم چەنـد مۆمـی لەسـەر بـوو، لـە بـەر ڕۆشـنایی مۆمەکانـدا، وەک پیرێکـی زێڕین دەینوانـد. بـۆ یەکەمجـار بەوجـۆرە ڕووبـەڕوو سـەیریدەکردم و دەیگـووت « بـە تەنیـا کـوڕی تـۆ نەبـوون، کـوڕی ئـەم تەبیعەتەبـوون، کـوڕی ئـەم خـاک و مەوتیـن و عەردەبـوون... ئەفسوسـمە تـۆ بیبینـی، وەک چـۆن مـن درەنـگ درەنـگ دەیبینـم. سـەیرکە... لـە سـووتانی ئـەودا دەتوانـی سـووتانی هەمـوو ئـەم عـەردو ئاوەدانییـە ببینیـت». سـەیریدەکردم و شـەرابەکەی هەڵـدەداو دەیگـووت «بـۆ دەتەوێـت یەکێـک ببینـی کـە ناتوانێـت لەگەڵتـدا بدوێـت... مـن خاترجەمـم کـە تـۆ شـتێکی تـر لـە خەیاڵتدایـە، نیـگاری کەسێکی تـرت لـە ڕۆحـی خۆتـدا غەملانـدووە... مـن تێدەگـەم... تـۆ بیسـتویەک سـاڵە بیـر لـە کوڕەکـەت دەکەیتـەوە، وەک شـەراب بـە شـتێک مەسـتیت، بـە وێنەیـەک مەسـتیت، داتنـاوە نیـگاری کوڕەکـەت بەوجـۆرە بێـت، داتنـاوە

جوان و لاوچاک و سوارە بێت... وانییە... وانییە... تاڵترین جۆری شەراب چاوەڕوانییە، من هەموو جۆرەکانی مەییم تاقیکردۆتەوە، ڕیشم لە سەر کاسی بادە سپیکردووە، چاوم لە چاوەڕوانی ساقییدا کزبووە، من پێتدەڵێم چاوەڕوانی دوورودرێژ ئادەمی تووشی وڕێنە و ماخۆلان دەکات، کوڕەکەی تۆ لەوێیە لەوێ، لەگەڵ ئەوانی تردایە، لەگەڵ ئەو منداڵە سووتاو و بریندار و غەمبارانەدا لە ماڵێکدایە، کەسانێکی خێرخوا بەخێویاندەکەن... کوڕەکەی تۆ لەوێیە، بەڵام دەڕوات ئەویش دەڕوات، نا موزەفەری سوبحدەم، بینینی دەتکوژێت، هیواخەسارت دەکات. من هەمیشە وەک باوکێک بۆی گریاوم، بۆ ئەو و هەموو منداڵەکانی تر، لەگەڵ هەموو قومێک شەراب دڵۆپێک زوخاوی ئەو منداڵانە چۆتە ڕۆحمەوە و نایەتەدەرێ، وازیلێبهێنە بابڕوات، باسوار کەشتییەکی بکەن و بیبەن، سوار باڵدارێکی وەک سیمرخی بکەن و بیبەن، تۆ هیچت بۆ ناکرێت... هیچ، وەک هەموو باوکێکی دۆڕاو وەرەو لەگەڵ منداخۆت مەستکە، خۆت مەستکە و تەماشای ڕەز و کاسی بادەو سوراحی شەراب بکە».

من دەمزانی لەچ بەدبەختییەکەوە قسەدەکات، دڵنیابووم غەمبارە، بەڵام زۆری غەم بەرەو بێباکی و کەمتەرخەمییەکی زاهیدانەی بردبوو. بە هێمنی دەیگووت «هەبوو نەبوو کوڕە پادشاهێک هەبوو، ساڵەهای ساڵ عاشقی نیگاری سەر دیوارێک دەبێت، ساڵەهای ساڵ دەکەوێتە سەر خولیای گەڕان بۆ ساحێبی ئەو وێنەیەی لەقەد ئەشکەوتێکی بەرز و دووردەستدا دەیبینێت، دێتەدەرێ و کۆشک و شکۆی شاهان بەجێدەهێڵێت و دەکەوێتە دوای سۆراغی عەشقێکی نابەکام، تاج و سەوڵەجان توڕدەدا و عەسا هەڵدەگرێ و خیرقەی دەروێشان دەکاتەبەر، ساڵەهای ساڵ دونیا لەمسەر بۆ ئەوسەر تەیدەکات و ئەو نیگارە نادۆزێتەوە کە شەوقی دڵی بشکێنێت، تا وەک پیری مەیخانەکان بەسەر مێزی بادەدا

کوردەبێت و خوداحافیزی لە جوانی و جەهێڵی خۆی دەکات. لەگەڵ پیری و داچەمین و سیسیدا قەت ئاگری دڵی ئارامنابێتەوە ڕۆژێک ڕودەکاتە دار و دیارێک و داوەتی خاتوونێکی بۆدێت، کە پێیدەڵێت "وەرەو من ئەو مەعشوقەیەی تۆم، ئەو نیگارەم کە تۆ زەوی لەمسەر تا ئەوسەر بۆ تەیدەکەیت... وەرەو ئەمشەو میوانم بە". بۆ ئێوارە ئەمیری عاشق و کەنەفتە لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی دەکات و دەبینێت کە پیری چی پێ کردووە، تەنیا ئەوکات دادەنیشێت و بیر لە دڵڕەقی دەهر دەکاتەوە، بیری ئەوەی دەکەوێتەوە کە کاری دەهر تەنیا ئەوی نەگرتۆتەوە، بەڵکو مەحبوبەش هەر دەستکردی خالیقە و لە دەست هێز و قانونی خالیق دەرناچێت... ئەوشەوە کە دەگاتە بەر ماڵی حەبیبە، پیری ئەژنۆکانی لاوازکردووە، لەبەردەرگا دەوەستێت و دوودڵە لەوەی بچێتە ژوورێ، دوودڵە بڕوا و دەموچاوی ڕاستەقینەی دەهر ببینێت، یان بوەستێ و بەو نیگارە خەیاڵییەی خۆیەوە بکەڕێتەوە و تاماوە بە خولیای نیگارێکی خەیاڵینەوە سەربنێتەوە، دواجار لەو ساتەدا کەوەختە دەست بۆ تەقولبابی ماڵی مەعشوقە دەبات، دەستی دەلەرزێت و گیانی دەچێتە سەر ئاوو لەرز دەچێتە ئەژنۆی... لەویادا بڕیاردەدا کە چۆن ساڵەهای ساڵ تەنیا بە خەیاڵ ژیاوە، هەر بە خەیاڵ بژی و چۆن عەشقی نیگارێک بووە هەروا لێگەڕێ و هەروا بەردەوام بێت... ئیدی دەست لەو دەرگایە بەردەداو خیرقەی خۆی کۆدەکاتەوەو وەک قەلەندەرانی بێمەکان دەکەوێتەوە شاخ و کێو و جارێکی دی ڕووناکاتەوە ئەو ماڵەی کە مەنزڵی مەعشوقەیە... مەعشوقەیەک هەر لە خەیاڵدا جوانە و لەویادا مەعنای هەیە".

دەستی سەی جەلالی شەمسەم دەگرت و دەمگووت "پیری دانا... مەبەستت لەم حیکایەتە چییە... دەتەوێت چیم پێ بڵێیت؟".

شەرابەکەی دەنۆشی و دەیگووت "تۆ لەوە زیرەکتریت لێم

تێنەگەیت... پێتدەڵێم، دەست بەو نیگارە خەیاڵییەی ناو دڵتەوە بگرە چاترە... شیرینی شەرابی خەیاڵ، لە تاڵی ئاوی حەقیقەت باشترە».

من دەمگووت «نا بەڕێزی من... من تاڵی ئاوی حەقیقەتم پێباشترە... من لەو زاهیدە ناچم کە تاج و سەوڵەجان بۆ خەیاڵێک فڕێدەدا، لەوانە نیم لە ترسی نیگاری مەحبوبەم، لە بەردەرکی ماڵیان ئەژنۆم بلەرزێت و ڕوو وەرگێڕم... گەر کوڕەکانم چڵوچێوێکی ڕەشیش بن، ناچارم باوەشیان پیابکەم... ئەوان ئازارێکی ئەوتۆیان چەشتووە شایەنی ئەوەن یەکێک بێ مەرج، بێ هیچ شەرت و پەیمانێکی پێشوەخت خۆشیبوێن... تۆ حیکایەتی تەواوی کوڕەکانی من نازانێت... تۆ نهێنی سەرەتایانت لەلایە، دەزانی لە کوێوە هاتوون، بەڵام من دەزانم چۆن ژیاون... چۆن لەسەر شۆستەی شارەکان و لە هەڵم و باروتی شەڕدا ونبوون... ئەوان زوڵمێکی ئەوتۆیان بینی کە شایستەی لێبوردنێکی گەورەن... شایستەی عەشقێکی ڕاستەقینەن... ئەوانە کوڕی منن... کوڕی من... من تا دواهەناسە ئازاری چارەنوسیان هەڵدەگرم».

فەقیانەکانی کۆدەکردەوەو بە تووڕەییەوە سەیریدەکردم و دەیگووت «کوڕی تۆ نین...بەتەنیا کوڕی تۆ نین... کوڕی هەموومانن... دەبوایە هەموومان ژانی چارەنوسیان هەڵگرین».

من بە غەمگینی تەماشامدەکرد و دەمگووت «یان کوڕی هیچ کەس نەبوون... هیچ کەس... نە کوڕی من بوون، نەهی تۆو نە هی کەسی تر».

چاوی دەنوقاند و لەبەر ڕۆشنایی زەردی مۆمەکاندا وەک نیگارێکی خەیاڵی لێدەهات، بە ڕۆحێک دەچوو بۆ ماوەیەک دەردەکەوێت و کە ونبوو ئیتر لە ناو مەرزەکانی ژیاندا نەیدۆزیتەوە، بە هێمنی مەستێکەوە کە سوڵتانی هێشتا بەدەستی هەستەوەیە چەند جارێک لەبەرخۆیەوە دەیگووت «کوڕی هەموومان بوون...هەمووومان... هەمووومان».

من دەستیم ماچدەکردو دەمگووت «پێمبڵێ دواهەمین سەریاس لە کوێیە... پێمبڵێ».

دەستی دووردەخستەوە و دەیگووت «خودایە لە مەستیم عەفوومەبە... ئەوە ئەو گوناهەیە کە بۆم تەرکناکرێ... خودایە گەر تۆ پێتوایە ئۆباڵی ئەو گەنجانە لە گەردنی منە لەویشم عەفوومەبە، چونکە نازانم کێ گوناهبارە... کێ... ئەوانە کوڕی هەمووومان بوون و کوڕی هیچ کەسیش نەبوون... وەک مانگ، وەک جەبەروتی خۆت، وەک شەراب لە ناو وجودی ترێدا، کە موڵکی هەموومانن و موڵکی هیچ کەسیش نین... سێ مەلۆتکەبوون، سێ پارچە گۆشتی مەعسوم، دواتر شتێک لەگەڵ خۆیدا بردنی، بایەک لەدەستی مەستێکی وەک من بەهێزتر. موزەفەری سوبحدەم چۆن بوومەلەرزە دەتوانێ سوراحی شەراب بشکێنێت، چۆن دەتوانێت پیاڵەی بادە بەخۆی و شەرابەوە سەرەوژێربکات، گەردەلوولیش هەیە دەتوانێ کوڕەکانمان بفڕێنێت... ئەوان سێ نەمام بوون کە با لە باغ هەڵیکەندن و بردنی، یەکی هەنارێکی شوشەیان پێبوو تا یادگاری ئەو باغەیان لە یادنەچێتەوە کە تیا سەوزبوون، یەکی هەنارێکی شوشە کە گەر ڕۆژێک کەوتنە سەر ڕێگای یەک، یەکدی بناسنەوە، گەر ڕۆژێک بۆیان گەڕاین لە پێچ و پەناکانی دونیادا بیاندۆزینەوە».

من بە غەمگینییەوە دەمگووت «بەڵام هیچ کەس بۆیان نەگەڕا... هیچ کەس»

ئەو بەپەژارەیەکی گەورەوە سەریدەخستە سەر کتێب و وەرەقەکانی کە لە بێدەنگی ئێوارەدا، لە بەر ڕۆشنایی مۆمەکاندا، ئارەزووی بێدەنگییان قووڵترو قووڵتر دەکردەوە. بە دەنگێک کە هێندە خامۆش و کپ بوو، هیچی لەدەنگی ئەو پیاوە نەدەچوو کە بەدرێژایی ئێوارە قسەیکردبوو دەیگووت «لەبەرئەوەی کاتمان نەبوو، ئەی دۆست کاتمان نەبوو... شەڕو مەستی ئێمەی لەگەڵ خۆیدا برد... بادە و جەنگ...

بادە و جەنگ... بادە و جەنگ». سەیرێکیدەکردم و بەهەمان ڕوخسارو سیماوە دەیگووت «ئەو نەیدەویست... نەیدەویست... هیچ کەس لاپەڕەی ئەو چیرۆکانە هەڵبداتەوە». من دەمگووت «ئەو کێیە... ئەو کێیە پێمبڵێ؟». وەک یەکێک لە ئەستێرە و هەور و درەخت و کاسی شەرابەکەی بترسێت، بە ئەسپایی دەیگووت «سەرۆک... سەرۆک... یاقوبی سنەوبەر...».

دەمویست زیاتر بیهێنمەقسە، دەمویست تێمبگەیێنێت کە ئەڵماسی ئەم نهێنییە لە کوێدایە، بەڵام هیچی نەدەدرکان، بەر لەوەی شەو بگاتە قووڵترین ماڵی خۆی، بەر لەوەی ئەو بەجۆرێک مەستبێت، هەستێت و بڕواتە ناو جێگەی ئەو حۆرییە خوداییەی، وەک پەپولە بەدەورماندا دەهات و دەچوو. لێمدەپرسی «سەی جەلالی شەمس، ڕێگام بۆ ڕۆشنبکەرەوە، تۆ باوەڕت بە شەراب و مۆم و خەڵوەتی مەعشوقە هەیە... بەهەر سێکیان سوێندتدەدەم دواهەمین سەریاس لە کوێیە؟». وەک ئەوەی ماندوومکردبێت، وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبێت چیرۆکی ئەو منداڵانە وا ئازاریبدات، وەک ئەوەی چیتر مەی مەستینەکات و چیتر نەتوانێ بخەوێت، هەڵدەستاو بە گرژییەکەوە کە لە بەر مۆمەکاندا شێوەی پەیکەرێکی کۆن و بەویقاری دەدایە دەیگووت «لەوێیە، لەوێ لە ماڵی منداڵە سووتاوەکاندایە، لەگەڵ براکانیایەتی... بڕۆ... بڕۆ موزەفەری سوبحدەم... بڕۆ بۆ لای مۆژدەی شەمس، سەی مۆژدەی کوڕمان... ئەو تاجیری ئەنتیکە و توحەفیات و شتی کۆنە لە ناو قەیسەرییەکاندا دەیدۆزیتەوە... ئەو دەتبات بۆ لای سەریاسی سوبحدەم، ئەو دەتبات».

دادەنیشت و بەخەتێکی شکستە، کە تا ئەوکات جوانترین خەتێک بوو دیبێتم، نامەیەکی دەنووسی و بێئەوەی سەیرمبکات، دەیگووت «ئەو نامەیەی بدەرێ و تەواو... ئەو نامەیەی بدەرێ و هەنارە شوشەکەتی

نیشانبدە و بڵێ من ئەوم... ئەوم، بەڵام موزەفەری سوبحەدەم یەک شت بزانە، یەک شت، شتێک لەوانەیە سوود و ئیستیفادەیەکی گەورەی هەبێت و لەوانەیە مەنفەعەتێکیشی نەبێت، بزانە مەحەبەت تازە دەردی ئەو منداڵانە تیمارناکات».

شەوێکی ساردبوو کە لە باغی سەی جەلالی شەمس هاتمەدەرێ. شەوێکی ساردتر لە شەوەکانی دیکەی دونیا... شەوێک بوو هەستمکرد تا قووڵترین شوێنی ژیانم لە نهێنییەکدا نوقمبووم سەروبنی نییە... دەڕۆیشتم و وەک شێت چاوەڕوانی بەیانیم دەکرد... بەیانییەک بەوپەڕی بێڕەحمییەوە منی هەڵگرت و بەرەو ئەم کەشتییەی هێنام.

## ١٨

چەند ساڵێک لەمەوبەر محەمەدی دڵشوشە، لەو ئێوارەیەدا کە تۆفانەکان لەگەڵ خۆیاندا بردیان، دەبایە بچوایە بۆ لای سەی مژدەی شەمس، ئەو ئێوارەیە کە بە خۆی و هەنارە شوشەکەیەوە، عەشق ڕێگای پێگرت و خەیاڵی پێگۆڕی، دەکرا ئێوارەیەکی گرنگ بێت لە دۆزینەوەی سەریاسەکاندا بۆ یەکتر، بەڵام کاتێک عەشق دڵی محەمەدی دڵشوشەی شکاند و بە خێرایی بەرەو مەرگ فڕاندی، کاتێکی ئەوتۆی نەبوو ئاڕاستەی خۆی بگۆڕێت و چیرۆکی سەریاسەکان بگەیێنێتە کۆتایی خۆی. نا من وەک سەریاسی دووەم ئەو گومانەتان تیادروستناکەم کە محەمەدی دڵشوشە کوژراوە، من دەمەوێت لە وێرانەی عەشقی ئەودا بژیم، نەوەک لە تەلیسمی مردنیدا، تەلیسمێک کە بۆمناکرێتەوە و گوناهبارێک نامەوێت بۆی بگەڕێم، کوژراوێک نامەوێت ئەو خەونە کۆنەی منداڵی بکوژم، کە حەزیدەکرد لە عەشقدا بمرێت..بەڵێ... ئەو ئێوارە سەیر و ساردەی تۆفانەکان بوو، چیرۆکی سەریاسەکانی ڕاکێشایە ئەم زەریایەوە. سەیرکەن هەموو حکایەتێک وەک جۆگەلەیەکی چکۆلانە وایە کە دواجار دێت و دەڕژێتە ناو دەریای بەرینی هەزاران حیکایەتی ترەوە... هەر حکایەتخوانێکیش لە ڕێگا مرد دەبێت حیکایەتخوانێکی دی هەبێت شوێنی بگرێتەوە و ڕووبار لە دوای ڕووبار و دەریا لەدوای دەریا دوای ئەو چیرۆکە بکەوێت.

حیکایەتـی منیش وابـوو، مـن ئـەو سـەفەرەم تەواوکـرد کـە محەمـەدی دڵشوشـە لـە ئێوارەیەکـی تۆفانـدا نەیتوانـی تەواویبـکات.

ئـەو شـەوە کـە لای سـەی جەلالـی شـەمس گەڕامـەوە، جیهـان بـە جۆرێـک تاریـک بـوو، وەک ئەوەبـوو لـە جوغزێکدا گیریکردبێـت و یەکێـک لەوسـەری ئەوسـەری دونیـاوە هاواربـکات «تـەواو ژیـان شـێوەیەکی هەتاهەتایـی خـۆی وەرگرتـووە و کاتـی قسـە و دوودڵـی و دەسـتکارییەک نەمـاوە». شـەوبوو مـن بـە هەسـتی یەکێکـەوە بزانێـت پـەل بـە هیچییـدا ڕادەکێشـێت، دەهاتمـەوە بـۆ ئـەو گونـدە... سـەیربوو لـەلام کـە بینیـم خوشـکە سپییەکان لە تاریکییـدا چاوەڕوانمدەکـەن. چیرۆکـی سەرياسـەکان لـە قووڵاییـدا بریندارپدەکـردن، لـەوە دەترسـان ڕۆژێـک بێـت سـەدان سـەرياس سـەر دەربهێنـن، لـە قووڵایـی ئـەو شـار و گوندانـەوە سـوپایەک لـە منداڵانـی هەتیـو بـە خۆیـان و سـەدان هەنـاری شوشـەوە بڕژێنـە ژیانـی منـەوە، لـەوە دەترسـان شـار و گوندەکانـی وڵات هەموویـان لـە ژێـرەوە پڕبێـت لـە هـەزاران منداڵـی تر کە هەمـان چیرۆکـی سەرياسـەکانیان هەیـە، دەترسـان بکەومـە گومۆکەیەکـی کوشـندەوە نـە دەری هەبـێ و نەدەرچـوون. ئـەو شـەوە مـن باوەشـم بەهەردووکیانـدا کـرد کـە وەک دوو پـەری گـەورە لەسـەر بەردێـک لـە نزیـک ڕێگاکانـەوە چاوەڕوانیاندەکـردم. وەک هەمیشـە بێدەنـگ و قـووڵ و بەحیشـمەت دەیاننوانـد، دوو مەخلـوق بوون لە خەویشـدا نەتدەتوانـی لەیەکیـان جیابکەیتـەوە، لـەو ڕێـگا تاریکـەدا تـا گەیشـتینە مـاڵ، باسـی ئـەو یەکـدی بینینـە سـەیرەی سـەی جەلالـی شەمسـم بـۆ کـردن، باسـی ئـەوەم کـرد کـە سەرياسـێکی دیکـە لـە شـوێنێکی دیکـە، لـە ڕوخسـارێکی دیکـەدا لـەو شـارەدا دەژی. مـن ئـەوکات جگـە لـەو ڕسـتە سـەیرو ئاڵۆزانـەی سـەی جەلالـی شـەمس هیچـی دیکـەم لـە سـەر دواهەمیـن سـەرياس نەدەزانـی. بـەڵام بیرتـان نەچێـت «دواهەمیـن سـەرياس» ناوێـک بـوو دواتـر لـە کۆتایـی هەمـوو شـتێکدا بەخشـیمە ئـەو منداڵـەی دۆزەخـی

بینیبوو. ئێستاش واتێدەگەم ئەو دواهەمین سەریاسی دونیا نەبوو، بەڵکو دواهەمین سەریاسی ژیانی من بوو.

ئەو شەوە بۆ ئەوەی ئازارەکانی خۆم هێوربکەمەوە، وەک هەمیشە قسەم لەیەکێتی مرۆڤەکان کرد، قسەم لەوەکرد کە ناوی سەریاس جگە لە ناوێکی دیکەی ئینسان هیچی تر نییە. وشەی سەریاس ناوێکی ترە لە بری مانا گشتی و مەجازییەکەی ئینسان بەکاریدەهێنین. پێمدەگووتن، چیرۆکی سەریاسەکان لەسەرەتاوە تا کۆتایی هەر ڕەنگێک وەربگرێت، بە هەر ڕێگایەکدا بڕوات، لەوە دەرناچێت کە چیرۆکی هەموو ئەوانەیە لەم سەر زەوییەدا بێهیچ کۆمەکێک کەوتوونەتە ناو گەردەلوولەکانەوە. من لە مێژبوو وازم لەوە هێنابوو بۆ یەکێک بگەڕێم ژیانی لەناو هەزاران هەزاری زیندەگی تردا توابووەوە، دەمزانی جیاکردنەوەی هەر یەکێک لەوان لەویدی، بێماناکردن و کوشتنێتی... ئاه ئەی دۆستانی ئەم شەوە تاریکە لەوانەیە لای ئێوە وا نەبێت، لەوانەیە شتەکان بۆ ئێوە کە خۆتان نیشتەجێی هەمیشەیی ئەوماڵە بوون چەشنێکی دیکە بنوێنێت، بەڵام لای من کە لە دوورەوە هاتبووم، ساڵەهای ساڵ لە سەحرادا یەک دیمەنم بینیبوو، ساڵەهای ساڵ مەودایەکی نەشکاو و نەبڕاوم لە هەموو شتەکان وەرگرتبوو، وەک چۆن بیابان لە یەکێتی و یەکانگیری سروشت ئاگاداریکردمەوە، چۆن دەریای لمی بێسنوور لەو بۆتەیەی خەبەرداریکردمەوە کە هەمووان وەک مرۆڤ و گیانەوەر و خودا لە ناویدا نیشتەجێین، ئاوەهاش لە یەکێتییەکی سەرتاسەری ژیان وەئاگایهێنامەوە. دەشێت ئێوە تاکەتاکە سەیری زیندەگی خۆتان بکەن و بڵێن ئەمە ژیانی منە، بەڵام کاتێک مرۆڤ بیستویەک ساڵ لە ماڵ دووربێت کە دەگەڕێتەوە، کە دادەنیشێ و تەماشادەکات، ناتوانێت، یەکە یەکە پێتانبڵێ «ئەمەیە ژیانت»، بەڵکو دەتوانێت پێتانبڵێ «ئەمەیە ژیانتان» «ئەمەیە ژیانمان» «ئەمەیە ژیان». من سەریاسم لە ناو

ئەو یەکێتی و تێکەڵاوبوون و ئاوێتەبوونە مەزنەدا بۆ جیانەدەکرایەوە. من ئەمشەو لەبەردەم ئێوەدا دەیدرکێنم و خۆشبەختیشم، لە گەڕانی دوورو درێژمدا بە دوای سەریاسی سوبحدەمدا، سەریاسی ڕاستەقینەم نەدۆزییەوە، ئەو کوڕە ڕاستەقینەیەم نەبینی کە وێنەکەی لە خەیاڵمدا بوو، بەڵام هەموو ئەو جیهانەم بینی کە سەریاسی تیا ونبووبوو. ئەو شەوەی لای سەی جەلالی شەمس گەڕامەوە و درەنگ وەخت لە تاریکی ناو کێڵگەکاندا قسەم بۆ خوشکە سپییەکان دەکرد، بە جۆشی دەروێشێکەوە قسە لە خودا بکات، دەمگووت سەریاس ناوێکی ترە لە ناوەکانی ئادەم... ئادەمێک بێخودا لەم زەمینەدا دەسووتێت و هەڵدەستێتەوە، دەردەکرێت و دەگەڕێتەوە. بەڵام خوشکە سپییەکان، جۆرە نیگەرانی و پەرێشانییەکیان تیابوو من تێینەدەگەیشتم.

من لە تاریکیدا دەستم بەرزدەکردەوەو دەمگووت «لالای من، شاشای سپیم... باوابێت... باوابێت... با ئەم عەوداڵی و گەڕانە لەگەڵ خۆیدا بمبات، بمبات بەرەو ناو گەردەلوول، بۆ سەحرا، بۆ ناو قوللە تاریک و داخراوەکان، بۆ پشت هەر دەرگایەک کە کلیلەکانی لای مرۆڤ نییە... بابمبات، ئێوە غەمی چی لە من دەخۆن، من بۆیە لێرەم تا دەریاکان بەدوای ئەودا بگەڕێم، دەزانم ئێستا لێم دەپرسن ئەو کێیە، من بۆ کامە سەریاس دەگەڕێم، سیفەتی ئەو سەریاسە چییە کە وەک شێت لە دوی خۆم دەدەمە دەست لافاوەکان. نازانم لەوانەیە زنجیرەیەک ڕۆحی بەدبەخت هەبن، کە بە زنجیرەیەک چیرۆکی شەیتانکرد پێکەوە بەستراون، کە هەریەکەیان بمانبەنە سەر ئەوی تریان... من تا ئەو جێگایەی بتوانم دەڕۆم... تا ئەو جێگایەی خەیاڵم ئەم مەحشەرە قبووڵدەکات دەڕۆم ، من گەر خودایە دەستم دەگرێت و گەر شەیتان، دواجار دوایدەکەم».

ڕۆژی دوایی ئەو هەنارە شوشەیەم لە خوشکە سپییەکان خواست و بەتەنها چوومە لای «سەی مژدەی شەمس» ئەو توحفەفرۆشە گەنجەی هیچی لەو پیرەمێردە عاشقە نەدەچوو کە لە ناو چیاکاندا دیبووم، پیاوێک بوو لە نوسینگەیەکی گەورەدا دانیشتبوو، بە هێمنی و ویقارێکەوە قسەیدەکرد تەنیا لەو سیاسیانەم بینی بوو هەندێجار لە کەناڵە ناوخۆکانەوە لە پشت کورسی و مێزەوە قسەیان بۆ تەلەفزیونەکان دەکرد، منگی و گڕییەک لەدەنگیدابوو، لەگەڵ هەر کەسێکدا قسەی بکردبایە وەک ئەوەبوو بۆ کۆمەڵێک ئافرت قسەبکات و بیەوێت بە دەنگی سەرسامیانبکات، نامەکەی باوکی و هەنارە شوشەکەم دایە، ئەو دەستی بردو لە مێزێکی تەنیشت خۆیدا قاسەیەکی گەورەی کردەوە، هەنارێکی شوشەی دیکەی لەو قاسەیە دەرهێنا، هەنارێکی شوشە کە تەواو لەو هەنارە شوشەیە دەچوو کە من خستبوومە سەر مێزەکەی. بە هێمنی هەردوو هەنارەکەی بەراوردکرد و گووتی «من لەسەر ڕاسپاردەی باوکم سەرپەرشتیدەکەم... ئەو کەسی من نییە... لەگەڵ کۆمەڵی منداڵی تردایە، ڕێکخراوێکی بیانی بەخێویاندەکات». سەیرێکیکردم و بەسەرسامییەوە پرسی «تۆ دەزانیت چۆنە؟... بینیوتە؟...دەزانیت چ ڕوخسارێکی هەیە؟». من گووتم «نا... لە کوێوە بزانم، لە کوێوە؟ تا ئێستا نەمبینیوە». بە هێمنی کلیلی ماشێنەکەی هەڵگرت و گووتی «بابڕۆین». ئەو منی برد بۆ ئەو ماڵە گەورەیە کە لە کوچەیەکی نوێ و لە بەشێکی تازەی شاردا بوو. سەی مژدەی شەمس لە ڕێگا سەرییادەداو دەیگووت «قوربان من نایناسم، من لەسەر قسەی سەی جەلال هەموو شتێکم بۆ کردووە، من ئەو ڕێکخراوەم بۆ دۆزییەوە کە سەرپەرشتی منداڵانی کەمئەندام و ئیفلیج دەکات، لەوانەیە بیبەن بۆ ئەوروپا، دکتۆرێک پێیگووتم لەوێ دەرسی لەسەر دەخوێنن... دەمێکە بە باوکم گووتووە خۆی لەم چیرۆکانە دووربخاتەوە... بەڵام ئەو

وازناهێنێت... قوربان بزانە، من هەموو شتێکم لەبەر خاتری سەی جەلال بۆ کرد». پیاوێک بوو خۆی لەوە بەگەورەتر دەزانی بایەخ بە چارەنوسی هەندێ کەسی بچوکی وەک دواهەمین سەریاس بدات. منی لەبەر دەرگاکە داگرت و گووتی «دەتەوێت بێمەوە بە دواتا؟». گووتم «نا... ئەزیزم... من خۆم شارەزای هەموو ڕێگاکانی دونیام». نازانم بۆ لەگەڵمدا نەهاتە ژوورێ، پێدەچوو نەتوانێ لەو دونیایە نزیکبکەوێتەوە کە ئەو منداڵانە تیادەژیان. وەک ئەوەی ترسێک لەو جێگایەی دووربخاتەوە کە تەنیا ڕێزو مەحەبەتی باوکی ناچاریکردبوو ڕووی تێبکات، بە پەلە ماشێنەکەی ئاژووت و دەربازبوو. سەی مژدەی شەمس وەک یەکێک نەهاتە پێشچاوم مەراقێک لە دونیا بخوات، وەک یەکێک جگە لە خۆی شوێنێکی بۆ کەسانی تر و زیندەگییەکانی تر لە ژیانیدا جێهێشتبێت، پیاوێک بوو لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا منی گەیاندە خانوویەکی گەورە کە لە ناوەوە جۆرە قەڵایەکی داخراوی دیکە بوو، تێکەڵەیەک بوو لە خەستەخانە و زیندان، لە شوێنی بەخێوکردن و شوێنی قەهر، لە ماڵی سەرپەرشتیکردن و ماڵی وێرانکردنی مرۆڤ، منی گەیاند و ئیتر نەمبینییەوە. بەڵێ، هەر ئەو جارە بوو ئیدی من سەی مژدەی شەمسم نەبینییەوە، ئەو پیاوەی دەبایە محەمەدی دڵشوشە ببات بۆ لای دواهەمین سەریاس، بەڵام کە بینیم هیچی دەربارەی محەمەدی دڵشوشە نەدەزانی، ئاگاشی لە چیرۆکی سەریاسەکانی تر نەبوو. دەیگووت «ئەوەندەم کات هەیە بە دوای ژیانی خۆمدا ڕابکەم، ساڵەهای ساڵە بە سەی جەلالی شەمس دەڵێم ئەو هەنارە شوشەیە چییە بافڕێیبدەم، خۆ قاسەکەم تەنەکەی خۆڵ نییە، هەر جارێک کە دێت، دەرگای قاسەکەم پێدەکاتەوە تەماشایدەکات و دەگری، من هەموو جارێک دەڵێم بابە ئەم شتانە چییە، ئەمە سەنعەتی چ زەمانێکە، ئاخر ئەم شوشەیە خۆ توحفە نییە، من چی لێبکەم،

براگیان سا شوێنم لێدەگرێت، ئەو دەڵێت فرێینەدەیت، ڕۆژێک شتێکی گەورە ئاشکرادەکات». لە بەردەرکی ئەو ماڵە هەنارە شوشەکەی دامێ و گووتی «من ساڵەهای ساڵ پاراستوومە، ئیتر ماڵی خۆتە، کە سەی جەلالی شەمست بینی، بڵێ هەنارەکەم بە ساغی لە مژدە وەرگرت، با لای باوکم عەیببار نەبم». بە هێمنی دەمگووت «دڵنیابە... دڵنیابە... دڵنیا». ئەو دەڕۆیشت و بە کەمتەرخەمییەکەوە هۆڕنێکی خوداحافیزی لێدەدا و بەپەلە جێیدەهێشتم.

بەتەنیا چوومە ئەو ماڵەوە کە ڕێکخراوێکی بیانی بۆ گەنجە پەککەوتەکانی دروستکردبوو. دروست نازانم ئەو ماڵە چەند ژوور بوو، وەک ئەوە بوو لە هەزاران هەزار ژوور دروستبووبێت... لە هەزاران هەزار ڕاڕەو و پێچاوپێچ، لە سەدان ساڵۆنی گەورە گەورە. لەدەرەوەڕا وەک ماڵێکی ئاسایی دەینواند، بەڵام لە ناوەوە وەک ئەوە بوو تائەوسەری ئەوسەری گەردون درێژ بووبێتەوە. بەڵام هاوڕێیان بزانن تادەمرم ئەو سەفەرە ترسناک و سەیرەم لە دالآن و ژوور و هۆڵ و قاوشە سەیرەکانی ئەو ماڵەدا لە یادناچێتەوە.

هەزاران ژوور بوو... هەزاران ژوور. پڕ لە گەنجی پەککەوتە و شێواو. کوڕانی بێ دەست و قاچ و سەر. پڕ لە مەخلوقاتی سەیرو نەبینراو، پڕ لەو کوڕانەی پارچەپارچە بووبوون و دەستێک بە شێواوی نابوونی بەیەکەوە. پێدەچوو ژوورەکان بە پێی جۆری دەردەکان دابەشبووبن، چەندەها ژووری دوورودرێژ پڕبوون لەو گەنجانەی هەردوو قاچیان نییە. شوێن زیندەگی ئەو کوڕانە بوو لەسەر دەست دەڕۆیشتن، وەک هەندێک تەنی دابڕاو لە زەوی لە بەتانی سەیر سەیردا هەڵواسرابوون، لە پێخەفە هەواییەکانیاندا جۆلانێیان دەکرد، هەندێکیان پێدەچوو بە دارشەقەکانیاندا هەڵواسرابێتن، هەندێکیان لە ژێر قەرەوێڵەکانیاندا دەخەوتن و قاپی

خواردنەکانیان لەسەر زەوییەکە لە نزیک خۆیانەوە جێهێشتبوو و لە بنەوەڕا نیگای ئەو ڕێبوارانەیان دەکرد کە بە کس جێگاکانیاندا تێدەپەڕین. شوێنێکی دی شوێنی ئەو گەنجانە بوو اکە دەستیان نییە، دیمەنێکی سەیربوو سەدان لەو گەنجە بێدەستانە بەدەم قاپەکانیان دەگرت، سینیەکانیان لەسەر سەر ڕادەگرت و لە ڕاڕەوێکی درێژدا وەک لە پێشبڕکێیەکی بێدەنگ و درێژدا بن دەڕۆیشتن. من یەکە یەکە بە ڕاڕەوەکاندا دەهاتم، بۆنی دونیایەکی سامناک دەهات بەسەرمدا. سەیرت لێدەهات ئەو هەموو ئازارە چۆن لە شوێنێکی وادا جێگای دەبێتەوە، هەزاران منداڵ و گەنجی زامداربوون کە بێدەنگ و بێباک دەهاتن و دەچوون، یەکێک بوو لە بێدەنگترین جێگاکانی دونیا، بە ئاستەم دەنگێکت دەبیست. بە چرپەی ترساو قسەیان لەگەڵدا یەکدا دەکرد، هەر شتێکت دەپرسی بە ئەسپایی وەڵامیاندەدایتەوە. لە بەشی کوێرەکاندا هێمنییەکی خۆڵەمێشی باڵی بەسەر شتەکاندا گرتبوو، وەک ئەوەی نەبینینی دووردرێژی کوێرەکان نیگار و ڕەنگی شتەکانی کاڵکردبێتەوە، لە شوێنی کەڕەکاندا کپییەک لە کپی سەحرا دەچوو، بێدەنگییەک لە بێدەنگی ڕاڕەوێکی ناو مەلەکوتی دەکرد ڕکێفی شتەکانی لەدەستابوو. لە شوێنێکی دیکەدا ئەو کوڕانەم بینی کە پێدەچوو هەلاهەلابووبن و کۆکرابێتنەوە، مەخلوقاتی شێواو، مەخلوقاتی کۆلاجکراو لەسەر یەک، ئەوانەی پارچەکانیان پەڕیبوو بۆ یەک. هەستتدەکرد سەری یەکێکیان بە لەشی ئەوی دییەوە و چاوی یەکێکیان لەسەری ئەوی دیکە و کەپوی ئەوی دیان لەسەر ڕوخساری یەکێکی دیکەیە... هەستتدەکرد دەستێک هەموویانی پارچەپارچەکردووە و تێکەڵاویکردوون، بەڵام هێندە تێکەڵاویکردوون دواتر نەیتوانیوە دروستیانبکاتەوە، ئادەمیزادت دەبینی نیوەی پەڕیوە بۆ سەر ڕوخساری یەکێکی تر، ئادەمیزادیشت دەبینی وەک لە پارچەی زیادی هەزاران ئادەمی دیکە دروستبووبێت، هیچ بەشێکی

لەگەڵ ئەوی دیکەیدا نەدەگونجا. من دەهاتم و لە هەموو داڵان و هۆڵ و ژوور و ساڵۆنەکاندا دەمپرسی «کەس سەریاسی سوبحدەم دەناسێت؟» هەمیشە دەنگێکی هێمن بە چرپەوە دەیگووت «نایناسین». دەنگێک دواتر نەتدەزانی لە کوێوە هاتووە و کێ وەڵامیداویتەوە. ئاوڕتدەدایەوە بۆ ئەوەی بزانیت کێ وەڵامیداویتەوە، بەڵام کەس تەماشای نەدەکردی. لە ژوورێکدا لەوسەری ئەوسەری ڕاڕاوەکان. لە بەشی منداڵانی پشکۆ، شوێنی ئەو کوڕانەی لە جەنگدا سووتابوون، سەریاسی سوبحدەمم دۆزییەوە. لەبەردەرکی بەشەکەدا وەستام و بەدەنگێکی کەمێک بەرز پرسیم «تکایە، کێ سەریاسی سوبحدەم دەناسێت؟». کوڕێکی بچکۆلانەی باریک کە نیوە ڕووت لە دەرپێ و فانیلەیەکدا دەسوڕایەوە، سەرتاپای گیانی بە شێوەیەکی ترسناک سووتابوو، دوو چاوی پێوە بوو شین، لەسەر تەختی دەموچاوێکی داقرچاو، کوڕێک بێبرۆو بێبرژانگ، وەک تارماییەک لە خەونێکی تاریک ڕاپکردبێت بە ئەسپاییەوە هاتەبەردەمم و گووتی «سەی جەلالی شەمس تۆی ناردووە؟». چرپاندم بە گوێیدا «ئەو منی ناردووە. سەی جەلالی شەمس... منی ناردووە... تۆ ئەویت سەریاسی سوبحدەمیت؟». بە ئەسپایی گووتی «نا... نا... من ئەو نیم... بەڵام دەیناسم، من سەریاسی سوبحدەم دەناسم؟ وەرە بتبەم بۆ لای». دەستیگرتم و بە ئەسپایی بردمی. ئەو بە منی گووت ئەم ژوورانە شوێنی منداڵانی پشکۆن، سەدەها گەنجی سووتاوبوون کە لەشیان وەک مۆم توابوووەوە، جەستەیان وەک لاستێکێکی شل بەسەر نوێنەکاندا ڕژابوو، وەک لاستیکێک دواتر ساردبووبێتەوە و هیچ قاڵبێک کۆی نەکردبێتەوە، هەندێکیان پێدەچوو هەمیشە بسووتێن، کاتێک سەیری چاویانت دەکرد پڕ بوو لە پشکۆ، هەناسەیان لە هەناسەی کوورەیەکی گەرم دەچوو. کە بە ژوورەکاندا دەڕۆیشتی هەستت بە گڕەیەک دەکرد لە گڕەی بای بیابان بەهێزتر. ئەو کوڕە کە بەراورد

بەوانی تر پێدەچوو لە هەموویان باشتربێت گووتی «من ناوم، ئەستێرە کامیلە، پێمدەڵێن ئەستێرەی ڕەش، لەبەرئەوەی تاکە کەسێکم دەتوانم نیوەشەوان کە دونیا تاریکدادێت بچمەدەرەوە و بازاڕ و کوچە ڕەشەکان ببینم... دەزانی من چۆن سووتام؟ نازانیت. لە دەغلێکی سەوزدا سووتام، لەگەڵ کچی شێخێکدا لە ژێر ئاسمانێکی ڕۆشندا خەوتبووم، کەسوکاری ئەو ئاگریان لە هەردووکمان بەردا، من هەرچۆنێک بوو بە ئاگرەکەوە خۆم گەیاندە ئاو، ئەو نەیتوانی دەرچێت، لەوێ لە ناو گەنمەکاندا سووتا». بە سووکییەکی سەیر قسەیدەکرد، مرۆڤ وا هەستیدەکرد لە بەندیخانەیەکی ترسناکدایە نەوەک لە خەستەخانە وماڵێکی سەرپەرشتیکردندا. بەجۆرێک سووتابوو مرۆڤ نەیدەتوانی نیگاری پێش سووتانەکەی بهێنێتەوە پێشچاوی خۆی. بەڵام شتێک لە درەوشانەوەو سافی ڕۆح لە چاویدا دەبینرا. گووتی «دەزانی بۆچی وا بە سووکی قسەدەکەین؟». گووتم «نازانم، نا». سەیریکردم و گووتی «دەبووایە بزانیت... لێرە هەمووان هاواردەکەن ، هەمووان دەناڵێنن، ئەوانەی زۆر بەدەنگی بەرز قسەبکەن و بناڵێنن پشووی ئەوانی تر تێکدەدەن، ئیسراحەتی دکتۆر و ستافی ڕێکخراوەکە تێکدەدەن کە ئەوەتان لەسەرروومانەوەن... ڕۆژێک هاتن و هەموو ئەوانەیان دەرکرد کە بەدەنگی بەرز هاواردەکەن و دەناڵێنن، بۆ ئەوەی لێرە بژیت و نانبخۆیت و لە لێفەیەکی گەرمدا بخەویت نابێت بەدەنگی بەرز هاواربکەیت». لە پڕێکدا وەستاو بە گومانێکەوە سەیریکردم و گووتی «تۆ کێیت؟... تۆ لە یەکێک دەچیت ئێرەت نەبینیبێت و لەم شارە نەژیابێت». من بە هێمنی سەیرمکرد و گووتم «من باوکی سەریاسی سوبحدەمم». نەمتوانی هیچ لە چاویدا بخوێنمەوە، وەک ئەوە بوو نەیەوێت زۆر تەماشای چاوی بکەم، وەک ئەوەی بزانێت ئەو ڕوونی و سافی و قووڵییەی نیگاکانی زۆر نهێنی دڵی ئاشکرادەکەن، سەری دانەواندو گووتی «من قەت تۆم

نەدیوە». وەک شتێک ڕایچەڵکێنێت بە خێرایی سەیریکردمەوە و گووتی «سەریاسی سوبحدەم دەنێرن بۆ ئەورووپا... ناوی دەرچووە، دەینێرن بۆ ئەورووپا، چەند ڕۆژێکی تر دەڕوات، لەوێ دەرسی لەسەر دەخوێنن، پێنج کەسن، دوو پیاوی ئینگلیز هەڵیانبژاردن». بە غەمگینییەکەوە سەریدانەواندو گووتی «منیان هەڵنەبژارد، یەکێکیان دەویست بە چەکی قورس سووتابێت، ئەوانەیان هەڵبژارد کە بە بۆمب و غاز و کیمیاوی سووتاون... منیان نەویست، یەکێکیان دەستی لە پێستەکەمدا و گووتی ئەمەمان ناوێت». بە هێمنی دەستی بۆ هاوڕێکانی درێژکرد و گووتی «پێماندەڵێن مندالانی پشکۆ، چونکە هەموو بە ناو ئاگردا ڕۆیشتووین، لە پێشدا بەم بەشەیان دەگووت «جەهەنەم» ڕۆژێک شاعیرێک هات، ئەو ناوی نایەن مندالانی پشکۆ، شیعرێکی درێژی نوسیبوو، لە تەلەفزیۆن پیشانیاندا، دوایی هات و بۆ ئێمەشی خوێندەوە... شیعرێکی درێژبوو، من هیچیم لەبەر نییە». لە ناکاو ئێستێکی تری گرت و گووتی «تۆ دەزانیت سەریاسی سوبحدەم قسەناکات... دەزانی یان نازایت؟». من پێشتر نەمویستبوو هیچ شتێکی ئەوتۆ گرنگ لە زاری سەی جەلالی شەمس فێربم، دەمویست خۆم باوەشی پیابکەم و دەستی لێبدەم و لە ئازارەکانی تێبگەم. گووتم «نا... نازانم... نازانم». بە دەنگێکی سووکتر و غەمگینتر گووتی «ناتوانێت قسەبکات... لەو کاتەوەی سووتاوە... ناتوانێت قسەبکات... دەتوانێت هەندێ وشە بڵێت... هەندێ وشە کە لە خەیاڵی خۆیایەتی، قەرەوێڵەکەی لە تەنیشت قەرەوێڵەکەی منەوەیە من چەند ڕۆژ دەوەستم و کەلیمە کەلیمە قسەکانی پێکەوەگرێدەدەم شتێک تێدەگەم، بەس من دەتوانم وا بکەم، کەسی تر ناتوانێت وابکات». بە شەرمێکەوە سەریدادەناوند و دەیگووت «چونکە قەرەوێڵەکەی لە تەنیشت قەرەوێڵەکەمەوەیە».

ڕاڕاوەکان لەوە درێژتربوون من چاوەڕوانمدەکرد، دەڕۆیشتین و

ئەستێرەی ڕەش دەیگووت «سەریاس ناتناسێتەوە، سەریاس کەس ناناسێتەوە... ڕۆژێک پیاوێکی کوێر و کوڕێکی تر هاتن و ئەو نەیناسینەوە، دوایی زانیم کە نەیناسیونەتەوە، کە دوای هەفتەیەک هەموو قسەکانیم نایەوە بەیەکەوە...».

سەریاسی سوبحدەم لەوسەری ڕاڕاوەکەدا لەسەر دوا قەرەوێڵە دانیشتبوو، ئەستێرە گووتی «ئەوە سەریاسی سوبحدەمە». بە هێمنی لێی نزیکبوومەوە، خەریکی یاریکردنبوو بە تەزبێحێکی درێژ، ژوورەکەی هەشت کەسی دیکەی تیابوو، ئەو بەتەنیا لەسەر دوا قەرەوێڵە بێئەوەی تەماشای هیچ بکات، یاری بەدەنکە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئەو تەزبێحە گەورەیە دەکرد. تا لە نزیکەوە نەمبینی تێنەگەیشتم بۆ سەی جەلالی شەمس نەیدەویست ببینم. خودایە چ شتێکی ترسناک بوو، پارچەیەک گۆشتی تواوەبوو، هەستتدەکرد چاوی بەسەر ڕومەتیدا تواوەتەوە، ڕوومەتی بە چرنوکێکی گەورە پچڕاوەو ئێسکەکانی دەرکەوتوون، لچی بەسەر چەناگەیدا شۆڕبووبووەوە، شتێک گوێکانی لوولکردبوون، بایەکی ترسناکیش هەموو قژی لەگەڵ زەبرو جەبەروتی خۆیدا هەڵکەندبوو. لەلای ڕاستییەوە پێستی ناوچاوانی وەک لاربوونەوەی گەڵایەکی وشک بەسەر چاویدا هاتبووەخوارێ، بۆ ئەوەی باش ببینێت دەبایە ئەو پارچە پێستە درێژە بەدەست بەرزبکاتەوەو ڕایبگرێت، چاوی ڕاستی بە پێچەوانەی چاوی چەپییەوە بە جۆرێکی سەیر بچوکبوو، لە کاتێکدا چاوەکەی دی بێئەندازە لە ئاستی درێژی گەورەبووبوو، کەپووی لە پارچە گۆشتێکی سووتاو دەچوو، کاتێک هەناسەیدەدا گوێت لە خیزەی سینەی بوو. بە هێمنی چوومە بەردەمی و دانەویمەوە کڕنووشم بۆ برد و قاچە سووتاوەکانیم ماچکرد، بە جۆرێک لە بەردەمیدا نوشتامەوە، وەک ئەوە بوو سوژدە بۆ خودایەکی چکۆلانە بەرم. کە قاچیم ماچکرد

کەس نەیبینیم، هەتا سەریاس خۆشی تەماشای نەکرد. ژیان هێندە گازی خوێناوی لێگرتبوو، نەیدەتوانی هەست بەو ماچە بچوک و هەتیو و بێمانایەی من بکات. ئەو کات ئەو قسەیەی سەی جەلالی شەمسم هاتەوە یاد کە گوتی «مەحەبەت ناتوانێت دەردی ئەم منداڵانە تیماربکات».

مەحەبەتی من مەحەبەتێکی درەنگ وەخت بوو، خۆشەویستی درەنگ وەختیش هەمیشە لە بەزەیی و پەشیمانییەوە نزیکترە نەوەک لە خۆشەویستی. کاتێک لەبەردەم ئەو منداڵانەدا وەستام وەک ئەوەبوو سەفەری دووردرێژی ژیانم گەیاندبێت بە کۆتایی، وەک ئەوەبوو چیتر لەم گەردونەدا هیچی دی لەو سات و چرکەیە گرنگتر نەبێت کە تیا نوشتامەوەو ئەو کوڕەم ماچکرد، کوڕێک بێئاگا لە من لە دونیای خۆیدا نوقم بوو.

پێدەچوو گەورە نەبووبێت، بەشی هەرە زۆری ژیانی لە دوای سووتان لە شوێنی تاریک و لە ژووری داخراودا بردبووە سەر، بەر لەوەی ئەم رێکخراوە بە خۆی بگرێت ماوەیەکی درێژ لە ژووری مزگەوتێکی تاریکدا لەگەڵ چەند لێقەوماوی تردا بە یارمەتی سەی جەلالی شەمس ژیابوو. نەیدەتوانی لە شوێنی خۆی هەستێت، قاچەکانی بە شێوەیەکی سەیر بچوک و منداڵانە مابوونەوە، لەو ڕۆژەوەی ئەو بۆمبایە سووتاندبووی قاچەکانی گەشەیان نەکردبوو. تەنیا بەشی سەرەوەی بە نارێکی بە هەموو لایەکدا گەورەبوو بوو، حیکایەتێکی نەبوو، لە منداڵییەوە سووتابوو و لە ژوورە تاریکەکاندا گەورەبووبوو، هیچ شتێکی لەسەر دونیای دەرەوە نەدەزانی، نەیدەتوانی باش سەیربکات، نەیدەتوانی باش قسەبکات، بەڵام «ئەستێرەی ڕەش» دەیگووت، لە هەندێ شت تێدەگات. لەبەردەمیدا وەستام و گوتم «من باوکتم». بە هێمنییەوە سەیریکردم و هیچی نەگووت، وەک ئەوە بوو ئەو وشەیەی نەبیستبێت.

پاش ئێستێکی کورت سەری بەرزکردەوەو ئەو هەنارە شوشەیەی بەدەستمەوە دی و گووتی «هەنار». سەری دانەواند و چەند جارێک بە دەنگێکی غەمگینەوە گووتییەوە «هەنار... هەنار... هەنار». من بە هێمنی باوەشم پیاکرد، لێوم خستە سەر ئەو ناوچاوانە زامدارەی و ماچمکرد، ماچێک پێشتر هیچ کەسم بەو جۆرە ماچنەکردبوو، پێدەچوو پێش منیش هیچ کەسێک بەو شێوەیە ئەوی ماچنەکردبێت. ئەستەمترین شتێک مرۆڤ بتوانێت بیری لێبکاتەوە، دروستکردنی ڕێگایەک بۆ ناو دڵی ئەو کورە. کە ماچمکرد بتە خۆشییەوە سەری بەرزکردەوە و گووتی «سبەی... سبەی». ئەستێرەی ڕەش لە تەنیشتمانەوە بوو گووتی «چەند ڕۆژێکی تر دەتوانیت لە مانای قسەکانی تێبگەیت».

هەندێ ساتەوەخت هەیە لە ژیاندا، سەرەتای هەموو ئەو گۆڕانکارییانەیە کە پێشوەخت پێشبینیت نەکردوون.

ئەو کورەی لەویادا وەک جەستەیەکی پەرێشان لە دونیای ئاگرەوە هاتبووەدەرێ و بۆنی هەموو ئەو ژوورە تاریک و زوڵوماتە ڕەشانەی لێدەهات کە تیا گەورەبووبوو، کوڕی من بوو. یەکەمجار بوو یەکێکم لە بەردەمدا بێت باوەشی پیابکەم و پێیبڵێم «کوڕم»، ئەو ساتەی بیستویەک ساڵ لە سەحرا بیرم لێکردبووەوە. ئا وامەزانن من بەبینینی ئەو کورە هەستم بە ئازاری ئەوانی دیکە هێورتربووەوە، وامەزانن هێندەی من باوەشم بەو کورەدا کرد، ئیدی سەریاسی دووەمم لە زیندانە تاریک و نهێنییەکەی خۆیدا لەیادکرد، وامەزانن ئەو پەیوەستە عاتیفییەم بە گۆڕی سەریاسی مەزنەوە پچڕان کە لە دڕک و داڵی دەشتێکی دووردا نێژرابوو، وامەزانن ئیتر ئەو منداڵانەم لە یادکرد کە سەرەڕۆ و بێکەس لە ناو بازاڕ و لە کێڵگەکان و لە شوێنەکانی شەڕدا گیریانکردبوو.

لەو ساتەدا کە باوەشم بە دواهەمین سەریاسدا کرد، تێگەیشتم من نابم بە باوکێکی ڕاستەقینە. ئەو کاتە چاومکردەوە و تێگەیشتم ئەوەی لە بەردەستی مندایە بەشی ئەوە نییە من بکاتە باوکێکی ڕاستەقینە. من چیم لە بەردەستدا بوو، لە گۆڕێک، پارچەیەک گۆشتی هەلاهەلا، کۆمەڵێک کاسێت و دوو هەناری شوشە زیاتر. بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە سەریاسەکان هەرگیز نەبووبوون بە برای یەکتر، منیش نەدەبووم بە باوکیان، من و ئەوان بۆ هەمیشە لە گەردونێکی مەجازیدا نوقم بووبووین کە لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا شتێکی قووڵتر لە برایەتی، باوکایەتی، دۆستایەتی ئاسایی و خۆشەویستی ئاسایی پێویستبوو. ئەو ساتەی باوەشم بەو پارچە گۆشتە ماندو و تواوە و بێئاگایەدا کرد، وەک شتێکی قووڵ لە ناخمدا بدرەوشێتەوە لە مانای ئەو پەیمانانە تێگەیشتم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان سەریاسی مەزنی بە هاوڕێکانی و خوشکە سپییەکانەوە بەستەوە، لە مانای ئەو سوێندە تێگەیشتم لاولاو و شادەریای پێکەوە گرێدەدا. لەو ساتەدا تێگەیشتم بەرامبەر بە خامۆشبوونی هەستەکان، بە سەحرا، بە مردن، یەکدی نەدۆزینەوە، لێکدابڕانە گەورەکان، ئەو پەیمانانە تەنیا ڕێگایەکی ژیانە. لەو ساتەدا کە باوەشم پیاکردبوو، کە هەستم بە گەرمای جەستەی دەکرد، هەستم بە گرێکی هەرگیز خامۆش نەبووی ناو ڕۆحی دەکرد، کاتێک وەک باوەشکردن بە درەختی ناو جەریانی لافاوێکی مەزندا دەستمکردبووە ملی، لەو ساتەدا تێگەیشتم ژیانی من و ئەو پێویستیان بە پەیمانێکی گەورە هەیە، گەورەتر لە باوکایەتی و خۆشەویستی و بەزەیی. باوەشم پیادەکرد و بۆنم پێوەدەکرد دو ئەو ڕستە سامناکەی سەی جەلالی شەمس لە سەرمدا دەنگیدەدایەوە، تەماشامدەکرد و دەمگرتەوە ئامێز، ماچمدەکرد و دەستە باریک و سووتاوەکانیم دەخستە سەر دڵم، دەگریام و سەرم دەخستە سەر ئەو

سینەیەی خوێنێکی ئارامی پیادەڕۆی... چ ڕستەیەکی ترسناک بوو «مەحەبەت ناتوانێت دەردی ئەو منداڵانە تیمار بکات». لەو ساتەدا من سەرم بەرزدەکردەوە، سەیری ئەو قاوشە دووروودرێژانەی مەڵبەندەکەم دەکرد، سەیری ئەو کوڕە سووتاوانەم دەکرد کە لەسەر قەرەوێڵەکانی خۆیانەوە، هەر یەکەیان سەرقاڵی یاریکردنبوون بە شتێک. تەماشای ئەو گیانە وێران و ژیانە خاپوور و نیگا خامۆشانەم دەکرد، تەماشای ئەستێرەی ڕەشم دەکرد وەک ئەوەی حەسوودی بە سەریاسی سوبحدەم بەرێت لە ئامێزمدا سەیریدەکردم، لەوساتەدا بە چاوی پڕ فرمێسکەوە، بە هەڵچوونێکی خوێناوی دڵەوە، بڕیارمدەدا خۆم و ژیانی خۆم بە پەیمانێکی هەتاهەتایی بەم کوڕەوە ببەستمەوە. پەیمانێک کە تەنیا خۆم لەگەڵ خۆمدا مۆرمدەکرد، خۆم دەمنوسی و دەمبرد و هەڵمدەگرت.

پەیمانەکەی من ئەوە بوو جارێکی دی سەریاسی سوبحدەم جێنەهێڵم، بۆ هەر کوێیەکی زەمین ڕۆی دواییکەوم، لە هەر جێگایەکدا لەیەکپچڕاین بگەڕێم و بیدۆزمەوە، لە هەر شوێنێکدا ونمکرد، هەموو ژیانم تەرخانبکەم بۆ دۆزینەوەی.

دواهەمین سەریاس نەیدەزانی بۆ ماچیدەکەم، نەیدەزانی باوک مانای چی؟ بەڵام هەستمدەکرد باوەشەکانی من دڵی دەمێنێتە سەما، تەماشای چاویم دەکرد، ئەو چاوە گەورەیەی کە پێدەچوو شتەکان بە جۆرێکی تر ببینێت جیاواز لە بینینی ئێمە، باوەشم پیادەکرد و گەرمایی جەستەی هەستێکی کوشندەی بە تەنیایی پێدەبەخشیم. هەستمدەکرد من ژیانێکە لە ئامێزانی مرۆڤ بەدووربووم، هەستمدەکرد جەستەی هەلاهەلای ئەو مرۆڤە، هاوارێکی مەزن و قووڵی تیایە بۆ ژیان، کە باوەشم پیادەکرد وەک هەر ڕۆحێکی مەحروم لە خۆشەویستی پتر خۆی پێوە دەنووسانم، ئەو نەیدەزانی من کێم، نەیدەزانی بۆ باوەشی پیادەکەم، نەیدەزانی من چیم لەو دەوێت، بەڵام بە فرمێسکەکانمدا شتێک

لە نیازی من تێدەگەیشت، غەریزە سادە و پاکەکانی ڕێنمایاندەکرد بۆ تێگەیشتن و جیاکردنەوەی باوەشی من لە هەر ئامێزێکی تری دونیا. سەیربوو لەگەڵ دۆزینەوەی سەریاسی سوبحدەمدا دەبایە ونیبکەمەوە. ئەستێرەی ڕەش کە لە سەر قەرەوێڵەکە لە تەنیشت سەریاسەوە دانیشتبوو و سەیریدەکردین، دەیگووت «چەند ڕۆژێکی تر دەیبەن بۆ ئەورووپا، لەوانەیە چاکیبکەنەوە، لەوانەیە بیکەنەوە بە کوڕێکی ساغ وسەلیم کە بەپێی خۆی بتوانێت بڕوات». وەک من باوەشیدەکرد بە سەریاسی سوبحدەمدا و دەیگووت «من زۆر بیریدەکەم... ئێمە ڕەفیقی یەکین، هەموو ڕۆژێک بەیەکەوە ناندەخۆین». ئەستێرەی ڕەش کوڕێکی شەرمن بوو، بەڵام ڕاستگۆ بوو، ئەو دەستی منی گرت و پێیگووتم «دەتوانی چەند ڕۆژێک لەگەڵ خۆتدا بیبەیتە دەرەوە... لەوانەیە بڕوات بۆ ئەورووپا، پێش ئەوەی بیبەن، دەتوانیت چەند ڕۆژێک بیبەیت بۆ لای خۆت». توند دەستی دەگوشیم و دەیگووت «منیش بەرن لەگەڵ خۆتاندا، من دەمێکە شەو لە دەرەوە نەخەوتووم... حەزدەکەم ئەستێرە ببینم، لێرەوە ئەستێرە نابینم». من ئەو کات نەمدەزانی بیر لە چی بکەمەوە، پیاوێک بووم پەشۆکاو و سەرلێشێواو، لە دەستشۆری تەنیشت ژوورەکەدا دەموچاوم دەشت و تەماشای ئەو هەموو ترس و پەشۆکانەم دەکرد کە لە چاومدا بوو. بێئەوەی ئاگاداربم بەردەوام دەگریام. سەرم بەسەر دەستشۆرەکەدا شۆڕدەکردەوە و هەستمدەکرد خوێن دەهێنمەوە. توڕەبووم لە دونیا، لە ئاسمان، لە گەردون، لە هەر کەسێک دوور و نزیک پەیوەندی بە ڕێکخستنی ژیانەوە هەبێت لەسەر ئەم ئەستێرەیە، هەر کەسێک کە خۆی بە نوێنەری مەلەکوت بزانێت لەسەر زەوی، هەر کەسێک سەریاسەکانی بەو دەردەبردبێت. بەڵام نەمدەزانی توڕەیی خۆم ئاڕاستەی کێ بکەم؟ سەرمدەخستە بەر دەسشۆرەکە و هەوڵمدەدا خۆم ئارامبکەمەوە. بینینی ئەو هەموو برینە

بە جەستەی مرۆڤێکەوە، هەر کەسێکی والێدەکرد گومان لە بێگوناهی خۆی بکات. بینینی ئەو سالۆن و ڕاڕەو و قاوشە پڕ برینانە، بەشی ئەوە بوو هەموو ڕۆحلەبەرەکانی دونیا هەست بە گوناه بکەن.

دواهەمین سەریاس کەسێک نەبوو لە ماوەیەکی کەمدا لە هەموو نهێنییەکانی تێبگەیت، نەوەک دەرگای ئەو تەلیسمانەی بۆ نەدەکردمەوە کە چیرۆکی سەریاسەکانی تیاونبوو، بەڵکو خۆی نهێنی و تەلیسمێکی گەورە بوو، هەستمدەکرد لەپشت ئەو ڕوخسارە شێواو و نیگا وێڵ و بێدەنگییە کوشندەیەوە دڵێکی گەورە هەیە. من دووبارە گەڕامەوە بۆ ناو سالۆنەکە و سەرمخستەوە سەر سینەی، گوێم لە دڵی گرت، گوێم لە ئیقاعی هێمنی هەناسەی گرت کە وەک فڕینی پەپولەیەک لە سینەیدا دەهات و دەڕۆی. لە ساتێکی ماندووبووندا لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاکشاو، بەو تەنیا چاوە گەورەیەی سەیری سەقفەکەی دەکرد، هەستمدەکرد ژیانێکی درێژ هیچ شتێک نەبووە سەیریبکات ئەو سەقفە نەبێت. لەبەر خۆیەوە ئەو وشانەی دەگووتەوە کە مانایان نەبوو. ئەستێرەی ڕەش بە منی دەگووتەوە «گەر دەتەوێت لەگەڵ خۆتدا بیبەیت... من فێرتدەکەم چی بڵێیت؟». من دەستم دەخستە سەر شانی و دەمگووت «وەرە، ئەستێرەی ڕەش وەرە، من دەمەوێت لەگەڵ خۆمدا بیبەم، دەمەوێت تۆش لەگەڵ خۆمدا ببەم، بەر لەوەی بڕوات، پێکەوە دەبین، تا ڕۆژی ڕۆیشتنی ئێمە پێکەوە دەبین».

بە ڕوخساریدا نەتدەتوانی لە شادمانی ئەستێرەی ڕەش تێبگەیت. ئاگر، سۆز و کامەرانی و پێکەنینەکانیشی لەگەڵ خۆیدا سووتاندبوو، بەڵام بەدەنگیدا دەمتوانی ئەو خۆشییە نهێنی و قووڵەی ناو ڕۆحی ببینم کە ئاگر دەستی پیاناگات.

ئەو فێریکردم چۆن سەریاسی سوبحەم وەرگرم، خۆی لەگەڵمدا

هات بۆ سەرەوە، بۆ ئەو شوێنەی فەرمانبەران و دکتۆر و بەرپرسانی ڕێکخراوەکە کاریاندەکرد. هەستمکرد ئەستێرەی ڕەش دەسەڵاتێکی تایبەتی بەسەر هەموو ئەوانەدا هەیە کە لەوێ کاردەکەن، بردمی بۆ لای پزیشکێک، کە دەبایە شوناسی خۆمی بۆ ئاشکرابکەم. ئەستێرەی ڕەش بە منی گووتبوو «هەر چییەک بێت نابێت تورەبیت... دەبێت جار دوای جار و بە ئەسپایی قسەکەی خۆت دووبارەبکەیتەوە، بەلام تورەنەبیت، چونکە هێندەی دەنگت بەرزکردەوە هەموو شتێک تەواودەبێت، لێرە هیچ کەس بۆی نییە دەنگ بەرزبکاتەوە، گەر بەدەنگی بەرز قسەتکرد ئیتر نە من نە سەریاسی سوبحەدەم ناتوانین لەگەڵتدا بێین». دکتۆرەکە ڕەوانەی خانمێکی دیکەی کردین ناوی چیمەن خان بوو. ئەستێرەی ڕەش منی برد بۆ لای چیمەن خان، کچێکی ڕەشتاڵەی بێنەندازە باریک و چکۆلە و بێنەندازەش منداڵ بوو، پێدەچوو ئەو ڕۆژە لە قوتابخانەی سەرەتایی هاتبێتە دەرەوە. بەدەنگی منداڵێکەوە پرسیار لە منداڵێکی تر بکات دەیگووت «فەرموو، مشکیلەت چییە؟». من هەموو چیرۆکی خۆم بۆ باسدەکرد و گووتم «دەمەوێت سەریاسی سوبحەدەم و ئەستێرەی ڕەش لەگەڵ خۆمدا ببەم و بەر لە ڕۆیشتنی چەند شەوێک پێکەوە بین». ئەستێرەی ڕەش هەمیشە لەو دیو دەرگاکەوە وەستابوو. چیمەن خان بەهەمان ڕوخساری منداڵانەوە سەیری دەرەوەی دەکرد و دەیگووت «وویی... وویی... ئەستێرە گیان تۆش دەچیت؟». ئەو جۆرە ڕستانە زۆر لەگەڵ ڕوخسارە منداڵانەکەیدا دەگونجا، ئەستێرەی ڕەش دەهاتەژوورێ و دەیگووت «دەمەوێت بڕۆم ماوەیەک سەیری ئاسمان بکەم، لەدەرەوە بخەوم، شیری مانگا بخۆمەوە». چیمەن خان دەیگووت «ئەستێرەی ڕەش، ئەگەر نەهێڵم بڕۆیت چیدەکەیت؟» ئەستێرەی ڕەش دەیگووت «قەپاڵ لە خۆم دەگرم، قەپاڵ لە خۆم دەگرم تا دەمرم». چیمەن خان سەرە چکۆلانەکەی دەهێنایە پێشێ و

دەنگی باریکدەکردەوە و وەک قسە بۆ کچێکی هاوڕێی خۆی بکات بە چرپەوە بە منی دەگووت «زۆر شێتە... کە زۆری بۆ بێنیت قەپاڵ لە خۆی دەگرێت، دەبێت ئاگات لێبێت... بە شەرتێ مۆڵەتت دەدەمێ لە چاو غافڵی نەکەیت». بە جۆرێکی سەیر سەیری چاوی دەکردم و دەیگووت « لێرە ئیشیان پێیەتی... دەبێت زۆر ئاگات لێبێت». من کاغەزێکم پڕکردەوە و زامنی ئەوەمدا، کە دوو ڕۆژی دیکە بەیانی زوو هەردووکیان دەگێڕمەوە بۆ خەستەخانە.

کە ئەو مۆڵەتە تایبەتییەیان دامێ و دەستی ئەستێرەی ڕەشم گرت، تێگەیشتم ڕۆژانی داهاتوو کۆمەڵێک ڕۆژن لە ژیانی مندا دووبارەنابنەوە. لە جێبێکی چکۆلانەدا هەردووکیانم گەیاندە ئەو گوندە... پێدەچوو سەرياسی سوبحدەم دەمێ ساڵ بێت دەرەوەی نەدیبێت، نیگاو هاوار و سەرسامی هێندە گەورەبوون مەپرسن. شتێک لە ترس لە چاویدا بوو لە ژوورەوە نەمدیبوو. ئەستێرەی ڕەش دەیگووت «قەت لەو خەستەخانەیە نەچۆتەدەرەوە... زۆر لە نەخۆشەکان ناتوانن بچنەدەرەوە... چونکە کەس ناتوانێت سەیریانبکات». من لەو باوەڕەدابووم ئەگەر دەرگای قاوشەکانی ئەو بنکەیە بخرێتە سەر پشت شار پڕدەبێت لە دیمەنی هەزاران پیاوی زامدار، پڕدەبێت لەو نیگارە سامناکانەی خەڵکانێک ناتوانن تەماشایانبکەن، پڕدەبێت لەو دەموچاوانەی سیمای ڕاستەقینەی ژیانمان لەو وڵاتەدا نیشاندەدەن. پڕدەبێت لەو ڕوخسارانەی دڕندەیی و گوناهی مرۆڤەکان دەرهەق بەیەک ئاشکرادەکەن. هەستدەکەم گەر ڕۆژێک ئەو سیمایانە، ئەو ڕۆحانەی لە خواری خوارەوەی دونیادا دەژین، ئەوانەی ناتوانن دەموچاوی خۆیان بدەنە بەر خۆر بێنەدەرێ، ئەو کات جەنگێک دروستدەبێت، جەنگێکی کوشندە، جەنگێکی گەورە لە نێوان ئەوانەی دەیانەوێت حەقیقەتی ژیان لە بیرکەن لەگەڵ ئەوانەدا کە دەیانەوێت دەموچاوی ڕاستەقینەی

ئەو ژیانە ببینین. کە لەو بیمارستانە هاتمەدەرێ تێگەیشتم لە ناوی ناوەوە، لە پێچ و پەناو سوچە بچوکەکانی ئەو وڵاتەدا لەشکرێکی نادیار دەژی، سوپایەک لەو کەسانەی هیچ کەس نایەوێت بیانبینێت. سوپایەک لە کەسانی گەمارۆدراو و دەستبەسەر کە شتێکیان لە ڕوخساری خۆیاندا هەڵگرتووە، جیاوازە لەو شتانەی ئێمە لە سەر شەقام و کوچەکاندا دەیبینین.

بەدرێژایی ڕێگا ئەستێرەی ڕەش باسی ژیانی ئەو خەستەخانەیەی دەکرد، یەکە یەکە چیرۆکی ئەوانەی دەگێڕایەوە کە لە شەڕی جۆراوجۆر و ڕووداوی جۆراوجۆردا سووتابوون، باسی هاوڕێیەکی دەکرد بەئاگرێکی ئەزەلییەوە لە چیاکان هاتبووەخوارێ، ئاگرێک هەرگیز ناکوژێتەوە، بەو ئاگرەوە خۆی کردبوو بە شارەکاندا، بەو ئاگرەوە هێنابوویان بۆ بیمارستان، کڵپەیەک هیچ ئاوێک نەیدەکوژاندەوە، ئاگرێک بێئەوەی لەشی ئەو بسووتێنێت و بێئەوەی بشکوژێتەوە. دەیگووت «ئاویان پیادەکرد هەر نەدەکوژایەوە، بەتانیان پیادەدا هەر نەدەکوژایەوە، دەیانخستە حەوزەوە کە دەهاتەدەرێ هەر وەک خۆی بوو، کە بە قاوشەکاندا دەسوڕایەوە هەموو دەترساین پەردەو چەرچەف و جلەکانمان بیگرێت، خۆی لەسەر قەرەوێڵەیەکی ئاسن دەخەوت، هیچی نەدەدا بە خۆیدا، لە خەویشیدا هەر دەسووتا، ڕۆژێک بە تەلەفزیۆن ڕەسمیان گرت و بردیان، کە بردیان دوایی هاتەوە، دوایی جارێکی تر بردیانەوە، مەلاکان پێیاندەگووت جەهەنەمییە بۆیە دەسووتێت، ئەوە موعجیزەی خوایە تا جەهەنەم ببینین، خۆی ئازاری زۆر بوو، شەوێک لەدەست پاسەوانەکان ڕایکردو ونبوو، کەس نازانێت لە کوێیە، پێیان دەگووت گوڵی ئاگر». بەشەرمەوە قسەیدەکرد، بەڵام زوونووش سەری بەرزدەکردەوەو دەیگووت «ئاوابوو، گوڵی ئاگر، ڕایکرد، گوڵی ئاگر سەریاسی سوبحدەمی زۆر خۆشەویست، سەریاسی سوبحدەم، حەوت

ساڵە لەو ژوورەدایە، گوڵی ئاگر منیشی خۆشەدەویست، بەڵام من زۆر لێیدەترسام، بەڵام من لە سەریاس ناترسم، کەس لەسەریاس ناترسێت، حەوت ساڵە یەکجار بردیان بۆ ئەو چیمەنەی پشتەوە، ئیتر قەت قەت دەرەوەی نەدیوە». سەریاس بە زمانێکی پچڕپچڕ دەیگووت «هەتاو، هەتاو... شەو، شەو، شەو...شەماڵ، شەماڵ» سەریم نوساندبوو بە شانی خۆمەوە و لێدەگەڕام قسەبکات. ئەستێرەی ڕەش لە پەنجەرەی ماشێنەکەوە سەریدەردەهێنا و تەماشای سروشتی دەکرد، من توانام نەبوو لەگەڵ کەسیاندا بدوێم، خەیاڵم لای قسەو هەڵسوکەوت و شێوەیان نەبوو، بەڵکو خەیاڵم لای ڕۆحیان بوو. ئەستەم بوو بۆ من کە لە بیابانەوە هاتبووم تێبگەم ئەو تەمەنە دوورودرێژەی ژیان لە قاوشی خەستەخانەیەکدا، ژیان لەگەڵ هەزاران بیماری تردا کە نەیاندەتوانی بێنەدەرێ و بەتەنیا بژین، چی لە ناوەوە دروستدەکات؟ من دەمزانی بیابانەکان چی لە ڕۆح دەکەن، بەڵام نەمدەزانی ئەو گەرداوی ئاگر و وەرزی ناکۆتای پشکۆیە کە ئەم منداڵانە تیا ژیاون، چی لە ڕۆح دەکات؟. تا ماشێنەکە زیاتر بڕۆیشتبایە، زیاتر خەتێکی تاریک و نهێنی لە پێشچاوی من بەرجەستە دەبوو... ئەو هێڵە تاریکەی لە نێوان ئەم جەستە تێکشاوانە و کۆی خاپوورییەکانی تردا هەیە. بیرم لە قسەکانی سەریاسی دووەم دەکردەوە لەسەر عەرەبانە تێکشکاوەکان، ئەو بازاڕە گەورە و تاریکانەم دەهاتە بەر چاو کە بەیانییەک لەمسەر بۆ ئەوسەر دەبێتە خەرابات، خاپووری، تێکچڕژان، هەڵپڕژان، ڕوخان. ئەو گوندە وێرانانەم دەهاتە بەرچاو کە ئاسەواریان لەسەر زەمین نەمابوو. هەستمدەکرد دەستێکی سەیر هەموو ئەو شتانەی تێکشکاندووە، دەستێک دواجار پاڵی بە سەریاسی دووەمەوە ناوە شەوێک لەسەر ترۆپکی هەنارەوە دەستبەرێت و هەنارە شوشەکەی خۆی بشکێنێت و بەرەو نادیار توڕیبدات، دەستێک هەنارە شوشەکەی

دواهەمین سەریاسی لە قاسەیەکی تاریکدا هەڵگرتووە، سینەی کەژاڵی پارچەپارچەکردووە، چارەنوسی شتە بچوکەکان و ئینسانی وەک یەکتر تەماشاکردووە.

سەیری دواهەمین سەریاسم دەکرد و باوەشم پیادەکرد، لەودا ئەو هەنارە شکاوەم دەدۆزییەوە کە سەریاسی دووەم توڕیدابوو، لەودا تێکشکانی سینەی کەژاڵم دەدۆزییەوە، لەودا ئەو جەستە ماندوو کوژاراوەی مارشاڵم دەبینی وەک ئەوەی لە تەپوتۆزی گۆڕەوە هەستابێتەوە، وەک ئەوەی لە جەهەنەمێکی دوور ڕایکردبێت و هاتبێتەوە بۆ لام، لەودا ئەو دەستە لەرزۆک و ترساوانەی سەریاسی دووەمم دەبینی کە لە خۆڵ و تۆزی سەنگەرەکانەوە بەرەو زیندانێکی دوور و داخراو ڕۆیشتبوو.

ئەو ڕۆژە کە دواهەمین سەریاس سەری خستبووە سەر شانم، لە هەناسەیدا هێندەی بۆنی زەمانم دەکرد، بۆنی هیچ شتێکی ترم نەدەکرد، سەختبوو بۆ من مرۆڤەکان وەک شتێکی تر ببینم جیاواز لە خۆیان، مرۆڤەکان لە چارەنوسی تایبەتی خۆیان جیابکەمەوە، بەڵام ئەو ساڵە دووروودرێژانەی ناو زیندان کاتێکی درێژی پێبەخشیم بیر لە چارەنوسی خۆم بکەمەوە، من ئەو هەموو ساڵە ئەگەرچی لە کوشندەترین تەنیایی و لە دووردەستترین بیابانی دونیادا دەژیام، بەڵام توانام هەبوو بە ڕۆشنی ببینم چارەنوسی مرۆڤ چەندە بە شتەکانی دیکەوە نوساوە، مرۆڤ لە دووردەستترین سەحراشدا چارەنوسی هێشتا بە شتەکانی دیکەوەیە، هێشتا پابەندی ژیان و گۆڕان و دەستکارییکردنی ئەوانی ترە بۆ یاساکانی دونیا. من خۆم حەزم نەدەکرد کەس ژیانی خۆمم لێبستێنێت و بیدات بە یەکێکی تر، کەس ئازارەکانی خۆم لێزەوتبکات

و بیبەستێتەوە بە ئازاری ئەوانی ترەوە. بەڵام نەمدەتوانی ئەو ئازارە گەورانەی سەر جەستەی ئەم کوڕە جیانەکەمەوە و تێکەڵی نەکەمەوە بە هەموو ئازارەکانی گەردون، بە جۆرێک لە باوەشکردن بەسووتانی ئەودا باوەش بە ئاگری هەموو دونیادا بکەم.

ئەستێرەی ڕەش لەدەرەوەی خەیاڵەکانی من ، لە دونیای خۆیدا بوو، خۆشحاڵبوو دوای چەند ساڵێک دێتەوەدەرێ و پێدەشت و کێڵگە و مەزرا سەوزەکان دەبینێت، ئەو چەند ساڵە بووبوو بە کوڕی شار، کاتێک سەیری دەشتەکانیشی دەکرد شتێک هەر بەرەو دونیای ناو خەستەخانەکەی دەگێڕایەوە. زووزوو تەماشای منی دەکرد و وەک ئەوەی من لە نهێنییەک حاڵی بکات دەیگووت «هەموویان خراپ نین، ها، خۆت بینیت هەموویان خراپ نین، هەندێکیان پێمدەڵێن ئەستێرە گیان. من یەکەمجار دڵم زۆر زۆر ناسک بوو، دڵم لە خۆیەوە دەشکا، دڵم وەک شوشە وابوو... ڕۆژێک سیستەرێکمان بۆ هات زۆر جوان بوو، من حەزم لێکرد، زۆر زۆر جوان بوو، قژێکی هەبوو درێژترین قژ بوو، شەوێکیان بە ناوی سەرنێشەوە چووم بۆ ژوورەکەی لە قاتی سەرەوە، بەترسەوە پێمگووت من زۆر حەزم لە تۆ کردووە، چیم لێدەکەیت؟ زۆر زۆر زۆر». ئەو وەڵامی نەدامەوە دەستی گرتم و بردمییەوە ناو جێگاکەم و بەتانیاکەی پیادام و گووتی «بەساقە بخەوە... بیر لەو شتانە مەکەرەوە». من هەموو شەوێک دەچووم و دەمگووت «چیم لێدەکەیت، من حەزم لێتکردووە...» ئەویش هەموو شەوێک دەستی دەگرتم و دەیخستمە ناو جێگاکەوە و وەک منداڵێک ماچبکات، ماچیدەکردم و دەیگووت «بەساقە بخەوە...». دوو ساڵ پەیوەندییەکەمان ئاوەهابوو، تا شەوێکیان بە گریانەوە هات بۆ لام و ماچیکردم و گووتی «ئەستێرە گیان، ئیتر من و تۆ یەکتر نابینینەوە».

بۆ ڕۆژی دوایی بۆ هەتاهەتایە خەستەخانەی بەجێهێشت، نازانم، لەگەڵ دکتۆر و شتێکی گەورەتردا تووشی شتێکی خراپ بووبوو... شتێکی زۆر زۆر خراپ. دوایی لەدەرەوە خۆی سووتان، ڕۆژێکیان بینیم بە سووتاوی دەیانبرد بۆ بەشی ژنان، تۆ دەزانی بەشی ژنانیش هەیە؟... من نەمبینیوە، ئەو بەشەم قەت نەبینیوە، بەڵام یەکێک بنیوێتی، یەکێک بینیوێتی، پیاوێکی ڕۆژنامەنوس بینیوێتی کە جارێک هات شتی لەسەر ئێمە نوسی، ئەو بۆ هەموومانی باسکرد... ئەو گوتی پێشنیار و شتدەکات، تا تێکەڵاومانبکەن، بۆ ئەوەی لەیەکتر تێبگەین...خەیاڵی لای شتێکی وابوو پیاوە سووتاوەکان و ژنە سووتاوەکان تێکەڵبکات تا لەیەکتر تێبگەن، یەک ڕۆژ هات، یەک دونیا خەیاڵی لەو نەوعەی خستە سەرمانەوە و ئیتر نەمانبینییەوە... نازانم چوو بۆ کوێ... نەمانبینییەوە». وەک هەمیشە کە لە قسە تەواو دەبوو سەریدادەخست و لە ژێرەوە سەیریدەکردیت. بە ئەسپایی لێمپرسی «ئەی دوایی... دوایی دڵی تۆ چی لێهات». گوتی «ئا... دڵی من... دڵی من وانەما، کە ئەو کچە ڕۆی دڵی من وەک بەردی لێهات». هەندێجار بە خێرایی سەری دەخوراند و وەک شەرمبکات بەپەلە دەستی دادەنایەوە. شتێکی سەیر بوو لەلام کە وشەی دڵشوشەی بەکارهێنا، وەک ئەوە بوو ئاماژەیەکی سەیر و نادیار بۆ من بکات کە ئەو کەسێکە لە کەسە دووبارەکانی ئەم چیرۆکەی من تیادەژیم، وەک ئەوەی پێمبڵێ، من وێنەیەکی تری، چیرۆکێکی ترم، بەڵام لە ناو جەستەیەکی تر و لە شوێنێکی تر و بە ڕێگایەکی دیکەدا ڕۆیشتووم. من بۆ ئەوەی زۆر بیرنەکەمەوە، دەستیم توند دەگرت و دەمگووت «نابێت دڵی ئینسان لە شوشە بێت، نابێت... چونکە زوو دەمرێت و هەموو شتەکان لەگەڵ خۆیدا دەبات». نا نەمدەویست کەسێکی تر ببینم دڵی لە شوشە بێت، کەسێکی تر ببینم بڕوات و کۆمەڵێک نهێنی ئاڵۆزو نەکراوەم بۆ

بەجێبهێڵێت، کە من وامدەگووت «ئەستێرەی ڕەش» سەری دادەنەواندو بە ترسەوە دەیگووت «بەڵام وابوو... ڕۆژێک لە ڕۆژان دڵی من لە شوشە بوو»

ئەوە دواهەمین ڕستەمان بوو، دواهەمین ڕستە بەر لەوەی بگەینەوە نزیک ماڵی خوشکە سپییەکان.

# ١٩

ئێوارەیەک من و دواهەمین سەریاس بەرەو لای « دواهەمین هەناری دونیا» سەرکەوتین. لە بناری ئەو لووتکەیەدا دواهەمین سەریاسم کردە کۆڵم و تا گەیشتینە سەر چیا دامنەگرت. بەئەندازەیەک سووکەڵە و بێ جەستە و قەوارەبوو وەک ئەوەبوو ڕۆحێکم خستبێتە سەر شان، وەک ئەوەبوو بایەکم هەڵگرتبێت، خەیاڵێکم نابێتە قەڵا دۆشکان.

دەبایە دواهەمین سەریاس بەسەر ئەو لووتکەیەدا سەرکەوێت. دەبایە وەک براکانی لەو ترۆپکەوە دونیا ببینێت. ئەو هەمیشە ئەو سێبەرە ون و بزرەبووە کە هەمووان بۆی گەڕاون، ئەو بەشە بووە لە ڕابوردوو و داهاتووی خۆیان کە ونیانکردبوو. تەنیا لەویادا من دەمتوانی زەمەن بە جۆرێک بگێڕمەوە دواهەمین سەریاس ببێتە بەشێک لەو سێ برایەی جەنگ و بێهودەیی و مردن نەیهێشتبوو بگەنە یەک و سەرکەون بۆ پلەی کەماڵ... لەویادا دەمتوانی ئەو پەیمانانە زیندووبکەمەوە کە مردن و ڕەشەباو زەمان دڕاندبوونی، لەویادا دەمتوانی منیش بچمە ناو ئەو یارییەوە، منیش سوێندی خۆم بخەمە بن ئەو هەنارەوە، لەسەردەمێکدا براکان دەبوونە سەراب، باوکەکان لە بیابانەکاندا دەبوون بە لم، کوڕەکان دەبوون بە خۆڵەمێش.

لەو لووتکەیەوە من دونیام بینی، بۆنی ئەو خەونانەم کرد کە لە لقەکانی ئەو درەختە دەبارین. هەستم بە سرووەیەکی خوداکرد

کرد هەڵدەکات، لەویادا هەموو ئەو ئومێد و هیوا و ئیلهامانەم بینی کە ئەو گەنجانە لە ژێر ئەو درەختەدا ناشتبوویان. لەویادا پەیمانی هەتاهەتایی خۆم نوسی، بڕیارمدا ئەو بەرەو هەر جێگایەک ڕۆیشت دوایبکەوم، تادەمرم لە نزیکییەوە بم، بۆ هەر جێگایەک ڕۆیشتم چیرۆکی سەریاسەکان لەگەڵ خۆمدا ببەم. لەویادا پەیمانی خۆم نوسی، دواهەمین سەریاس نەیدەتوانی هیچ بنوسێت، نەیدەتوانی هیچ شتێک لەگەڵ مندا مۆربکات، ئەو قەرزاربواری هیچ کەسێک نەبوو، سەریاسەکان کەسیان چی دی قەرزارباری کەس نەبوون، دەبایە ئیتر ئێمە، هەموو ئەو زیندوانەی ئاگامان لە چیرۆکی ئەوانە پەیمانێک مۆربکەین ئازادیانبکات، لە فەرامۆشی و تەپوتۆز دەریانبهێنێت. من ئەو پەیمانەم نوسی و بە خوێنی خۆم مۆرمکرد. پەیمانێک لەنێوان من و ئاسماندا، لە نێوان من و ئەو درەختەدا، لەگەڵ دواهەمین هەناری دونیادا ئەو هەنارەی تاکە نوێنەری خەونی ئەوان بوو لەو تخوبەدا کە دەکەوێتە نێوان ئاسمان و زەوییەوە، ئەو خەونەی نەیاندەتوانی ناویبنێن، ئەو خەونەی لە سروشتی درەختێکی وا دووردا نەبایە بەرجەستە نەدەبوو، خەونی لەیەک تێگەیشتنی مرۆڤەکان و براکان و دوژمنەکان.

دۆستانی من، ئەی ئەوانەی چەندەها شەوە بێماندوبوون گوێ لەم چیرۆکەی من دەگرن... ئێستا تێدەگەن من لەم دەریایەدا چی دەکەم، تێدەگەن پیاوێکی ریش سپی و ماندووی وەک من لەسەر ئەم کەشتییە چی دەکات. دۆستان ئەو پەیمانە « ئەو پەیمانەی ئێستا لەگەڵ پەیمانێکی دیکەدا لە ژێر دواهەمین هەناری دونیادا خەوتووە» منی بەرەو ئەم دەریایە هەڵگرت کە ئێستا لەم کەشتییەوە چاوەڕوانی دۆزینەوەی ڕێگایەکم بمباتەوە سەر ئاسەوار و شوێنی دواهەمین سەریاس.

من پەیمانی خۆم لەگەڵ ئەو درەختەدا مۆرکرد و چڵێکی چکۆلەم بۆ یادگار کردەوە و بەجێمهێشت، هەر کەسێک لە ئێوە ڕۆژێک لە ڕۆژان

ڕێگاتـان کەوتـە بـن ئـەو درەختـە پەیمانـی خۆتـان مۆربکـەن و چڵێکـی چکۆلـە بـۆ یـادگار لێبکەنـەوە و جێیبهێڵـن، ئینسـان دەبێـت دووبـارە بـە جۆرێکـی تـر خـۆی بـە ژیـان بناسـێنێتەوە. لـەو سـاتەدا کـە خـۆم بـە دواهەمیـن هەنـاری دونیـا ناسـاند هەسـتمکرد ئیـدی ژیانێکـی تـازە دەسـت پێدەکەمـەوە، هەسـتمکرد ئـەو شـتانەم دۆزیوەتـەوە کـە بـۆی دەژیـم، ئـەو ئامانجـەم بینیوەتـەوە کـە دەبێـت دوایبکـەوم... کـە لـەو ترۆپکـە دابەزیـم ڕوونتریـن سـاتەکانی ژیانـی خـۆم دەژیـام، لـە دوای بیسـتویەک سـاڵ دەسـتم دەخسـتە سـەر نهێنـی ئـەو ئازادییـە گەورەیـەی مـرۆڤ بەدەسـتی دەهێنێـت، کاتێـک ڕێگایـەک دەدۆزێتـەوە... مـن کـە لـە پاتـرا سـواربووم هەمـوو هێـز و ئیـرادەی خـۆم لەسـەر ئـەوە کۆکردبـووەوە ڕێـگاکان وننەکـەم ئـەو ڕێگایـەی دەمبـات بـەرەو دواهەمیـن سـەریاس، ئـەو گەنجـەی دەبێـت ئێسـتا لـە یەکـێ لـە نەخۆشـخانەکانی خۆرئـاوادا لـە پەنجەرەیەکـەوە سـەیری ئەسـتێرەکان بـکات. مـن کـە لـە ترۆپکـی هەنـار دابەزیـم ڕێـگای خۆمـم دۆزییـەوە... ئـا پێممەڵێـن تەماشـای خـۆت بکـە تـۆ ئێسـتا لـەم کەشـتییەدا نازانیـت لـە کوێـی زەمیـن و زەمانـدا وەسـتاویت. هاوڕێیـان، ئـەم دەریایـە پـڕە لـە ڕێـگا... هەمـوو بسـتێکی ئـەم ئـاوەش ڕێگایـە... لەگـەڵ هەمـوو وێڵـی و ونبوونەکانیشـدا مـرۆڤ کـە زانـی بـەرەو کـوێ دەڕوات وننابێـت.

مـن دەزانـم مـرۆڤ مەخلوقێکـە ئێجـگار زوو ڕێگاکانـی لێتێکدەچێـت، دەزانـم مرۆڤ ڕێـگاکان نادۆزێتـەوە، ئـەوە ڕاسـتییەکی زەهرچەشـە و درەنـگ بـاوەڕی پێدەهێنین، هیـچ مەخلوقێکـی دی لـەم سـەر زەمینـەدا وەک مرۆڤ ڕێگاکانـی لێونانابێـت... مرۆڤ هیـچ نییـە جگـە لـە مەخلوقێکـی ڕێوێڵکـەر، بەڵـێ دۆسـتانی مـن، ئـەی ئەوانـەی بێوچـان گوێـم لێدەگـرن، مـرۆڤ مەخلوقێکـە بێڕێـگا، لەبـەر ئـەوەی دواجـار نازانێـت بـۆ کـوێ دەڕوات، ئـەو بۆیـە دەرگاکان لـە خـۆی دادەخـات تـا خـۆی نەداتـە دەسـت سەرکێشـی دۆزینـەوەی ڕێگایەک. بـەڵام بـا پێتان بڵێم مرۆڤ بە چ هەڵەیەکی کوشـندەدا

دەچێت، کە لە زینـدان بـووم هەمیشـە یـەک خەونـم دەبینـی، بـەردەوام یـەک خەونـم دووبارەدەکـردەوە، یـەک خـەون هەمیشـە دژی بـە خەونەکانـی تـر دەدا و دەهاتەپێشـەوە و دووبارەدەبـووەوە، خـەون بـە سـەحرایەکەوە لەلـم، سـەحرایەکی زەرد لـە لمـی زێڕیـن، ڕێگایەکـی درێـژی بێنەمسـەر و ئەوسـەر، ڕێگایـەک نەمدەزانـی لـە کوێـوە دێـت و بـەرەو کـوێ دەچێـت، لـە کۆتایـی خەونەکەمـدا هەمیشـە بایەکـی بەهێـز دەهـات و ئاسـەواری ئـەو ڕێگایـەی دەسـڕییەوە، بەجۆرێـک ونیدەکـرد چ پاشـماوە و شـوێنەوارێکی نەدەمایـەوە. لـە خەونەکەمـدا بێباکانـە دەڕۆیشـتم و درێـژەم بـەو سـەفەرە گەورەیـەی نـاو بیابـان دەدا، سـاڵ دوایـی سـاڵ ترسـی مـن لـە نەمانـی ئـەو ڕێگایـە کەمتـر و کەمتـر دەبـووەوە. لەگـەڵ تێپەڕینـی زەمانـدا تێدەگەیشـتم هەمـوو بستێک لـە زەوی سـەرەتایەکی کـوژراوە بـۆ ڕێگایەکـی دی، هەمـوو ئاڕاسـتەیەکی سـەر زەوی و نـاو دەریـا ئەگـەری ڕێگایەکـی نەدۆزراوەیـە بـۆ مـرۆڤ. سـەیرکەن ئـەی دۆسـتان ئەوەتـا ڕێـگاکان دەمانبـەن... ڕێـگاکان ئێمـە هەڵدەگـرن بـۆ ئـەو شـوێنەی ئـەوان دەیانەوێـت، نـا... ئەی دۆسـتان... ئـەی پەنابەرانـی ئـاو و شـەو و تاریکـی... مەبەسـتم ئـەوە نییـە پێتانبڵێـم مـرۆڤ شـتێکی بێتوانـا و بێئیـرادە و گەمـارۆدراوە... نـا، مەبەسـتم ئەوەیـە مـرۆڤ بتوانێـت بەسـەر هەسـتی وێڵـی و ونبووندا سـەرکەوێت، کـە ڕێـگاکان نەمـا واهەسـتنەکات چیـدی چ ڕێگایەکـی دی نییـە، بـاوەڕ بـەوە بهێنێـت هـەر کاتێـک ونبـوو دەتوانێـت لێـرەوە لـە هەمـان ئـەو جێگایـەوە کـە تیـا وەسـتاوە دەسـت پێبکاتـەوە، دەشـێت پێچەبەدەورەیەکـی مـەزن بـەدەوری شـتە ئاسـایی و ڕۆژانەکانـدا بـکات، بـەڵام ئێـوە پێمبڵێـن ژیـان خـۆی چییـە جگـە لـە پێچەبەدەورەیەکـی مـەزن بـە دەوری شـتە ئاسـاییەکاندا؟ پێچەبەدەورەیەکـی مـەزن بـە دەوری ئـەو شـتانەدا کـە لـە شـوێنێکی دی و بـە جۆرێکـی دی دەتوانیـن بچینـەوە سـەریان و بـە گۆشـە نیگایەکـی دییـەوە تەماشـایانبکەینەوە.

من دواهەمین هەناری دونیا پێیگووتم بڕۆم و بۆ ئەو ڕێگایانە بگەڕێم کە دەبێت بۆیان بگەڕێم، وەک چۆن بە نەدیمی شازادەی گووت بڕوات و لە هەموو کونج و کەلێنێکی زەویدا بۆ بینین و سۆمایی خۆی بگەڕێت، وەک چۆن ئیلهامی بەخشییە سەریاسەکان بژین و نەچن بۆ جەنگ و قسە لە برایەتییەکی جاویدان و گەڕانێکی جاویدان بکەن بەدوای خۆیاندا. لە بن ئەو هەنارەدا هەستمکرد دڵی دواهەمین سەریاسیش بە جۆرێکی دی لێدەدا، ئەو پێستە سوتاوەی سەرچاوی بەرزدەکردەوەو تەماشای ئەو بەهەشتە ناکۆتاییەی دەکرد کە پێشتر نەیبینیبوو. وەک لە ماناو ئەفسونی ئەو درەختە تێگەیشتبێت، دەستی گرتم و سەری خستە سەر ڕانم و بەرابەر ئەو جیهانە خەوی لێکەوت. ئێستا لەیادم نییە چەند سەعات خەوت، ئەوەم لە یادە کە سەری ئەو لە ئامێزی مندا ئەو هەستەی پێبەخشیم کە من بووم بەبەشێک لە جیهان و گەردون و خەونی ئەو منداڵانە. ئەو ئامێزان و نوستنە نیشانەی گەڕانەوەی من بوو بۆ مەلەکوتە خوداییەکەی ئەوان. لەویادا هەستمکرد ئەوە تەنیا سەری دواهەمین سەریاس نییە لە ئامێزمدا، بەڵکو ژیانی هەموو ئەوانی دیکەشە سەری ناوەتە سەر ڕانم، لەویادا گوێم لەو مۆسیقا ئەفسانەییە بوو کە محەمەدی دڵشوشە لە ژێر ئەو درەختەدا گوێی لێبووبوو، ئەو وێنە سەیرانەی گەردون و ئاسمانم بینی کە سەریاسەکان بینیبوویان، بۆنی ئەو ڕۆژ و ئێوارە و شەوانەم کرد کە لەویادا ئاگریان کردبووەوە. وەک هەستێک هەموو وێنەکانم بینییەوە، وەک ئەوەی ئەو درەختە یادەوەری خۆی بە یادەوەری من ببەخشێت، وێنەکانی خەیاڵی خۆی بە وێنەکانی خەیاڵی منەوە گرێبدات. هەموو شتەکانم بینییەوە، ئێستا دڵنیانیم، خەون بوو یان ڕاستی. من خەوتبووم و بۆ ناو سێبەری ئەو ڕۆژانە داچووم یان بەئاگابووم و ئەو درەختە نهێنییەکانی خۆی بۆ

ئاشکرادەکردم. من لە ساتێکدا هەموو ئەو شتانە ژیام کە سەریاسەکان تیاژیابوون. دەستم لە دڵی دواهەمین سەریاس دەداو هەستم بە هەمان هەست و هەڵچوون کرد. کە هەستا بەجۆرێک سەرسام بوو، هەموو ئاگرەکانی دونیا نەیاندەتوانی جوانی ئەو سەرسامییەی بکوژن. پڕبوو لە ئومێد، پڕبوو لە هاواری سەیر دەربارەی ئاسمان و هەنار و دەریا. ئەو لەویادا تێکەڵ بەو کیمیایە بوو کە ئێمەی بەوانەوە گرێدەدا.

کە دام بە کۆڵمداو لەو ترۆپکە دابەزین ئیدی لەبری بۆنی ئاگر، بۆنی هەناری لێدەهات. لە دامێنی چیا دامگرت و ماچمکرد و هێشتا هەر بۆنی هەناری لێدەهات... بۆنی زەوییەکی لێدەهات لە خەونیدا پێی تێخستبوو، زەمینێک وەک هەموو ئەو زەمینانەی هاوڕێکانی ئەو درەختە پێیان تێخستبوو، پڕبوو لە هیواو ئەفسانە... لە ئەگەر و نائەگەر... لە بوون و لە عەدەم.

ئەو دوو ڕۆژەی من دواهەمین سەریاسم تیا ئامێزگرت کورتترین دوو ڕۆژی ژیان بوون، بە خێراییەکی هێند سەیر ڕۆیشتن، من جگە لە تێرامانێکی بێدەنگ لەو منداڵە، فریای هیچ نەکەوتم. خوشکە سپییەکان وەک هەمیشە سووربوون لەسەر ئەوەی هیچ کەسێکی دی نەبینن ناوی سەریاسی سوبحدەم بێت. ئەوان مرۆڤیان بە تاقانەیی خۆشدەویست، مرۆڤیان وەک شتێک خۆشدەویست کە دەگمەن و بێوێنەیە. من دەچوومە ژوورەکەیان و دەستە سپییەکانیانم ماچدەکرد، کڕنووشم بۆ دەبردن و تکام تیادەکردن تێبگەن کە سەریاسی سوبحدەم ناوی مەخلوقێکە بە چەندەها ڕەنگ بەسەر ئەم زەوییەدا ڕابوردووە، کە سەریاسی سوبحدەم تەنیا کەسێک نییە، گۆڕێک نییە، بەڵکو شەبەنگێکی گەورەیە و هەر بەشێکی شتێکمان نیشاندەدات، بەڵام ئەوان بەو چاوە ساردانەوە تەماشایانکردم و هیچیان نەگووت.

خوشکە سپییەکان خیانەتیان لە یادگاری ئەو برایە نەکرد... هیچ فریشتەیەک بەو جۆرە بە پەیمانی خۆیەوە لەگەڵ خودادا نانوسێت وەک ئەوەی ئەوان بە پەیمانی خۆیان لەگەڵ یەکەمین سەریاسدا نوسابوون... هیچ ڕێگایەک نەمابوو کەسێکی دی بێتە ژیانیانەوە، ئیدی هەموو دونیاو ژیان لە پەراوێزی خوشکایەتییەکی جاویداندا بۆ سەریاس تێدەپەڕی. ئەوان هاتبوونە ئەو گوندە تا خۆیان لە هەموو خەیاڵ و فریو و وەسوەسەیەک بشارنەوە، سەرقاڵی بەخێوکردنی ئەو منداڵانە بن کە هیچ شتێکی ئەستەمیان لێداوا ناکەن... لەوێدا هەموو شتەکانی دونیا بە پەراوێزی ژیانی ئەواندا تێدەپەڕی... ئەو شەوەی تکام لێکردن بێن و بۆن بەسەریاسەوە بکەن، گەرمای ئەو ئاگرە ببینن کە تا ئەو کات لە دڵیدا دەسووتا، نەهاتن... هاوڕێیانی من، ئەی ئەوانەی بێماندووبوون گوێم لێدەگرن ئەوان نەیاندەویست هیچ شتێک لەو کۆتاییە بگۆڕن کە بینیبوویان... هەموو ئەم یارییەی منیان بە درۆی پیاوێک دەزانی نایەوێت باوەڕ بە مردنی کوڕەکەی بێنێت... درۆی پیاوێک سوورە لە خەیاڵەکانیدا ئەو کوڕە بدۆزێتەوە کە بیستویەک ساڵ لەوەوبەر ونیکردووە... هەموو ئەم چیرۆکەی منیان بە دەستکاریکردنی کۆتایی چیرۆکێک دەزانی کە کۆتاییهاتووە... ئەوان لێکچوونی ناوی سەریاسەکانیان تەنیا بە لێکچوونی هەندێ ناو دەزانی، نەوەک بە لێکچوونی هەندێ سەرەتا، هەندێ جەوهەر، هەندێ کۆتایی.

ئەو دوو ڕۆژە ئەستێرەی ڕەش ئازادانە بە دەشت و سەرچەم و ناو درەختەکاندا دەسوڕایەوە، لەدەشتەکاندا یاریدەکرد و شیری مەڕی دەخواردەوە، کە هەستم بە بەختەوەری دەکرد خۆشحاڵبووم ، جارێکیان لێیپرسیم «موزەفەری سوبحدەم کە سەریاس ڕۆیشت دێتەوە بۆ خەستەخانە، دێتەوە بۆ لای من؟». من بەغەمگینییەوە پێمگوت «نا... ئەستێرەی ڕەش، ئەو ڕۆژەی سەریاس دەڕوات منیش دەبێت خۆم بۆ

ڕۆیشتن ئامادەبکەم... دەبێت بەدوایدا بڕۆم، لە یۆنانەوە سوار کەشتی دەبم و دەچم بۆ خۆرئاوا، بەدوایدا دەچم بۆ ئینگلستان». لەدەنگیدا هەستم بە غەمێکی قووڵ و گەورەکرد، دەمزانی ناتوانم هیچ بکەم... لەوە ئیفلیجترم بتوانم بچوکترین کۆمەک بەو و بەو هەزاران ڕۆحلەبەرە سووتاوانە بکەم کە لەویادا دەمێننەوە. گەنجێک بوو گەمارۆدراو، نەدەیتوانی وەک مرۆڤێکی ئاسایی بگەڕێتەوە بۆ کوچە و کۆڵانە سادەکان، نەدەیتوانی سەفەربکات، نەدەیتوانی لەو خەستەخانەیەشدا تا ئەبەد ئارامبگرێت. کە گەڕاینەوە بۆ خەستەخانەکە، وەک ئەوەبوو خیانەتم لێکردبێت، لە بەردەرگاکەوە بەشەرم و غەمگینییەوە گووتی «ئیتر تۆش نایەیتەوە؟». من نەمدەویست درۆی لەگەڵدا بکەم، نەمدەویست هیوای درۆی پێببەخشم، نەمدەویست چاوەڕوانی هیچ کەسێک بکات، چاوەڕوانی هیچ بکات، باوەشم پیاکردو گووتم «ئەستێرەی ڕەش وەرە دەرێ... تۆ دەتوانی قسەبکەیت... تۆ دەتوانی لە بری هەموو ئەو پیاوە سووتاوانە قسەبکەیت، تۆ لە هەموویان بەهێزتری، وەرە دەرێ و دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆت نیشانبدە و مەترسە... دەبێت ئەم شارە فێربێت سەیری دەموچاوتان بکات» ئەستێرەی ڕەش بەترسێکەوە گووتی «گەر لێرە بمانکەنەدەرێ، ناژین... بمانکەنەدەرێ لەسەر جادەکان هەر پشیلە دەمانخۆن...» من ئەستێرەی ڕەشم ڕادەوەشاندو دەمگووت «پێیانبڵێ وەرنە دەرێ... با هەمووتان ڕۆژێک بێنەدەرێ و بڕژێنە کۆڵانەکان... وەرنەدەرێ با ئێمە بتانبینین... ئەوانە بتانبینین کە هێشتا چیرۆکی ئێوەیان نەبیستووە». ئەستێرەی ڕەش خۆی لەدەستم ڕادەپسکاند و ڕایدەکردەو بەدەنگێکی گریاو دەیگووت «هەمویان دەزانن... هەموویان دەزانن... هیچ کەس نییە نەزانێت». ئەو دەڕۆیشت و من هاوارم لێدەکرد «وەرنەدەێ... وەرن خۆتان پیشانی ئێمەبدەن، خۆتان پیشانی درەختەکان بدەن... خۆتان پیشانی با و باران بدەن... دەستی یەکتر بگرن و وەرنەدەرێ». دەزانم هاوارێکی بێمانا بوو، هاوارێک بوو

لەو کوچە بێدەنگەدا ونبوو. بەداخەوە ئەی دۆستان، هەزاران ئەفسوس و حەسرەت من ئەستێرەی ڕەشم هێند نەناسی، ئەو کورە بەشێک بوو لە چیرۆکێکی تر، پارچەی ناو حیکایەتێکی تاریکی دیکەبوو، بەجۆرێکی سەیر و لە چرکەیەکی دیاریکراودا تێکەڵ بەو چیرۆکەی من بوو، چیرۆکی ئاڵۆزی یەکێک ڕێگایەکی نەبوو بۆ تێرامان لە چیرۆکی کەسی تر. ئەستێرەی ڕەش خۆی دەیزانی من ناتوانم دوای ئەو بکەوم، سڵاویشی لە من، وەک سڵاوی غەمگینی تارماییەک بوو کە بە حیکایەتێکدا تێدەپەڕێت.

من دەستی سەریاسم دەگرت، دەمگرتە ئامێز و بەرەو ناو خەستەخانەکە تەکانمدەدا، لەو ساتەدا ماشێنێک لە تەکمانەوە دەوەستا... چوار چەکدار دادەبەزین، بەخێرایی ئابلۆقەیاندەداین، هەریەکەیان لە تەنیشتێکەوە دەیگرتم، چوار کەس بوون هەر چواریان یەک سیما و ڕوخساریان هەبوو، یەکێکیان لە هەموویان بەویقارتر بوو دەیگووت «موزەفەری سوبحەدەم... ڕۆژ باش... داوای لێبووردندەکەین، فەرمانێکمان پێیە دەبێت لەگەڵماندا بێیت... بەهێمنی ئەو نەخۆشە دانێ و لە گەڵماندا وەرە، ئێمە خۆمان سەریاسی سوبحەدەم دەگێڕینەوە سەر شوێنی خۆی... دەیبەینەوە سەر جێگای خۆی... غەمی هیچت نەبێت... وەرە لە ماشێنەکەدا دانیشە و ئارام بە... ئێمە هەموو شتەکانی تر دەکەین... تۆ ئەوەت لەسەرە لێرەدا دانیشیت و هێمن بیت و هەوڵی هیچ نەدەیت... ئێمە هەموومان تۆ دەناسین... پێمانگووتی فەرمانێکی تایبەتیمان پێیە لەگەڵ خۆماندا بتبەین... فەرموو... فەرموو... ئاه... دواجار تۆمان دۆزییەوە... تۆمان دۆزییەوە موزەفەری سوبحەدەم... خودایە چەندە ئێمە لەدووی تۆ دەگەڕێین؟ لە مێژە بەدواتدا دەگەڕێین... لە مێژە... تۆ لە کوێیت؟ موزەفەری سوبحەدەم تۆ لە کوێیت؟»

***

لـە منداڵییـەوە وابـوو هـەر کاتێـک درۆی بکردایـە شـتێکی دیکـە ڕوویـدەدا، یـان بـاران دەبـاری، یـان درەختـەکان دەکەوتـن، یـان باڵنـدەکان بـە پـۆل بەسەرسـەرماندا دەفڕیـن. ئـەو ڕۆژە کـە لەبـەردەم بیمارسـتانەکەدا گیـرام، دڵنیابـووم دەمبەنـەوە بـۆ لای ئـەو، ئـەو ماوەیـەی لـە دەرەوە ئازادانـە دەهاتـم و دەچـووم باکـم بـە هیـچ نەبـوو، دڵنیابـووم ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دەمبەنـەوە بۆ لای ئـەو. مـن لێـی نەترسـاوم... پیاوێـک بـوو لەگـەڵ هەمـوو گوناهـە گەورەکانیـدا نەدەکـرا لێـی بترسـم، بەشـێک بـوو لـە ژیانـی مـن. دەمزانـی خەڵکانێکی زۆر لەبـەر سـامی ئـەو، لـە بێزاریانـدا لـەو ئـەم وڵاتـە چۆڵدەکـەن... بـەڵام مـن لێـی نەدەترسـام.

ئێوارەیەکـی درەنـگ بـوو منیـان بـرد بـۆ لای، لـە ژوورێکی کەمێـک تاریکدا کەوتبـوو، بۆنـی مردنـی لێدەهـات، ئـەو چەنـد مانگـەی مـن نەمدیبـوو تـەواو پیربووبـوو، خـۆی لـە بەتانییەکـەوە پێچابـوو، لەسـەر سیسـتمێکی گـەورە و نیمچـە شـاهانەدا بـە ڕۆبێکـی گرانبەهـاوە خەوتبـوو، دونیـا ساردنەبوو بـەڵام هەسـتمدەکرد ئـەو زۆر سـەرمایەتی. وەک ئـەوەی لەشـتێکی نادیـار بترسـێت، هەمـوو دەرگاکانـی لـە پشـت خۆیـەوە داخسـتبوو، هەسـتمدەکرد ترسـێکی قووڵیشـی لـە پاسـەوانەکان هەیـە. کـە منـی بینـی بـە حورمەتێکـەوە خـۆی ڕاسـتکردەوەو گووتـی «موزەفـەری سـوبحدەم هاتیـت... دەترسـام نەیەیـت... دەترسـام نەتدۆزنـەوە». بێـزاری لەدەنگـی دەبـاری، نـەوەک توڕەیـی. گەرچـی هەردووکمـان زۆر پیـر نەبوویـن، بـەڵام تـەواو بـە دوو پیرەمێـرد دەچوویـن... دوو پیرەمێـرد کـە بـۆ حیسـابێکی قـورس لـە ژوورێکدا کۆبوونەتەوە. کەسـمان نەماندەزانـی چـۆن و لـە کوێـوە دەسـتپێبکەین، کەسـمان کۆتایـی دواهەمیـن گفتوگـۆی خۆمـان لـەو ماڵـە سـەوزەدا لـە یادنەبـوو. ماوەیـەک بـە بێدەنگـی تەماشـای یەکدیمـان کـرد، بـە جۆرێـک پیربووبـوو، بـە ئەسـتەم وێنـەی ئـەو پیـاوەی تیابـوو کـە سـاڵانێک لەوەوبـەر شـەوێکی تاریـک منـی لـە ماڵێکدا بـە

جێهێشت و ڕۆیشت. من بە هێمنی چوومە تەنیشتییەوە و گووتم «یاقوبی سنەوبەر، زۆر پیربوویت... زۆر». توند دەستیگرتم و گووتی «پێمگووتیت تاعوون بڵاوبۆتەوە... پێمگووتی دەردێکی کوشندە بڵاوبۆتەوە، پێمگووتی یان نا؟... پێمگووتیت یان نا؟». بە هێمنی گووتم «پێتگووتم... لە بیرمە پێتگووتم». بە ئەسپایی سەرییباداو بەدەنگێکەوە کە هەمووی حەسرەت بوو، گووتی «پێمگووتیت تۆ یاقوتێکی پاکی یان نا... پێمگووتیت یان نا؟». من بۆ ئەوەی هێمنیبکەمەوە دەستەکەی دیکەم خستە سەر دەستی و پێمگووت «پێتگووتم... پێتگووتم» بە چاوێکەوە هەمووی خەفەت و پیری بوو تەماشایکردم و گووتی «پێمگووتیت مەچۆرەوە بۆ ناو ئەو دونیایە... خۆت لەو پیسییە هەڵمەکێشە، ڕۆحی خۆت بە دووربگرە... ڕۆحی خۆت کە خودا ئەو بەهرەیەی پێبەخشی پاکبێت... بۆ ڕۆیشتیت... بۆ تێنەگەیشتی من باسی چیت بۆدەکەم؟ بۆ؟». سەیرمدەکردو دەمگووت «یاقوبی سنەوبەر من و تۆ هەردووکمان نەخۆشین... من و تۆ هەردووکمان پیرین، حیسابێکی زۆریشمان لەبەیندایە... حیسابێکی زۆر».

ژوورەکەی لە ژووری پادشاکان دەچوو، خۆی لە بیمارێک دەچوو لەسەرە مەرگدا، هەندێجار دەکۆکی، هەندێجار دەسرێکی کاغەزینی لە پاکەتێکی قەشەنگ دەردەهێناو لێوی خۆی پێدەسڕی. کە پێمدەگووت «من و تۆ حیسابێکی زۆرمان لە بەیندایە» زەردەخەنەیەکی دەگرت، زەردەخەنەی پیرەمێردێک بە ئەستەم دەتوانێت بۆ ژیان پێبکەنێت. دەیویست پێبکەنێت بەڵام کۆکەیەکی قورس دەنیشتە سەر سینەی، دوایی بە هەمان نیگای کۆنەوە، نیگای سەرۆکێک چیتر بەدروستی نازانێت چی دەوێت، پیاوێک میوەیەک نەماوە تاقینەکاتەوە، بیمارێک لە نهێنی مردن و ئازار، لە لەزەتی ژیان و شادییەکانی تێگەیشتووە، پیاوێک

تەنیا خەیاڵـی لای تاقیکردنـەوەی مردنـە. بـە ئەسـپایی دەیگـووت «مـن و تـۆ هاوڕێمـان نییـە... کـەس ناتوانێـت لـە نێـوان مـن و تـۆدا حەکـەم بێـت، کەس ناتوانێـت». بـە خەفەتێکـەوە دەمگـووت «ئەوانـەی دەتوانـن حەکـەم بـن، یـان مـردن، یـان دیلـن، یـان زمانیـان نییـە». نیگایەکـی پڕمانـا تەماشـایدەکردم و دەیگـووت «ئـەوە دواهەمیـن ئومێدمـان بـوو، دواهەمیـن ئومێـد... ئێسـتا هیوایەکمـان نییـە، دەکـرا مـن و تـۆ دوور لـە هەمـوو دەردەکان، دوور لـە تاعـوون، پێکـەوە خۆمـان بـۆ خەڵوەتێکـی درێـژ تەرخانبکەیـن... دەکـرا مـن و تـۆ پێکـەوە هەمـوو شـتێک تێبگەیـن، بـەڵام ئێسـتا تـۆ هەمـوو شـتێک دەزانێـت، زانیـن بێگوناهـی مـرۆڤ لکەداردەکات... هەمـوو ئەوانـەی نهێنییەکان دەزانـن پاکنیـن، زانینـی نهێنییـەکان پیسـماندەکات... ئێمـە تـا ئەوکاتـە پاکیـن کـە شـتەکان نازانیـن، کـە گومـان ناکەیـن... کـە ئینسـان تێکـەڵ بـە نهێنییـەکان بـوو، کـە حەقیقەتـی ئەوانـی دی بینـی دەبێتـە گوناهبـار، مـرۆڤ تـا ئـەو شـوێنە پاکـە کـە هیـچ لـە گوناهـی ئەوانـی تـر نازانێـت، تـا ئـەو شـوێنە پاکـە کـە دەرکـی بـە پیسـی دونیـا نەکـردووە».

دەمزانـی دەیەوێـت بڵێـت چـی، دەستمدەخسـتە سەرشـانی و دەمگـووت «مـن ئێسـتا هەمـوو شـتەکانم بینـی، لەهەنـدێ نهێنـی تێگەیشـتم، هەنـدێ دەرگامکـردەوە... بەپێـی خـۆم چوومـە نـاو پیسـییەکانەوە، تـۆ پێتوایـە دەبووایـە مـن نەچوومایـە... هـا پێتوایـە دەبایـە هەمیشـە لـەو خانـووە سـەوزەدا چاوەڕوانـی تـۆم بکردایە؟». وەک بـۆ دوور بڕوانێـت سـەری بەرزدەکـردەوەو دەیگـووت «گـەر تـۆ نەچوویتایـە، دەکـرا لـە نێـوان مـن و تـۆدا شـتێکی تـر هەبێـت، دەمانتوانـی لەسـەر مەعدەنـی مـرۆڤ، گەوهـەری ژیـان، ناوەڕۆکـی وجـود قسـەبکەین، بێئـەوەی کاتێـک مـن قسـەدەکەم بـەو چاوانـە تەماشـامبکەیت، ئـەو نیگایـەم تێبگریـت و وام لێبکەیـت هەسـت بەشـەرمبکەم... مـن دەمویسـت مـن و تـۆ باسـی چاکـە و خراپـە، جوانـی و درێـوی بکەیـن ، پێکـەوە بژیـن و لـەو دیـو وجـودی بچوکـی خۆمانـەوە

قسـە لەسـەر شـتەکان بکەیـن... تێدەگەیـت لـەو دیـو وجـودی بچوکـی خۆمانـەوە...». چەندەهـا جـار ئـەو ڕسـتەیەی دووبارەدەکـردەوە. ئـەو ڕقـی لـە وجـودی بچوکـی مرۆڤـەکان بـوو، لـە کۆنـەوە وابـوو، چـاوی لـە جـۆرە ژیانێـک بـوو، ئەسـتەمبوو بەبـێ فەرامۆشـکردنی بوونـی بچوکـی مرۆڤـەکان بێتـەدی. پشـوویەکی کەمـی دەدا، من تەماشـامدەکرد و هیچم نەدەگـووت... دەمزانـی هێشـتا مەودایەکـی درێژمان لەبەردەمدایـە بۆئـەوەی هەمـوو شـتێک بڵێیـن. نەخۆشـی و پەککەوتەیـی هیچیـان لـە تیـژی خەیـاڵ و قووڵـی نیگاکانـی نەگۆڕیبـوو، کـە تەماشایدەکرد دەتزانـی هەنـدێ شـت دەبینێـت تـۆ نایبینیـت، هەسـت بـە هەنـدێ شـت دەکات تـۆ هەسـتی پێناکەیـت. کەمێـک دەکۆکـی و لەسـەرخۆ لـە جێگاکـەی خـۆی هەڵدەسـتا و بەتانییەکـەی لە خۆی دەپێچـاو دەیگـووت «ماڵێکـی سـەوزبوو... ماڵێکـی سـەوز، بـۆ ئـەم ڕۆژانـە دروسـتمکرد کـە پیردەبیـن، کـە چیتـر ئارەزوویەکمـان نامێنێـت لـە شـتە ڕۆژانەکانـدا ونبیـن، لەوێـدا کۆدەبینـەوە، خۆمـان تەرخاندەکەیـن بـۆ ڕامـان لـە مانـا گـەورەکان... قسـە لـە سیاسـەت و شـەڕ ناکەین، بەڵکـو قسـە لـە دونیادەکەیـن بەوجـۆرەی کـە بەبـێ ئـەو شـتانە هەیـە، بەبـێ ئـەو ئازارانـەی مـرۆڤ بـۆی زیـاددەکات... لـەزەت لـە بێدەنگـی سروشـت و ئارامییەکانـی دەبینیـن... چ خۆشـە مـرۆڤ لـە ئاسـوودەییەکی قووڵـدا بیربکاتـەوە، لـە ئاسـوودەییەکی ڕاسـتەقینەدا بیربکاتـەوە و بمرێـت... تـۆ ئـەو لەزەتـەت لـە مـن حەرامکـرد... مـن دەترسـم بەتەنیـا بیـر لـە ژیـان بکەمـەوە، دەترسـم لەسـەرەمەرگدا بەتەنیا بیـر لـە ژیـان بکەمـەوە».

کەدەیزانـی مـن هیچـم نییـە بیڵێـم دەیگـووت «یەکجـۆرە پاکـی هەیـە، یەکجـۆرە پاکـی و هیچـی تـر، ئەویـش ئەوەیـە نەهێڵیـن مـرۆڤ لـە مـرۆڤ تێبـگات... کـە مـرۆڤ لە مرۆڤ تێگەیشـت هەموو شـتێک دەبێتـە گوناه». من دەمگـووت «یاقـوب... ئـەوە چ پاکییەکـە لەسەر نەزانین دروسـتبوویێت؟!». ئەویـش دەیگـووت «ئـەی ئـەوە چ زانینێکـە دەمانـکات بە دوژمـن... دەمانخاتە

گومانـەوە، ناهێڵێـت ئـارام بژیـن و بخەویـن؟!». دەوەسـتاو بـە خێراییەکـی نائاسـاییەوە دەیگـووت «مـن بـاس لـە زانینێـک دەکـەم پاکـی ببەخشـێتەوە بـە مـن... نەهێڵێـت زۆر تەماشـای نـاو دڵـی خـۆم بکـەم... موزەفـەر مـن لـە تەماشـای دەرونـی خـۆم بێـزارم. مـرۆڤ نابێـت لـە کۆتاییـدا بیـر لـە وەڵامـی ئـەو پرسـیارانە بکاتـەوە کـە بەدرێژایـی ژیـان نەیتوانیـوە وەڵامیانبداتـەوە. بەر لـە مـردن دەمەوێـت هێـزی ئـەوەم هەبێـت بیـر لـە وەڵامـی هیـچ پرسـیارێکی بچـوک نەکەمـەوە. دەمەوێـت مـن و تـۆ ئاسـوودە بمریـن، ئاسـوودەیش ئەوەیە بـەر لـە مـردن بـۆ هیـچ نەگەڕێیـت، بـەر لـە مـردن خەیاڵـت لای وەڵامـی هیـچ پرسـیارێکی بچـوک نەبێـت. مـن باسـی ئاسـوودەییم بـۆ کردیـت، ئاسـوودەیی بـۆ تێمنەگەیشـتیت؟ بـۆ مـرۆڤ لـە نزیـک مردنـەوە هەمیشـە بیـر لـە ڕابوردوو دەکاتـەوە... بـۆ؟ بـۆ ئاوڕدەداتـەوە؟ مـن دەمەوێـت بمـرم و ئاوڕنەدەمـەوە». بەکەمێـک نائارامـی و تووڕەییـەوە دەمگـووت «لەبەرئـەوەی گـەر ئاوڕبدەیتـەوە سەریاسـەکان دەبینیـت، لەبەرئـەوەی تـۆ دەترسـیت تەماشـای سەریاسـەکان بکەیـت، دەتەوێـت مـن و تـۆ دۆسـتایەتییەک ببەسـتین لەسـەر فەرامۆشـی و نەزانیـن و یادچوونـەوە دروسـتبووبێت... وەک هەمـوو حوکمڕانەکانـی تـر دەتەوێـت بمریـت و پێـش خـۆت هەمـوو نهێنییەکانـت سـووتاندبێت، بمریـت و کـەس تەماشـای دەفتەرێکـت نـەکات... وەک هەمـوو حوکمڕانـەکان، وەک هەمـوو پێغەمبـەرەکان، دەتەوێـت لـە ڕێـگای بیرکردنـەوە لەگـەردون و ژیـان و سروشـت و جەوهـەرە دوورەکان، مـرۆڤ لەیـاد خـۆت بەریتـەوە، ئـەم بوونەوەرە بچـوک و گەمـارۆدراوە لـە بیـر خـۆت بەریتـەوە... یاقـوب ڕێـگای مـن و تـۆ یـەک ڕێـگا نییـە، بمبـورە مـن نەمتوانـی لەگەڵتـدا بێـم... یاقوبـی دۆسـت نەمتوانـی، عەفوومبکـە... لەبەرئـەوەی دوای بیسـتویەک سـاڵ زینـدان، دوای تێفکرینـی گـەورە لـە سروشـت و گـەردون و بیابـان و ژیـان، دوای تێفکرینـی زۆر نەمتوانـی مـرۆڤ فەرامۆشـبکەم... تـۆ بۆیـە منـت دەوێـت هەردووکمـان پێکـەوە مـرۆڤ لـە یـادەوەری خۆمـان بسـڕینەوەو بەسـەر ژیـان و وجـودی

بچوکی ئەواندا بازبدەین، تۆ بۆیە دەژیت بۆ ئەوەی لەیادیانبکەیت، من بۆیە دەژیم بەیادیانبهێنمەوە، ڕێگای من و تۆ یەک ڕێگا نییە».

تورەبوونی من کەمێک ئارامیدەکردەوە، دەیزانی من چی دەڵێم و چاوەڕوانی ئەو قسانەشی دەکرد.

گووتی «زیندووین یان مردوو. لەیادیانبکەیت یان نا، ئێمە بەیەکناگەین. دڵیان پڕ بێباکی و گاڵتەبوو. قێزو فەرامۆشی، کەمتەرخەمی و ڕق. نەدەکرا فەرامۆشیان نەکەم، نەدەبوو، چارەیەکی ترم نەبوو». بەدەنگێکی هێندە سەیر ئەو قسەیەیدەکرد، نەمدەزانی تەواو هەست بەچی دەکات، دەنگی پڕبوو لە دڵنیایی و پەشیمانیش. هاتە تەنیشتمەوە و گووتی «دەمزانی تۆ دوایاندەکەویت، دەمزانی بەدوایاندا دەڕۆیت... ئەو ڕۆژەی لەسەریاسی سوبحدەمت پرسی، دڵنیابووم هەموو شتێک لە نێوان من و تۆدا دەشکێت... دەمزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ڕێگایەکدا دەڕۆیت و دەگەیتە بەردەم سەید جەلالی شەمس... دواجاریش ڕۆیشتیت و گەیشتیتە بەردەم سەید جەلالی شەمس... مەلعونە ئەوەی نهێنی ئەم چیرۆکەی هەڵدایەوە... مەلعونە».

کە ناوی سەید جەلالی شەمسی دەهێنا تێدەگەیشتم دەیەوێت ئەو چیرۆکەم بۆ باسبکات کەساڵەهای ساڵ بە نهێنی هەڵیگرتبوو. بە غەمگینی پیرێکەوە دەیگووت »«ێستا تۆ دوو هەناری شوشەت لایە و من هیچ». دەچووە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی پەردەکانی تەواو دەکردەوە، هێمنی و تاریکی ئێوارە غەمگینییەکی قورستریان دەهێنایە ژوورێ، بەتانییەکەی توندتر لە خۆیەوە دەپێچاو لەسەر مۆبێلێکی چەرمی ڕەش لە نزیک پەنجەرەکەوە دادەنیشت و دەیگووت «سێ هەناری شوشە بوون، سێ هەناری شوشە یەک دەست دروستیکردبوون، باوکێک بۆ سێ کوڕی خۆی دروستیکردبوون... باوکێکی سەنعەتکار، هونەرمەندێک سیحرێکی گەورە لەدەست و پەنجەکانیدا بوو، سێ کوڕی هەبوو،

هەر سێکیان پێشمەرگەبوون، هەر سێکیان لە بۆردومانێکی دەوڵەتدا شەهیدبوون، من لە گوندێکی چکۆلانەدا لە باکور خەریکی کۆکردنەوەی هێزەکانمان بووم. ئەوکات سەرەتای شۆڕش بوو، هەر سێکیانیان بە شەهیدی هێنا و لە مزگەوتی گوندەکەدا لەتەنیشت یەکدییەوە دایاننان، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ باوکیان هات، پیرەمێردێکی هونەرمەند بوو، جگە لەو هەنارە شوشانە هیچی دی پێنەبوو... کە منی بینی دەستیکردە ملم و دانەوییەوە و دەستی ماچکردم. شەهیدبوونی کوڕەکانی ورەیان نەڕوخاندبوو. غەمی لەوە دەخوارد نەیتوانیبوو ئەو سێ هەنارە فریای کوڕەکانی بخات. بەمنی گووت «سێ برا بوون، لەیەکتر جیانەدەبوونەوە، هەمیشە بەیەکەوەبوون، لەقوتابخانە، لەیاریگا، لە زانکۆ... هەمووشتێکیان پێکەوەبوو، کە بوونە پێشمەرگە دەستی یەکتریان بەرنەدا. ڕۆژێک نامەیەکیان بۆ ناردم بۆ وەرشەکەم، گووتبوویان شۆڕش فەرمانی پێکردوین لەیەکتر جیاببینەوە، شۆڕش واپێویستدەکات هەریەکەمان بچینە هەرێمێک و لە هێزێکی تایبەتدا خزمەتی نیشتیمان بکەین. داوایان لێکردبووم شتێکیان بۆدروستبکەم هەڵیگرن و بیپارێزن، تا لەهەر شوێنێکی دونیادا بوون کە تەماشایانکرد یەکتریان بەیادابێتەوە. شتێک کە گرتیان بەدەستەوە هەستی برایەتییان تیا بجوڵێنێت، شتێک بیانبەستێتەوە بەیەکەوە». موزەفەری سوبحدەم دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستاش نیگای ئەو پیرەمێردە و دەنگیم لەیادە، ئێوارەیەک بوو هەمووی تەم بوو، من و ئەو لە ناو تەمەکەدا پیاسەماندەکرد، ئەو لەبری ئەوەی باسی مردنی کوڕەکانی بکات، باسی لە شتێک کرد هەموومان پێکەوە ببەستێتەوە. تەم بوو موزەفەری سوبحدەم لەگەڵ ئەوەشدا من چاوی ئەو پیرەمێردەم لە یادە... تەم بوو، کەچی من دڵ و هەناسە و نیگاکانیم لەیادە. بەغەمگینییەوە دەستی خستە سەرشانم و گووتی «من ئەم هەنارانەم بۆدروستکردن... ئەم هەنارانە» دەستی برد و لە گیرفانیدا

سێ هەناری شوشەی دەرهێنا... » بە ئارامییەوە گووتی «ئەم هەنارانە فریایان نەکەوت... هەڵیگرە، سەرۆک ئەم هەنارانە هەڵگرە، با شتێک هەبێت هەموومان بەیەکەوە ببەستێتەوە، شتێک هەبێت من بە تۆوە ببەستێتەوە، کوڕەکانی من بەوانەوە ببەستێتەوە کە ئێستا لەدایکدەبن، شتێک هەبێت ئێستا و سبەی پێکەوەگرێبدات... هەڵیانبگرە سەرۆک، تۆ دەتوانیت مانا ببەخشیتە ئەم هەنارانە... من ناتوانم هیچ شتێک پێشکەش بە شۆڕش بکەم، ئەم هەنارانە نەبێت، ئەم هەنارانەی دەبایە کوڕەکانم هەڵیگرن و ئێستا مردوون... ئەم هەنارانە بدە بەوانەی کە نابێت یەکتریان بیربچێتەوە، ئەوە تاکە دیارییەکە دەتوانم پێشکەشی شۆڕشی بکەم».

هەر ئەو شەوە ئەو سێ هەنارەم لە شوێنێکدا شاردەوە، لە جێگایەکدا هەڵمگرتن هیچ کەس زەفەریان پێنەبات. کوڕەکانی ئەو چیتر پێویستیان بەو هەنارانە نەبوو، ئەو هەنارانە بۆ ژیان بوون... بۆ ژیان... بۆ ئەوانە بوون کە زیندوون... موزەفەر... هاوار... موزەفەر هاوار ئێستاش دەڵێیت ئەو ساتەیە، دەڵێیت ئەو شەوە تاریکانەیە کە لەگەرمەی شۆڕشدا دەچووم و ئەو هەنارانەم دەردەهێنا و تەماشامدەکردن. هەموو پێشمەرگەکانمان ئامادەبوون خۆیان فیدابکەن، ئامادەبوون بمرن... ئەوان لەگەڵ مردندا سوێندیان خواردبوو، بەڵام ئەم هەنارانە هەناری وەفابوون، هەناری ئومێدبوون، ئومێدی پیرێک کە ژیانێکی جاویدانی بۆ کوڕەکانی خواستبوو... نەمدەویست ئەم هەنارانە بدەم بەیەکێک کە دەمرێت، بیدەم بەیەکێک کە دەشێت لەم جەنگانەدا تیا بچێت، دەمویست بیدەم بەوانەی کە ژیانیان لەبەردەمدایە... ژیان... ژیان... ژیان بەهەموو مانا بێسنوورەکانی ئەم وشە مەلعونەوە... بەڵام لە هیچ کەس دڵنیانەبووم. دەبووایە سێ کەس بدۆزمەوە کە بژین و یەکتر وننەکەن، دەبوایە خیانەت لە مانای ئەو هەنارە شوشانە نەکەم، سێ

هەنار، کەوەک سێ پەیامی هەتاهەتایی برایەتی، لە نێوان سێ مرۆڤدا، لە نێوان سێ کەسدا کە دەبایە یەکتر وننەکەن... موزەفەری سوبحدەم هاوار من وەک تۆ دەزانم... وەک تۆ هەستدەکەم هیچ شتێک لەیەکتری ونکردن سەختتر نییە... دەبایە بیدەمە سێ کەس کە نابێت یەکتری ونبکەن... ئەو شەوەی کە سەریاسەکان هاتنە دونیاوە وەک ئەوەبوو ئەوان بۆ ئەو سێ هەنارە دروستبووبن... تێمدەگەیت... وەک ئەوەبوو ئەو منداڵانە بۆ ئەو سێ هەنارە دروستبووبن».

من قسەکانیم پێدەبڕی و دەمگووت «بەڵام دواجار ئەو هەنارانەت دایە ئەو منداڵانەی ونتکردن و ونیانکردیت، ونتکردن و خۆشیان یەکتریان ونکرد».

دەنگی بەرزدەکردەوەو دەیگووت «بێدەنگ بە... موزەفەری سوبحدەم... تۆ بێدەنگ بە... لێگەڕێ با سەرەتای ئەو چیرۆکەت بۆ بگێڕمەوە، کە هیچ کەس جگە لە من لەمسەر ئەستێرەیە نایزانێت. بێدەنگ بەو گوێبگرە و ئەو ساتەم لێمەشێوێنە کە عومرێکە لە رۆحی خۆمدا هەڵمگرتووە». دەوەستاو کەمێک ئاوی دەخواردەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و بە ئارامییەکەوە کە ئارامی کەسێک بوو بڕیاریدابێت گەورەترین نهێنی ژیانی خۆی ئاشکرابکات، دەیگووت «تۆ دەزانی تۆ باوکی یەکێک لەو سەریاسانەیت، تەنیا یەکێک، دڵنیاشم لە خۆتت نەپرسیوە ئەی باوکی ئەو دوو سەریاسەی تر کێیە؟ من تۆ دەناسم، چونکە ناو رۆحت دەخوێنمەوە. بێگومانم نەتپرسیوە ئەو پیاوە دڵڕەقە کێیە کە دوو کوڕی خۆی بەرەڵاکردۆتە بەر تۆفانی زەمان، دەستی لێبەرداون و بەخشیونی بە گەردەلوول... نەتپرسیوە، لەبەرئەوەی دڵنیابوویت هەرگیز ناتوانیت ئەو وەڵامە بدۆزیتەوە، ناتوانیت بگەیتە هیچ شتێک، ئەگەر گومانێکیشت هەبێت تیا ناگەیتە یەقین، بەڵام من بەتۆ دەڵێم، ئەو دووانەی تر کوڕی منن ئەو دوو سەریاسەی تر کە کوڕی

تۆ نین کوڕی منن... حەرامزادەی منن... تێدەگەیت، حەرامزادەی ئەو ڕۆژ و شەوە تاریکانەی شۆڕشن کە من شەوانە بە کوێری لە باوەشی هەندێ ئافرەتدا لەو گوندە بەرزانەی چیا ڕۆژمدەکردەوە، منداڵی ئەو شەوانەی سەرۆکێکن گەر ئافرەت نەبووایە شۆڕش دەیکوشت... من لەو چیایانە بەچی دەژیام، ها تۆ دەزانی بەچی دەژیام، موزەفەر دەزانی بەچی دەژیام؟. بەو شەوانە دەژیام کە بە نهێنی و بەتەنیا دەردەچووم و هیچ کەس نەیدەزانی دەچم بۆ کوێ، ئەو شەوانەی لە هەر شوێنێکی ئەم وڵاتەدا بوومایە، لە هەر گوندێکدا بوومایە ئافرەتێک هەبوو لەگەڵمدا بخەوێت. گەر ئافرەتێک نەبووایە هەستم بە شکست دەکرد.»

کە قسەیدەکرد شتەکان خامۆش بوون، هەستمدەکرد لە دڵەوە قسەدەکات، هیچ شتێک لەجێی خۆی نەدەجوڵا، هەوا کپ، زەمین کپ، گوڵدانەکان بێدەنگ، فەزای ژوورەکان ئارام، پەردەکان بێجوڵە و خامۆش. ئەو درۆینەدەکرد. وەک ئەوەبوو بڕیاریدابێت نەهێڵێت هیچ شتێک لەو ژوورەدا بجوڵێتەوە، نەهێڵێت لە ڕاستی زیاتر هیچی تر بێتە ناو ئەو ئێوارەیەوە، ڕاستییەک ئارامییەک ببخەشێتە ڕۆحی خۆی و شتەکانی دەوروبەریش. بە کۆکەیەکی توندەوە دەستی وەک دەستی فیرعەونێکی نەخۆش بەرزدەکردەوە و بە نیگایەکی قووڵەوە دەیگووت «ئەوان کوڕی من بوون... کوڕی من... لە خوێنی من بوون... بەرهەمی شەوە تاریکەکانی من بوون، بەرهەمی ئەو شەوانەی تەنیا من و خودا و مەعشوقەکانم دەمانزانی... ئەو شەوانەی نەدەبایە هەواڵیان لە هیچ زارێک بترازێت... ئەو شەوانەی تاریکتر لە هەر تاریکییەک، تەلیسماویتر لەهەر تەلیسمێک هەڵمدەگرتن. هیچ کەس تا ئەمڕۆش نهێنی ئەو شەوانە نازانێت. گوێبگرە سوبحدەم و غەمبار مەبە، بەشێکی گەورەی ئەو نهێنیانە لەگەڵ مندا دەچێتە گۆڕەوە. مرۆڤ نهێنییەکانی خۆی لەگەڵ

خۆیدا دەبات. گەر نهێنی نەبێت ژیان دەبێتە قەسابخانەیەکی گەورە، خێزانەکان دەڕوخێن، لەشکرەکان شکستدەهێنن، مرۆڤەکان ڕیسوادەبن... من هەمیشە ستایشی نهێنی دەکەم... هەمیشە... هەمیشە. ئەو دووانەش دوو نهێنی گەورەی من بوون... ئەو دوو سەریاسە دوو نهێنی من بوون... لە من بوون... دایکیان بێوەژنی جووتیارێک بوو، من لەگەڵیدا خەوتم و نەمدەزانی دەکرێت دوو کوڕ لە ژوانەکانمان دروست بێت، دوو کوڕی حەرامزادە، دوو کوڕ نەمدەویست لەدایکبن... هەمیشە وایە، شۆڕش هەمیشە وایە... هەمیشە لە هەناوی شۆڕشدا کۆمەڵێک منداڵ لەدایکدەبن کە کەس نایەوێت لە دایکبن... دێن و کەس نایەوێت بێن. دایکیان لە شەوی لەدایکبوونیاندا مرد، من خۆم مامانی بووم، خۆم سەرمخست بۆ ئەشکەوتێکی بەرز، ئەشکەوتێک نزیک لە خودا و دوور لە زەمین، نەدەبایە هیچ کەس بە نهێنی ئەو منداڵانە بزانێت. گەر یەک کەس بەو چیرۆکەی بزانیبایە، دەبایە واز لە شۆڕش بهێنم، دەبایە سەرۆکایەتی چۆڵکەم بۆ ئەوانەی وەک دوپشک چزووەکانی خۆیان لەسەر سەرم ڕاگرتبوو، دەبوایە واز لەو میللەتە بهێنم کە بەبێ من جەستەیەکی ئیفلیج بوو. گوێبگرە موزەفەر... گوێ لەو نهێنییە بگرە کە تەمەنی بیستویەک ساڵە. شەوێک ئەو ژنەم برد بۆ ئەشکەوتێکی دوور و لەوێدا لەدەست نەیارانی من و لەدەست کەس وکاری ئەو حەشارمدا، لەبەرئەوەی خۆشمدەویست، گەر خۆشم نەویستایە، دەکرا حاشای لێبکەم و وازی لێبهێنم بمرێت... نا وازم لێنەهێنا تا لەویادا منداڵی بوو، شەوێکی تاریک لەبەر فوتیلەیەکی دووکەڵاویدا دوو کوڕی بوو، بەڵام خۆی بەدەم ئازارێکی گەورەوە مرد... موزەفەری هاوڕێم... دۆستی من تێمبگە، لە ترس و ئازاری من بگە لەو شەوەدا، لەوە بگە دوو کۆرپەت لەبەردەستدا بێت، دوو کۆرپەی حەرام، ژنێکی مردووت لەبەردەستدا بێت. سەرتاپای خۆت ترس و خوێن بێت. ئەو شەوە کۆرپەکانم پێچایەوە و دایکیانم لە

گۆڕێکدا ناشت کە هیچ کەسێک ناتوانێت بچێتەوە سەری. گۆڕێک بە نهێنی دەمێنێتەوە... نهێنییەک هیچ کەس ناتوانێت بیشکێنێت... وەک نهێنییە گەورەکانی ئەم وڵاتە لە سندوقێکی داخراوو تاریکدا سەری دادەخرێت و کەس ناتوانێت بیکاتەوە. سندوقێک کلیلەکانی لای کەس نییە... من پێمگووتی، تکام لێکردیت دوای ئەو شتانە نەکەویت کە لە زەریایەکی قووڵدا ونبوون. دوای ئەفسانەیەک نەکەویت کە نایدۆزیتەوە... بەڵام تۆ بەقسەی منت نەکرد، بەقسەت نەکردم. ئەو شەوە لە ژێر ئەستێرەکاندا ئەو ژنەم ناشت و کەسێک لەمسەر ئەستێرەیەدا نەیزانی... خوداحافیزیم لێکردو بە دوو مەلۆتکەوە لەو چیایانە دابەزیم. دەزانیت ئەو شەوە کەی بوو، دەزانیت؟... مانگێک دوای ئەو شەوە بوو کە من و تۆ لەو گەمارۆیەدا ماڵاواییمان لەگەڵ یەکدا کرد. ناوی تۆ ئەو کات لەنێوان شۆڕشگێڕەکاندا شتێک بوو، سەنگێکی هەبوو. من ئەو کۆرپەیەی تۆشم لەبەردەستدا بوو، سەریاسی تۆم لای خێزانێکی دۆستی حیزب لە گوندێکدا بەئەمانەت دانابوو. نەدەبوو هیچ کەس بزانێت ئەوانە کوڕی منن... هەردووکیانم گرتبوو بەدەستمەوە و وەک شەیتانێکی بەد لە تاریکیدا دەلەرزیم. هەموو دەمارەکانم لە حەسرەتی شتێکی ترسناک دەفڕی، نەمدەزانی ئەو منداڵانە چی لێبکەم... نەمدەتوانی لە ناو ئەو بەردانەدا جێیانبهێڵم، ئەوان کوڕی من بوون، دەبووایە بیانناسم، بیانبینم، هەست بە وجودیان بکەم... نەمدەویست ئاوەها فڕێیاندەم، بیانخەمە نزیک دیواری مزگەوتێک و بەجێیانبهێڵم، تا ئەگەرچی دواجار هەموو شتەکان واکەوتنەوە، بەڵام من وانەبووم. من خەونێکم بۆ ئەو منداڵە حەرامزادانە هەبوو... تێمدەگەیت خەونێکم بۆیان هەبوو... خەونێک... من ناتوانم ژیان بگۆڕم، من سەرۆکم، من خودا نیم... تێدەگەیت، سەرۆکەکان تەنیا دەتوانن خەونەکان بگۆڕن... من خودا نیم... خودا نیم. خودا ژیان دەگۆڕێت، بەڵام سوبحدەم تۆ تێناگەیت،

ئەوان خەونێکی تریان هەبوو، کوڕەکانی من نەدەکرا خەونی تریان هەبێت. چ شتێک لەوە غەمگینترە تۆ نەتوانیت خەونی کوڕەکانی خۆت تەفسیربکەیت... تۆ تێناگەیت».

ئەو ماوە درێژە وەک ئەوەی لە ژوورێکی خاڵیدا بۆ سێبەرەکانی خۆی قسەبکات، قسەیدەکرد.

دواجار لەسەرە خۆ دەمی سڕی و بەردەوام دەبوو.

«بەڵام وازبهێنە با بەجۆرێکی تر چیرۆکەکەت بۆ بگێڕمەوە. ئەو کات هەموو دەیانزانی تۆ کوڕێکت لێبەجێماوە، دەیانزانی ئەو شەوەی کە گیرایت تازە بە تازە بووبوویت بە باوکی کۆرپەیەکی چکۆلانە. دەیانزانی کۆرپەکەی تۆ ناوی سەریاسە، ناوێکی سەیر لە باوکێکی سەیرەوە. ئەو شەوە کە لە ناو بادا دەلەرزیم شتێک لە قووڵایی دڵمدا پێیدەگووتم تەنهایی ئەو کۆرپەیە و ونبوونی، جیاوازییەکی نییە لەگەڵ تەنهایی ئەم کۆرپانە و ونبوونیاندا، هەر سێکیان بێدایک بوون، هەر سێکیشیان نەیاندەتوانی خاوەنی باوک بن، هیچ کەسیشیان جێگایەکی نەبوو لەم زەویەدا بەخۆی بگرێت... تۆ پێمبڵێ موزەفەر کۆمەڵێک پیاوی کێونشین دەمانتوانی چی لە سێ کۆرپەبکەین... چی؟». هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشاو پڕ بە ژوورەکە هاواریدەکرد «وای لە من وای... وای لە من وای».

«تەنیا ڕێگایەک بۆ ئەوەی ڕزگاریانبکەم، ئەوە بوو یەک ناویان لێبنێم... ئەوە تەنیا ڕێگابوو نەهێڵم نهێنییەکەیان لە ناو نهێنییەکاندا ونبێت، نەهێڵم ناویان لە ناو ناوەکانی تردا ببێت بە ژێرەوە، لەیەککاتدا ونیانبکەم و نەشهێڵم ونبن. نەهێڵم ئەو داوە دەزووە ونبێت کە دواجار هەموومان دەباتەوە سەر ئەو حیکایەتە... وای لە من وای... ئەوە تەنیا چارە بوو... وای لە من وای، وای لە من وای».

بە شێوەیەکی ترسناک دەیناڵاند و هاواریدەکرد.

«مـن بەئومێـدی ئـەوە نەبـووم بژیـم و ڕزگاریانبکـەم... دەبایـە خۆیـان خۆیـان ڕزگاربکـەن، ئـەو شـەوەی چـووم هەنـارە شوشـەکانم دەرهێنـا، ئـەو شـەوەی ئەسـپم زینکـرد و هانـام بـۆ سـەی جەلالـی شـەمس بـرد، دەمزانـی نـە مـن نـە تـۆ ناتوانیـن ڕزگاریانبکەیـن... نـە مـن نەتـۆ ناتوانیـن». کەمێـک ئارامدەبـووەوە و بـە هێمنـی دەیگـووت «موزەفـەری سـوبحدەم ئـەم نالّیـن و هاوارانـەم نەتترسـێنێت، هەمـوو ئـەو شـتانە ئێسـتاش لـە مۆتەکەیەکـی قـورس دەچـن... ئـەوان یـەک کـەس بـوون، دەبووایـە یـەک ناویـان هەبێـت و ئـەو نـاوەش نـاوی تـۆ بێـت، تـا ئەگـەر ڕۆژێـک ویسـتیان شـانازی بـە شـتێکەوە بکـەن، شـانازی بـە تـۆوە بکـەن... دەبایـە هـەر سێکیشـیان ناویـان سـەریاس بێـت، هـەر سێکیشـیان دوور لەیـەک بژیـن، هەرسـێکیان بچنـە سـەر ڕێـگای جیـاواز و لـە سـێ هەرێمـی جیـاواز و لـە سـێ شـوێنی دوور لەیەکـدا بژیـن، تـا هیـچ کـەس ئـاگاداری چیرۆکەکەیـان نەبێـت، کـەس بـە حەرامـزادە بانگیـان نـەکات، بەڵکـو وەک کـوڕی موزەفـەری سـوبحدەم بانگیانبکـەن... سـێ چیـرۆک کـە دواجـار یـەک چیـرۆک بـوون، بـەلام دەبایـە وابکـەم کـەس دوای نهێنییەکانیـان نەکەوێـت، مەلعونـە ئـەو کەسـەی یەکەمجـار بـەدوای نهێنـی ئـەم چیرۆکـەدا گـەڕاوە، مەلعونـە و ئاسـمان تۆڵـەی لێدەسـێنێتەوە... مەلعونـە و دەبایـە بمرێـت. خـودای مـن... خـودای گـەورەی مـن دەبایـە دابەشـیانبکەم تـا نەترسـم، تـا گـەر یەکێـک پرسـی ئـەم سەریاسـە کێیـە، بـاس لـە منداڵـە حەرامزادەکانـی خـۆم نەکـەم، بەڵکـو بـاس لـە منداڵـی دیلێـک بکـەم کـە سـەربەرزانە لـە زیندانـەوە شـەڕ لەگـەڵ داگیرکەرانـدا دەکات... مـن و سـەی جەلالـی شـەمس نەبێـت هیـچ کـەس لـەم دونیایـەدا نەیدەزانـی کـە سـێ سـەریاس هەیـە. موزەفـەری سـوبحدەم بـەلام مـن خەونـم هەبـوو... خـەون... دەبایـە ئـەو هەنـارە شوشـانە شـاهیدمان بـن... ئەو ناوە شـاهیدمان بێـت... بۆیـە هـەر سـێکیان یـەک ناویـان هەبـوو تاتێبگـەن یـەک کەسـن، یـەک ڕۆحلەبـەرن، یەکجـۆر ئـازار دەچێـژن، لەنـاو یـەک ئاگـردا گەورەدەبـن،

یەک کێشەیان هەیە، تا پێیانبڵێم وەک یەک دەیانبینم. موزەفەر من لەو ساتەوە دەمزانی کە ئەوان تا هەتاهەتایە دوور لە من و تۆ گەورەدەبن، تا هەتاهەتایە من و تۆ و ئەوان پێکەوە کۆنابینەوە، دەمزانی دوور لە چاوی دونیا، دوور لە هەستی دونیا، دوور لە یەکتر گەورەدەبن... ناو کاتێک سوودی هەیە بتوانێت ئادەمیزادەکان لەیەکتر جیابکەیتەوە. من لەو شەوە ساردەوە دەمزانی لەجەوهەردا هیچ شتێک نییە لەیەکیان جیابکاتەوە، موزەفەر تۆ مردبوویت و دەبایە هەرسێکیان بزانن کە من ئەوان وەک یەک دەبینم، هەر سێکیان وەک یەک مەخلوق دەبینیم کە دواجار لەو دنیایەی مندا دەژین و گەورەدەبن و دەمرن. بەڵام وای لە دەردی من... وای لە پەژموردەیی و پەرێشانی من» کەمێک دەوەستاو دەیگووت «ئەوان یەک ژیانیان هەبوو، درۆبوو ناوی دیکەیان لێبنێم... درۆبوو». من دوای ئێستێکی درێژ لە بێدەنگی دەمپرسی «درۆبوو یان ناوی سەریاس دەمامکێک بوو دەتکردە سەر گوناهێک کە گوناهی ئەو منداڵانە نەبوو؟». بۆ یەکەمجار بە هێمنی ئاوڕیدەدایەوە و دەیگووت «ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە ئەوان برای یەک بوون، دەبایە شتێک هەبێت کۆیانبکاتەوە... شتێک پێکیانەوە ببەستێت، شتێک لە پاشەڕۆژدا ببێتە هەوێنی خۆدۆزینەوەیان... من لەو ساتەدا کە لێکم جیادەکردنەوە، دەبوایە پەتێکیان بۆ بەجێبهێڵم، بگەڕێنەوە بۆ لای یەک... بەڵام گوناهی من نەبوو... گوناهی من نەبوو... ئەوەی دواتر ڕوویدا گوناهی من نەبوو، ئەوەی هەموو شتەکان لەدەستچوون، شتێکی تربوو کە من بۆم ڕاست نەدەکرایەوە. من لە یەکەم ڕۆژەوە دەمزانی ناتوانم وەک کوڕی خۆم باوەشیان پیابکەم. دەزانی گەر ئێمە منداڵە حەرامەکانی خۆمان ئاشکرابکەین چی دەبێت؟ دەزانیت؟ ئەوە مانای کۆتایی، مانای کۆتایی من، کۆتایی منیش مانای کۆتایی نیشتیمان».

من هاوارمدەکرد «یاقوبی سنەوبەر پێمبڵێ تۆ دوای سەرکەوتن

لەدویان گەڕایت یان نا؟... دوای ڕاپەڕین ئاگاداری چیرۆکەکەیان بوویت یان نا؟».

یاقوب سەریبادەدا و دەیگووت «تۆ پرسیارێکم لێدەکەیت لە توانای مندا نییە وەڵامیبدەمەوە، لەسەر و وزەی منەوەیە. لە هێزی مندا نییە بیگەمێ، پرسیارێکم لێدەکەیت پەیوەندی بەهەموو ئەو پرسیارە تاریکانەوە هەیە کە من بەدرێژایی ژیانم بۆی دەگەڕێم و نایگەمێ... تۆ نازانیت ئەو سەردەمانە چۆن بوون... نازانیت. من لەگەرمەی شۆڕشدا ئەوانم ونکرد... ونمکردن و تەنیا ساڵانێک دواتر دۆزیمنەوە... ساڵانێک دواتر کە دەبایە حیسابی شتەکانی ژیانی خۆم بکەم... بەڵام کە دۆزیمنەوە ئەوان بۆ هەتاهەتایە ونبووبوون، کە دۆزیمنەوە لە نێوان من و ئەواندا دیوارێک دروستبووبوو بەرزتر لە هەموومان».

بە گومانەوە سەیریدەکردم و دەیگووت «سێ حەرامزادە بوون لە شەوە تاریکەکانی شۆڕشدا لەدایکبوون، سێ منداڵ کە کوڕی من و تۆ نین، بەڵکو کوڕی ئەو ڕۆژگارانەن... کوڕی من و تۆ نین، بەڵکو کوڕی هەموو ئەم دونیایەن...». بەتوڕەییەوە هەڵدەستاو هاواریدەکرد «موزەفەری سوبحدەم، دەکرا من وەک منداڵی پاشاکان بەخێویانبکەم، دەکرا بیاننێرم بۆ دوور، بیاننێرم بۆ مەملەکەتێک بە بەختیاری تیابژین، بەڵام ئەوە چ درۆیەکی گەورە دەردەچوو... چ خیانەتێک دەبوو... چ بێوەفاییەک دەبوو... گوێبگرە... منیش بێگوناهێکم لە بێگوناهەکان... بێگوناهێکم لە بێگوناهەکان» بە نرکەیەکی هێندە سەیر باسی لە بێگوناهی خۆی دەکرد من دەترسام.

بەئەسپایی پێمدەگووت «یاقوب من بۆنەوە ناگەڕێم گوناهبارەکان بدۆزمەوە، من بۆ سەریاسی سوبحدەم دەگەڕێم، نەوەک بۆ گوناهبارەکان».

نەیدەهێشت هیچ بڵێم، بەدەستووری هەمیشەیی خۆی قسەکانی پێدەبڕیم. دەستیدەکردە ملم و بەهێمنی دەیگووت «تۆش بوویتایە

ژیانت نەدەشێواندن، عومرێکی دەستکردت بۆ دروست نەدەکردن. ئەوان لە شەوە تاریکەکانی ئێرەدا لەدایکبوون، لەگەڵ ئەوانی تردا بوون، تێدەگەیت لەگەڵ ئەوانی تردا بوون، ئەوانەی هاتن و لەدایکبوون و مردن، لەدایکبوون و دەبایە بەو جۆرە بژیابانایە کە ئەم سەردەم و زەمانە دەیسەپێنێت، لێرە لەگەڵماندا بوون و ڕۆیشتن و نەگەیشتنە هیچ... نەگەیشتنە هیچ... نەگەیشتنە هیچ». دوای هێمنی و بێدەنگیەکی کورت بە ئەسپایی دەگەڕایەوە سەر قەنەفەکە و دادەنیشت، کەمێک سەیری ئەو باڵندانەی دەکرد کە لە کۆتایی ئێوارێدا بە هێمنی لە سەر درەختەکان سەیری هاتنی شەویان دەکرد. سەری دەخستە سەر دەستی و سەیری نادیاری دەکرد و دەیگووت «سالانی منداڵی چاوم لێیان بوو، دەمزانی لە کوێن، دەمزانی چۆن دەژین، دەمزانی کێ سەرپەرشتیاندەکات. یەکە بە یەکە هەواڵیانم بۆدەهات... بەلام نەمدەتوانی دەستبخەمە چارەنوسیانەوە. لە ناکاو دونیا بە شێوەیەک گۆڕدرا ئیدی هیچ شتێک دەستکاری نەدەکرا. کارەساتە گەورەکان ڕێڕەوێک بە ژیان دەبەخشن کە دواتر دەستکاری ناکرێت. لەو سالانەدا ئێمە شکستمان خوارد. شەوێک لە خەو هەستاین و بینیمان بستێک ئاسمان بەسەر سەرمانەوە نەماوە. بەسەر ئێسک و پروسک و کەللەسەری هاوڕێکانماندا هەڵهاتین، لەو هەڵهاتنەدا سەریاسەکانم ونکرد، سەریاسەکانیش لەگەڵ ئەوانی تردا ڕۆیشتن، لەگەڵ ئەو سەدان هەزار کەسەدا کە نەمبینینەوە، دوای ئەوە کەسمان نەبووینەوە بە مرۆڤەکانی جاران، وەک هەموو ئەو زەمین و باغ و کێڵگانەی کە هەرگیز نەبوونەوە بەو زەمین و باغ و کێڵگەیەی جاران... موزەفەری سوبحدەم کە یەکجار مرۆڤێکت جێهێشت ئیتر بۆ هەتاهەتایە جێتهێشتووە، کە یەکجار جێگایەکت جێهێشت ئیتر بۆ هەتاهەتایە جێتهێشتووە. موزەفەری سوبحدەم پێمبڵێ، تۆ پێمبڵێ، بەدوای چیدا بگەڕامایە ؟... دەڕۆیشتم و زەویم نەدەناسییەوە، من دەریایەک مردووم،

لەبەردەستدا بوو، دەریایەک مردوو... کەمن گەڕامەوە ژیانیان ڕوخساری هەتاهەتایی خۆی وەرگرتبوو».

بە ئارامییەوە پاڵیدەدایەوە و وەک ئەوەی ڕۆحێکی ئارام و تارماییەکی مژدەبەخش ببینێت بە هێمنی دەیگووت «کەمن گەڕامەوە یەکەمجار ئەو سەریاسە زامدار و هەلاهەلایەم بینییەوە، سەید جەلالی شەمس ئەوی لە گوندێکدا دۆزییەوە، شەوێکی تاریک هەردووکمان چووین بۆ لای، شەوێک بوو لە تاریکترین شەوەکانی دونیا، لەناو کۆمەڵێک منداڵی سووتاوی تردا بوو، نەیدەزانی ئێمە کێین... پێمنەگووت «من باوکتم...» نا پێمنەگووت لەبەرئەوەی سوودی نەبوو... من باوکی نەبووم، هیچ کەس باوکی نەبوو... ئەو کوڕی ئەو ئاگرەبوو، کوڕی ئەو پشکۆیانە بوو کە لە ناو دڵیدا دەسووتان، کوڕی ئەو هاوڕێ بچوکانەی خۆی بوو کە وەک خۆی لە حەوزێک بڵێسە هەڵکێشرابوون. ئا... ئا... جێگایەک هەیە لە ژیان، شوێنێک هەیە لە خەرابات و خاپووری نیتر مرۆڤ ناتوانێت کۆمەکی مرۆڤ بکات. من و ئەوان نەماندەتوانی یارمەتی یەک بدەین... دڵنیابووم تا من نزیکببمەوە ئەوان دووردەکەونەوە... تا پتر دەستم درێژبکەم، ئەوان پتر قێزیاندێتەوە... ئەوان بەتەنیا نەبوون، لەگەڵ ئەواندا بوون... لەگەڵ ئەواندا، ئێمە و ئەوان هەرگیز بەیەکناگەین».

هاوڕێ ئازیزەکانم، ئەی پەناهەندە هاوڕێکانم، ئەی ئەوانەی شەو و تاریکی و ئاو بەیەکسانی لەگەڵ یەکدا بەشدەکەین. لەو ساتەدا ئەو قسەی لەوەدەکرد کە سەریاسەکان لە دونیای خۆیان جیانەدەکرانەوە، سەریاسەکان لە هاوڕێکانیان جیانەدەکرانەوە. من تووشی ئەو دۆخە سەیرەبووم کە پێشتر وەک هەستێکی نادیار تیامدا دروستبووبوو. ئەوەی من دەمبیست دەنگی یاقوبی سنەوبەر نەبوو، ئەوەی بەرامبەرم وەستابوو یاقوب نەبوو، بەڵکو نیگارێکی تری خۆم بوو. ئەو دەنگە هەمان دەنگی

من بوو، بەڵام لە زارێکی ترەوە... من گوێم لێدەگرت و سەرسامبووم، خودایە من و ئەو یەک بووین... یەک بووین و پارچەپارچەبووبووین. من بۆ ساتێک وەستام و دڵنیابووم گەر منیش بە ڕێگای ئەودا بڕۆشتبامایە، هەمان یاریمدەکرد. هەر سێکیانم ناودەنا سەریاس، ئەو سێ هەنارە شوشەیەم دەدانێ، دەمخستنە سەر سێ ڕێگای جیاوازو پێمدەگووتن "بڕۆن و بژین" دەزانم دەکرا من چەندەها شتی تربکەم، دەکرا لەبەردەمیاندا بگریم و مەحەبەتی خۆم ئاشکرابکەم، دەکرا پێیانبڵێم بمخەنە ناو ئەو پەیمانانەوە، بەڵام لە قووڵاییدا شتێک دەمایەوە کە بە من دەستکاری نەدەکرا، شتێک کە بۆنی جەستەو هەناسە و هاوار و خەونە ئاگرینەکانی خۆیانە، شتێک دەمایەوە کە دیواری گەورەی نێوان ئەوان و جیهان بوو، دیوارێک ئەوانی لە هەموو ئەم گەردونە جیاکردەوە، دیوارێک یاقوبی سنەوبەر دڵنیابوو ناتوانێت ببیڕێت، بەڵام من تا ئەمڕۆ سەرسەختانە دەمەوێت بەسەریدا سەرکەوم.

هاوڕێیان، ئەی ئەوانەی ڕەشەبا و ئومێد و غەم بەیەکسانی لەگەڵ یەکدا دابەشدەکەین. دوای ئەو قسانە هەستم بە نزیکییەکی سامناک کرد لە نێوان خۆم و ئەودا، هەستمدەکرد ئێمە هەموو کۆمەڵێک وێنەی تێکەڵاوی یەک بووین. تا ئەو زیاتر قسەیدەکرد و من زیاتر ڕادەمام، زیاتر تێدەگەیشتم کە ڕوخسار و دەنگ و نیگاکانی لە من دەچن، شتێکمان تیابوو پتر لەوەی جیاوازی نێوان دوو ڕۆح بێت، جیاوازی نێوان دوو نیوەی یەک جەستەبوون. وەک ئەوەی من و ئەو دوو بەشی یەک جەستەبین، دوو تارمایی بین لەیەک جەستە جیابووبێتینەوە. دەنگی ئەو هەر دەنگی خۆم بوو لەگەروویەکی ترەوە دەهاتەدەرێ. ئەو هەموو ڕێگا جیاوازانەی بڕیبوومان دواجار هەردووکمانی گەیاندبووە سەر ئەو ڕاستییەی کە غوربەتێکی بێئەندازە قووڵ لە نێوان ئێمە و ئەو منداڵانەدا

هەیە. غوربەتێک من بەهەموو هێزی خۆمەوە دەمویست بیشکێنم، ئەو بە هەموو هێزی خۆی لێدەگەڕا وەک خۆی بمێنێتەوە. من و ئەو دوو باوک نەبووین... نا، کە لەبەردەمیدا وەستام و گوێم لە هاوارەکانی گرت، گوێم لە نرکەکانی گرت، هەر ئەو هاوار و نرکە و گریانانە بوون کە من بە درێژایی ژیانم لەگەڵ خۆمدا کێشمکردبوون، هەر ناڵینەکانی خۆم بوو، کە باوەشم پیاکرد، باوەشم بە خۆمدا دەکرد، بۆ ساتێک وەستام... بۆ ساتێک چاوانم لێکناو وەک بروسکەیەکی خێرا، ئەو خەیاڵە ترسناکە بەسەرمدا تێپەڕی، تێگەیشتم ئەو خەڵوەتەی ئەو باسیدەکات، هیچ نییە جگە لە پەیمانێکی تر لەو پەیمانانەی کە دەبایە من و ئەو مۆریبکەین و نەمانکرد... ئەو خەڵوەتەی ئەو باسیدەکات جگە لە خەونێکی هاوشێوەی خەونەکانی ژێر دواهەمین هەناری دونیا هیچی تر نییە. من و ئەو یەک کەس بووین و دابەشبووبووین، وەک چۆن سەرباسەکان یەک کەس بوون و دابەشبووبوون. جەبەروتی ئەو، ڕێگای لەوە نەدەگرت کە دواجار نیوەیەکی تێکشکاوی هەیە کە منم... نیوەیەک نەدەنرا بەیەکەوە... من و ئەو تامەتامەتایە لەیەکترازابووین و نەدەنراین بەیەکەوە. من و ئەو یەک کەسی شکاوبووین، یەک باوکی شکاوبووین، هەر وەک سەرباسەکان، وەک ئەوان کە یەک کوڕی شکاوبوون.

ئەو ساتەی ئامێزی پیاکردم، دڵنیابووم باوەش بە خۆمدا دەکەم، باوەش بە شتێکدا دەکەم یان جەستەی خۆمەو من سێبەری ئەوم، یان سێبەری منە و من جەستەی ئەوم. لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابووم هیچ خەڵوەتێک ئێمە نانوسێنێتەوە بەیەکەوە، هیچ خەونێک جارێکی تر کۆماننناکاتەوە. ئەو ڕاستیدەکرد، هاوڕێکانم، دۆستانی شەوانی ساردی دەریا... ئەو ڕاستیدەکرد. من و ئەو تا ئەوسەری ئەوسەر نهێنی یەکترمان دیبوو. چیتر من نەمدەتوانی پەیمان لەگەڵ ئەودا بنوسم، لەبەرئەوەی دەمزانی ئەو یەک پەیمانی دەوێت، پەیمانی ئەوەی بە

ئاسوودەیی کۆتایی بەم چیرۆکە بهێنین. منیش تەنیا بەدوای پەیمانێکدا دەگەڕام، ئەوەی تا کۆتایی دوایی چیرۆکی سەریاسەکان بکەوم و هەرگیز کۆتایی پێنەهێنم و لە ژێر باری گوناهەکانیدا دەرنەچم. ئەو خەڵوەتەی ئەو باسیدەکرد، ئاسوودەیی من و ئەو بوو لەوسەری سەفەرەکانماندا بەدوای خۆماندا. ئەو پەیمانەی منیش باسمدەکرد خۆتەرخانکردن بوو بۆ نائاسوودەیی... پەیمانی دروستکردنی کۆتاییەکی تر بوو لەم چیرۆکە.

ئەو ڕۆژەی ئەو منی بردو ئامێزمان بەیەکتردا کرد، دەیویست بگەینە کۆتایی، بەڵام من پێموابوو هێشتا لەسەرەتادام.

وەک بزانێت من بیر لە چیدەکەمەوە، وەک دڵنەواییم بداتەوە، هۆی بێباکی و کەمتەرخەمی خۆیم بۆ ڕوونبکاتەوە گووتی «ئێمە و ئەوان یەکتری ناناسینەوە، ئێمە و سەریاسەکان یەکتری ناناسینەوە. چەند ساڵێک لەوەوبەر لەگەرمەی جەنگدا، کاتێک لە یەکێک لە چیا دوورەکاندا هێزەکانی خۆمانم دەپشکنی، لەیەکێ لە سەنگەرەکاندا گوێم لێبوو پێشمەرگەیەک هاواری لە یەکێک کرد و گووتی «بەسەریاسی سوبحدەم بڵێ، هەندێ زەخیرە بخاتە پشتی پیکابەکەوە». هاوارێکی ڕاگوزەر بوو، بەڵام من تێگەیشتم یەکێک لە کوڕەکانی من لەوێیە، دوای چەند سەعاتێکی تر کاتێک پێشمەرگەکانم بەسەر دەکردەوە، گەنجێکی باریک و غەمگین و ڕیشدرێژ هاتە بەردەمم و گووتی «سەرۆک من ناوم سەریاسی سوبحدەمە، گەورەم دەمەوێت داوایەکت پێشکەشبکەم، بمگوازەوە بۆ پێشی پێشەوە، بۆ کامە شوێنێک جەنگ زۆر سەختە». گەنجێکی جوان و نائومێدبوو. من کە بەساردی و دڵڕەقی و بێڕەحمی ناسرابووم، خەریک بوو دەستبکەمە ملی، خەریک بوو ماچیبکەم، خەریک بوو بنوشتێمەوە و توند پێڵاوەکانی بگرم و بڵێم بمبورە. بەڵام نەمکرد، بە هێمنی تەماشامکرد و گووتم «بۆ کوڕی من؟ بۆ دەتەوێت

بچیت بۆ جێگایەک مردنی لێبێت؟...». بەسەرسامییەوە گووتی «سەرۆک بمبورە من دەچم بۆ جێگایەک ژیانی لێبێت... ژیان... مردن لێرەیە، گەورەم جگە لە جەنگ چ ژیانێکی تر هەیە من بۆی بژیم، جگە لە جەنگ چ شوێنێکی تر هەیە ژیانی تیابێت؟». دڵنیانەبووم ئایا دەیەوێت ئازارمبدات و لە ناو هاوڕێکانیدا بمکات بە گاڵتەجاڕ، یان بەڕاستێتی. من لەو ساتەدا چەند سەرسامی ئەوە بووم کە ئەمە کورمە و ناتوانم باوەشی پیابکەم، کوڕمە و ناتوانم بانگیبکەم... چەندە سەرلێشێواوی داگیرسان و کوژانەوەی خۆم بووم، سەرسامی ئەو قسانەش بووم کە ئەو بێباکانە دەیکرد. ئەو منی نەدەناسییەوە لە دەنگیدا ڕق و قیز و وەڕزییەک هەبوو تەنیا من هەستم پێدەکرد... بە حورمەتێکی زۆرەوە قسەیدەکرد، بەڵام وەک ئەوەبوو ئێمە فریوبدات و خۆشییەکی گەورەش لەوە ببینێت کە ئێمە بزانین فریوماندەدات، لەوەدا ڕاستگۆ بوو کە دەیویست بچێت بۆ جەنگ. بەڵام هۆکەی ئەوەنەبوو حەزی بە جەنگە، بەڵکو گاڵتەی بە ژیان دەهات. بە جۆرێک تەماشایدەکردم تێگەیشتم من و ئەو تا کۆتایی یەکتری ناناسینەوە، چاوانی پڕبوون لە گاڵتەکردن بە ئێمە و بە ژیان. موزەفەر گەر بیزانیبایە من باوکی ئەوم سەرگەردان تر دەبوو... من دەستم خستە سەر شانی و بەکورتی گووتم «بڕۆ، بۆ هەر کوێ دەتەوێت بڕۆ... بەڵام ئاگاداری خۆت بە».

هیچ هەستێکی نەبوو کە من باوکی ئەوم، گەر ناوەکەشی نەبایە من نەمدەناسییەوە... وەک ئەوەبوو هاتبێت پێمبڵێت «هیچ شتێک من بە تۆوە نابەستێت» پێمبڵێت «ئەمە ئەو ژیانەیە کە تۆ بۆ ئێمەت دروستکردووە و منیش بێباکانە تیادەژیم، بەڵام لە دڵمدا گاڵتەیەکی تاریک و قیزێکی ڕەشم بەرامبەر بە تۆ و هەموو ئەم دونیایە هەڵگرتووە». موزەفەری سوبحدەم بەر لەوەی بڕواتەدەرێ بە هەمان وشەی پڕ ویقار و حورمەت، بەڵام لەهەمان کاتدا پڕ لە قیز و گاڵتە گووتی «مردن لە پێناوی

ئەم نیشتیمانە پاکەدا، لە پێناوی ناو و دەسەڵاتی ئێوەدا شەرەفێکی گەورەیە. من زۆر شاد و کامەرانم کە بە شەرکەرێکی خۆتان منتان قبووڵکردووە و نانمدەدەنێ». قسەکانی هەموو کاڵتەیەکی گەورەبوون بە من، موزەفەر هاتبوو پێمبڵێت من بۆیە جەنگت بۆدەکەم، چونکە هیچی تر نییە بیکەم. ئەو شەوە من نەخەوتم، لە بنکەکەی خۆمدا خۆم نەگرت. وەک شێت کەوتمە چیاکان، تابەیانی لە بن درەختێکدا دانیشتم و گریام... پازدە ساڵ بوو نەگریابووم، دەزانی چەند خراپە مرۆڤ ماوەیەکی ئاوەها درێژ نەگری. بۆ بەیانی هەزاران نامەم نوسی، بۆ دوژمنەکانم، بۆ دۆستە نزیکەکانم، بۆ وڵاتە دوورەکان... هەزار نامەم بە دونیادا بڵاوکردەوە و داوای ئاشتیم کرد... بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە، موزەفەر هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە».

یاقوبی سنەوبەر دەچووە بەر پەنجەرەکە، چەند جارێک دەستیدەبرد بیکاتەوە و پەشیماندەبووەوە. بە ئارامی تەماشایدەکردم، من بۆئەوەی نەهێڵم ئەو شەوەمان زۆر درێژبێتەوە، گووتم «یاقوب ئەو کوڕەی تۆ بینیوتە سەریاسی دووەمە. من ناوی دەنێم سەریاسی دووەم... ئەو ئێستا دیلە». بە غەمگینییەوە گووتی «دەزانم... دەزانم... من هەموو شتێک دەزانم، بۆیە تۆم هێناوە تا تکات تیابکەم کە نەزانێت من باوکی ئەوم، تازە لە نێوان من و ئەودا جگە لە قێز و پەشیمانی هیچی تر نییە... ڕەنگە ڕۆژێک لەگەڵ دیلێکدا بیگۆڕمەوە، بەڵام لەگەڵ ئەودا ناتوانم بیر لە دروستکردنی خەڵوەت بکەمەوە... ئەو بەکەڵکی خەڵوەتەکانی من نایەت... ». دەهاتە نزیکمەوەو دەیگووت «منیش مەحکومم بەوەی بەتەنیا بیر لە مردنی خۆم بکەمەوە... بەتەنیا».

من دڵنیامکردەوە و پێمگووت «یاقوبی سنەوبەر مەترسە. سەریاسی بچوک، کە لە زیندان هاتەدەرێ، ناوی خۆی دەگۆڕێت و دەچێت بۆ مەملەکەتێکی تر».

هەناسەیەکی غەمگینی هەڵدەکێشاو دەیگووت «ئەی تۆ چی دەکەیت... ئەی تۆ؟».

پێمگووت «من دەڕۆم. لەگەڵ دواهەمین سەریاسدا دەڕۆم بۆ خۆرئاوا...». بە غەمگینییەوە دەیگووت «من هەموویان بۆ تۆ جێدەهێڵم. هەموویان بۆ تۆ جێدەهێڵم و دەچم بۆ دۆزەخ».

لە منداڵییەوە وابووین ئەو شتەکانی خۆی بۆ من جێدەهێشت و من شتەکانی خۆم بۆ ئەو.

دەستمدەخستە سەرشانی و دەمگووت «یاقوبی سنەوبەر بەجێیانبهێڵە بۆ من و مەترسە. بەجێیانبهێڵە بۆ من و ئاسوودەبە. من داوای هیچیان لێناکەم. تۆ داوای شتێکی ئەستەمیان لێدەکەیت، من داوای هیچیان لێناکەم... تێمدەگەیت دەڵێم چی؟ ها تێمدەگەیت... مەبەستم لە باوکایەتییە. تۆ دەتەوێت ئەو منداڵانە دان بە باوکایەتی ئێمەدا بنێن، بمانناسنەوە، تێمانبگەن، شتێک هەبێت لە نێوانماندا... نا من داوای هیچیان لێناکەم... من داوای هیچییان لێناکەم. من لە سەحراوە، لە بێدەنگی لمەوە فێربووم چاوەڕوانی هیچ وەڵامێک نەکەم. من تەنیا خۆمیان بۆ تەرخاندەکەم و هیچی تر... من و تۆ هیچ مافێکمان نییە داوای هیچ بکەین... هیچ مافێکمان نییە». وەک ئەوەی تەوقەی ماڵاواییم لەگەڵدا بکات دەستی دەگرتم و دەیگووت «من دەمتوانی هەموو شتێک بکەم، ئەوە نەبێت کە خۆمیان بۆ تەرخانبکەم... ئەگەر جارێکی دیش هەمان ژیان بژیمەوە لەگەڵ هەموو پەشیمانییەکانمدا ناتوانم خۆمیان بۆ تەرخانبکەم. نا ئەوە من نیم کە خەڵکان وندەکەم، من نیم کە منداڵەکانی خۆم فەرامۆشدەکەم، ئەوە ڕێگاکانن لەیەکتر جیادەبنەوە... ڕێگاکانن... برام ڕێگاکان».

لەو ساتەدا ئارەزوویەکی قووڵم هەبوو باسی دواهەمین هەناری دونیای بۆبکەم، باسی ئەوەی بۆبکەم ئەو کوڕانە درەختێکیان هەبووە کە درەختی

خـەون و ئومێـد و ئیلهامەکانیـان بـووە، درەختێـک لـەو کۆشـکەی ئـەو سـیحراویتر و کراوەتـر بـووە، بـەڵام هەسـتمدەکرد ئارەزوویەکی ڕاسـتەقینەی نییـە گـوێ لـە چیرۆکـی ئـەوان بگرێـت. ئـەو هەسـتیدەکرد چیتـر لـە نێوان ئـەو و سـەریاسـەکاندا هیـچ شـتێک نەمـاوە و هیـچ شـتێک نابێـت.

سـەری بەرزدەکـردەوە و قـووڵ تەماشـای نیگاکانـی منـی دەکـرد، وەک ئـەوەی بـۆ دواجـار سـەیری چـاوم بـکات، بیەوێـت دوا سـەرەنجەکانم بخوێنێتـەوە. دەیڕوانـی و دەیگـووت «مـن ئومێـدم هەبـوو بەبـێ منیـش بچنـەوە سـەر ڕێـگای یـەک... بـەڵام سـەردەمێکی تاریـک بـوو، موزەفـەر سـەردەمێکی تاریـک. گـەڕان لـە دوای ئەوانـی تـر لـە تاریکیـدا مانـای نییـە، گـەڕان لـە تاریکیـدا بـەدوای شـتێکدا کـە نەتبینیـوە مانـای نییـە».

بـە غەمگینییـەوە دەسـتم دەگـرت و دەمبـردەوە سـەر جێگاکـەی یەکەمجـاری و پێمدەگـووت «بـەڵام مـن بـە دوایانـدا دەگەڕێـم، مـن هیچـی تـرم نییـە بیکـەم، جگـە لـەوەی بـە دوایانـدا بگەڕێـم، تـۆ کـاری تـرت زۆرە، یاقوبـی سنەوبەر کاتـی تـۆ تەنیـا بەشـی ئـەوەدەکات حوکمـی دونیابکەیـت، نـەوەک لـە تاریکییـدا دوای شـتێک بکەویـت کـە نایناسـیت». وەک پیرەمێردێکـی نەخـۆش دەکۆکـی، بەجۆرێکـی هێنـد سـەیر دەکۆکـی دەترسـام بمرێـت. بـەدەم کۆکـە و خیـزەی سـنگییەوە، بـەدەم پاککردنـەوەی گـەروو، سـڕینی دەموچاوییـەوە دەیگـووت «کاتـی مـن تەنیـا بەشـی حوکمکردنـی دونیایەکـی درێـودەکات. مـن مەجبـورم حوکمـی ئـەم دونیـا ناشـیرینە بکـەم، لەبـەر ئـەوەی دونیـا وایـە... دواجـار دەبێـت یەکێـک هەبێـت حوکمیبـکات، دەبێـت ئـەوەی حوکمیـدەکات وەڕزبێـت، دەبێـت کـەوەڕز بـوو مەعشـوقەی حەرامـی هەبێـت، دەبێـت کـە شۆڕشـیکرد حەرامـزادەش بخاتـەوە، دەبێـت توانـای هەبێـت حاشاشـیان لێبـکات، بیانـکات بە ژێـرەوەو بیانخاتـە ژوورە تاریکەکانی ژیانـی خۆیـەوە، هەقـی خۆشـییەتی نەیەوێـت کـەس جارێکـی تـر ئـەو ژوورە تاریکانـە ڕۆشـنبکاتەوە... هەقـی خۆیەتـی. حوکمکردنـی دونیایەکـی وا درێـو

مافی گەورە و سزای گەورەشی هەیە، موزەفەری سوبحەدەم، حوکمکردنی وڵاتێک تاعوون لێیداوە، لەزەتێکی زۆر و ئازارێکی زۆریشی هەیە، من هەردووکیانم تا سەر ئێسقان چەشتووە».

هاوڕێیانی شەو و دەریا... ئەو شەوە، ئەو دەیویست بۆ هەتاهەتایە بخەوێت و من دەمویست لەخەو هەستم. توند دەستیگرتم و گووتی «دەمەوێت بخەوم، بە ئاسوودەی بخەوم، ئەوەی حوکمی دونیا بکات دەبێت بە ئاسوودەیی بخەوێت».

بە هێمنی چووە ژێر بەتانییەکەیەوە، من لەتەنیشتییەوە دانیشتم و گووتم «یاقوبی سنەوبەر من دەڕۆم، بە پاسەوانەکانت بڵێ، ڕێگام لێنەگرن... من دەڕۆم، دەبێت من درێژە بەو ڕێگایەی خۆمبدەم».

گووتی «منداڵی من و تۆ بوون، منداڵی هەردووکمان بوون. هیچ کەس ئەوە نازانێت من نەبێت. بۆئەوەی لە دۆزەخ ڕزگاریانبکەم لە خۆمم دوورخستنەوە. ئەوان لەگەڵ ئەوانی تردا ڕۆیشتن، چوون بۆ شوێنێک کە من و تۆ نازانین کوێیە... وەک چەند گەڵایەک بابردنی، بابردنی و تەواو».

بە هێمنی گووتم «هەموو کەسێک پاشماوەیەک، هەناسەیەک، نیشانەیەک بەجێدەهێڵێت. من بەدوای ئەو نیشانە و هەناسانەدا دەگەڕێم کە ئەوان جێیانهێشتووە... بەڵام یاقوب گوێبگرە، نامەوێت جارێکی تر لەدەستت هەڵبێم، بە پاسەوانەکان بڵێ دەرگاکانم بۆبکەنەوە».

وەک ئەوەی بخەوێت، چووەوە ناو جێگاکەی و گووتی «موزەفەری سوبحەدەم تۆ ئازادی، تۆ هەمیشە ئازادبوویت، بڕۆ هەموو پاسەوانەکان دەزانن تۆ ئازادی... دەزانن من و تۆ نالکێینەوە بەیەکەوە... بڕۆ موزەفەری سوبحەدەم ماڵاوا... من چاوەڕێتدەکەم، گەر ڕۆژێک گەڕایتەوە، پێکەوە قسە لە مردن دەکەین... حەزدەکەم من و تۆ پێکەوە بمرین... چاوەڕێتدەکەم... موزەفەری سوبحەدەم... چاوەڕێتدەکەم».

بێئەوەی ماڵاوایی لێبکەم، لەدەرگای ئەو ژوورە هاتمەدەرێ، خۆم لە حەوشی کۆشکێکی گەورەدا دۆزییەوە، لەویادا هەستمکرد یاقوب لە کۆشکێکدا دەژی لە وەهم، کە هاتمەدەرێ ئەو وێنە سەیرانەی ساڵانی شۆڕشم هاتەوەیاد، هەستم بەبایەکی خێراکرد هەڵدەکات، هەستم بە جوڵەیەکی سامناککرد لە درەختەکاندا، سەدان باڵندەم بینی لەو حەوشەیەدا سەرگەردان بە هەمولایەکدا هەڵدەفڕن، هەستێک بوو ساڵانێک لەوەوبەر لە چیاکان تاقیمکردبووەوە، ئەوکاتانەی یاقوب پێشمەرگە غەمگینەکانی کۆدەکردەوە و لە ناو دارستان و ئەشکەوت و بنترۆپکەکاندا باسی ئازادی و دادپەروەری بۆدەکردن. من سەرلێشێواو لە حەوشێکی گەورەدا تکام لە پاسەوانەکان کرد، ڕێگام نیشانبدەن، ئەوان دەرگاکەیان لێکردمەوە و ڕێگایان نیشاندام. لەبەردەرگاکە گوتم «خودایە، نامەوێت لەگەڵ ئەودا بمرم... نامەوێت». بەڵام ئێستاش کاتێک قسەکانی ئەوم دێتەوە گوێ ترسێکی گەورە دامدەگرێت... ترسێک وادەکات لەبەر خۆمەوە بڵێم من نامرم... من دان بە هیچ مردنێکدا نانێم، نە مردنی خۆم و نە مردنی سەریاسەکان... ئەوەی دان بە مردندا نەنێت دەبێت تا کۆتایی بۆ ئەو زیندووانە بگەڕێت کە ونیاندەکات. دۆستان گوێبگرن... ڕێگای ئەوانەی کە دان بە مردندا نانێن جیاوازە، ڕێگایەکی درێژترو ئاڵۆزتر... ڕێگایەکە لە ڕێگای من دەچێت لەنێوان بیابان و دەریادا، ئەوانەی کە دان بە مردندا نانێن مەحکومن بەوەی یارییەکی قورس لەگەڵ ژیاندا بکەن، مەحکومن بەوەی هەموو زەوی بە دوای کەس و هاوڕێ و هاوجنسەکانیان بکەون و دڵنیابن کە جارێکی دی ئەوانی دی لە شوێنێکی دیدا دەدۆزنەوە.

## ٢٠

هەفتەیەک دواتر بەیانی زوو، لەسەر دەنگی خوشکە سپییەکان بەئاگاهاتمەوە کە وەک دوو ستونی نور لە ناو دەرگاکەدا وەستابوون و چاوەڕوانی هەستانی منیان دەکرد. بڕیاربوو ئەو ڕۆژە بۆ دواجار بچمە سەر گۆڕی سەریاسی یەکەم و سەر گۆڕی محەمەدی دڵشوشە «ئەو کوڕەی لەناو تەپوتۆزی سەفەرەکانیدا دەژیام». بڕیاربوو دوا شەویش لەگەڵ ئیکرامی کێودا ببەمە سەرو بەیانی زوو بەرەو خۆرئاوا بکەومەڕێ. تاکە شتێک لە گیرفانمدابوو ناونیشانی خەستەخانەیەک بوو لە ئینگلستان، کە دەبێت ئێستا دواهەمین سەریاس لەوێ بێت و لە پەنجەرەکانەوە سەیری ئەستێرە بکات.

ئەو ڕۆژە ڕووناکی و نوری خوشکە سپییەکان لە بەیانییەوە تا ئێوارە هاوڕێمبوون، لەو باوەڕەدانەبووم بتوانن بەو نیگا ساردانەی خۆیانەوە بەوجۆرە بگرین. ڕۆیشتنی من کۆتایی بە ڕۆژگارێکی دی لە ژیانیاندا دەهێنا کە وەک هەندێک ڕۆژی غەمگین و جوان تەماشایاندەکرد. ئەوان سووربوون لەسەر ئەوەی من دوای سەراب کەوتووم. سووربوون لەسەر ئەوەی بڵێن من یارییەکی بێکۆتا دەکەم. ئەوان هەمان ئەو ڕۆژە گەڕانەوە بۆ سەر هونەرێکی کۆن و لە یادکراوی خۆیان «دەست خوێندنەوە» و بە منیان گووت لە دەریادا وندەبم. ئەو ڕۆژە من

پێدەکەنیم و دەمگووت «گەر لەدەریاشدا ونبم، هەر دەبێت بڕۆم». کە بە کۆمەڵێک گوڵ و بوغرد و مۆمەوە چووین بۆ سەر گۆڕی سەریاس لە ڕێگا بە خۆیان و سەرپۆش و نیگا سپییەکانیانەوە، جار دوای جار پێیاندەگووتم «مەڕۆ با لەو دەریایانەدا وننەبیت... مەڕۆ... تۆ هیچت دەستناکەوێت». لاولاوی سپی، ئەو کیژە ئاسکەی لە پەرییەک دەچوو لە ئاسمان تۆرابێت، زووزوو دەیگووت «باوکی سەریاس، تۆ بەهیوای چیت؟ بایەک چەندین ساڵ لەوەوبەر هەندێک لمی وردی بە دونیادا پەرش و بڵاوکردبێتەوە، ئێستا کۆناکرێنەوە». شادەریا دەیگووت «من و لالای سپی... شاشای چکۆلانەی خۆت و خوشکە غەمگینەکەی تا دەمرین لە خزمەتدا دەبین، خۆت دەزانی ئێمە هەتا هەتایە شووناکەین، ئێمە کچی پاکیزەی تۆین و تا مردن لەگەڵماندا بەو لەگەڵتدا دەبین... سەیرکە دەشتەکان چەند جوانن، ئاو چەند جوانە، منداڵە چکۆلەکان چەند جوانن، ئەو مەڕو مریشک و مراوییانەی خۆت بە خێویاندەکەیت چەند جوانن. شاشای خۆت و لالای سپی خۆت لێرەن، مەرج نییە کە لە لم و بیابان حاڵی بوویت ئیتر ئاسان بێت، لە شوێنی تر بڕوێیت... من خەوم بینیوە، مەڕۆ... خەوم بینیوە تۆ لە دەریادا وندەبیت. خەوم بینیوە.». لاولاوی سپی دەستی دەکرد بە قوڵمدا و دەیگووت «باوکی سەریاس، تۆ و ئێمە هەموو هەفتەیەک دێینە سەر گۆڕی سەریاس، دێینە سەر گۆڕی ئەم کوڕەی تۆ، ئەمە کوڕی تۆیە، من دەزانم، ئەو هەموو شتێکی لە تۆ دەچوو، هیچ کەسێکی تر کوڕی تۆ نییە ئەو نەبێت. دوای هیچی تر مەکەوە».

من دەستمدەکردە ملی هەردووکیان و دەمگووت «من چووم بۆ بن دواهەمین هەناری دونیا، ئەو کوڕە سووتاوەم کۆڵکردو چوومە ژێر ئەو درەختە، لەوێ سوێندمخوارد و پەیمانێکی گەورەم بەست کە

دوای چارەنوسی ئەو منداڵە سووتاوە بکەوم. ئەو تەنیا زیندووەیەکە بۆ من ماوەتەوە. ئێوە دەزانن من ئێوەم چەند خۆشویست... تاهەتاهەتایە شتێکی نائاسایی و جوانتان لە مندا چاند، منتان فێرکرد شتێک هەیە ناوی مرۆڤە، شتێکی نازک و دڵگەورەو هەیە، مەخلوقێک هەیە کە دەبێت بەوەفابێت بۆ هاوجنسەکانی خۆی... ئێوە منتان لە بیابان دەرهێنا، تا نەهاتمەماڵی ئێوە، تا ئێوە چیرۆکی سەریاسەکانتان بۆ نەگێڕامەوە، تا ئێوە منتان بەو سەردەمانە ئاشنانەکردەوە، من هەر لە بیاباندا بووم. ئەمڕۆ کە توانیومە قاچێک بخەمەوە ناو ژیان، واملێهاتووە لە گەڵاو درەخت نەترسم، بە هۆی ئێوەوەیە. من قەرزارباری ڕووناکی ئێوەم، هیچ کەسێک نییە لەگەڵ ئێوەدا بژی قەرزارباری جوانی و ڕووناکی و لێبوردنتان نەبێت. بەڵام وەفاداری ئینسان بۆ ئینسان لە هەموو شتەکان گەورەترە. مرۆڤ دەبێت قەرزەکانی خۆی بداتەوە... وانییە مرۆڤ دەبێت قەرزەکانی خۆی بداتەوە؟». خوشکە سپییەکان لەو پێدەشتەدا بە کراسە سپییەکانیانەوە دەگریان و دەیانگووت «تۆ قەرزارنیت، مەڕۆ، تۆ ناگەیتە ئینگلستان... ئێمە دەزانین... خەونمان پێوە بینیویت... شێخی غەم، باوکی ئازارەکان... تۆ ناگەیتە ئینگلستان... لەوێ لە دەریادا وندەبیت... مەڕۆ». من و ئەوان جەنگ و جەدەلێکی شیرینمان کرد... هەمیشە لەگەڵ ئەواندا لە جەنگ و جەدەلی شیریندا بووم. من تاکە کەسێک بووم کە دەمگووت ئەم چیرۆکە دوایی نەهاتووە. هەموو ئەوانی دی دەیانگووت، تەواو حیکایەتی سەریاس و مردنەکانی دواییهاتووە.

ئەو ڕۆژە لەسەر گۆڕی دواهەمین سەریاس تێر گریام... هێند گریام بە هیچ شتێک ئارام نەدەبوومەوە، ماڵاواییکردنم لە گۆڕی پرۆفیسۆری شەوە تاریکەکان، فیغان و فرمێسکێکی گەورەبوو. ئەوان لەگەڵمدا

دەگریان و دەنوسان بەدامێنمدا و دەیانگووت مەڕۆ. من دەگریام و دەمگووت «دڵی ئەم مردووە، ژیانی ئەم، هەناسەکانی لێرە نین، بەڵکو لە ناو دڵ و ژیان و هەناسەی دواهەمین سەریاسدان... ئەو لە بری هەموو سەریاسەکانی تر دەژی... من دەبێت دوای زیندووەکان بکەوم... دوای زیندووەکان». بەجۆرێ دەگریام، هەستم بەلەرینەوەی ئاسماندەکرد لەسەر سەرم، هەستم بە دڵی پەژموردە و برینداری خوشکە سپییەکان دەکرد کە دەیانگووت لەدوای تۆ ئێمە دەبین بە دوو پیرە کچی غەمگین کە چ یادگار و چ کەسێک نابێت دڵمان خۆشبکات. هاوڕێیانم، ئەوان دوو کچبوون هەمیشە لە ڕابوردووی خۆیاندا دەژیان... لەم سەردەمدا ئەستەمە ئافرەتێک بدۆزیتەوە تەنیا بۆ ڕابوردوو بژی، بەڵام ئەوان وابوون بۆ ئەو ڕابوردووە بچکۆلەیەی خۆیان دەژیان. منیش بۆ ئەوان بەشێک بووم لەو ڕابوردووە، سیما و ڕوخساری من وەک سیمای ئەو سەردەمەبوو کە هێدی هێدی دەڕۆیشت و خوشکە سپییەکانی جێدەهێشت، ئەو خوشکانەی دەبوونە بەشێک لە چیرۆکێکی کۆن... چیرۆکێک نەیاندەتوانی لێیجیاببنەوە و خیانەتی لێبکەن.

لەسەر گۆڕی محەمەدی دڵشوشە هەمان ئازارم لە سیمایاندا بینی، هەرسێکمان کێلەکانی گۆڕەکەمان ماچکرد. هەرسێکمان بەدەنگی بەرز پێماندەگووت «محەمەدی دڵشوشە، خۆشماندەوێیت». کە هەستاین گۆڕەکەی جێبهێڵین هەرسێکمان وەک بایەکی فێنک، وەک شنەیەکی نهێنی لە هەودا هەستمان بە سامالّی ڕۆحی کرد. کەسەیری چاوی هەردووکیانم کرد بە غەمگینییەوە گووتیان «خواجای برینەکان، دوای ساڵەها بیرکردنەوە لەم کورە ئێستا هەستدەکەین خۆشماندەوێت، هەستدەکەین لەیەکەم چرکەوە کە بە جلە تەڕەکانییەوە لە سەر ئاوەکان وەستابوو، خۆشمانویست، مەحەبەتمان بۆی هەبوو، بەڵام

مەحەبەتێـک هیچـی پێناکرێـت، مەحەبەتێکـی بێکەڵـک و بێپاشـەڕۆژ».
من دەسـتی خوشـکە سـپییەکانم گـرت و بردمـن... دەسـتمگرتن و بردمـن و گووتـم «لـەم گـۆڕە دوورکەونـەوە... ئـەم گـۆڕە نائومێدتـان دەکات، ئازارتانـدەدات...» لـە قووڵایـی دڵمـەوە دەمویسـت هەسـت بـە گونـاه نەکـەن... دەمویسـت بـە یەقینـەوە پاکـی خۆیـان بژیـن.

من ئێستاش هەمـوو شـەوێک کـە سـەیری دەریـا دەکـەم دەڵێـم «ئـەی دەریـای گـەورە، ئـەی ئەسـتێرەکان کۆمەکـی ئـەو دوو خوشـکە بکـەن، با بـە یەقینـەوە پاکـی خۆیـان بژیـن...» بەدەریـا دەڵێـم «هەمـوو ئـەم چیرۆکـەی مـن بـۆ تـۆ و ئـەم پەنابـەرە وێڵانـەی دەگێڕمـەوە گوناهبارێکـی تیـا نییـە. ئـەی دەریـای گـەورە، ئـەی شـەپۆلە خەوتـووەکان، مـن چیرۆکێـک ناگێڕمـەوە، گوناهبـاری گـەورەی تیابێـت... ئیـدی چـۆن دەشـێت خوشـکە سـپییەکان، فریشـتە دڵڕۆشـنەکانی مـن گوناهباربـن... مـرۆڤ خـۆی مەخلوقێکـی ناسـکە... ئاه خودایـە کـە مـرۆڤ بوونەوەرێکـی برینبـەرە». ئـەو ڕۆژە کـە لەسـەر گـۆڕی محەمـەدی دڵشوشـە دەسـتی خوشـکە سـپییەکانم گـرت، هەسـتم بـەو ناسـکییە ترسـناکە کـرد، هەسـتمکرد ئەوانیـش دوو مەخلوقـن لـە شوشـە. دوو مەخلوقـن گـەر بـەر هـەر شـتێک بکـەون دەشـکن... خودایـە کـە ترسـام... کـە ترسـام. ئێـوە نازانـن بـە چ سـامێکەوە ئەوانم لـەو گـۆڕە دوورخسـتەوە و پێمگووتـن دەبێـت ئـاگاداری خۆتـان بـن... ئـاگاداری دڵـی خۆتـان بـن... ئـاگاداری لەشـتان بـن... ئێـوە دوو کچـن لـە شوشـە... دوو کچـن لـە شوشـە.

ئـەو ڕۆژەی لـە نیشـتیمان هاتمـە دەرەوە، لـەو سـاتەدا کـە خوشـکە سـپییەکانم بەجێهێشـت ئـەو بیرۆکەیـەم تیـا سـەوزبوو کـە ئـەوان لـە بزربوونـی منـدا دەشـکێن. ئـەو ترسـە تـا ئێسـتاش لەگەڵمدایـە، ئـەو ترسـەی گـەر ڕۆژێـک لـە ڕۆژان گەڕامـەوە بـۆ نیشـتیمان، دەترسـم

ئەو دوو کچە وەک دوو بوونەوەری شوشەیی پەراش بووبن و تۆزێکی سپییان جێهێشتبێت تا من یان هەر یەکێکی تر لە ناویدا ونببین. لەو ساتەوە کە لە سەر گۆڕەکەی دڵشوشە هەستاین من سات بە دوای سات پتر وەک دوو گیانی شوشەیی دەمبینین. وێنەکەیان لەبەرچاوم بوو، وێنەی دوو کچ وەک تەم کاڵدەبنەوە و کاڵدەبنەوە و دەبنە تۆزێکی نەرم، تۆزێک بادەیبات و بەسەر ئەو زەمینەدا بڵاویدەکاتەوە. دوو کچ لەهەوادا دەتوێنەوە، تێکەڵ بە تەمی ئێوارەیەک دەبن و ئیتر نایەنەدەرێ، دوو کچ لە دوای خۆیان تەنیا دوو ڕەفتەی ڕەش جێدەهێڵن، کە ڕەفتەی وەفایانە بۆ سەریاسی مەزن. ھاوڕێیان من بەو هەستە ترسناکەوە ماڵاواییم لە خوشکە سپییەکان کرد، بەو هەستەوەی کە ئەوان دەشکێن و من نایانبینمەوە، ئەوان لەترسی شکان هێز و توانایەکی گەورەیان خەرجدەکرد، پەیمانێکی هەتاهەتاییان مۆرکردبوو تا نەشکێن، وەڵامی عەشقیان نەدەدایەوە تا نەشکێن، پێویستیان بە برایەکی هەتاهەتای هەبوو تا نەشکێن، لە شار هەڵدەهاتن تا نەشکێن... من لە یەکەم شەومەوە لە دەریادا ئەو ترسەم تیادەژی کە ئەوان شکاون، ئەوان چوونەتە ناو ئەو تەم و تۆز و تاریکییەوە کە جوانییەکانی تیا نوقمدەبێت.

بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە کە من خۆم بۆ سەفەر ئامادەدەکرد ئەوان جانتاکەیان بۆ ئامادەدەکردم، بەدەنگێک کە بەردەوام نازک و نازکتر دەبووەوە گۆرانیان دەگووت، هەستمدەکرد لەگەڵ هەموو غەمە گەورەکانی خۆیاندا هەوڵدەدەن دوا سەعاتەکانی من لەگەڵ ئەواندا شاد تێبپەڕێت، هەر ئەو ئێوارەیە دوو گوڵی سپییان بۆ هێنام کە خۆیان لە قوماش دروستیانکردبوو، دوو گوڵ خستیانە ناو جلەکانمەوە تا لەیادیاننەکەم. هەر ئەو ئێوارەیە لالای سپی بە خۆی و گوڵدانێکی زیو و هەناره شوشەکەوە هات، هەمووتان ئەو گوڵدانە

زیوەتـان لـە یادە کـە محەمـەدی دڵشوشـە لەسـەر لافـاوەکان گرتییـەوە و لەئێـوارەی بارانەکانـی مردنیـدا پێشـکەش بـە خوشـکە سـپییەکانی کـرد، ئـەوە گەورەتریـن یـادگاری ئـەو کوڕەبـوو، ئـەوان ئـەو گوڵدانەیـان پێشکەش بەمن کرد، تـا لەگـەڵ خۆمـدا بـە زەوی و دەریاکانـدا بیگێـڕم، هەنارە شوشـەکەی لـە پەڕۆیەکـی مۆری قەشـەنگەوە و پێچابـوو و گووتـی «ئەوەیـان هەنـاری تۆیـە، تـۆش وەک ئێمـە ئـەوت خۆشـدەوێت، خودایـە بتوانێـت لـەم سـەفەرەدا یارمەتیتبـدات و لـە دەریـادا وننەبیـت». مـن هـەردوو یادگارەکـەم خسـتە نـاو جانتاکـەوە و ناوچاوانـی لاولاوم ماچکـرد و گریـام.

شـەو ئیکرامـی کێـو هـات، وەک هەمیشـە قـووڵ بەڵام بێدەنـگ و غەمگین بـوو. ئەویـش چەندەهـا جـار پێیگووتـم «لـە دەریـادا ئـاگاداری خـۆت بـە». مـن لیسـتێکی درێـژ هیـوا و داواکاریـم بـۆ بەجێدەهێشـت، لیسـتێک تەنیـا لـە توانـای فریشـتە گەورەکانـدا بـوو غەمیبخـۆن. لەبەردەمیـدا نوشـتامەوە و حـەرف حـەرف چیرۆکـی ئـەو ڕۆژانـەم بـۆ گێڕایـەوە، چیرۆکـی سـەرکەوتنم بـۆ لای سـەید جەلالـی شـەمس، چیرۆکـی چوونـم بـۆ خەسـتەخانەیەکی تاریـک و بێدەنـگ و ترسـناک، چیرۆکـی دۆزینـەوەی دواهەمیـن سـەریاس بـە سـووتاوی، بەسـەرهاتی گیرانـم و دیـدارم لەگـەڵ یاقوبـی سـنەوبەردا، حیکایەتـی سـەرکەوتنم بـۆ بـن دواهەمیـن هەنـاری دونیا و مۆرکردنـی سوێندێکی ئەبـەدی، هەمـوو ئـەو شـتانە لـە ماوەیەکـی کورتـدا ڕوویانـدا بـوو. ئـەو سەرسـامانە تەماشـایدەکردم و دەیگـووت «بـۆ مـن لـەو سـاتانە بێبەشـدەکەیت... بـۆ؟ چەنـدە جـوانَ بـوو مـن ئـاگاداری هەمـووی بـم». دواهەمیـن شـیومان پێکـەوە خـوارد، دواهەمیـن سـفرەمان پێکـەوە کۆکـردەوە، بۆنـی دواهەمیـن ماڵاوایـی لـە دواهەمیـن دانیشـتنمان دەهـات. مـن پێمگـووت «ئیکرامـی گـەورە، دەبایـە ئـەو شـتانە هەمـووی مـن بیانکـەم، دەبایـە تـاک و تەنیـا وەک یەکێـک کـە چارەنوسـی خـۆی بخاتـە

سەر دەستی و بە مردندا بفڕێت، هەموو ئەو شتانە خۆم بیانکەم... ئەوانە ڕێگای تاک و تەنیای من بوون، ئەو ڕێگایانە بوون کە هیچ کەس لە بری من نەیدەتوانی پیا بڕوات، مرۆڤ دەبێت بزانێت کامەن ڕێگاکانی خۆی، ڕێگای تاک و تەنهای خۆی کە کەسی تر لە بری ئەو بۆی نییە پیابڕوات... هەندێ ڕێگا لە ژیاندا هەن مرۆڤ گەر بە مردوویش بووە دەبێت لە قیامەتەوە بگەڕێتەوەو پیابڕوات، چونکە گەر بەو ڕێگایانەدا نەڕوات مردنی ناتەواو دەمێنێتەوە... منیش نامەوێت مردنم ناتەواو بمێنێتەوە». ئەو نیگای فریشتەیەکی بێدەنگی هەبوو، بەو جەستە گەورەیەی سێبەرێکی مەزنی هێنابووە ژوورەکەوە، شەرمی لەوە دەکرد سێبەرەکەی هێند گەورەیە ڕووناکی چراکان تا دوا ئەندازە کزدەکات. بەهێواشی چاکەی دەخواردەوەو دەیگووت «ئاگات لە خۆت بێت لە دەریادا... ئاگات لە خۆت بێت، خەڵک زۆر لەوێ دەخنکێن». وەک هەمیشە ئەو پشت و پەنای مەزنی من بوو، وەک هەمیشەی کیسەی پارەکانی دادەناو چی هەبوو دەیدامێ و دەیگووت «دەبێت لە ئەستەمبول کاریکەیت... ئاگات لە دزەکان بێت، ئاگات لە ڕێگاکان و دەریا بێت... کە گەیشتیتە ئەوێ ئاگادارمبکەرەوە». من دەمگووت «ئیکرامی هاوڕێم، من ئەرکی سەختت بەسەردا جێدەهێڵم... ئەرکی ئەوتۆ کە دڵنیام تەنیا تۆ دەتوانی جێبەجێیانبکەیت» ئەو بە غەمگینییەوە دەیگووت «هەر شتێک کە بکرێت دەیکەم... بەڵام من لەوێزەی هەموو ئازارەکان نایەم». پێمدەگووت «ئیکرام من دەزانم... دەزانم، تۆ چ فریشتەیەکی بەهێزیت، چ دڵێکت هەیە، من نامەوێت باسی جوانیت بکەم، دەزانم ئینسان بەتەنیا لە وێزەی ئازارەکان نایەت، تۆش کوڕی وڵاتێکیت مرۆڤە جوانەکانی هەمیشە تەنیان، کێشەکە ئەوە نییە ئێمە دەتوانین یان نا... ئەوەیە کە دەبێت بەبێدەنگی شتێک بکەین. شتێک ناوینانێم شەڕ، چونکە شەڕ

ئازارەکانی دونیا گەورەتر دەکات، شەڕ ئەگەر دژی هەموو خراپەکانیش بێت، دواجار بەجۆرێکی تر زەوی پڕدەکاتەوە لە ئازار، شەڕ ئەگەر ئەوپەڕی دادپەروەریش بێت، هەمیشە زەوی لێوان لێودەکاتەوە لە غەم. نا ئیکرامی کێو من قسە لە داد ناکەم، ئەگەر قسەم لەداد بکردایە دەبایە دوای بکوژانی سەریاسی یەکەم بکەوم، دوای ئەوانە بکەوم کە سەریاسی دووەمیان بەو دەردە برد، دوای ئەوانە بکەوم دواهەمین سەریاسیان سووتان، من قسە لە داد ناکەم، داد زۆرجار دڵڕەقترە لە ناداد. بەڵکو قسە لە شتێک دەکەم ناوی نییە، شتێک تا ئێستا مرۆڤ ناوی نەناوە. مرۆڤ دەبێت شتێک بکات، شتێک کە هەر کەسەو لە ژیانی خۆیەوە ئیلهامی بۆ وەردەگرێت... بەڵام ئیکرام من باسی چی دەکەم، من ئیلهامی ئەو شتانەم هەمووی لە تۆوە بۆ هات... ئیلهامی ئەو شتانەم لە تۆوە بۆ هات. نا ئیکرامی مەزن، من باس لە خۆتەرخانکردنی مرۆڤ دەکەم بۆ مرۆڤ».

من لەدوا ئێوارەدا بە هەمان شێوەی یەکەمین ئێوارە دەنگم بەرزدەکردەوەو دەمگووت «من شتێکی زۆرت بۆ بەجێدەهێڵم، خوشکە سپییەکانت بۆ بەجێدەهێڵم، سەریاسی دووەمت لەو زیندانە دوورەدا بۆ بەجێدەهێڵم، ئەدیمی شازادەت بۆ بەجێدەهێڵم کە من نەمبینیوەو بەبێ ئەو ئەم چیرۆکەم وەک هەموو چیرۆکەکانی دونیا ناتەواو دەمێنێتەوە، ئەستێرەی ڕەشت بۆ بەجێدەهێڵم ئەو منداڵەی دەبێت یەکێک لەو خەستەخانە تاریکە دەریبهێنێت، ئەو نەخۆشانەت بۆ بەجێدەهێڵم لە بەشی سووتاوەکاندا دونیا لە یادیکردوون. گۆڕی سەریاس و محەمەدی دڵشوشەت بۆ بەجێدەهێڵم کە لەبری من بچیتە سەریان، دواهەمین هەناری دونیات بۆ بەجێدەهێڵم».

ئەو بە بێدەنگی سەیریدەکردم و هیچی نەدەگووت. پێشتر بەدەگمەن قسەی لەو شتانەدەکرد کە دەیکات. ئەو شەوە تا بەیانی جگە

لەوەی لە دەریا ئاگاداریدەکردمەوە هیچی تری نەدەگووت. هەندێجار دەیگووت ناتوانم دڵنیاتبکەم، هەموو شتێک دەکەم، بەڵام ناتوانم دڵنیاتبکەمەوە. بەیانی کاتێک دوا ماڵاواییم لە خوشکە سپییەکان کرد، کاتێک ناوچاوانی هەردووکیانم ماچکرد و فرمێسک بە ڕوومەت و ڕیشمدا دەهاتەخوارێ، ئیکرام بەبێدەنگی دەستیگرتم و سوار ماشێنەکەی خۆی کردم و گووتی « بابڕۆین». لێتان ناشارمەوە نەموێرا دوا ئاوڕ لە خوشکە سپییەکان بدەمەوە، نەموێرا نیگای ماڵاواییان لێبکەم، دەبێت تێمبگەن، هەموو ئەم چیرۆکەی من لە ترسێکی گەورەوە لە ماڵاوایی سەرچاوەی گرتووە. ئەوان لەویادا وەستابوون، بای بەیان یاری بە قژیاندەکرد، ئەو قژەی ئێستاش هەستدەکەم لەسەر ئەم دەریایە لەگەڵمدا دەشنێتەوە، ئەو قژەی هەمیشە با بەرەو ئەوسەری دنیا دەیفڕاند. ئەوان لەبەردەممدا وەستان و من نەموێرا ئاوڕی ماڵاواییان لێبدەمەوە، نیگاکانیانم نەبینی، ئەوەی بینیم تەنیا قژێکی کێویی و بادۆست بوو، با لەگەڵ ڕێگاکەماندا دەیبرد و لە پشتیشیەوە پێکڕا سێبەری مانگی بەربەیان و تریفەی کۆتایی شەو هاودەم دەبریسکانەوە.

لەو جێگایەی کە لە ماشێنەکەی ئیکرام دابەزیم و سوار ماشێنێکی تر بووم بۆ سەر سنوور خۆر بە ئاستەم هەڵهاتبوو. من و ئیکرامی کێو لە ڕووناکی سەرەتای بەیاندا باوەشمان بەیەکدا کرد و گریاین، من وەک شێتێک گریام و ئەویش وەک خۆی بە ویقاری مەخلوقە ئاسمانییەکان فرمێسکی دەڕشت، ماوەیەکی زۆر یەکترمان بەرنەدا. شتێکی قووڵتر و سەیرتر لە هاوڕێتی لە نێوان من و ئەودا دروستبووبوو کە دەکرێت پێیبڵێم تێگەیشتنی مرۆڤ لە مرۆڤ. پێیبڵێم حاڵیبوونی ئەو لە ڕێگا پێچاوپێچ و شەوە تاریک و خەیاڵە لمینەکانی من.

لەدوا ساتدا بەمنی گووت «من دەبێت لەوێ بم، لەو دارستانەدا بم و چاوەڕوانبم چ تەیرێکی بیمار لە نزیکمەوە نیشتەوە تیماریبکەم».
ئەوە دواهەمین ڕستەی ئەو بوو، چاوی سڕی و دەسڕەکەی خۆیدایە دەستم، خوداحافیزی لێکردم و ڕۆیشت. من لە شوێنی خۆم دەگریام و جگە لە سێبەری ئەو کە ئەو جێگایەی پڕکردبوو، هیچی دیکەم لە جیهاندا نەدەبینی. کە بەجێیهێشتم هەستم بە ڕووتی و لاوازییەک کرد تا ئەم چرکەساتە لە جەستەم جیانەبۆتەوە. کە بەجێیهێشتم هەستمکرد ئیتر تاهەتاهەتایە تەنهام، بەڵام من و ئەو دوو ڕێگامان هەبوو، من دەبایە بەرەو دەریا بکەومەڕێ، دەبایە ئەو سەفەرە تەواوبکەم کەسەفەری من بوو.

ئاوەها بەرەو دەریا کەوتمەڕێ، ئاوەها دوای ئێستێکی کورت لەو شارەدا کە ئەو هەموو ڕۆحلەبەرانەی پێناساندم، لە بیابانە دوورەکانەوە بەرەو دەریا هاتم. ئەو شەوە کە لە پاترا سوار کەشتییەکان بووم، جانتاکەم هەر هەمان ئەو شتانەی تیابوو کە دەبایە تیابێت، جلەکانم، دوو هەناری شوشە کە سێهەمیانم بۆ هەتاهەتایە ونکردبوو، گوڵدانێکی زیو، کاسێتەکانی سەریاسی دووەم، ناونیشانی خەستەخانەیەک لە ئینگلستان کە دواهەمین سەریاس لەبەر پەنجەرەکانییەوە سەیری ئەستێرەکان دەکات، چڵێکی چکۆلانەی دواهەمین هەناری دنیا کە تا مردن لەگەڵ خۆمدا دەیگێڕم، پارچەیەک ڕۆژنامە بەوێنەی مارشاڵ و عەرەبانە چکۆلانەکەیەوە، دوو گوڵی سپی جاویدان، دوو گوڵ شەوانە بۆنی ئەو دوو کچە سپییە دەهێننەوە ژیانم.
لە ئەستەمبوڵەوە دواهەمین کاسێتی سەریاسی دووەمم بۆهات، منیش لە پاتراوە دواهەمین کاسێتی خۆم بۆ نارد. تا ئێستا کە من لەسەر ئەم کەشتییە وەستاوم و ئەم چیرۆکە دەگێڕمەوە ئەو لە

زیندانەکەی خۆیدا چاوەڕوانی ئاشتییەکە لەو قەلایە دەریبهێنێت، خەو بە ڕۆژگارێکەوە دەبینێت ناوی خۆی تیا بگۆڕێت، بڕوات و منداڵێک دروستبکات ناوی سەریاسی سوبحەدمی نەبیستبێت.

دۆستان نازانم سبەی شەو دەبێت باسی چیتان بۆبکەم، ئەم چیرۆکەی من هەرگیز کۆتاییناپەت، چیرۆکی ئەو کوڕە شوشانەی، لە وڵاتێکی شوشەدا، لە زەمانێکی شوشەییدا ژیان. سبەی شەو دەکرێت دووبارە دەستبکەمەوە بەم چیرۆکە، لەهەمان جێگاوە دەستپێبکەمەوە و بەڕێگایەکی دیکەدا بتانهێنم و بتانهێنمەوە سەر ئەم کەشتییە، دواجار ئەوە گرنگە پیاوێک هەیە لە ناو لمەوە دێت و لە کەشتییەکی پەنابەراندا لە دەریادا وندەبێت، ئەو پیاوە منم. من شەو دوای شەو گومانم لەم سەفەرە گەورەتر دەبێت، ئێمە نەزانانە لە ئۆقیانۆسێکی ترسناکدا دەسوڕێینەوە... چەندەها شەوە دەسوڕێینەوە و ناگەینە هیچ، ئەم کەشتییە تا هەتاهەتایە لەم دەریایەدا دەمانخولێنێتەوە، من هەموو شەوێک لێرەوە هاواردەکەم سەریاسی سوبحەدم تۆ لە کوێیت، من پیاوێک لە لم و ئاو، تۆش کوڕێکی لە خۆڵەمێش. هەموو شەوێک کە ئێوە دەخەون بێوچان دێم و بە دەریا دەڵێم شتێک لە من بەرە بۆ ئەو و شتێک لە ئەو بهێنە بۆ من. هاواری لێدەکەم سەریاس وەلاممبدەرەوە، بەلام جگە لە سەدای شەپۆلەکان هیچی دی نابیستم. هاواری لێدەکەم ئەی منداڵی ئاگر من بەرەو لای تۆ دێم وەرە زمان، بەلام ئەو هیچ ناڵێت. ئەو لەم زەریایانە بێدەنگترە، زۆر شەو هەستدەکەم ونبوونی من لەم ئۆقیانووسەدا ونبوونمە لە ناو بێدەنگی بێسنووری ئەودا. مەخلوقێک کە جارێک لە جارەکان لە سەر زەوی لەدایکدەبێت و دەسووتێت و بێدەنگییەک هەڵدەبژێرێت کە لەو بێدەنگییە زیاتر هیچی دی نییە هەڵیبژێرێت. بێدەنگی ئەم

دەریایە و بێدەنگی سەریاسەکان، ونبوونی من لێرەدا و لەوێدا، خنکانی من لێرەدا و لەوێدا یەکشتە... دۆستانی من، ئەی ئەوانەی بێوچان گوێم لێدەگرن، وەرن ئیدی باسەیری دەریا بکەین... وەرن و دەستی خۆتانم بدەنێ با سەیری ئەو شەپۆلانە بکەین کە پێدەچێت تا کۆتایی ئێمە بەم زەریایەدا بسوڕێننەوە، سەیرکەن ئەستێرەکان لەسەرمانەوە تەماشادەکەن، هەموو شتەکان پێکەوەڕا یەک ئاوازمان بۆ دەهێنن، هەموو شتەکان پێماندەڵێن تا دەتوانن بوەستن و سەیری ئێمەبکەن، نا من لەناو ئەم دەریا گەورەیەدا کە بێڕەحمانە یاریمان پێدەکات ماندوونابم... سەیری ئەو شەپۆلانە بکەن چ تورە لە دوورەوە دێن و یاری بەم کەشتییە چکۆلانەیە دەکەن، من بۆنی گەردەلوولێکی سامناک دەکەم، بۆنی بارەشێکی توندی دەریا دەکەم لەدوورەوە دێت و ئاسمان تاریکدەکات. هەستدەکەم چیتر زەریا گوێ لە هاواری ئێمە ناگرێت، خودایە من شەپۆلی گەورە و ترسناک دەبینم لە دوورەوە دێن، هەست بە شنەی تاریکی مردن دەکەم لەم ئۆقیانوسەدا بێغەم بەسەر سەرماندا دەفڕێت. تا دێت هەستدەکەم ئاو زیاتر و زیاتر بەرەو دووری و تاریکی ڕاماندەکێشێت، بەڵام ئەی دەریا من لە تۆ ناترسم. گوێبگرە ئەی دەریا... گوێبگرە لێم... من ماندوونابم... دڵنیام گەر لێرەشدا بمرم، شتێک سەدای من بۆ دوور دەبات... شتێک دەنگم تێکەڵ بە دەنگەکان دەکاتەوە... شتێک ئەم چیرۆکەی من بەرەو ئەوبەری ئۆقیانووسەکان دەبات... شتێک... مرۆڤێک... ئاوازێک کە دواجار یەکێک دێت و شفرەکانی دەخوێنێتەوە و دەیگەێنێتەوە بەوانی تر... وەرن سەیری دەریابکەین... سبەی شەو سەرلەنوێ ئەم چیرۆکەتان بۆ دەگێڕمەوە، تا گەر ئێوەش لەبەرتاننەکرد، دەریا لە بەریبکات، ماسییەکان لەبەریبکەن، ئەستێرەکان لەبەریبکەن... سبەی دووبارە لێرەدا دادەنیشین و بەجۆرێکی دی و بە هاوارێکی ترەوە

چیرۆکی ئەو کوڕانەتان بۆ دەگێڕمەوە کە من لەدوای ئەوان هاتوومەتە ئەم ئۆقیانووسەوە... مەڕۆن... دڵنیام گەر ئێوەش گوێنەگرن باکان گوێدەگرن... ئێوەش نەمبیستن ئەو باڵندە خەوتووانەی سەر کەشتییەکە دەمبیستن... وەرن بێوچان سەیری دەریا بکەین... بێوچان سەیریبکەین... بێوچان... بێوچان... بێوچان. ئێمە تا هەتاهەتایە لەم ئۆقیانووسەدا ونین... ئەوەی لەدەریادا ونبوو دەبێت بتوانێت بەدوای خۆیدا تەماشای ئاو بکات ، وەک ئەوەی لەسەحرادا وندەبێت و بەدوای خۆیدا تەماشای لم دەکات. ئەوەتا من لەم دەریایەدا ونم... ونم و لێرەوە، لە قووڵایی ئاوو تاریکییەوە هاواردەکەم «سەریاسی سوبحدەم، تۆ لە کوێیت... تۆ لە کوێیت؟ تۆ لە کوێیت؟ تۆ لە کوێیت؟ تۆ لە کوێیت؟.....».

## کۆتایی

## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١ | بنەڕەتەکانی فەلسەفە | حەمید عەزیز | |
| ٢ | کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (چ٢) | فەرهاد پیربالْ | |
| ٣ | ڕێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢) | فەرهاد پیربالْ | |
| ٤ | مۆزەخانەی پاکیزەیی | ئۆرهان پامۆک | بەکر شوانی |
| ٥ | نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٦ | ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢) | جەعفەر عەلی | |
| ٧ | سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | جەعفەر عەلی | |
| ٨ | مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢) | ئەحمەدی مەلا | |
| ٩ | نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ١٠ | کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>هیوا عومەر |
| ١١ | کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١٢ | فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣ | شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |
| ١٤ | دەسەڵات و جیاوازی | مەریوان وریا قانع | |
| ١٥ | لە چ ئێستایەکدا دەژین | مەریوان وریا قانع | |
| ١٦ | شوناس و ئاڵۆزی | مەریوان وریا قانع | |
| ١٧ | سیاسەت و دونیا | مەریوان وریا قانع | |
| ١٨ | جەمشید خانی مامم | بەختیار عەلی | |
| ١٩ | کەشتی فریشتەکان (کتێبی١) | بەختیار عەلی | |
| ٢٠ | کەشتی فریشتەکان (کتێبی٢) | بەختیار عەلی | |
| ٢١ | لە دیارەوە بۆ نادیار | بەختیار عەلی | |
| ٢٢ | وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٣ | چێژی مەرگدۆستی | بەختیار عەلی | |
| ٢٤ | مەعریفە و ئیمان | بەختیار عەلی<br>هێمن قەرەداخی | |
| ٢٥ | دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو... | گۆران ئیبراهیم صاڵح | |
| ٢٦ | سەمەرقەند (چ٢) | ئەمین مەعلوف | ئەحمەدی مەلا |
| ٢٧ | وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٢٨ | ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٢٩ | گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٠ | مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | جەمال ڕەشید<br>فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١ | منداڵی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٢ | مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٣٣ | پەیوەندییە سیاسیپەکانی نێوان هەرێم و دەولەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٣٤ | مێژووی گۆرانکاری کۆمەلایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٣٥ | سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا رەشید کەریم | |
| ٣٦ | شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٣٧ | کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٣٨ | فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانع | |
| ٣٩ | فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤٠ | دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤١ | کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤٢ | کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٤٣ | زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤٤ | فرانسیسکۆس قەدیسی من (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤٥ | ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |
| ٤٦ | شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٤٧ | من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٨ | میرنامە (چ٢) | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٤٩ | ڕووخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٠ | قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥١ | خەونی پیاوە ئێرانییەکان و کەوتنی بۆرە قەڵا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٢ | گرگن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٥٣ | ١٩٨٤ (چ٢) | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٥٤ | سوور و ڕەش | ستاندالْ | سیامەند شاسواری |
| ٥٥ | دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٥٦ | جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٥٧ | جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٥٨ | ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٥٩ | دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٠ | ئێوارەی پەروانە (چ٩) | بەختیار عەلی | |
| ٦١ | شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٢ | مەرگی تاقانەی دووەم (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٦٣ | کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٦٤ | تا ماتەمی گوڵ.. تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٥ | سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٦ | ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٦٧ | غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٨ | ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩ | دواهەمین هەناری دونیا (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠ | ئێمەی پەنابەر | کۆمەڵێ نووسەر | |
| ٧١ | گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢) | عەتا نەهایی | |
| ٧٢ | عێراقییەک لە پاریس | سەمۆئێل شەمعون | سەباح ئیسماعیل |
| ٧٣ | جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٤ | کچەی پرتەقاڵ (چ٣) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٥ | لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٦ | کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٧ | نهێنی یاری کاغەز (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٨ | مایا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٩ | ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار | کۆمەڵێ نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٨٠ | فەلسەفەی بوون | محەمەد کەمال | |
| ٨١ | وەک ڕووبارە بەخوڕەکە | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٨٢ | دیارییە مەزنەکە | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٨٣ | سیشەممان لەگەڵ مۆریی | میچ ئەلبۆم | جوتیار ژاژڵەیی |
| ٨٤ | دوالیزمی دژ یەک لە هۆنراوە لیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و... | لهۆن قادر عەبدولڕەحمان | |
| ٨٥ | ڕووناک وەک ئەوین، تاریک وەک مردن | مەمەد ئوزون | وریا غەفووری |

